# مختصر صحيح البخاري

المسمى بـ:

# التجريد الصريح

دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى

بە كوردى كردن و ليكۆلينەوەى

نورى فارس حمە خان

بەگوێرەى تەخريجى (د. مصطفى ديب البغا) تەخريج كراوە

محمود أحمد محمد

پێيدا چۆتەوەو سەرپەرشتى لە چاپدانى كردووە

دار المعرفة
بيروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

***********************************************

📖 ناوی کتێب: مختصر صحیح البخاری المسمی بـ( التجرید الصریح ).

📖 دانراوی: ابي العباس زين الدين الزبيدي.

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ ( ٢٥٠٠ ) دووهەزارو پێنج سەد دانـــه .

📖 ژمارەی سپاردن: ( ٢٤٦٤ ساڵی ٢٠٠٩ ).

📖 ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز ١٤٣١ ك

📖 کۆمپیوتەرو هەڵە چنین : ( ڕوبار حسین/کۆمپیوتەری شانیا )

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپ کراوە. 

# مُخْتَصَر صَحِيحْ الْبُخَارِي

الْمُسَمّى

# بِالتَّجْرِيد الصَّرِيحْ

دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى

بە كوردى كردن و ليّكۆڵينەوەى

**نورى فارس حمە خان**

بەگوێرەى تەخريجى ( د. مصطفى ديب البغا ) تەخريج كراوە

محمود أحمد محمد

پيّيدا چۆتەوەو سەرپەرشتى لە چاپدانى كردووە

2010 ز 1431 ك

بەرگى يەكەم

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

لەپاش سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆخودای گەورەو میهرەبان، حەزدەکەم کەئەم چەند خاڵە بۆ خوێنەرانی ئازیز روون بکەمەوە:

١- بەدەستی خۆم لەپاکنووس و هەڵەبـژێری ئەم چاپە نوێیەی ئەم بەرگی یەکەمە بوومەوە، لەم کتێبە پیرۆزە، کە موختەصەری صەحیحی بوخارییە، کەناسراوە بەتەجریدی بوخاری.

٢- بەپێی تەوانا، ئەو هەڵانەی کەلەچاپی یەکەما هەبوو، ئەوانەشم بەسەر گرتەوەو راستم کردنەوە، کەلەزۆر شوێنا لەچاپی یەکەما هەڵەی گەورە هەبوو.

٣- لەم چاپەدا:

أ- تەخریجی حەدیثەکان، وەك چاپە کۆنەکە بەپێی تەخریجی (د.مصطفى ديب البغا) کراوە.

ب- تەخریجی حەدیثەکان بەپێی تەخریجی مامۆستا (شێخ خلیل مأمون شیحا) لەسەر شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم: (دار المعرفة: لبنان – بيروت. ط/١٢—١٤٢٧هـ-٢٠٠٦م).

٤- ئاماژەم بۆ جێگەو ژمارەی فەرموودەکان، لە (رياض الصالحين و تاج الأصول)دا کردووە، بەپێی چاپە نوێکانیان، بەتایبەتی چاپی چوارەمی تاج الأصول بەپێی ئەم رونکردنەوەی وا لەدواوە.

وەرگێڕ

نوری فارس حەمە خان

کوردستان.سلێمانی. مامۆستایان

ماڵی خۆمان – ٢٠٠٩/٧/٢٠

# پێشەکی

الحمدُ لِلهِ رَبِّ العَالَمِينَ، أَحْمَدَهُ حَمْداً كَثيراً طيباً مُبَارَكاً فِيه وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ محمداً عَبْدَهُ وَرَسُولَهُ، صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلاَمُهُ عَلَيْهِ وَعَلَى سَائِرِ الأَنبيَاء وَالمُرْسَلين، وآلِ كُلّ، وَسَائِرِ عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِين، وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإحْسانٍ إلى يَوْمِ الدِّين.

لەپاش سوپاس‌و ستایشی خودای گەورەو ناردنی درووودو سڵاوی بێپایان بۆ سەر گیانی پیرۆزی پێغەمبەری زێدە خۆشەویست، وە بۆ سەر گیانی هاوڕێ نازدارەکانی، عەرزم ئەمەیە:

١. لە ٣١-٧-١٩٧٢ دەستم کردووە بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە پیرۆزە، لەشاری کەرکووکی خۆشەویست، بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، وەلەو ساکەوە هەتا ئەم دەمە هەر خەریکی ئەم جۆرە تەرجەمانەم، مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێ کە چەندە هەوڵی ساخ کردنەوەیان‌و خزمەتیان بووم، لەخوا داوادەکەم‌و دەپاڕێمەوە کە قەبووڵیان بفەرموێ، وەبیان کا بەمایەی ڕەحمەت‌و بەسەرچاوەی خێرو خۆشی بۆ وڵات‌و خوێنەرو بیسەرو هەرکەسێ بۆ ڕەزای خودا بەهەر شێوەیێ خزمەتیان بکات.

٢. ئەم تەرجەمەیە، هەتا بڵێی ئەمین‌و بێ گەردە، بەپێی سەرچاوەی بتمانەپێکراو واتای فەرموودەکان کراوە،بگرە ئەم تەرجەمەیە دادەنرێ بەشەرحێکی کورتی پوخت، کەبەکەمترین ئەرك خوێنەر بەجوانی لەواتای فەرموودەکان حاڵی دەکات.

٣. لەم وەرگەڕانەدا بەهەرەم لەسەرچاوەکانی وەرگێڕانی تاجول ئوصول‌و ریاض الصالحین‌و فیقهی ئاسان‌و إصابەو إستیعاب‌و تەهذیب‌و تەهذیبی عەسقەلانی وەرگرتووە.

٤. دەق بەپێی تەخریجی مامۆستا (دکتۆر مصطفی دیب البغا) فەرموودەکانم لەصەحیحی موسلیم دا تەخریج کردووە، بەڵام زۆر فەرموودە هەیە کەئەو لێیان بێ دەنگ بووە، وەئەوانیش ژمارەیەکی زۆرن، لەبەرئەوە من خۆم لەموسلیما تەخریجم کردوون، وە ئاماژەم بۆ سەرچاوەی تەخریجەکەم کردووە، کەعەینییە، یا فەتحول بارییە، یا هەر سەرچاوەیەکی تره، تەنانەت ئاماژەم بۆ بەرگو لاپەڕەی سەرچاوەی تەخریجەکە کردووە، هەتا خوازیار لەکاتی پێویستا موتاڵای بکا. لەم چاپە نوێیەدا، فەرموودەکانم لەصەحیحی موسلیم دا تەخریجو تەرقیم کردووە، بەپێی تەخریجی مامۆستا شیخ خلیل مأمون شیحا (دار المعرفە: بیروت. لبنان. لسنه ١٤٢٧هـ-٢٠٠٦م).

٥. ژیاننامەیەکی کورتو پوختم بۆ هەموو صەحابەیێ نوسیوە، لەو شوێنەدا کەیەکەم جار ناوی لەتەجریدەکەدا دێ. گەلێ جار نەوادرو کەراماتو خەواریقی پیاوانی رشتە (سند)ەکانم نوسیوە، کە گومانم لەوەدا نییە کە ریجالی صەحیحی بوخاری شەریف هەموویان ئەولیا بوون، خوا لەگەڵ ئەوانا لەهەردوو جیهانا لەگەڵ هەموو خۆشەویستانمانا حەشرمان بفەرموێ. بڕوانە ئەم ژمارانە تاهەندێ لەحاڵی ئەم پیاو چاکانە حاڵی ببی: (٣٠، ٤٩، ٦٦، ٧٥، ٨٣، ٨٩، ٩٧، ١١٧، ١٧٧، ٢٨٥، ٣٤٩، ٤٣٤، ٤١٩، ...).

٦. بەپێی حاڵ، لەکاتی پێویستا کورتە شەرحو ڕونکردنەوەیەکم لەسەر فەرموودەکان نوسیوە، وە زۆرترین کات ئاماژەم بۆ جێگەی فەرموودەکە کردووە لەتاجول ئوصولو ریاج الصالحین دا، بەتایبەتی کوردیەکەی، زۆرترین ئاوا بەهێما {ت-٣ ل-٢٦٥ ز-١٠١ ف-١} = {تاجول ئوصول-بەرگی سێیەم لاپەڕە-٢٦٥ زنجیرە-١٠١ فەرموودەی یەکەم لەو زنجیرەیە}. ئیتر هەروەها... گەلێ جار لەتاجا دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بوخاری یا موسلیم یا..... ڕیوایەتی کردووە، من بۆ ئەم زاتانە ئەم نیشانانەم داناوە:

{ب=بوخـــاری، م=موســـليم، ش=شـــەيخان، ت=ترمـــذي، د=ئـــەبو داوود، ن=نەسائی} چـونکە ئەمـە بۆکەسـی خـۆی زۆر گـرنگ‌و سـوود بەخـشە، بەتایبەتی بۆهەڵە بژێری لەومرگەڕاوە کوردیەکان لەچاپی ئاییندەدا.

٧. وردەکارییـەکی زۆرم لەبابـەت زانـستی فـەرمووده شوناسـییەوە، بـۆ یەکـەم جار لە کوردی دا پیادەکردووە.

٨. بەپێی (طەبعەی یەکەمی فتح الباري — دار الرَّيان للـتراث القـاهرة - ١٩٨٦) ئامـاژەم بۆ ئەترافەکانیـشی نوسـیوە، هەیـە خـۆم ئامـاژەم بـۆ ئەترافـەکانی کـردووە، بـەناوی (المترجـم)، وە هـەموو فـەرمودەیێ دوو ژمـارەم بۆدانـاوە، لەسەرەتاوە ژمارەی فەرمووده‌کە لەتەجریـدا، لەکۆتاییـشەوە ژمـارەی ئـەو فەرموودەیە لەفەتح الباری دا، بـەپێی چاپی نـاوبراو. وەگەلـێ وردەکاری تریـشم نوسـیوە وەك سـەرباس دانـان بـۆ بابەتـەکان چـونکە گەلـێ جـار خوێنـــەر وا هەســـەت دەکـــات فەرموودەکـــە پەیوەنـــدی بەبابەتـــە سەرەکییەکەوە نییە.

٩. هەمیشە من دوعای خێر دەکـەم بـۆ ئـەو بەڕێزانـەی کـە ئـەرکی پـەخش‌و چاپکردنی ئەم کتێبە پیرۆزانە دەگرنە ئەستۆ، بەپشتی خودا بۆیـان دەبـێ بەمایەی پیت‌و فەڕ، هەتا بۆ ئەو چاپخانەیەیش کەتیایدا لەچاپ دەدرێـن، بەتایبەتی جەنابی (مامۆستا محمـود أحمـد محمـد) خـوا بـە لـوتفی خـۆی سەربەرزی دین‌و دونیای بفەرموێ.

١٠. ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە کەواین لەخزمەتیـدا خـوا بەکـەرەمی خـۆی لـەپیت‌و فـەڕی بێبـەشمان نـەکات، جـوانترین پوختـەی صـەحیحی بوخارییـە، کەناوداره بـە موختەصـەری زوبەیـدی. صـەحیحی بوخـاری خـۆی (٧٢٥٧) فەرموودەیـە، بەشـێکی زۆری فـەرموودەی موسـنەدی متـصلی پێغەمبـەر خۆیـەتی، کەبریتییـە لـەم تەجریـدە صـەریحە. پێـشەوا بوخـاری (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای لـێ بـێ) بەشـازده سـاڵ صـەحیحی بوخـاری دانـاوە، گەشـتێکی گـەورەی بـۆ ئـەم مەبەسـتە پـیرۆزە ئـەنجام داوە، لەسـەرەتاوە

لــەبوخاراو ســەمەرقەندو دەورو بەريانــەوە دەســتى پێكــردووە، هــەتا لەتەمەنى هەژدە سالّى دا لەخزمەت دايكىو ئەحمەدى براى دا دەچن بۆ حەج، بەسەر ساراى قرمو ئەفغانستانو ئێرانو عێراقو شامو دەرياى سووردا دەڕۆن هەتا دەگەنە حيجاز.!

دەبێ چ سۆزو ئەشقو شەوقێ پالّى پێوەنابن كە سەفەرێكى ئاوا دورو درێژو پڕ مەترسيى بگرنە بەر. جا لەپاش حەج دايكىو ئەحمەدى براى گەڕانەوە بۆ بوخارا، پێشەوا بوخارى بڕيارى دا كە لە مەككە لەخزمەت بەيتا بمێنێتەوە، بۆ وەرگرتنى زانست، ماوەيەكى باش لەزاناكانى مەككەو مەدينە، فەرموودەيەكى زۆرى وەرگرت، ئەوجا بەرەو عێراق درێژەى بەگەشتەكەى دا، ماوەيێ لە كووفەو بەصرەو بەغدا مايەوە، پێنج سالّ لەبەصرە بوو، هەر پێنج سالّەكە حەجو عەمرەى كرد، لەبەغدا بەخزمەت ئيمامى ئەحمەد دەگا، دەبێ بەفەقێى، كاتێ ئيمامى ئەحمەد دەمرێ، بوخارى لەجێگەى ئەو كرا بە مامۆستاى زانستگاى حەديث لەبەغدا.

بەلێ جەنابى شێخى بوخارى لەپێناوى خزمەتو ڕاژەى سوننەتى پێغەمبەردا ساخ بۆ ڕەزاى خوداو بەس، بوخاراو سەمەرقەندو حيجازو شامو عێراقو ميصرو زوربەى ولاتەكانى ئاسيا گەڕاوە، قەبوولى غەريبىو ئاوارەيىو برسێتىو تونێتىو خەتەرى ڕێگەو بانى پڕخەتەرى كردووە، بەهەزاران ميل ڕێگەى بڕيوە، سەرماو گەرماى زۆرى چەشتووە، بەهەزاران كۆڕى زانستيى بەستوە، بەسەدان مامۆستاو فەقێى بووە، هەموو جارێكيش لەپاش كۆششو لێكۆلّينەوەيەكى باش، كاتێ فەرموودەيەكى بەدلّى خۆى دەست دەكەوت، كەدەقەكەى بێ گەردبێو ڕشتەكەى (واتە: سەنەدەكەى) بێ نەنگ بێ، دەسنوێژێكى جوانى دەگرت، غوسلّێكى سوننەتى دەكرد، ئەوجا دوو ركات نوێژى سوننەتى سوپاسى خواى لەسەر ئەم بەهرە گەورەيە دەكرد، كەئەو فەرموودەيەى دەست كەوتووە، ئەوجا فەرموودەكەى لەبەر دەكردو

لەپاشا لەناو بوخاری شەریفا دەینووسی، وەك گەنجی گەوهەری دۆزیبێتەوە ئاوا بگرە زیاتریش.

لەموقەدیمەی فتح الباري دا ئەم زانیارییانەی سەبارەت بەشێخی بوخاری واتیادا: {... بوخاری بەمنالی باوکی دەمرێ، سامانێ باشی بۆ بەجێ دەهێلێ ... دەیدا بەقازانج بەهاوبەشی، هەرچی لەوە دەست دەکەوێ دەیکا بەخێر ... دایکی بەمنالی گەورەی دەکا، هەر بەمندالی بوخاری کوێر دەبێ، حەزرەتی ئیبراهیم (سلاوی خوای لێ بێ) دەچێتە خەوی دایکی، پێی دەفەرموێ: (بەبەرەکەتی دووعای زۆری تۆ خودا چاوی کوڕەکەتی چاك کردەوە..) .. (هەموو سێ شەوێ لەڕەمەزانا خەتمەیەکی قورئانی دەکرد، لەکاتی بەرەبەیاندا تەواوی دەکرد، هەموو ڕکاتێ بیست ئایەتی تیادا دەخوێند، تا لەسەر ئەو شێوەیەیش لەشەوانی ڕەمەزانا خەتمەیەکی تریشی دەکرد... ئەمەش بەشەو، بەڕۆژیش هەموو ڕۆژێ خەتمەیەکی تریشی دەکرد، لەکاتی بەربانگا تەواوی دەکرد! ... بوخاری زۆر زۆر سەخی بووە، هەتا تەصەوور بکەی زاهیدو موتتەقیو بێ هەواو خاکیو کەمخۆرو کەم خەوو حەلاڵ خۆر بووە ... خۆی دەیفەرموو شك نابەم یەك درهەمی حەرام لەماڵەکەم دا هەبێ ... زۆر جار لەخەودا بەخزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشتووە، بەهرەی لەو خەونانە وەرگرتووە، لەخەودا دەبینێ، باوەشێنێکی واپێ مێش لەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوور دەخاتەوە، ئەم خەونە دەبێ بەهۆی دانانی صەحیحی بوخاری ... چونکە مانای خەونەکەی ئەوە بوو کە درۆ لەپێغەمبەر دوور دەخاتەوە زۆر زۆر موسالیمو بێ وەی بووە، خۆی دەیفەرموو: گومان نابەم کەلە قیامەتا کەسێ هەبێ داوای لەسەرم هەبێ ... وە دەیفەرموو: چل ساڵ نانم بەبێ پێخۆر خواردووە!... لەبەر ئەوە زۆر لاواز بوو بوو} .

کورتو پوخت باشترین پێناسە بۆ بوخاری ئەمەیە (كَانَ خُلُقُهُ صَحِيحَ البخاري) بەسیشە بۆ پەسنو مەدحی صەحیحی بوخاری کە دووەمین کتێبی

صەحیح‌و موقەددەسە لەئیسلاما، یەکەم: قورئان، دووم: صەحیحی بوخاری، سێیەم: صەحیحی موسلیم.

هەروا لەموقەدیمەی فەتحولباری دا دەفەرموێ: (... لەهەر سەخڵەتی‌و تەنگانەیەکا، خەتمەی صەحیحی بوخاری کرابێ، خودا دەرووی لێیان کردۆتەوە، ئەو پاپۆڕەشی کە صەحیحی بوخاری تیادا بووبێ قەت نەبووە کە غەرق بوو بێ...).

منیش لێرەدا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: (... باشترین فریا ڕەسم لەکاتی مەینەت‌و تەنگانەو سەخڵەتی‌و کێشەو بەرەو خەم‌و خەفەت‌و ترس دا ئەم کتێبە پیرۆزانە بووە، شەوی وا بووە تا بەیانی بەرگێکی تاج الأصول لەسەر دڵم بووە، فەرامۆشیم بۆ هاتووە، قەت نەبووە لەخودا داوابکەم‌و بڵێم: خوایە، بەبەرەکەتی ئەم کتێبانە لەم تەنگانەیە ڕزگارم بکەو ڕزگاری نەکردبم ...).. ئومێد دەکەم کە موسوڵمانانی تریش لەکاتی وادا خودا بەبەرەکەتی خزمەتی ئەم کتێبانە نزایان قەبووڵ بکا.

لەپایانی ئەم پێشەکییەدا بەدڵێکی پڕەوە لەخودای گەورە دەپاڕێمەوەو دەڵێم: ... خوایە گیان! خۆت ئاگات لەحاڵمانە، واسبەینێ من‌و هاوسەرم دایکی صەلاح زەکیە کریم علی لەخزمەت کۆمەڵێکی موبارەك دا لەپیاوو لەژن دەکەوینە ڕێ بۆ سەفەری حەج، خودایە! بە نصیبمانی بفەرموو، ولێمان قەبووڵ بکە، لەناو ئەو کۆمەڵە موبارەکانەدا ئەم زاتانەی واتیادا: مامۆستا مەلا عوزەیر حافیظ نەذیر کە ئیمام‌و خەتیبی مزگەوتی حاجی عوسمانی عەلافە لەزەرگەتە لەسلێمانی لەگەڵ برای بەڕێزمان مامۆستا شەماڵ موفتی لەگەڵ مامۆستا مەلا ئەحمەدی شافیعی، بەڕاستی سێ مامۆستای مجاهیدو موبارەکن. خوایە لەمردوو زیندومان خۆش بە، بەڕەحمەتی خۆت کاری دین‌و دنیامان بۆ ئاسان بفەرموو، لەدایك‌و باوکمان خۆش بە خوایە! چاوی ڕەحمەتت لەخۆمان‌و ماڵ‌و منداڵ‌و هاوسەرو براو خوشك‌و کەسوکارو دۆست‌و برادەرمان بێ، (يَاحَيُّ يَاقَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ)

خوایـه: بەڕەحمـەتی خـۆت فریامـان بکـەوە، لەماڵـەوە، لەدەشـت، لـەدەر، لەسـەفەر، لەهـەرکوێ بـووین، چاوی ڕەحمـەتت لێمان بێ، کارمان بۆ ئاسان بفەرموو، خودایە! بەبەرەکەتی ئەم کتێبەو ئەو دوعایەی کە ئیمامی بوخاری کردوویەتی بۆ خوێنەری ئەم کتێبە خەمو ترسمان بڕەوێنەوە، مرازمـان بـدە، نزای خێرمان بۆ خۆمـانو کەسوکارمانو دۆسـتو بـرادەرو خوێنـەرو وڵاتمـان گیرا بفەرموو. خودایە! نائومێدمان نەکەی، بـەخراپی خۆمـان لەگـەڵ نەکـەی، خودایە! لەدنیاو لەقیامەتا لەگەڵ پێغەمبـەرانو زانایـانو پیاوچاکانو شێخو مـەلاو صـۆفیو دەروێـشو حـاجیو فـەقێو نوێژکـەرو ڕۆژووگـرو خوناسـانا حەشـرمان بکـەی، خودایـە! بەتایبـەتی بەبەرەکـەتی ئـەم کتێبـە پیرۆزە لـەم سـەفەرەدا دایکـی سـەلاح لـەش ساخ بفـەرموو، بـاری لەشـی سـووك بفـەرموو، بەڕاستی هەقی زۆری بەسەر منو بەسەر ئەم کتێبانەوە هەیە.

خودایـە! چـاوی ڕەحمـەتت لێمـان بێ، ڕەنجە ڕۆمـان نەکـەی، ڕوو زەردی دیوانی خۆتمان نەکەی، خودایە! ئاواتی دینو دنیامان بهێنە دی.

خودایـە! کوردسـتان پڕکـەی لـەخێرو خۆشـیو ئـازادیو سەربەسـتیو ئاشتیو برایەتیو کاربەدەستی دادپەروەرو لەزانای کارای دانای لـەخواترسو لەمەلای بەهەق مەلا، وەپاکی بکەیتەوە لەکاربەدەستی ناعادلو مەلای نامەلا.

چـەندەم خـۆش دەوێ مـەلای مـەردی کـورد
خزمـەتی کـورد کـا، لەسـەر خـۆ، ورد ورد!!

غَفَرَ اللهُ لِي وَلِوالِدَيَّ ولِسائِرِ المُسلمين، وَصَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَى سَيِّدِنَا محمدٍ وَآلِـهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ، وآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحمدُ لِلهِ رَبِّ العَلَمِين.

وەرگێڕ
نوری فارس حەمە خان حەسەن
سلێمان/مامۆستایان/ماڵی خۆمان
کاتژمێر دەی شەو ٢٠٠١/٢/٢٣

بسم الله الرحمن الرحيم

## ١- باسی ئەوەی سرووش (وەحی) چۆن چۆنی دەستی بەهاتن کرد بۆ پێغەمبەری خوا، حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ)

## (باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ))

١- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ). (الحديث رقم: ١ في فتح الباري)[١]

فەرمانڕەوای موسوڵمانان، ئەمیرلوئمینین عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەرم بیست (دروودو صەلاتو سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو کارو کردەوەێی بەپێی نیازو نییەتەکەیەتیو هیچ کارێ بەبێ نیازو خواستی دڵ دانامەزرێ، وەهەموو کەسێکیش بەپاداشی نیازو نییەتی خۆی دەگا،چ چاك چ خراپ،کەوابوو هەرکەسێ مەبەستی لەکۆچ کردنو هیجرەتەکەی لەمەککەوە بۆ مەدینە ڕەزای خوداو پێغەمبەر بێ ئەوا کۆچ کردنەکەی قەبووڵەو بەپاداشی گەورە دەگا، وەهەر کەسێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دنیایی بێ کەدەستی بکەوێ، یاخۆ لەبەر ئافرەتێ بێ کەمارەی بکا، ئەوە کۆچ کردنەکەی بەپێی نیازەکەیەتیو هیچ خێری ناگا لەسەری).

---

(١) أخرجه مسلم في كتاب الامارة، باب قوله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انما الاعمال بالنية. رقم: ١٩٠٧ = ٤٩٠٤ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح النووي. دار المعرفة. بيروت. لبنان. ١٤٢٧هـ-٢٠٠٦م.

## شیکردنەوە:

کردەوەی جەستەیی (عەمەلی بەدەنی) فەرزبێ یان سونەت بەبێ نێتو نیاز لێهێنان دانامەزرێ، بەڵام ئەمە بەزۆری وایە دەنا هەندێ کردەوە بەبێ نێتلێهێنانیش دادەمەزرێ، وەك قورئانخوێندنو ذیکرو یادی خودا کردنو بانگ دان، بەبێ نیازهێنانیش وە وازهێنان لەحەرام دادەمەزرێن، هۆی روودان (ورود) ی ئەم فەرموودەیە سەرگورشتەکەی ئوممەوقەیسە کەپیاوێ بەناوی کۆچ کردنەوە شوێنی کەوتبوو بۆ مەدینە،جا خودا کۆچەکەی دایەوە بەسەریدا چوونکە نیازەکەی پاك نەبوو. ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودانەی کەدەبن بەسوورگەو مەدار بۆ ئیسلام. ئەم فەرموودەیە موسلیمو ئەبوداودو تیرمیذیو نەسائیش (رەزای خودیان لێ بێ) گێڕاویانەتەوە. نێتو نیاز خواستی دڵن، گوتنیان بەدەم سوونەتە: (تاج-ل-٦٥) موسلیم (رەزای خوای لێ بێ) لەنامەی فەرمانڕەواییدا گێڕاوییەتەوە باسی (انما الأعمال بالنیة) ژمارە: ١٩٠٧ = ٤٩٠٤شیحا (رقم الحدیث في فتح الباری بشرح صحیح البخاري ١- أطرافه في: ٥٤، ٢٥٢٩، ٣٨٩٨، ٥٠٧٠، ٦٦٨٩، ٦٩٥٣).

٢- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ، قَالَتْ: عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا). (الحديث -٢ - طرفه فی:٣٢١٥).[٢]

---

(٢) أخرجه مسلم في الفضائل، باب طيب عرق النبي (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) في البرد وحين يأتيه الوحي، رقم: ٢٣٣٣ = ٦٠١٣شیحا.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حاریثی کوڕی هیشام لە پێغەمبەری پرسی، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! سروشت چۆن بۆدێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گەڵێ جار بەوێنەی زرینگەی زەنگ بۆم دێ، ئەم جۆرەیان سەختترین شێوەیەتی لەلام، جا کەفریشتەی سرووش (یا سرووشەکە خۆی) بەرم دەداو باری لەشم سووك دەبێ، ئیتر فریشتەکە هەرچی فەرمووە پێم گشتی وەك خۆی دێتە بەرمو باش دەیزانمو لێی تێ دەگەم، زۆرجارانیش فریشتەکە (کەجوبرائیلە) لەشێوەی پیاوێکا، وەك دەحیەی کەلبی خۆی دەردەخا بۆمو قسەم لەگەڵ دەکاو هەرچی دەفەرموێ وەری دەگرمو دێتەبەرم، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا خۆم پێغەمبەرم دیوە، وەها سەخڵەت دەبوو، کەسروشی بۆ دەهات، لەڕۆژی سەرماو سۆڵەدا کەسروش دەهاتە خوارەوە بۆی، لەوکاتەدا کەبەری دەدا چۆڕاوگەی ئارەق بەناوچاوانی دا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە!).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

سرووش (وەحی) فەرمانێکە، یا فەرمایشتێکە بەهۆی فریشتەوە لەخواوە بێ بۆ پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێ) سرووش جۆرێکی تری بەخەونەو جۆرێکی تریش بەخستنە ناو دڵە کەپێی دەکوترێ ئیلهام، دیمەنو ڕواڵەتی فەرموودەکە وادەگەیەنێ کە (متصل) بێ، نەك (مرسلی صحابی)، ئەویش بەڵگەی ئەوەیە کەژن بۆی هەیە ئامادەی کۆڕی پیاوان بێو گوێ لەقسەو گفتوگۆیان ڕابگرێو هاوبەشی کۆڕی زانستی زانایان بکا، چوونکە ئەوەتا شتی وا لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا رووی داوە، بەڵێ ئەمە وایە بەمەرجێ مەترسی ئاژاوە نەبێ، وەك بەشداریکردنی ئافرەتی کوردەواریی خۆمان، لەلادێ، لەزۆربەی کارو فرمانەکانا، هەتا لەدەرو دەشتیش وەك مەڵۆ کردنو شارا کردنو کۆڵکێشانو بژارکردنو شتی وا، وەمەترسی ئاژاوەیش زۆر زۆر

کەمە. موسلیمو تیرمیزیش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ)
(بڕوانە: تاج/٤ ل/٢٩١ ز/٩٨ ژ/٣١٤٧ بەرگی/٣ چاپی چوارەم) موسلیم لە فضائیل دا، لەباسی طیب العرق النبي (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) وحين يأتيه الوحي)، دا گێڕاویەتەوە. ژمارە: ٢٣٣٣ = ٢٣٣٣شیحا.

٣- عَنْ عَائِشَةَ أم المؤمنين (رضي الله عنها) قَالَتْ: (كَانَ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةَ فِي النَّوْمِ فَكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلَاءُ فَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ يَتَحَنَّثُ فِيهِ ـ وَهُوَ التَّعَبُّدُ ـ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا حَتَّى فَجِئَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ جَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ قَالَ مَا أَنَا بِقَارِئٍ قَالَ فَأَخَذَنِي فَغَطَنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ قَالَ قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ قَالَ فَأَخَذَنِي فَغَطَنِي الثانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ أَقْرَأْ فَقُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ فَأَخَذَنِي فَغَطَنِي الثالِثَةَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ. خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ} فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرْجُفُ فؤاده حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بنت خويلد (رَضِيَ اللهُ عَنها) فَقَالَ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ ثُمَّ قَالَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي فَقَالَتْ خَدِيجَةُ كَلَّا وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا وَإِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَتَقْرِي الضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنُ عَمِّ خَدِيجَةَ وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعَرَبِيَّ وَيَكْتُبُ مِنْ الْإِنْجِيلِ بِالْعَرَبِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ يا بن عَمِّ، اسْمَعْ مِنْ ابْنِ أَخِيكَ فَقَالَ لَهُ: وَرَقَةُ بْنُ نَوْفَلٍ يَا ابْنَ أَخِي مَاذا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَبَرَ مَا رَآهُ فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذا النَّامُوسُ الَّذي نَزَّلَ اللهُ عَلَى مُوسَى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْتَنِي

فِيهَا جَذَعٌ يَا لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذ يُخرِجُكَ قَوْمُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ). قَالَ وَرَقَةُ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قط بِمثل ما جِئْتَ بِهِ إِلَّا عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا، ثم لم ينشب وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّي وفتر الوحي). (الحديث ٣ ـ أطرافه في: ٣٣٩٢، ٤٩٥٣، ٤٩٥٥، ٤٩٥٦، ٤٩٥٧، ٦٩٨٢)[٣]

عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەرەتاوە کەسرووش دەستی پێکرد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خەونی باش بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەر خەونێکە دەدی بەوێنەی شەبەقی بەیان دەهاتەدی، لەپاشا بەرە بەرە حەزی لەتەنهایی‌و گۆشەگیری‌و خەڵوەکێشان بوو، جا دەست دەکا بەخەڵوە کێشان لەئەشکەوتی حیراء دا، وە لەوێ هەموو جارێ چەند شەوێ بەژمارە دەمایەوەو لێ دەبڕا بۆ خوا (واتە: خواپەرستی دەکرد) وەلەوماوەیەدا تاسەو ئەڵهای کەس‌و کاری نەدەکردو نەدەچووەوە بۆلایان، وەبۆ ئەمەیش توێشەی لەگەڵ خۆیا دەبرد، ئینجا دەگەڕایەوە بۆماڵەوە بۆلای خەدیجەی هاوسەری‌و سەرلەنوێ توێشەی ئەوەندەی تریشی دەکردەوەو دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، جا ئاوا هەتا ماوەیێ لەسەر ئەم حاڵە دەوامی کرد، هەتا لەپڕ لەئەشکەوتی حیراء دا بەم شێوەیە سرووشی بۆدێ، فریشتەکە دێتەلای‌و پێی دەفەرموێ: بخوێنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: من خوێندەوار نیم، فەرمووی: جا جوبرائیل گرتمی‌و گوشیمی بەسینگی خۆیەوە تاهێزی لێ بڕیم، ئەوجا بەری دام‌و فەرمووی: بخوێنە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی گوتم: چی بخوێنم خۆمن خوێنەوار نیم، دیسانەوە گرتمی‌و گوشیمیەوە بەخۆیەوە تا وزەم لێ بڕاو تەواو شەکەت بووم، دیسان بەری دامەوەو فەرموویەوە: بخوێنە: گوتمەوە: من

(٣) أخرجه مسلم في الايمان باب: بدء الوحي إلى رسول الله (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ)، رقم:١٦٠ = ٤٠١شيحا.

خوێنـدەوار نـیم، دیـسانەوە بۆجـاری سـێیەم گرتمـیو گوشـیمی بەخۆیـەوە تاتاقەتم لێ بڕا، ئەوجا بەری دامەوەو فەرمووی: {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّـذِي خَلَـقَ. خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّـمَ بِـالْقَلَمِ عَلَّـمَ الْإِنْـسَانَ مَـا لَـمْ يَعْلَمْ} بخوێنە بەیارمەتیو پیرۆزی ناوی پەروەردگاری خۆتەوە کەهەموو شتێ ئەو دروستی کـردووە، مرۆڤی دروسـت کـردوە لـەتنۆکێ خـوێنو لەپارچـەیێ خوێنپـارە کەلـەتنۆکێ تۆمـەوە پەیـدا دەبـێ، بخوێنـەو بزانـە کـەخودای تـۆ خودایەکی وایە کەلەهەموو کەسێ بەخـشندەترە. ئنجا حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم ئایەتانـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆماڵـەوەو سام دای دەگـرێو دڵـی دەلـەرزێو دەڕواتەوە بۆلای خەدیجەی کچی خووەیلیـد، کەیەکـەم ژنـی بـوو، دەفـەرموێ: دام پۆشن، دام پۆشن، ئەوانیش دای دەپۆشن، تا ترسو سامەکەی دەنیـشێتەوە، ئـەوجا ئـەم باسـە دەگێڕێتـەوە بـۆ خەدیجـەو دەفـەرموێ: بـەخودا مەترسـیم لەخۆم کرد کەبمرم ئەوەنـدە سامێ گـرانم لێ نیشت، خەدیجـەیش (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: دووربا شتی وامەفەرموو، بەخودا هـەرگیز خـودا شـتی واناکـاو تـۆ ڕیسوا ناکا، چونکە بـەهرەوەریی تـۆ بـێ وێنەیە، تـۆ پیـاوێکی خـزم دۆسـتیو خزمـەتی خـزمو خـۆیش دەکـەیتو پیـاوی کـۆڵیو دەسەوسـان دەگریتـە مـل خـۆتو بـاری ئـازاری خـەڵك دەخەیتـە سەرشـانی خـۆتو داڵـدەی بـێ نـەواو هـەژارانیتو خـاوەن نـانو دیوەخانیـتو شـتی واچـاك بەخـەڵك دەبەخـشی بەهـەموو کەسـێ نابەخـشرێو میوانـداریی بـەمیوان دەکـەیو یاریـدەی لێقەوماوان دەدەی، یارمـەتی مـەردوم دەدەیو بـەکورتیو پوختی: پیـاوەتیو کۆمـەکیت کـردووە بەپیـشەو بەئـەرکی سەرشـانی خـۆت. ئـەوجا خەدیجـە لەخزمـەتی دا دەچـێ بـۆلای وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەلی کـوڕی ئەسـەدی کـوڕی عەبـدولعوززا، کـەئامۆزای خەدیجـە بـوو، و لەسـەردەمی نـەزانی دا بـوو بـوو بەمەسـیحی، وەنووسـینی عیبرانـی دەزانـی، ئەوەنـدەی خـوا حـەزکا، ئینجیلـی بەعیبرانی دەنووسییەوە، خۆی پیرەمێردێکی ئیختیار بوو کوێر بـوو بـوو، جا

خەدیجه پێی دەڵێ: ئامۆزا! گوێ لەبرازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی، وەرەقەیش دەڵێ: ئەی کوڕی برام! ئادەی پێم بڵێ چی دەبینیت؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) چی دیبوو بۆی گێڕایەوە، وەرەقە پێی دەڵێ: ئەمە هەمان فریشتەیە کەئەمیندارو پیرۆزە، کەلەکاتی خۆیا خوای گەورە ناردبووی بۆلای موساو بۆلای عیسا (علیهما السلام)، ئەوە جوبرائیلە ئەمینداری سروشە، ناسراوە لەناو خاوەن نامەکانا بەناموسی ئەکبەر، خۆزگەم لەکاتی ئاشکرابوونی پێغەمبەرایەتی تۆدا من جەهێڵ دەبووم. خۆزگەم ئەو سەردەمە من دەمام، بریا نەدەمردم، تا ئەو رۆژەی کەگەلەکەت لەمەککە دەتکەنە دەرەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بۆچی خزمانی من شتی وادەکەن و لەمەککەم دەکەنە دەرەوە؟ دەڵێ: بەڵێ، چونکە هەر پیاوێك داوایەکی وەکوو ئەم داوا رەوایەی تۆی هێنابێ، مسۆگەر گێچەڵیان پێ کردوەو دوژمنایەتی یان تێ بەستووە، ئەگەر من فریای ئەو رۆژە پیرۆزەت دەکەوتم کەبانگەوازەکەت ئاشکرا دەکەی، یارمەتیەکی زۆر باشم دەدای، ئیتر وەرەقە ئەوەندەی نەبرد کەمردو بەرەحمەتی خودا بوو، ئیتر لەدوا ئەمجارە تاماوەی سێ ساڵ سروش وەستاو کپ بوو، لەو ماوەیەدا جوبرائیل نەهاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (تاج/٤ ل/٢٩١ = تاج/٣ ژ/٣١٤٧ چ/٤) لەم جۆرە شوێنانەدا (ل) نیشانەی تەرجەمە کوردییەکەی (تاجول ئوصول)ە.

## راڤەو شیکردنەوە:

عائیشە کچی ئەبوبەکری صدیقە، خێزانی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ)، بەپێ ی ئایەتی (وأزواجه أمهاتهم) بەهەموو یەکێ لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەگوترێ: ئوممولمۆئمینین، واتە: دایکی موسوڵمانان، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەزانا گەورەکانی ئیسلام، شەریعەتزانێکی چاك بووە، فەرموودەی پێغەمبەری زۆر گێڕاوەتەوە، خوێنەوار بووە، دووهەزارو

دووسەدو دە حەدیثی ڕیوایەت کردوە، (٢٢٨) حەدیپی لەبووخاریدا هەیە، (٢٣٢) حەدیثیشی لەصەحیحی موسلیم دا هەیە لەم حەدیثانە سەدو حەفتاوچواریان موتەفەقوعەلەیهین، واتە: هەم بوخاریو هەم موسلیم گێڕاویاننەتەوە، تەمەنی شەستو پێنج ساڵ بووە، مناڵی نەبووە، دەوری نۆساڵ لەهاوڕێتی پێغەمبەردا بووە، لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجاوپێنجی کۆچی دا لە مەدینە زایە دەبێ، ئەبوهورەیرە نوێژی لەسەر دەکا، لەسەر فەرمانی خۆی بەشەو لەپاش نوێژی وەتر لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك دەسپێردرێ، ڕەزای خوای لێ بێو پڕ گۆڕەکەی لەنوور بێ. عیبرانی زمانی جوولەکەیە، خەڵوەکێشانی سۆڤ یان لەم حەدیثە وەرگیراوە. (ت/٤ ل/١٥٢)= تاج بەرگی چوارەم لاپەڕە/١٥٢ هەروەها = تاج/٣ ژ/٣١٤٧ چ/٤.

٤- عَنْ جابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيَّ (رَضي اللهُ عَنْهُمَا) وَهُوَ يُحَدِّث عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ فَقَالَ: فِي حَدِيثِهِ: فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنْ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بصري، فَإِذا الْمَلَكُ الَّذي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْض فرعبتُ منهُ فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِرُ قُمْ فَأَنْذرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ وَالرُّجْزَ فَاهْجُر). فحمي الوحي وتتابع). (الحديث ٤ أطرافه في: ٣٢٣٨، ٤٩٢٢، ٤٩٢٣، ٤٩٢٤، ٤٩٢٥، ٤٩٢٦، ٤٩٥٤، ٦٢١٤).[٤]

جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) باسی ئەو ماوەیەی دەگێڕایەوە کە سروش بڕان بوو، سروش نەدەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوا بەڕێوەم دەڕۆم، لەپڕ دەنگێکم بەر گوێ کەوت لەئاسمانەوە دەهات، کەسەرم هەڵبڕی ڕوانیم وا ئەو

(٤) اخرجه مسلم في الايمان، باب: بدء الوحي إلى رسول الله (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ)، رقم:١٦١ = ٤٠٤ شيحا.

فریــشتەی کەلەئەشــکەوتی حــیراء هــات بــۆلام، لەســەر کورســییەك لەبــەینی ئاسمــانو زەوی دا دانیــشتووە، جوبرائیــل بــوو بەحــەواوە دانیــشتبوو بــانگی کردمو فەرمووی: ئـەی موحەممـەد! ئـیتر منـیش لـەوە تـۆقیمو گەڕامـەوە بـۆ ماڵەوەو گـوتم: دامپۆشـن، دامپۆشـن! ئـەوانیش دایـان پۆشـیم هـەتا ترسـەکەم ڕەوییەوە، ئەوجا خوای گـەورە ئـەم ئایەتانـەی نـاردە خـوارەوە فـەرمووی: (یـا أیها المـدثر، قـم فأنـذر، وثیابـك فطهـر، والرجـز فـأهجر) (٧٤/١-٥) واتـە: ئـەی ڕەهبەرێ کـەخۆت بـەنوێنی ناومـاڵ پێـچاوەتەوە، هەڵـسە تێکۆشـە، کـەی کـاتی نووستنو پاڵکەوتنە، ڕاپەڕە ئەو خەڵکە بێ ئاگایە بێدار کەرەوە، لەسزای خـوا بیانترسـێنە، تـەنیا خـودای خـۆت بەگـەورە بگـرە، هـەر ئـەو بـەخودای خـۆت بزانە، وەجلو بەرگی خۆت پاكو تەمیز ڕابگرە، وە وەك هەمیشەو تاسـەر واز لـەبتو بتکاری بێنـە، یـا دەسـت لـەگوناه هـەڵگرە. ئـیتر لـەوە بـەدوا سـرووش بەگەرمی دەهاتو پەیتا پەیتا بەرودوا دەهاتە خوارێ.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

جـابیر خـۆیو عەبـدوڵڵای بـاوکی هـاوڕێی پێغەمبـەر بـوون، ئـەمیش وەك عائیـشە یەکێکـە لـەو شـەش هاوڕێیـەی کەفـەرمووەی زۆرتریـان گێڕاوەتـەوە، هـەزارو پێـنج سـەدو چـل فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، دووسـەدو دەیـان هـی بوخاریو موسلیمن، پەنجاو هەشتیان پەسـندی هەردوولایـە، بیـستو شەشیان هی بوخاری یە، سەدو بیـستو شەشیـشیان بەتـەنها هی موسـلیمە، کـاتێ مـرد کوێر بوو بوو، تەمـەنی نـەوەدو چـوار سـاڵ بـوو، دوا هـاوڕێی پێغەمبـەر بـووە کەلەمەدینـە مـردووە، ئـەم فەرموودەیـە پـێ ی دەگـوترێ موعەللـەق، واتـە: بەتـەعلیق ڕیوایـەت کـراوە، تـەعلیق ئەوەیـە سـەرەتای ڕشـتەی فەرموودەکـە کرتێنرابێ، تەعلیقی صەحیحی بوخاری هـەمووی موسنەدە، واتـە: بەڕشـتەی ساخو بەئیـسنادی صـەحیح ڕیوایـەت کـراوە، یـا لەلایـەن بوخـاری خۆیـەوە یـا

لەلایەن فەرمووده زانێکی تری متمانە پێکراوەوە، بوخاری ڕشتەی ئەم فەرموودەیەی لەئەدەبو لەتەفسیردا لەم زاتانەوە دەیگێڕێتەوە تادەگاتەوە سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): لەیەحیاوە، لە لەیثەوە، لەعوقەیلەوە، لەئیبنو شەهابەوە، لەئەبوسەلەمەوە، لەجابیرەوە، لەپێغەمبەرەوە: (تاج/٤ ل/٢٩٤ ز/٩٨ ژ/٣١٤٨، ٣١٤٧ تاج/٣ چاپی/٤) + (ت/٥ ل/١٨١).

٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ) قَالَ: كانَ رسول اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعالِج من التنزيل شِدَّةً وكانَ مِمَّا يحرّكُ شَفَتَيْهِ فقالَ: ابن عباس فأنا أُحَرِّكُهُما لَكُمْ كَما كَانَ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَرِّكُهُما فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ} قالَ: جمعه لَهُ فِي صَدْرِكَ وتَقْرَأُهُ فإذا قَرَأْناهُ فاتَّبِعْ قُرْآنه. قال: فاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ. (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنا بَيانَهُ) ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ فَكَانَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ ذلِكَ إذا أتاهُ جِبْرِيل استمع فإذا انطلقَ جبريلَ قَرَأَهُ النَّبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا قَرَأَهُ. (الحديث ٥ ـ أطرافه في : ٤٩٢٧، ٤٩٢٨، ٤٩٢٩، ٥٠٤٤، ٧٥٢٤)[5]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەمووو: لەپێش دا کاتێ جوبرائیل - دروودی خودای لەسەربێ - سرووشی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەلەپەلی دەکردو خۆش خۆش لێوو زمانی بۆ دەبزواندو ئەم حاڵە زۆر پەرێشانی دەکرد، لەبەرئەوە ئەم حاڵەی پێوەدیار بوو، ئیبنوعەبباس بەسەعیدی کوڕی جوبەیری فەرموو: وەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێوی بۆ ئەجولان منیش ئاوا لێو بۆتۆ دەجولێنم هەتا لەو حاڵەتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەباشی حاڵی ببی، جا خودای بالادەستو خاوەن شکۆ ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە بۆی: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ} (٧٥/ ١٦-١٧) لەکاتی وەرگرتنی

(٥) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الاستماع للقراءة، رقم: ٤٤٨.

قورئـان دا، كـاتێ جوبرائيـل بەسـروش دەيهێنـێ بۆت، پەلـە پـەلی لێ مەكـەو دەمـت نەيـە بەيـەكاو مەترسـی ئـەوەت نـەبێ كـەبۆت رەوان نـاكرێ، چـوونكە ئێمە بەپێی بەڵێنێك كەداومانە پێت لەئايـەتی (سنقرئك فلا تنسی) دا، بـەپێی ئـەم بەڵێنـە لەسـەرمانە كـەكۆی بكەينـەوەو لەفـەوتان ڕزگـاری بكـەين‌و زۆر جوانيش بـەتۆی رەوان بكـەين، ئيبنوعـەبباس (ڕەزای خوايان لێ بێ) فـەرمووی: (واتـە: ئێمە لەسەرمانەو بەڵێنەو دەيدەين بەتۆ كەئەم قورئانە بەجوانی بـەتۆ رەوان بكەين‌و لەسەر زمانت ئاسانی بكـەين‌و بـەدڵ باش باش تـێ ی بگـەيت، هـەتا تۆيش گەلی خۆت فێری خوێندن‌و مانای قورئان بكەی! ئيبنوعەبباس (ڕەزای خوايان لێ بێ) فـەرمووی: ئـيتر لـەوە دوا كـەجوبرائيل سرووشـی بـۆی دەهێنـا، كەدەيخوێندەوە بۆی ئـەو مـات دەبـوو، گـوێی دەگـرت‌و قـسەی نـەدەكرد، كـاتێ دەڕۆيـشت حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) قورئانەكـەی بـەڕەوانی‌و بەشـێنەيی دەخوێنـد، وەك خـوا بـەڵێن‌و مـژدەی ئـەوەی پـێ دابـوو (تـاج/٧ ل/٢٢٩ ز/٥٨ = تاج/٤ ژ/٤١٩٥) = (تاج بەرگی/٧ ل/ ٢٢٩ زنجيرە/ ٥٨ فەرموودەی/ ١).

## ڕاڤەو شيكردنەوە:

ئيبنوعەبباس ناوی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسە، هەق ئـامۆزای پێغەمبـەرە، باسـی فەضل‌و گـەورەيی لەبـەرگی پێنجـەمی تـاج دا لـە لاپـەڕە (١٢١) دا هەيـە. ئەم زاتە پايە بەرزە ناسراوە بەحيبری ئوممەت‌و تەرجومانی قورئـان، چونكە بەراستی دەريای زانست‌و ڕاڤـەكاری قورئانـە، يەكێكـە لـەو شـەش هـاوڕێ يانـە كەفـەرموودەی زۆريـان گێڕاوەتـەوە، ئـەم حـەديثـەی مورسـەلی صـەحابی يـە، حـوكمی مـەرفووعی هەيـە، چـوونكە لـەكاتی هـاتنی ئـەم سـوورەتەدا ئيبنوعـەبباس هێشتا لـەدايك نـەبووە، كەواتـە بـەديار ڕووداوەكـەوە نـەبووە، شتی وايش لەخۆوە ناگوترێ، كـەوابێ دەبـێ ئيبنوعـەبباس ئـەم باسـەی يـا لـە پێغەمبەر خـۆی بيـستبێ، يـا لەيـەكێ لـەو هـاوڕێ يانـەی كـەئاگايان لـەم حاڵـە

بووه، مورسەلی صەحابی بۆیە حوکمو بڕیاری مەرفووعی هەیە چوونکە هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموویان ڕاستو ڕاستاڵو بەداد بوون، چوونکە هاوڕێتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵو دەروونیانی ڕووناك کردبۆوە، ئیبنوعەبباس (١٦٦٠) حەدیثی لەپێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، لەبوخاری دا (٢١٥) فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا (١٤٢) حەدیثی هەیە، نەوەدوپێنجیان پەسەندی هەردوولایە، لەتەمەنی (٧١) ساڵیدا لەطائیف کۆچی دوایی کردووە، لەکۆتایی تەمەنی دا کوێر بووە، ئەم حەدیثە بەلگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر خۆی ڕاڤەی قورئانی بۆ موسوڵمانان کردووە، هاوڕێیانیشی هەروا. مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان لەڕاڤەو وەرگێڕانی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (لەم حەدیثەدا ئادابی موعەللیمو موتوعەللیم بەیان کراوە = لەم فەرموودەیەدا دەستووری نێوان مامۆستاو فێرخواز دیاری کراوە!).

٦- وَعَنهُ (رَضي اللهُ عَنهُما) قَالَ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَام) وكَانَ يَلْقَاهُ فِي كل ليلة من رمضان فيدارسه القرآن، فلرَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنْ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ). (الحديث ٦ ـ أطرافه في: ١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧)[٦]

دیسان ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەییو پیاوەتی لەوێنەی خۆی نەبوو، لەڕەمەزانانیشا جوبرائیل (سڵاوی خوای لێ بێ) دەهات بۆلای، دەوری قورئانی بۆ دەکردەوە، جالەم کاتەدا لەهەموو کاتێکی تر زیاتر خێری دەکردو شتی دەبەخشی، جوبرائیلیش (سڵاوی خوای لێ بێ) دەستووری وابوو لەمانگی ڕەمەزانا هەتا مانگ تەواو دەبوو، هەموو شەوێ دەهات بۆ

(٦) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: كان النبيُ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) أجود الناس بالخير رقم: (٣٠٨) = ٥٩٦٧شيحا.

**خزمەتی دەوری قورئانی بە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەکردەوە، هەتا بەباشی رەوانی بکاو لەبیری نەچێتەوە، لەماوەی تەشریف هێنانی جوبرائیل دا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بۆ بەخشندەیی‌و چاکەخوازی سەری پێوەنەبوو، وە بۆئەمە ئەوەنە خێرابوو، وەئەوەندە بەهەر چوارلادا شتی دەبەخشی دەتگوت بای هەڵکراوە، سۆزەی بەهەمو لایەکا دەگات! (تاج - ٢ ل - ٩٣ ز - ٣٦).**

٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ مِنْ فِيهِ إِلَى فِيهِ قَالَ انْطَلَقْتُ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا بِالشَّأْمِ إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى هِرَقْلَ يَعْنِي عَظِيمَ الرُّومِ قَالَ: وَكَانَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ جَاءَ بِهِ فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى هِرَقْلَ، فَقَالَ هِرَقْلُ: هَلْ هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ قَالُوا نَعَمْ، قَالَ: فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ فَأَجْلَسَنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ أَنَا. فَأَجْلَسُونِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي ثُمَّ دَعَا بِتَرْجُمَانِهِ فَقَالَ لَهُ: قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنِ الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ. قَالَ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَايْمُ اللَّهِ لَوْلاَ مَخَافَةَ أَنْ يُؤْثَرَ عَلَيَّ الْكَذِبُ لَكَذَبْتُ. ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قَالَ قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذُو حَسَبٍ، قَالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: وَمَنْ يَتَّبِعُهُ أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قَالَ قُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ. قَالَ: أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ قَالَ قُلْتُ: لاَ بَلْ يَزِيدُونَ. قَالَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ؟ قَالَ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قَالَ قُلْتُ: تَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالاً يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ. قَالَ: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ: لاَ. وَنَحْنُ مِنْهُ فِي مُدَّةٍ لاَ نَدْرِي مَا هُوَ صَانِعٌ فِيهَا. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا أَمْكَنَنِي مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيْرَ هَذِهِ. قَالَ: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قَالَ قُلْتُ: لاَ. قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُ إِنِّي سَأَلْتُكَ

عَنْ حَسَبِهِ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي أَحْسَابِ قَوْمِهَا. وَسَأَلْتُكَ هَلْ كَانَ فِي آبَائِهِ مَلِكٌ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ. فَقُلْتُ لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ قُلْتُ رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ. وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِهِ أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ فَقُلْتَ بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ. فَقَدْ عَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَهُ سَخْطَةً لَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ. وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ إِذَا خَالَطَ بَشَاشَةَ الْقُلُوبِ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قَدْ قَاتَلْتُمُوهُ فَتَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سِجَالاً يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ. وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ الْعَاقِبَةُ وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَغْدِرُ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لاَ يَغْدِرُ. وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ. فَقُلْتُ لَوْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ قُلْتُ رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ. قَالَ ثُمَّ قَالَ بِمَ يَأْمُرُكُمْ قُلْتُ يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّلَةِ وَالْعَفَافِ قَالَ إِنْ يَكُنْ مَا تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ وَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّهُ مِنْكُمْ وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ مَا تَحْتَ قَدَمَيَّ. قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَرَأَهُ فَإِذَا فِيهِ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ أَسْلِمْ تَسْلَمْ وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ وَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ وَيَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَنْ لاَ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ عِنْدَهُ وَكَثُرَ اللَّغَطُ وَأَمَرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا. قَالَ فَقُلْتُ: لأَصْحَابِي حِينَ خَرَجْنَا لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ إِنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ قَالَ: فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا بِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ.

وَحَدَّثَنَاه حَسَنٌ الْحُلْوَانِيُّ وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالاَ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ وهُوَ ابْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ صَالِحٍ عَنْ ابْنِ شِهَاب بِهَذَا الإِسْنَادِ وَزَادَ فِي الْحَدِيثِ وَكَانَ قَيْصَرُ لَمَّا كَشَفَ اللَّهُ عَنْهُ جُنُودَ فَارِس مَشَى مِشنْ حِمْصَ إِلَى إِيلِيَاءَ شُكْراً لِمَا أَبْلاَهُ اللَّهُ وَقَالَ فِي الْحَدِيثِ مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَقَالَ إِثْمَ الْيَرِيسِيِّينَ وَقَالَ بِدَاعِيَةِ الإِسْلاَمِ). (الحديث ٧ ـ أطرافه في : ٥١، ٢٦٨١، ٢٨٠٤، ٢٩٤١، ٢٩٧٨، ٣١٧٤، ٤٥٥٣، ٥٩٨٠، ٦٢٦٠، ٧١٩٦، ٧٥٤١).[(٧)]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبوسوفیان بەزمانی خۆی بۆی گێڕامەوە گوتی: لەکاتی ڕێکەوتن (صولح)ی حودەیبییەدا کەلەنێوان منو پێغەمبەردا کرابوو، چووم بۆ شام لەوکاتەدا کەمن لەشام بووم، لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا، دیحیەی کەلبی نامەیەکی هێنا لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نووسرا بوو بۆ قەیصەری ڕۆم کە هەرقلە، دیحیە کاغەزەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەداتە دەست سەرداری بوصرا، سەرداری بوصراش دەیداتە دەستی هیرقل خۆی، هیرەقل لەشکری فارس دابووی بەسەری داو تەنگی پێ هەڵچنی بوو، شامو هەموو دەوروبەری شام تاجزیرەو گەلێ وڵاتی تری لێ داگیر کردبوو، خۆی پەنای بردبوو بۆ قوستەنتەنییە، لەوێشا ماوەیەکی دوورو درێژ گەمارۆی دابوو، کەخوا لەشکری فارسی لەکۆڵ کردەوە بۆ سوپاسی ئەو بەهرە گەورەیە لەحیمصەوە بەپێیان چوو بۆ قودس (زوهری (ڕەزای خوای لێ بێ) کەیەکێکە لەگێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە کەلەحیمسەوە تا قودس مافووریان بۆ ڕاخستبوو، گوڵو ڕەیحانەیان لەسەر دانابوو بەسەریا دەڕۆیی تابەیتولەقدیس) جاکاتێ نامەکەی پێغەمبەری پێ دەگا، دەڵێ: ئادەی بگەڕێن بزانن لێرەدا کەسێ هەیە کەلەهۆزی ئەم پیاوە بێ کەئەم کاغەزەی بۆمن نووسیوەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ؟ دەڵێن: بەڵێ:

(٧) اخرجه مسلم في المغازى (الجهادوالسير) باب: كتاب النبيُ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) الى هرقل: رقم ١٧٧٣ = ٤٥٨٣شيحا.

گوتی: جا من‌و چەند کەسێکی تری قورەیشییان بانگ کرد، کەدەوری سیی کەس دەبووین، بردینیان تاچووینە لای هیرقل لەقودس، لەبەر دەمیا دایان نیشاندین قەیسەر لەسەر تەختی پاشایی دانیشتبوو، تاجی لەسەرا بوو، گەورە گەورەی ڕۆم‌و پەتریق‌و قەشەو راهیبی زۆری لەدەورا بوو،گوتی: کامتان بەخزمایەتی بەم پیاوە کەگوایە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ نزیکترە؟ گوتی: گوتم: من، ئیتر منیان لەبەردەم خۆیدا دانیشان‌و هاوڕێکانمیان لەپشتمەوە دانیشان، ئینجا زبانزان (تەرجمان)ەکەی خۆی بانگ کردو گوتی: پێیان بڵێ: ئەوا من لەم پیاوە پرسیار دەکەم‌و هەواڵی ئەو پیاوەی لێ دەپرسم کە دەڵێ من پێغەمبەرم جا ئەگەر ئەم لەو بارەیەوە بەدرۆ وەلامی منی دایەوە ئێوە بەدرۆی بخەنەوە. ئەبوسوفیان گوتی: بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کەپێم شەرم بوو درۆم لێ دەرکەوێ، ئەگینا ئەو رۆژە درۆم دەکردو قەیسەرم چەواشە دەکرد لەبارەی هەواڵی پێغەمبەرەوە، چونکە ئەو سەردەمە من‌و حەزرەت هاوداوای یەکتری بووین. ئینجا هیرقەل بەزبانزانەکەی گوت: لێ ی بپرسە: بنەچەو رەسەنی لەناواتانا چۆنە، خانەدانە یان نا؟ گوتم: تابڵێیت خانەدان‌و وەجاخزادەیە، گوتی: ئایا لەناو باوو باپیریا پادشایان تیا هەڵکەوتووە؟ گوتم: خەیر، گوتی: باشە ئەم پیاوە لەپێش ئەوەدا کەبڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیوە؟ گوتم: نەء، گوتی: باشە ئەوانەی کەپەیڕەوی دەکەن‌و دەچنە سەر ئایینی ئەو لەخانەدانەکانی خەڵکن یالەلازەبوون‌و بێ نەواکانیانن؟ گوتم: نەء، هەر لە هەژارو لازەبوونەکانیان پەیڕەوی دەکەن، گوتی: بەرەبەرە زۆر دەبن یاکەم دەکەن؟ گوتم: خەیر، بەڵکوو رۆژ بەڕۆژ زۆر دەبن، گوتی: باشە کەس هەیە لەوانەی کەدەچنە سەر ئەو ئایینە لەپاشا لێی بێزاربێ‌و پاشگەز ببێتەوەو وەرگەڕێ‌و وازی لێ بێنێ؟ گوتم: نەء، گوتی ئەی شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵ دا کردووە؟ گوتم: بەڵێ: گوتی: شەڕکردن‌و جەنگینتان لەگەڵیا چۆنە؟ گوتم: تائێستا جەنگ لەنێوانی ئێمەو ئەودا دووبەختی بووە: بەنۆرەو بەسەرە بوو، جاری واهەیە ئەو زاڵ دەبێ بەسەر

ئێمەداو جاری وایش هەیە ئێمە زاڵ دەبین بەسەر ئەودا، گوتی: باشە، ئەی پەیمان دەشکێنێ یان نا؟ گوتم: تائێستا نەیشکاندووە، بەڵام ئێستاکە پەیمانێکمان لەنێوان دا هەیە، ڕێکەوتووین لەسەر شەڕنەکردن، بۆ ماوەیەکی ناوبراو، جانازانین دەیباتەسەر یانا، ئەبوسوفیان گوتی: بەخودا تەنیا ئەم وشەیە نەبێ مەودای تری نەدام، کەتێچێنێکی تێ چێنم و نەنگێ لە پێغەمبەر بگرم. گوتی: ئەی باشە کەسی تر لەپێش ئەمەوە قسەی وای کردووە لەناوتانا؟ گوتم: نەء، ئەنجا بەزوبانزانەکەی خۆیی گوت: پێ ی بڵێ: کەمن لێم پرسیت لەلایەنی بنەچەو رەسەنی ئەم پیاوەوە، تۆ وەڵامت دایەوە گوتت: کەهەتا بڵێ ی خانەدان و وەجاخزادەیە لەناومانا، ئەوەیش ئاداب و نەریتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، هەموویان وانە، هەمووکاتێ خوا کەسێکی خانەدان و وەجاخزادەی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو ناردوویەتی بۆسەر هۆزەکەی خۆی، لێشم پرسیت کەئایا باو باپیری ئەم پیاوە شایان تیابووە یانا، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەگەر لەباوك و باپیریا پادشا ببوایە دەم گوت پیاوێکە داوای موڵك و دەوڵەتی باوك و باپیری دەکاتەوە، پرسیاریشم لێت کرد ئایا پەیڕەوانی ئەم پیاوە رەشە خەڵك و کۆمەڵەی مسکێنەکانن، یا ئاغاو بەگزادەکانن، ئەوە بوو تۆ گوتت لازەبوون و مسکێنەکان پەیڕەوی دەکەن، لەڕاستی دا هەمیشە زۆربەی پەیڕەوانی هەموو پێغەمبەرێ ئەو جۆرە کەسانەن، لێشم پرسی ئایا لەپێش ئەوەدا کەبڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیبوو، تۆ گوتت نەء، منیش گوتم: چۆن دەبێ لەگەڵ خەڵکا درۆنەکا، بەڵام لەپاشا بچێ درۆ لەگەڵ خودا بکا، شتی وانابێ، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێ هەیە لەشوێنکەوتوانی، کەبچێتە سەر دینەکەی و کەشارەزایی لێ پەیدا کرد وازی لێ بێنێ و بەدڵی نەبێ؟ تۆ گوتت نەء، لەڕاستی دا هەرکاتێ دڵ کەخۆشی ی باوەڕو ئیمان بچێژێ و تام و چێژی لێ وەربگرێ ئیتر هەتا هەتایە ئەو فێنکی باوەڕە لەو دڵە ئارامە دەرناچێ و دەبن بەگوڵ و بوڵبوڵ! من لەتۆم پرسی ئایا پەیڕەوانی ئەو لەزۆرین یالەکەمین؟ تۆ

گوتت تادێ زۆرتر دەبن! هەموو ئایینو بیروباوەڕێکی دروست ئاوایە، هەر لەزیاد بوونە هەتا لەئەنجاما سەردەگرێو تەواو دەبێ، من لەتۆم پرسی ئایا شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵ دا کردووە، تۆ گووتت جەنگو شەڕمان لەگەڵ دا کردوەو تائێستا جەنگی نێوانمان دووبەختی بووە، جارێ ئەو دەیباتەوەو جارێ ئێمە دەیبەینەوە، لەڕاستی دا ئەمە ڕەوشتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، لەسەرەتاوە تاقی دەکرێنەوەو دووچاری سەراسێو ئێشو ئازاردەبن، بەلام لەئەنجام دا ئەوان سەردەکەون، کەخۆرهەلهات بەرەبەرە سوپای زۆرو ستەمو ناهەقی ئاودەکرێتە ژێریو گوڵوڵەی دەکەوێتە لێژی، من لەتۆم پرسی ئایا پەیمان دەشکێنێ یانا؟ تۆ گوتت: خاوەن پەیمانەو پەیمان ناشکێنێ، ئەمەیش شێوەو رەفتاری گشت پێغەمبەرانە، پێغەمبەران (سلاوی خوایان لێ بێ) قەت پەیمان ناشکێننو بەلێن دەبەنەسەر، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێکی تر لەپێش ئەم دا ئەم داوایەی ئەوی کردووە لەناوتاناو گووتویەتی من پێغەمبەرم، تۆگوتت نەء، منیش لەدلی خۆما گووتم ئەگەر کەسێکی تر لەپێش ئەمدا ئەم قسەیەی بگووتایە دەمگوت: ئەم پیاوەش لاسایی ئەو قسە کۆنەیە دەکاتەوە!! ئەبوسوفیان گوتی: ئەنجا هیرقەل گووتی: فەرمانتان بەچی پێ دەکاو دەلێ چی بکەنو چی مەکەن؟ گوتم: پێمان دەلێ: نوێژ بکەن، زەکات بدەن، خزم دۆست بنو بۆخزم باش بنو مافی خزمایەتی بەجێ بێنن، دەست پاك بن، داوێنپاك بن، دەمو دلپاك بن، بەندەیی ساغ بەس بۆخودای گەورە بکەن، هیچ شتێ نەکەین بەهاوەل بۆ خودا، واز لەو بتو خودا درۆیینانە بهێنین کەباوكو باپیرمان لەکۆنا دەیانپەرستن.

هیرقەل گوتی: ئەمەی تۆ دەیلێیت لەبارەی ئەو پیاوەوە ئەگەر راستو دروست بێو ئاوابێ ئەوە پێغەمبەرە، من دەمزانی کەئەم پێغەمبەرە بەزوویی پەیدا دەبێو دێ، بەلام نەمدەزانی کەلەئێوەیە ئەی کۆمەلی عەرەب! وەمن بەش بەحالی خۆم ئەگەر بزانم قووتار دەبمو دەگەمەلای حەز

دەکەم بچم بۆ خزمـەتی، ئەگـەر لـەلای دەبووم قاچـەکانیم دەشۆرد، بـەخودا قەڵـەمڕەوو دەسـتەڵاتی ئـەو دەگاتـە ئـەم شـوێن پایانـەی منـیش، وەخـاکی بەیتولمەقدیس‌و هەموو وڵاتی شام‌و ڕۆم داگیر دەکا. ئەبوسوفیان گوتی: لەپاشا داوای نامەکـەی پێغەمبـەری کـردو خوێنـدی یـەوە، ناوەڕۆکەکـەی ئەمـە بـوو: بەناوی خـودای بەخـشندەی میهرەبـان، لەموحەممـەدەوە کەبەنـدەی خودایـە: کەپێغەمبەری خودایە، بۆلای هیرقەلی مەزنی ڕۆم، سڵاوو درووود لەپـەیڕەوانی ڕێگـەی راسـتی، سـڵاو لەڕاسـتی خـوازان! لـەپاش ئەمـە مـن داوات لێ دەکـەم کەئیسلام ببیـت، ئیـسلام ببـە لەهـەردوو جیهـان دا سـەلامەت دەبیـت، ئیـسلام ببـە خـودا لـەباتی جـارێ دووجـار پاداشـت دەداتـێ، چـوونکە هـەمو خـاوەن نامەیـەکی نۆموسـوڵمان دووپاداشـی بـۆ هەیـە، سـەرەڕای ئـەوەیش کـەدەبی بەمامۆستای نیشاندەری خێر بۆ هەموو دەست‌و پەیوەندەکـەی خـۆت‌و دەبـی بەسـەر مەشـق بۆیـان، ئەگـەر سەرپێـچیش دەکـەی‌و گەردنکەچـی ناکـەی بـۆ ئیـسلام ئـەوە بزانـە کەهـەم ئۆبـاڵ‌و گونـاهی خـۆت‌و هـەم ئۆبـاڵ‌و گونـاهی مـسکێن‌و وەرزێرەکـانیش لەئەسـتۆی تۆیـە چـوونکە ئـەوان ژێردەسـتی تـۆن‌و چـاویان لـەدەمی تۆیـە. هـەروەها داوات لێ دەکـەم بـەهۆی ئـەم ئایەتەیـشەوە کەدەفەرموێ: {يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ} (٢- ٦٤) واتـە: ئـەی ئـەهلی کیتـاب! ئـەی خـاوەن نامـەکان! ئـەی کۆمەڵـەیێ کـەخودا نامـەی خـۆی بـەهۆی پێغەمبـەرێ لەپێغەمبـەرەکانی خۆیـەوە بـۆ نـاردوون! وەرن بۆسـەر وەرگرتنـی تاقـە فـەرموودەیێ، کـەبۆ ئێمـەو بـۆ ئێـوە یەکسانەو چـون یەکـە بـەبێ جیـاوازیی، کەبرێتییە لەنیازپاکی‌و ساخی لەگـەڵ خـوادا وەئـەم مەبەستەیش بـەم چـەن یاسـایە دێتـەجێ، یەکـەم عیبـادەت‌و پەرسـتن‌و خوداپەرسـتی بـۆ کەسـی تـر نەکـەین بـۆ خـودای گـەورە نـەبێ، دووەم هـاوەڵ‌و کـوڕو کـچ‌و بـاوك‌و دایـك‌و

کەسووکاری بۆ بڕیار نەدەین، سێیەم لەناو خۆمانا یەکتری نەکەین بەخوداو وەك خودا بیکەین بەخاوەن فەرمانو شت حەڵاڵو حەرام بکا بۆمان، بەبێ وەرگرتنی فەرمان لەخوداوە، جائەگەر ئەو خاوەن نامانە پشتیان لەم پەندو ئامۆژگاریو فەرمایشتە راستو دروستەو ڕووپێچی یان لەیەکتایی پەرستی کرد، ئەوا تۆ ئەی پێغەمبەر! هەم خۆت هەم پەیڕەوەکانت پێیان بڵێن: حەق دیارە، ئاشکرایەو بەڵگە نەویستە، کەئێوە قەبووڵی ناکەن ئەوا ئاگادار بنو بەشایەت بن ئێمە فەرمانبەرداری خوداینو موسوڵمانین، ئەبوسوفیان گوتی: کەهیرقەل لەخوێندنەوەی نامەکە بۆوە، لەدەوری بوو بەزڵە زڵو قاووقیژ، ئیتر دەستوور درا ئێمە کراینە دەرەوە، کەچووینە دەرەوە بەهاوڕێکانی خۆمم گوت: بەڕاستی خۆ کاری کوڕەکەی ئەبوکەبشە گەورە بوو، خۆ ئەوەتا شای رۆمیش لێ ی دەترسێ، (ئەبوکەبشە باوکی شیری پێغەمبەرە، مێردی حەلیمەیە کەدایەنی حەزرەت بووە) ئیتر هەر لەوکاتەوە من دەمزانی کەکاروباری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر دەکەوێو گومانم لەوەدا نەبوو، تا ئەو رۆژەی خودا کردمی بەموسوڵمانو چوومە سەر ئایینی ئیسلام.

(لێرەدا قسەی ئەبوسوفیان تەواو. زوهری دەفەرموێ: ئیبنو ناطوور فەرمانڕەوای قودسو هاوڕێ ی هیرەقل بوو، ئوسقوفو سەرۆکی ئایینی نەصارای شام بوو، لەسەردەمی عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوان لەشام بینیم ئەم داستانەی بۆ گێڕامەوە، گوتی: لەوکاتەدا کە هیرەقل هات بۆ قودس، بەیانییەك کەلەخەو هەڵسا رەنگو ڕووی تێك چووبوو، دەروون پەستی ی پێوە دیاربوو، هەندێ بەتریقو پیاوماقوڵانی دەوڵەتی پێیان گوت: شێوەت لەبەرچاومان گۆڕاوە، لەسەر بارودۆخی پێشووت نەماوی. ئیبنوناطوور دەیگوت: هیرەقل کۆڵەنانی (کاهن) بوو، ئەستێرە شوناس بوو، سەیری ئەستێرەی دەکرد، جا کەلێیان پرسی پێی گوتن: ئیمشەو تەماشای ئەستێرەم کرد، پادشای ئەو گەلەم چاو پێ کەوت کەخۆیان سوننەت دەکەن، زاڵ بوو

بوو، ئەرێ لەم میللەتانە کامیان خۆیان سوننەت دەکەن؟ گوتیان: هەر میللەتی جوولەکە خۆیان سوننەت دەکەن، بەوە خۆت سەخڵەت مەکە، بنووسە بۆ شارانی قەڵەمڕەوی خۆت هەرچی جوولەکەیان تیایە بیانکوژن!

لەم دەمەدا کەئەوان لەڕاوێژدا بوون، پیاوێکیان هێنا بۆلای هیرەقل، پادشای غەسسان ناردبووی، دەنگ و باسی پێغەمبەری باس دەکرد، کەپەیدا بووەو داوای پێغەمبەریی دەکا، کەهیرەقل هەواڵی کارەکەی لێ پرسی‌و وەڵامی وەرگرت، گوتی: بچن ئەم پیاوە ببەن بڕوانن کەسوننەت کراوە یانا؟ کەتەماشایان کرد هاتنەوە گوتیان: بەڵێ سوونەت کراوە، هیرەقل لێی پرسی: عەرەب خۆیان سوننەت دەکەن یانا؟ پیاوەکە گوتی: بەڵێ خۆیان سوننەت دەکەن، هیرەقل گوتی: ئەوەی من دیم لەوکاتەدا کەتەماشای ئەستێرەم کرد، کەسەرکەوتوو بوو، پادشای ئەم میللەتی عەرەبەیە پەیدا بووە. ئەوسا هیرەقل کاغەزی نووسی بۆ برادەرێکی خۆی لە (رومییە) ئەویش لەزانستا هاوتای هیرەقل بوو، ئەوجا خۆی رۆیی بۆ حیمس لەوێ مایەوە هەتا وەڵامی نامەکەی لەبرادەرەکەیەوە بۆ هاتەوە، رای ئەویش لەبارەی سەرهەڵدانی پێغەمبەرەوە رێکی رای هیرەقل بووە، لەبارەی ئەوەیشەوە کەپێغەمبەری خوایشە، ئەمجا هیرەقل گەورە پیاوەکانی وڵاتی رۆم بانگ دەکاو لەکۆشکێکی خۆیا لەحیمس کۆیان دەکاتەوەو فەرمان دەکا دەرگاکانیان خڕ داخست، خۆی چووە جێ یەکی بەرزو پێ ی گوتن: ئەی کۆمەڵەی رۆم! ئەگەر دەتانەوێ سەربەرزو سەرفراز بن هەتا هەتایە، وەموڵك‌و دەوڵەتیشتان بەردەوام بێ‌و بۆ بمێنێ وەرن زووکەن موسوڵمان ببن، کەهیرەقل وای وت ئەوان هەموو وەك کەرەکێوی شەڵەژان‌و بەرەو دەرگاکان هەڵیان تیزان کەبچن هیرقەل بکوژن، کەچوون دەرگاکان گشت داخرا بوون، هیرقەل کەچاوی کەوت بەهەڵسەڵەمێنەوەکەیان‌و نائومێد بوو لەئیسلام بوونیان گوتی: بیانهێننەوە بۆلای خۆم، کەگەڕانەوە پێی گوتن: ئەوە من کەئەو قسەیەم بەئێوە گوت

تاقیم کردنەوە، ویستم بزانم تاج رادەیێ ئایینی خۆتان بەتوندیی گرتووە، باش بوو هەڵوێستەکەتانم بەدڵ بوو، ئیتر ئەوانیش کورنووشی بەگەورە زانینیان بۆ بردو گلەی یان لێ ی نەما، ئەمە دواباسی هیرقەل بوو لەبارەی پێغەمبەرەوە لەم باسەدا. (ت ـ ٦ ل ـ ٦٧) = تاجول ئوصول بەرگی شەشەم بەکوردی لاپەڕە/٦٧ = تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٦٠ ج/٤ هەروا لەشوێنەکانی تردا.

### راڤەو شیکردنەوە:

ئەبوسوفیان ناوی صەخری کوڕی حەربە، لەمەسلەمەی فەتحە، چاوێکی لەرۆژی طائیف لەدەست داو ئەو چاوەکەی تری لەغەزای یەرمووك دا قەلپووچ بووە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، لەتەمەنی هەشتاو هەشت ساڵی دا لەمەدینە زایە بوو، خەزووری پێغەمبەر بوو (ت ـ٥ ل ـ١٤٥ تاج/٣ ز/٣٤ ل/٦٦٧ ج/٤).

## ٢- نامەی بڕوا (كتاب الإيمان)

٨- عنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: (رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول الله، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، والَحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ). (الحديث ٨ ـ طرفه في: ٤٥١٤)[8]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیسلامەتی لەسەر ئەم پێنج بنیاتە دامەزراوە: یەکەم شەهادەی؛ لااله الا الله ومحمد رسول الله: شایەتی دەدەم، بەزمان دەڵێم و بەدڵ باوەڕ دەکەم کەهەر یەزدانی پاك خودایەو هیچ خودای تر نییەو موحەممەدیش پێغەمبەری رەوانە کراوی خوایە، لەلایەنی خواوە رەوانە کراوە بۆسەر مرۆڤو جنۆکە، دوەم: راگرتنی نوێژو بەجێ هێنانیەتی بەپێی مەرجەکانی بەرێك و پێکی، سێیەم: زەکاتدان، چوارەم: حەجکردن، پێنجەم: رۆژوو گرتنی رەمەزان).

(٨)أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان أركان الاسلام ودعائمة العظام، رقم: ١٦ = ١١٣شيحا.

### راڤەو شیكردنەوە:

ئیبنو عومە ناوی عەبدوڵلای كوڕی عومەری كوڕی خەططابە، بەمنداڵی موسوڵمان بووە، یەكێكە لەو شەش هاوڕێیانەی پێغەمبەر كەفەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە، یەكێكیشە لەو چوار كەسە ناویان عەبدوڵلایەو ناسراون بەعەبادیلەی ئەربەعە، واتە: چوار عەبدوڵلاكە، كەدووەمیان ئیبنوعەبباسە، سێیەمیان عەبدوڵلای كوڕی عەمرە، چوارەمیان عەبدوڵلای كوڕی زوبەیرە، دووهەزارو شەش سەدو سیی فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا (٢٥١) فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا (٢٠١) فەرموودەی هەیە، سەدوحەفتایان پەسندی هەردوولایانە، لەناو هاوڕێ یاندا بێجگە لەئەبوهورەیرە كەسی تر بەقەد ئەو فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە، گوتەی بەهێزتر ئەوەیە كەساڵی حەفتاوسێ ی كۆچی لەفەخ لەنزیك مەككە كۆچی دوایی كردووە: (تاج - ١ ل - ١٧ = ژمارە:١ ز/١) + (تاج/٥ ل/١٣٠ = تاج/٣ ز/٢٧ ج/٤).

## باسی كاروبارەكانی باوەڕ

٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْإِيمَانُ بِضعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَانِ).(الحديث٩) [٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیمانو باوەڕ شەستو ئەوەندە لقە، شەرمو حەیا لقێكە لەباوەڕ).

### راڤەو شیكردنەوە:

ئەبو هورەیرە دەم سپی كۆمەڵەی هەژارەكانی صوففە بوو، لەساڵی گرتنی خەیبەردا موسوڵمان بوو، لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی ئەم غەزایە بوو،

(٩)أخرجه مسلم في الايمان، باب:بيان عدد شعب الايمان وأفضلها وأدناها رقم: ٣٥-١٥٢شيحا.

بۆخۆی دەفەرموێ: (بەهەتیوی پەروەردە بووم، کەکۆچم کرد بۆ مەدینە هەژار بووم، رەنجبەرو خزمەتکاری بوسرەی کچی غەزوان بووم، خوا کردمی بەمێردی) لەناو هاوڕێکانی پێغەمبەردا کەس بەقەد ئەو فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە، پێنج هەزارو سێ سەدو حەفتاوچوار فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەبوخاری شەریف دا (٤١٨) فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا (٥١٥) فەرموودەی هەیە، سێ سەدو بیستو پێنجیان پەسندی هەردوولایە، خەڵکی یەمەنە، لەخێڵی ئەزدە، کە دەچێتەوە سەر هۆزی دەوس، موحەڕڕەری کوڕی، یەکێ بووە لەو کەسانەی کەفەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، لەتەمەنی حەفتاو هەشت ساڵی دا، لەساڵی پەنجاو هەشتی کۆچی دا لەمەدینە کۆچی دوایی کردووە، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە. تەماشای باسی مەزناهی ئەبوهورەیرە لە (ت/٥ ل/٢١٧ = تاج/٣ ز/٦٢ ل/٧٣٤ ژ/٣٥٢١-٣٥٢٦) بکە.

١٠- عَنْ عَبْدِاللّهِ بْنِ عَمْرو (رَضِي اللهُ عَنْهُمـا) عَـنْ النَّبـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهاجِرُ مَنْ هَجَرَ مانَهى اللّهُ عَنْهُ). (الحديث ١٠ ـ طرفه في: ٦٤٨٤).[١٠]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مو سوڵمانی تەواو ئەو موسوڵمانەیە کەموسوڵمانانی تر لەزیانی زمانو لەزیانی دەستی ڕزگار بن، موهاجیری ساخو کۆچکاریش ئەو کەسەیە کە گوریزو ڕەو بکا لەوشتەی کەخودا قەدەغەی کردووە).

## راڤەو شیکردنەوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص یەکێکە لەهاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دوازدە ساڵ لەباوکی مناڵتر بووە، زانایەکی پایەبەرز

(١٠)أخرجه مسلم بعضه في الايمان، باب: بيان تفاضيل الاسلام واي اموره افضل،رقم٤٠=١٦١.

بـووە، زۆر زانـا بـووە، زۆر بـەدین بـووە، حـەوت سـەد فـەرموودەی هەیـە، لـەبوخاری دا (٢٥) فـەرموودەی هەیـە، لەموسلیم دا (٣٧) فـەرموودەی هەیـە، حەڤـدەیان پەسـندی هەردوولایـە، لـەمانگی قوربـانی سـاڵی شەسـتو پێنجـی کۆچی دا، لەمەککە، یا لەطائیف، یا لەمیسر، لەتەمـەنی حـەفتاو دوو سـاڵی دا کۆچـی دوایـی کـردوە: (تـاج/١ ل/٢٢ ز/٢ ف/٦ = ز/٢ ژ/٨ چ/٤) + (تـاج/٥ ل/١٤٠ ز/٣١ = تاج/٣ ز/٣١ ژ/٣٤١٦-٣٤١٩ چ/٤).

## کام موسوڵمانە زۆر باشە

١١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَـالَ: قـالوا يَـا رَسُـولَ اللّـهِ أَيُّ الْإِسْـلَامِ أَفْضلُ؟ قَالَ: ( مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَـدِهِ). (الحـديث رقـم: ١١ في فـتح الباری بشرح صحيح البخاري).[11]

ئەبو موسا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کام موسوڵمانە زۆر باشـە؟ فـەرمووی: (ئـەو کەسـەی کەموسـوڵمانان لـە زمانو دەستی سەلامەت بن).

### راڤەو شیکردنەوە:

ئەبو موسای ئەشعەری ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسە، لەهاوڕێ مەزنەکانی پێغەمبەرە، سێ سەدو شەست فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا (٥٤) فـەرموودەی هەیە، لە موسلیما (٦٥) فەرموودەی هەیە، پـەنجایان پەسـندی هـەردوو لایانـە، یەکێکە لەهاوڕێ زاناکـانی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەتەمـەنی (٦٣) سـاڵی دا، لەمەککە، یا لەکووفە مردووە.

(١١) اخرجه مسلم في الايمان، باب بيان تفاضل الاسلام وأي أموره أفضل، رقم: ٤٢ =١٥٩،١٦٢.

## خۆراك بەخشین بەشێکە لەئیسلام

١٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنهما) أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ تُطعِمُ الطعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ).(الحديث ١٢ ـ طرفاه في: ٢٨، ٦٢٣٦)[١٢]

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: چی شتێ لەئایینی ئیسلام دا زۆر چاکە؟ فەرمووی: (نانبدەبەو سڵاویش لەهەموو کەسێ بکە، چ بیناسی‌و چ نەیناسی). (تاج/١ ل/٢٢ ف/٧ ز/٨ چ/٤ ز/٢).

## بەشێکە لەئیمان چی بۆخۆی پێخۆشبێ بۆ برای موسوڵمانیشی پێی خۆشبێ

١٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُؤمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَ لأَخِيهِ مَايُحِبُ لنَفْسِهِ). (الحديث ١٣ ـ الرقم ١٣ في فتح الباري شرح صحيح البخاري).[١٣]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (کەستان بەتەواوی ئیمان‌و باوەڕ ناهێنێ هەتا هەرچی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ برای موسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ) (تاج/١ ل/٢٠ ف/٢ ز/٢).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

بەپێی دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز، موسوڵمانان لەناو خۆیانا خوشك‌و برای ئایینی یەکترین، یەزدانی پاك دەفەرموێ: (إنما المؤمنون إخوة) واتە: موسوڵمان برای موسوڵمانە، لەشەریعەت دا، بەپێ ی باوی ناو کۆمەڵ،

(١٢) أخرجه مسلم في الايمان، باب تفاضل الاسلام واى اموره أفضل رقم: ٣٩=١٥٩.

(١٣)أخرجه مسلم في الايمان، باب: الدليل على ان من خصال الايمان أن يحب لأخيه، رقم:٤٥ = ١٦٨.

زووربەی رووی قسە لەپیاوانە، بەڵام لەڕاستی دا هەموو گفتو گۆو بڕیاریٚ وەکوو یەك نێرو مێ دەگرێتەوە، مەگەر نیشانەیێ هەبێ دەقەکە تایبەت بکا بەلایەکیانەوە، کەواتە: مەبەست ئەوەیە مرۆڤی موسوڵمان، ژن بێ یان پیاو، چی بۆخۆی پێی خۆش بێ ئەوەشی بۆ براو خوشکی موسوڵمانی پێ خۆش بێ، کەواتە: وشەی برا لەفەرموودەکەدا بۆ تەغلیبە، نەك بۆ چەسپاندنی جیاوازیی لەنێوان نێرو مێ دا. ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) نۆکەری پێغەمبەر بووە، دەساڵ خزمەتی حەزرەتی کردوە، بەهەتیویی گەورە بووە، لەناو یاران دا کەس بەقەد ئەو منداڵی نەبووە، دەوڵەمەند بووە، تەمەنی درێژ بووەو پێغەمبەری خوا لەسەر داخوازی دایکی ئەنەس ئەم نزایەی بۆ کردووە: خودایە! پیتو فەڕ بخەرە ماڵو منداڵیو تەمەنی درێژ کەو لەگوناهی خۆش بە) ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (سەد منداڵ ـ دووکەمم ـ بەخاك سپاردووە، کەهەموویان لەپشتی خۆم بوون!) ڕەزێکی هەبوو هەموو ساڵێ دووجار بەری دەگرت، ڕێحانێکی تیا بوو بۆنی میسکی لێوە دەهات، دەڵێن: زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، دوا هاوڕێ بووە کەلە (٩٣) ی کۆچی دا، لەسەردەمی حەجاج دا لەبەصرە مردووە (٢٢٨٦) فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە (٢٥١) فەرموودەی لەبوخاری دا هەیە (٢٥٩) فەرموودەی لەموسلیم دا هەیە (١٦٨) یان پەسندی هەردوولایانن: (تاج/٥ ل/١٨٤).

## باسی خۆشەویستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباوەڕە

١٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ). (الحديث ١٤) [(١٤)]

---

(١٤) اخرجه مسلم في الايمان، رقم: ١٦٧. انظر: عمدة القاري العلامة العينى ج/١ ص ١٤٣ باب: حب الرسول (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) من الايمان ـ المترجم

ئوبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسەی کەوا گیانی من وا لەدەستی ئەوا کەستان بەتەواوی ئیمان ناهێنێو بەئیمانداری تەواو حسێب ناکرێ هەتا منی خۆشتر نەوێ لە لەباوكو لەدایكو لەماڵی خۆیو لە گشت خەڵکی تریش سەرجەم). (تاج/١ ل/٢٠ ز/٢).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

وشەی دەست لەم فەرموودەیەدا لەموتەشەبیهاتە، ئێمەیش وەك موفەوویچەکان دەرکی مەبەست لێ ی هەواڵەی زانستی خودا دەکەینو وەك ئەو هەواڵکەرانە دەڵێین: (وما يعلم تأويله الا الله) وەك (الراسخون في العلم) یش دەڵێین: (آمنا به كل من عند ربنا) نزای باشیش بۆ موئەوویلەکان دەکەین، کەبۆ خزمەتی ئایینی خودا ئەرکی زۆریان کێشاوەو بەتەئویلی جوان چارسەری زۆر لە کێشەکانیان کردوە، خوا پاداشی باشی هەموو لایێ لەڕاژەکەرانی ئیسلام بداتەوە. خۆشەویستی ڕاستو دروستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوە دەبێ کەموسوڵمان پەیڕەوی شەریعەتەکەی بکا، دەنا قسە فەقیرە هەمووکەس پێ ی دەوێرێ.

١٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ). تەرجەمەکەی لەفەرموودەی چواردەدا ڕۆیشت. (الحديث رقم: ١٥) [١٥]

## باسی چێژی شیرینی باوەڕ

١٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا

---

(١٥)اخرجه مسلم في الايمان باب: وجوب محبة رسول الله (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) اكثر من الأهل والولد، رقم: ٤٤ = ١٦٧اشيحا.

وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ).(الحديث ١٦ أطرافه في: ٢١، ٦٠٤١، ٦٩٤١)[١٦]

**لەئەنەسەوە لەپێغەمبەرەوە (درروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تێدابێ تامی شیرینی باوەڕ دەچێژێ یەکەم: خوداو پێغەمبەری خودای لەهەمموو شتێکی تر لەلا خۆشەویستتر بێ، دوەم: هەرکەسەی خۆش دەوێ ساخ لەبەر رەزای خوای گەورە خۆشی بوێ، سێیەم: چۆنیش پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوەئاوایش پێی ناخۆش بێ کەجارێکی تر بچێتەوە سەر کوفرو بێ بڕوایی، دوا ئەوە کەخوا رزگاری کرد لێ ی) (تاج/ عربی جلد/٥ ص ٧٨ ص = القسم العربی) + (تاج/١ ل/٢١ ز/٢ = ژمارە/٥).**

## باسی نیشانەی باوەڕ حوببی ئەنصارە

١٧- عَنْ أَنَسٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (آيَةُ الْإِيمَانِ حُبُّ الْأَنْصَارِ وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الْأَنْصَارِ). (الحديث ١٧ ـ طرفه في: ٣٧٨٤)[١٧]

**دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (درروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی باوەڕی بتەو خۆشەویستی ئەنصارەکانی پێغەمبەرە (درروودی خودای لەسەر بێ) کەبەکوردی پێیان دەگوترێ: یارمەتیدەرانی پێغەمبەر، درروودو سڵاوی خوای گەورە لەخۆی و رەزای خوای گەورە لەیارانی بێ، نیشانەی دوو ڕوویی و ناپاکیش لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلاما رق لێبوون و کینە کێشانە لەئەنصار). (تاج ـ ١ ل ـ ٢١ ز ـ ٢).**

### راڤەو شیکردنەوە:

**نیشانەی باوەڕو عەلامەتی ئیمان زۆرن یەکێ لەوانە خۆشەویستی ئەنصارە، ئەنصار موسوڵمانەکانی مەدینەن کەیارمەتی ئایینی خوایان**

---

(١٦) أخرجه مسلم في الايمان، باب: وجوب محبة رسول الله (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) أكثر من الأهل والولد والوالد، رقم: ٤٣ = ١٦٤.

(١٧)أخرجه مسلم في الايمان، باب الدليل على ان حب الانصار وعلى (رضي الله عنه) من الايمان، رقم: ٧٤ = ٢٣٢شيحا.

بەسەرو بەماڵ داوە، نیفاقو دوو ڕوویش لەئایینا ئەوەیە: کەسێ بەدەم موسوڵمان بێو لەدڵەوە ناموسوڵمانو بێ بڕوابێ، یا بەدەمو دڵ موسوڵمان بێ بەڵام رەفتاری وەك بەناو موسوڵمان وابێ!

١٨- عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: (بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا تَسْرِقُوا وَلَا تَزْنُوا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ وَلَا تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ به فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ). (الحديث ١٨ أطرافه في: ٣٨٩٢,٣٨٩٣,٣٩٩٩,٤٨٩٤,٦٧٨٤,٦٨٠١,٦٨٧٣,٧٠٥٥,٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨).[١٨]

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەدەوری بوون، فەرمووی پێیان: پەیمانم لەگەڵ دا بکەن لەسەر ئەوە: کەهاوبەش (شەریك) بۆ خوا دانەنێنو دزیو حیزی نەکەنو دەس پاكو داوێنپاك بنو منداڵی خۆتان لەبەر نەبوونی نەکوژنو لەخۆتانەوە لەخوتو خۆڕایی بوختیان هەڵنەبەستن، وەلەکردنی چاکەو پیاوەتی سەرپێچی نەکەنو لاریتان نەبێ لەکاری خێر) جا هەرکەسێکتان ئەم پەیمانەی هەتا سەر بردەسەر ئەوە پاداشی باشی دەکەوێتە سەر خوا، وەئەوەیشی تووشی شتێ بوو لەمانەو، لەم جیهانەدا تۆڵەی ئەوەی لێ سەندرا ئەوە دەبێ بەکەفارەت بۆیو ئەو تۆڵەیە برێتی ی تاوانەکەی دەکەوێ، وەئەوەیشی تووشی شتێ بوو لەمانە بەڵام لەجیهان داخودا بۆی پۆشی، ئەوە کاری دەکەوێتە دەست خوا، جا خودا ئەگەر حەز بکا ئەوا لێ ی دەبووری، ئەگینا تۆڵەی ئەوەی لەوجیهان دا لێ دەستێنێ)

(١٨) أخرجه مسلم في الحدود، باب: الحدود كفارات لاهلها، رقم: ١٧٠٩ = ٤٤٣٦ شيحا.

عوبادە فەرمووی: (جا ئێمەیش لەسەر ئەوە پەیمانمان پێ دا). (تاج/٣ ل/٢٦٥ ز/١٠١ ف/١ تاج/١ ز/٨ ژ/٥٥).

## راڤەو شیکردنەوە:

هەتا بزانرێ کەپیاوانی رشتەکانی فەرموودەکانی صەحیحی بوخاری چ کەڵە پیاوێ بوون، سەرگوڵێ لەمێژوویان دەنووسین، عوبادە: ئەنصاری یە، خەزرەجی یە، ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم‌و دووەم بووە، هەروا ئامادەی بەدرو ئوحودو پەیمانی خۆشنوودی (بەیعەتو رضوان) و هەموو شەڕگاکانی تری پێغەمبەر بووە، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) لەپێغەمبەرەوە (١٨١) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، شەشیان پەسندی هەردوولایە، دوانیان لەبوخاری دا هەیە بەلام لەموسلیم دا نییە،دوانیشیان لەموسلیم دا هەیە، بەلام لەبوخاریدا نییە، یەکەم کەس بووە کەبووە بەقازی فەلەستین، پیاوێکی کەڵەگەتی قەویلەی قۆزی بەهرەمەند بووە، ساڵی (٣٤) ك مردووە، گۆڕەکەی لەبەیتولەقدیسە جێگەکەی زانراوە، پەیوەندیی ئەم فەرموودەیە بەسەر دێڕی ئەم باسەوە، کەئیمان‌و باوەڕە زۆر کەمە، ئەوەیش بەهۆی ئەو تێهەڵکێشانەوەیە کە دانەری تەجریدی صەریح کردوویەتی لەنێوان سەرباسە سەرەکی‌و لاوەکی یەکانی صەحیحی بوخاریدا، ئەم ناسازی یە لەزۆر شوێن لەم کتێبە پیرۆزەیەدا دووبارە دەبێتەوە، بەلام چارسەری بەوە دەکرێ کەبگەڕێیتەوە بۆسەر ئەصلەکە، لەکۆندا موتالاکەری ئەم جۆرە کتێبانە ئاگایەکی چاکی لەم لایەنانە هەبوو، بەلام ئێستا وانەماوە، خوێنەر بەگشتی تەواو ساکارو ساویلکە بوون، مەگەر بەدانسقە خوێنەری پسپۆڕ هەبێ!

### باسی: بەشێکە لە ئایینداری ئەگەر لەدەست ئاژاوە ڕابکەی

١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ

وَمَوَاقِعَ الْقَطرِ يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنْ الْفِتَنِ). (الحديث ١٩ـ أطرافه في: ٣٣٠٠، ٣٦٠٠، ٦٤٩٥، ٧٠٨٨).(١٩)

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خوا (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاکا ئەو ڕۆژە هات کەمەردوم دەکەونە چەرخێکی خراپی واوە پیاوی موسوڵمان لەبەر ئاژاوەی زۆرو لەتاو ئاشووبو فەرتەنە بەئایینی خۆیەوە گوریزو ڕەو دەکاو هەڵدێو شوێن ئاژەڵو گەلەرانی خۆی دەکەوێو بەلوتکەی شاخەکانو بەلەوەڕگاکانەوە گڕیان دەدا، ئەو رانە لەم ڕۆژە رەشەدا باشترین ماڵی ئەو موسوڵمانە گۆشەگیرەیە، چونکە دەبێ بەهۆی پاراستنی ئایینیو مایەی گوزەرانی، دوور لەئاژاوەکان). (ریاض/٢ ل/٥٤٤ - کوردی) + (چاپی/٢ ل/١٥٠ ز/٦٩).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەبو سەعیدی خودری ئەنصاری یە، لەڕۆژی غەزای ئوحوددا لەبەر منداڵی ڕێگەی نەدرا کەبەشداری لەم غەزایەدا بکا، بەڵام لەوەدوا لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی دوازدە غەزابووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا شەهید بووە، هەزارو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لەبوخاری دا شەستو دووی هەیە، لەموسلیم دا نەوەدو هەشتی هەیە، چلو شەشیان پەسندی هەردوولایانن، بەپێ ی ئەم فەرموودەیە گۆشە گیری لەکاتی ئاژاوەدا سوننەتە، گۆشەگیریی لەهەموو کاتێك دا شتی چاکە، بەتایبەتی لەم زەمانەدا، بەمەرجێ نەبێ بەهۆی زیان بۆخۆی یا بۆ موسوڵمانان، وەك ئەوە ببێ بەهۆی تەرکی جومعەو جەماعەت، یا ببێ بەهۆی نەکردنی کاسبی. (ت/٥ ص/١٨٥ مبحث: السلامة في العزلة) + (ب - ١٠ز - ٣ ل - ١١ ف - ١+٢ تاج/٥ ز/٣ ژ/٥١٣٩، ١٤٠ ج/٤).

---

(١٩)من أفراد البخاري (عينى ج/١ ص ١٦٢ - المترجم)

## باسی: پێغەمبەر لەهەمووکەسێ زیاتر لەخوا دەترسێ

٢٠-عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أَمَرَهُمْ أَمَرَهُمْ مِنْ الْأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ قَالُوا إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللَّهِ أَنَا). (الحديث ٢٠ في فتح البارى شرح صحيح البخارى) [٢٠]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو کاتێ فەرمانی بەیارانی دەکرد بۆ کردنی کارێ، داوای شتێکی وای لێ نەدەکردن کەلەتاقەتیاندا نەبێ. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئاخر ئێمە وەك تۆنین، تۆ لەکوێو ئێمە لەکوێ، تۆ خودای کەورە لەگوناهی بەرو دوات خۆش بووە، کەواتە: ئێمە پێویستیمان بەکردنی کاری باش لەتۆ پترە! پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەر بێ) بەڕادەیەکی وا لەم قسەیەیان تووڕە دەبوو لەرووی دیار بوو، دەیشی فەرموو: (من لەهەمووتان زیاتر لەخودا دەترسم، وەلەهەمووشتان زیاتر دەیناسم، کەواتە: کاری زۆر بۆمن باشترە!). : (تاج/١ ل/٦٣ ز/١٠ = ژ/٨٠ چ/٤).

## باسی باوەڕ بەهێزو بێ هێزی هەیە

٢١-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَخْرِجُوا (مِنْ النَّارِ) مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدْ اسْوَدُّوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ

---

(٢٠) من افراد البخاري (عينى ج/١ ص ١٦٦) المترجم.

صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً). (الحديث ٢٢ في فتح الباري ـ أطرافه في: ٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦٠، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٧٤٣٩) [٢١]

لەئەبوسەعیدی خودریەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهەشتی یەکان دەچنە بەهەشتو دۆزەخییەکانیش دەچنە ناو دۆزەخ، لەپاشا خوای گەورە بەفریشتەکان دەفەرموێ: هەرکەسێ بەقەد سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ ئیمانو باوەڕ لەناو دڵی دا بووبێ لەدۆزەخ دەریکەن، جاکاتێ دۆزەخییەکان لەدۆزەخ دێنە دەرەوە بوون بەسووتە مەڕۆو ڕەش ڕەش بوون، ئەوسا هەڵیان دەدەنە ناو ڕووباری ژیانەوە، جا وەك تۆمەی قەراخ سێڵاو خێرا سەوز دەبنەوەو ئەژێنەوە، دیارە دیوتانە کەکاتێ تۆمەدەتەقێو چەکەرە دەکا چەندە گەشو زەرد باوو ناسكو نازدارەو بەرە بەرە بەدەم سروەی باوە شنەشن دەکاو کەروێشکە دەکا، ئەوانیش کەلەڕووبارەکە دێنە دەرەوە ئاوا ناسكو نازدارو بە کەیفن!). : (تاج/٥ ل/٤٠٠ ز/٢٣١) + (ب/١٠ ز/١٣٢ ل/٤٢٦ ف/٢ = تاج/٥ ز/١٣٢ ژ/٥٧٠٥ ل/٧٢١ چ/٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کەباوەڕ بەهێزو بێ هێزی هەیە، وەئەوەی لەسەر موسوڵمانەتی بمرێ زوو یادرەنگ دەچێتە بەهەشت، هەروەك ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کەمەعنەویات وەك باوەڕو کردار سەنگو کێشیان هەیە، لەم سەردەمەدا تەرازوو و پێوەر چەشنی زۆرو سەیری هەیە، مەرج نییە کەهەر شتی تەندار بکێشرێ، شتی بێ تەنیش (وەك کارەبا، موقناتیسی، پلەی سەرماو گەرما، رادەی شێ، خاسییەتو تایبەتمەندیی شت، ئەمانە هەموو گەرچی ماددەو جەوهەر نینو عەرەضو رووکەشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا

(٢١) أخرجه مسلم في الايمان، باب: إثبات الشفاعة وإخراج الموحدين من النار، رقم: ١٨٤=٤٥٦.





هەریەکێ لەمانە) پێوەری خۆی هەیە، ئیتر تەعبیر لەو حەقیقەتە بەهەر وشەیێ بێ دەبێ، ناوی دەنێ ی تەرازوو، یان مەتر، ئەوە لەجەوهەری بابەتەکە هیچ ناگۆڕێ!

نابینی لەرەی دەنگ، تیری‌و کاڵی رەنگ، خۆشی‌و ناخۆشی‌و چۆنێتی‌و چەندێتی ی تام‌و بۆ، ئەمانە هەموو شەپۆڵ‌و مەوجەی خۆیان هەیە، ئێستا بەپێوەری تایبەتی، ئەو شەپۆڵ‌و لەرانە لەیەك جیا دەکرێنەوە، لەسەر شەریت‌و نەوار تۆمار دەکرێن‌و هەرکاتێ ویستیان ئەو دەنگ‌و رەنگە وەك خۆیان دووبارە دەکەنەوە.

حەز دەکەم ئەم راستییە تۆمار بکەم: ئێمە کەموسوڵمان نین باوەڕمان وایە کەئیسلام تاقە ئایینی راست‌و دروستی خوایە، وەئەوەی پێویست بێ بۆ پیادە کردن‌و گەشە پێکردن‌و بەردەوام بوونی ئەم ئایینە خودای گەورە فەراهەمی هێناوە، جا لەسەر ئەم بنیاتە خودای گەورە لەژێر چاودێری خۆیدا، لەپێش پیادە کردنی ئیسلام دا، ئەم زمانی عەرەبییەی کەقورئان‌و حەدیثی پێ تۆمار کراوە، پەروەردە کردووە، ئەوەتا بەرێك‌و پێکی تەعبیری لەمەبەستەکانی خودا پێ دراوەتەوە، ئەمەش بەباوەڕی من بەشێکە لەئیرهاص، ئیرهاصیش: کارێکی نائاسایی یە لەپێش هاتنی لەدایکبوونی پێغەمبەرێك دا روو دەدا، هەتا ببێ بەنیشانەی دروستی ی پەیامەکەی، یەکێ لەو بنەمایانەی کەبوون بەهۆی سەرەکی پاراستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بنەمای تەوفیق‌و پشتگیریی خودایی یە، راستە کەپێویستە لەسەر موسوڵمان لەهەوڵ‌و کۆشش‌و کارو کردەوە سارد نەبنەوەو ئەوەی هۆی سەربەرزیی دیین‌و دنیایە هەوڵی بۆ بدەن، بەڵام تەوفیقی خوایی سەرو هەموو ئەمانەیە، دەنا کارەساتی گەورەی وا بەسەر میللەتی ئیسلام دا هاتووە ئەگەر پشتگیریی خوایی نەبوایە ئێستا ناوی ئیسلام سڕابۆوە.

٢٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثدِيَّ وَمِنْهَا مَا دُونَ ذَلِكَ وَعُرِض عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ قَالُوا فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الدِّينَ). (الحديث ٢٣ ـ أطرافه في: ٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩).[٢٢]

دیسان ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نووستبووم لەخەودا ئەو خەڵکەم پێ نیشان دران، هەموو سەرو کراسییان لەبەردا بوو، هەیان بوو کراسەکەی دەگەییشتە سەر مەمکیو هەیان بوو لەوە زیاتر پاکەمتر بوو، بەڵام کەسەرەی عومەری کوڕ خەطتاب هاتو ئەو بەبەردەمما رەت بوو تەماشام کرد کراسێکی ئاودامانی لەبەردابوو لەبەرپێی دەخشا، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوەت بەچی خەوپەرژین کردو بەچی لێکت دایەوە؟ فەرمووی: بەئایین). (تاج-٥ ل/٢٠ ز/٤ ف/١ ز//٣٢٤٥ چ/٤).

## شەرمو حەیا بەشێکە لەئیمانو باوەڕ بەخوا

٢٣- عَنْ ابْنْ عَمَرَ(رضي الله عنهما) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنْ الْأَنْصَارِ وَهُوَ يَعِظ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعْهُ فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنْ الْإِيمَانِ). (الحديث ٢٤ ـ أطرافه في: ٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩)[٢٣]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەلای پیاوێکەوە رابورد، ئەنصاری بوو، خەریك بوو ئامۆژگاریی برادەرێکی خۆی

(٢٢) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: من فضائل عمر (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، رقم: ٢٣٩٠ = ٦١٣٩.
(٢٣) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان عدد شعب الايمان وأفضلها وأدناها، رقم: ٣٦=١٥٣.

دەکرد، لەسەر ئەوە کەزۆر شەرمنە. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (وازی لێ بێنە چوونکە شەرمو شکۆ بەشێکە لەباوەڕو ئیمان) (ریاض/٢ ل/٥٩٢).

## ئەوەی شایەتمان بهێنێ و نوێژ بکاو زەکات بدا سەرو سامانی پارێزراون

٢٤- عَنْ ابْنِ عُمَر (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ فَإِذا فَعَلُوا ذلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ). (الحديث ٢٥)[٢٤]

دیسان لەوەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فەرمانم پێ کراوە کەشەڕ بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا هەتا شایەتمان دێنن و بەزمان دەڵێن: أَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ: شایەتی دەدەم کەهەر خودا خودایەو بەس، مەحەممەدیش پێغەمبەری خوایەو لەلایەن ئەوەوە رەوانە کراوە بۆسەر ئەو خەڵکە، وەتا پێنج فەرزەی نوێژ بەجوانی دەکەن و، زەکاتی فەرز دەدەن، کاتێ ئەوەیان کرد ئیتر سەرو ماڵ و ناموسیان لەمن حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، جا لەدوا ئەوە لێپرسینەوەیان لەبارەی نیازی دڵیانەوە لەو دونیا لەسەر خوایە). : (ریاض/١ ل/٣٧٢ ز/٤٩ + تاج/٢ ل/١٢ ف/٤ ز/٢) + (چاپی/٢ ب/٢ ل/٣٠٤ ف/١/٣٩٠).

### راڤەو شیکردنەوە:

لەم فەرموودەیەوە ئەم شتانە وەردەگیرێن: گوتنی شایەتمان بەزمان مەرجی یەکەمی قەبووڵی ئیسلامە، وەحوکم ناکرێ بە کافری و بێ بڕوایی

---

(٢٤) أخرجه مسلم في الايمان، باب: الأمر بقتال الناس حتى يقول: لاإله الا الله، رقم: ٢٢=١٢٤.

كەسێ بەهۆی کاری زۆر خراپەوە مادەم ئەهلی شایەتمان بێ، بەم جۆرە کەسە لەزاراوەی شەرعدا دەگوترێ: ئەهلی قیبلە، بڕیاری شەرع بەپێ ی رووکارەو لێپرسینەوە لەنیازی ناو دڵ لەسەر خوایە، بڕیاری شەریعەت لەسەر موسوڵمان جێ بەجێ دەکرێ ئەگەر سەرپێچی لەفەرمانەکانی شەرع بکا، وەك ئەوە بەناحەق کەسێ بکوژێ دەکوژرێتەوە.

## باسی: هەندێ دەفەرموون ئیمان کردەوەیە

٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (سُئِلَ أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضلُ؟ فَقَالَ: إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذا؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذا؟ قَالَ: حَجٌّ مَبْرُورٌ). (الحديث ٢٦ ـ طرفه في: ١٥١٩) [٢٥]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار کرا: کام کارە زۆر پەسەندە؟ فەرمووی: باوەڕ بەخوداو بەپێغەمبەری خودا، گوترا: ئەی لەدوا ئەو چی کارێ زۆر خێرە؟ فەرمووی: (غەزاو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا، گوترا: ئەنجا چی تر؟ فەرمووی: حەجێکی دروست!) (ریاض/٣ ل/٩٤٢).

### راڤەو شیکردنەوە:

لەهەندێ فەرموودەدا لەپاش باوەڕ باشترین کردەوە نوێژە، یاشتێکی ترە، وەك وەڵامێکی گشتی بۆئەم جۆرە باس و بابەتانە کەبەدیمەن بۆنی ناتەبایی یان لێ دێ، دەڵێین:

یەکەم: بەپێی حاڵ و بەپێی کەس وەڵام دەگۆڕێ، بەوێنە: کاتێ جیهان بەئاسایش بێ حەج لەغەزا باشترە، بەڵام کاتێ دوژمن شاڵاوی هێنابێ غەزا لەحەج باشترە،

---

(٢٥) أخرجه مسلم باب: بيان كون الايمان بالله تعالى افضل الأعمال، رقم: ٨٣=٢٤٤ شيحا.

دووەم: بەزۆری ئەم رستەو تەعبیرانە هاندانە لەسەر کردنی ئەو کارە باشانە، مەبەست بڕیاردانی پلەی باشترینی نێوانیان نییە،

سێیەم: وشەیێ لەزارا کرتاوە، بەلاّم لەدلّەوە مەبەستە، وەك وشەی (مِنْ) لێرەدا مورادە، ئەوکاتە پرسیارەکە ئاوای لێ دێ: (سئل أي العمل= من= أفضل الأعمال: کام کارە لەزۆر کارە پەسندەکانە؟).

چوارەم: ئیسمی تەفضیل لەم جۆرە شوێنانەدا بۆ تەفضیل نییە، وەك لەم ئایەتانەدا بۆ تەفضیل نییە: (وهو أهون عليه) هەروا: (وربكم اعلم بكم) کە (أهون) بەواتا (هَيِّنُ)بێو (أعلم) بەواتا (عالِم)بێ، ئەم جۆرە تەئویلە لەم شوێنانەدا زۆر پەسندە، زاناکان دەفەرموون: (ئەگەر دوو دەق بەدیمەن پێکەوە نەدەگونجان دەبێ لایەکیان بەپێی زانستی تەئویل تەئویل بکرێ، ئەوکاتە هەردوو دەقەکە پەسەندنو کار بەهەردوو لایان دەکرێ، بەلاّم ئەگەر بەتەئویلیش پێکەوە نەدەگونجان ئەوا بەهێزەکەیان پەسەند دەکرێو بێ هێزەکەیان کەنار دەکرێ، تەنانەت هەندێ زانا دەفەرموون: تەئویل دووریش بێ لەڕەتکردنەوەی دەق باشترە. تأويل لە (آل الشيء الى كذا)یە واتە ئەو شتە گەڕایەوە بۆ ئەوەو ئەوە)، لەزاراوەی زانستی فەرموودەدا مەبەست لەتەئویل ئەمەیە: گفتە (لفظ)ێ بەپێی دانانی بنچینەیی (وەضعی ئەصڵی) خۆی واتایێ دەگەیەنێ، بەلاّم لەبەر بەلگەیە لەو واتایەوە نەقلّ دەکرێ بۆ واتایەکی تر، ئەگەر ئەو بەلگەیە نەبوایە ئەو واتایەی کەبەڕواڵەت گفتەکە دەیگەیەنێ کەنار نەدەکرا.

## کاتێ ئیسلام لەسەر واتای راستەقینە نەبێ

٢٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقاصٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنه) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَعْطى رَهْطا وَسَعْدٌ جَالِسٌ فَتَرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا هُوَ أَعْجَبُهُمْ

إِلَيَّ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًا فَقَالَ أَوْ مُسْلِمًا فَسَكَتُّ قَلِيلًا ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي فَقُلْتُ مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًا فَقَالَ أَوْ مُسْلِمًا فَسَكَتَ قَلِيلاً ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي وَعَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ يَا سَعْدُ إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ). (الحديث ٢٧ ـ طرفه في: ١٤٧٨) (٢٦)

**سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من خۆم دانیشتبووم لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەستەیەکی دا، بەڵام بەشی پیاوێکی نەدا، بەلای منەوە ئەو پیاوە باشترینیان بوو، لەبەرئەوە گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی فیسارەکەست بوارد، خۆبەخودا من بەبڕواداری دەزانم، فەرمووی: بەڵکوو بڵێ بەموسوڵمانی دەزانم‌و لەحاڵی وادا شایەتی باوەڕ، کە شتێکە والەناو دڵ دا بۆئەم جۆرە کەسەی مەدە) جا منیش کەمێ بێدەنگ بووم، هەتا ئەوەی دەمزانی لەبارەی موسوڵمانەتی ئەو پیاوەوە زۆری بۆ هێنام لەبەر ئەوە پرسیارەکەمم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لەبەر ئەوە کەمێکی تریش بێ دەنگ بوومەوە، هەتا لەبەر هەمان هۆی پێشوو پرسیارەکەمم بۆ جاری سێیەم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسانەوە هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لەدوایی دا فەرمووی: (ئەی سەعد! گەلێ جار من بەش دەدەم بەهەندێ کەس، هەیشە لەوم خۆشتر دەوێ‌و بەشیشی نادەم، دەزانی ئەوەبۆ؟ چونکە هەندێ کەس نۆ موسوڵمانن، یاچاوچنۆکن، دەمەوێ بەبەش پێدان بیان لاوێنم‌و بیانکەم بەدۆستی ئیسلام، نەبادا بچێتەوە ناو بێ بڕوایی‌و خودا لەناو ئاگری دۆزەخ دا سەرەنگرێی بکا، بەڵام هەیە خۆی موسوڵمانی ساغە، پێویستی بەلاواندنەوە نیە).**

---

**(٢٦)أخرجه مسلم في الايمان، باب: تأليف قلب من يخاف على إيمانه لضعفه وفي الزكاة، باب إعطاء من يخاف على إيمانه، رقم: ١٥٠ = ٣٧٦، ٣٧٧.**

**راڤەو شیكردنەوە:**

سەعد لەعەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە كەسەیە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی بەهەشتی پێداون، لەموسوڵمانە هەرەپێشینەكانە، لەتەمەنی چواردە ساڵی دا ئیسلام بوو، ئامادەی غەزای بەدر بووە، هەروا هی غەزاكانی تری پاش بەدر بووە، نزای گیرابوو، یەكەم كەس بوو كەیەكەم تیری لەرێگەی خودا دا هاویشت، لەكۆچەرە هەرە پێشینەكان بوو، دووسەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لەبوخاری دا بیستی هەیە، لەموسلیم دا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوولایە، لەسەردەمی ئیمامی عومەردا لەسەر دەستی سەعددا مەدائین فەتح كرا، كووفەی دروست كرد، عومەر كردی بەفەرمانداری وڵاتی عێراق، لەپەنجاو حەوتی كۆچی دا مردووە، لەبەقیع بەخاك سپێردراوە، دواترین كەسە لەعەشەرەی موبەششەرە كە مردووە: (تاج/٥ ل/٨٦ = تاج/٣ ل/٦٠٩ ز/١٢ ز/٣٣٢٦ هەتا ٣٣٣١ ج/٤) لەم شوێنەدا لەتاجول ئوصول دا مناقبی سەعد نووسراوە.

## كفر تا كفر فەرقی هەیە

٢٧- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أُرِيتُ النَّارَ فَإِذا أَكْثرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ يَكْفُرْنَ قِيلَ أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَط). (الحديث ٢٩ ـ أطرافه في: ٤٣٢، ٧٤٨، ١٠٥٢، ٣٢٠٢، ٥١٩٧).[٢٧]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەرنجی ناو دۆزەخم دا ڕوانیم زوربەی خەڵكەكەی لەژنانی جیهان بوون،

---

(٢٧) أخرجه مسلم في أول كتاب العيدين، رقم: ٨٨٤=٢٠٤٥ شيحا.

چونکه سپڵەیی دەکەن) گوتیان: ئایا سپڵەیی لەگەڵ خودا دا دەکەن؟ فەرمووی: (سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو چاکەیان لەبەرچاو نییە، ئەگەر بەدرێژایی ساڵ چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەی، دوایی شتێکی کەمی لێ ببینێت کەبەدڵی نەبێ دەڵێ: هەرگیز چاکەم لەتۆ نەبینیوە!).

## کەس بەکردنی تاوانەکانی سەردەمی نەفامی کافرنابێ جگە لەشیرك‌و کوفر

٢٨- عَنْ أبي ذرٍّ (رَضي اللهُ عَنهُ) قَالَ: (سَابَبْتُ رَجُلًا فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا ذرّ أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمْ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ). (الحديث ٣٠ ـ طرفه في: ٢٥٤٥، ٧٠٨٣)[٢٨]

ئەبوذەڕی غیفاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (لەگەڵ پیاوێك دا جنێومان بەیەکتر دا، لەسەر قسەیە توانجم لەدایکی دا پێم گوت: کوڕی ژنە قولەڕەشەکە، ئەویش چوو لەلای حەزرەت سکاڵای لەدەست کردم، جا کەچووم بۆ خزمەت حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبوذەڕ! چۆن تانە لەدایکی دەدەی؟ تۆ چۆن پیاوێکی؟ هێشتا ڕەگی ڕەفتاری سەردەمی نەزانیت تێدا ماوە، ئەم بەندەو نۆکەرانەتان برای ئایینی ئێوەن، خودا کردوونی بەژێردەستەی ئێوە، خزمەتتان دەکەن، کەواتە لەخواردنو جل‌و بەرگا لەخۆتانیان جیا مەکەنەوە، کارو فەرمانی گرانی وایان مەدەن بەسەردا کەلەکێشیان دا نەبێ، ئەگەر دنیا بوو داوای شتێکی ئاواتان لێکردن یارمەتیان بدەن).

(٢٨) أخرجه مسلم في الأيمان والنذور، باب: إطعام المملوك مما يأكل، رقم: ١٦٦١=٤٢٨٩شيحا.

## راڤەو شیکردنەوە:

مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ - پڕگۆڕەکەی لەنوور بێ - دەفەرموێ: ئەو پیاوەی لەگەڵ ئەبوذەڕ جنێویان بەیەك داوە بیلالی حەبەشی بووە، لەعومدەتولقاریئدا دەفەرموێ : (چاکە کردن لەگەڵ ولاخو ئاژەڵیش دا سوونەتە، نابێ ناهەقی لەوانیش بکرێ!): (تاج/٣ ل/٤٤ ز/٢١ ف/٤ = تاج/٢ ل/٤٥٥ ژ/٢٠٢٩).

ئەبوزەڕی غیفاری یەکێکە لەناودارانی هاوڕێیان، لەخۆی دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: من چوارەمین کەس بووم کەئیسلام بووم، لەبەر زوهدیو بێ هەوایی لەحەدیثدا دەیشوبهێنن بە حەزرەتی عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوا جەنگی خەندەق لەمەدینە لەگەڵ حەزرەتدا مایەوە هەتا حەزرەت وەفاتی کرد. بەپێ ی ڕێبازو بۆچوونی ئەبوزەڕ: (نارەوایە بۆ مرۆڤ پتر لەپێداویستی خۆی سامان پاشەکەوت بکا) بۆیە پێی دەڵێن: (أبو الاشتراكية في الاسلام) لەئیسلام دا ماڵ بەهرەیەکە لەبەهرەکانی خودا، ماڵی ڕەحمەت هەتا زۆربێ دەستمایەی دینو دنیایە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیش دا دەوڵەتی ئیسلام مافی هەیە سیستەمی ماڵداریی چاودێری بکا، لەکاتی پێویست دا جڵەوی چڵێسی سەرمایەداری بگرێ. ئەبوزەڕ دووسەدو هەشتاویەك فەرموودەی هەیە، لەبوخاری دا چواردە فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا بیستو نۆ فەرموودەی هەیە، دوازدەیان پەسندی هەردوولایە، لەڕەبەزە لەساڵی (٣٢) ك ئەمری هەقی بەجێ هێنا، ئیبنوومەسعوود نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد. (ت/٥ ل/٢٠٤ = تاج/٣ ل/٧٢٢ ژ/٣٥٠٧-٣٥٠٩).

## باسی: صوڵح لەنێوان موسوڵماناندا

٢٩-عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ:سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ فَقُلْتُ يَا

رَسُولَ اللّٰهِ فهَذا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ). (الحديث ٣١- طرفاه في: ٦٨٧٥، ٧٠٨٣) [٢٩]

ئەبو بەکرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (هەرکاتێ دوو موسوڵمان دەستەو شمشێر بەرامبەربەیەك راوەستان، یەکێکیان یەکێکیانی کوشت، بکوژو کوژراو هەردوکیان لەئاگری دۆزەخدان) منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باشە وابکوژ لەبەر خوێنرێژییەکەی شایانی دۆزەخە، ئەی کوژراو بۆچی؟ فەرمووی: (چوونکە ئەویش بەخواستی دڵ سوور بووە لەسەر کوشتنی هاوڕێکەی).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەبو بەکرە لەهاوڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەرە، بەردەوام سەرگەرمی خواپەرستی جوان بوو هەتا لەبەصرە لەساڵی پەنجاو دووی کۆچی دا ئەمری هەقی بەجێ هێنا، سەدو سیی‌و دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەبوخاری دا (١٣) فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا (٩) فەرموودەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوولایانە.

## باسی: زوڵم تا زوڵم جیاوازی هەیە

٣٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ (الَّذينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظلْمٍ) قَالَ: أَصْحَابُ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّنَا لَمْ يَظلِمْ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: (إِنَّ الشِّرْكَ لَظلْمٌ عَظيمٌ). (الحديث ٣٢ ـ أطرافه في: ٣٣٦٠، ٣٤٢٨، ٣٤٢٩، ٤٦٢٩، ٤٧٧٦، ٦٩١٨، ٦٩٣٧). [٣٠]

(٢٩) أخرجه مسلم في الفتن واشراط الساعة، باب: اذا تواجه المسلمان بيفيهما،رقم: ٢٨٨٨=٧١٨١.

(٣٠) أخرجه مسلم في الايمان، باب: صدق الايمان واخلاصه، رقم: ١٢٤=٣٢٣.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کەئایەتی (الـذين آمنـوا ولم يلبسوا إيمانهم بظلم أولئك لهم ألأمن وهم مهتـدون) (٨٢/٦) هاتـە خـوارەوە، کەئەمـە ڕاڤەکەیـەتی: موسـوڵمانی ڕاسـتو دروسـت بـەپێ ی دەسـتوورەکانی دیـنو ئـایین، ئـەو بڕوادارانـەن کـەباوەڕێکی ساخی ڕەسای بێگـەردی باشـیان بەخودای خۆیان هەیەو بەهەموو پێغەمبـەرانی خـوا هەیـە، بـاوەڕێکی پـەتی کەتێکـەڵ بـەزۆرو سـتەم نـەبێ، ئەوانـە ئاسـایشو ئـارامو هێمنـی دادەبـارێ بەسەریانا، خۆشیان شارەزای ڕێگەی ڕاسـتنو مرازیـان هاتۆتـەدی. فـەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتـەخوارەوە بـوو بـەهۆی نیگـەران بـوونی موسـوڵمانەکانو مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کەبەر بەهرەی ئاسایشو ئـارامیو شارەزا بـوونی ڕێگەی ڕاست نەکەون، بۆیـە گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دەبێ کێ بێ لەئێمـە کـەزۆرو سـتەمی لـەخودی خـۆی نـەکردبێ؟ کەواتـە: ئـەم مژدەیـە بەئێمـە چـی؟ بـەڵکوو بەپێـچەوانەوە ئەمـە هەڕەشـەیە لەئێمـە، چـونکە هەموو کەسـێ لەئێمـە کـەم یـازۆر زۆرو سـتەممان کـردووە، ئـەویش (درووودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (مەبەسـت ئـەوە نییـە کـەئێوە تێـی گەییـشتوون، بـەڵکوو مەبەست لەو زۆرو سـتەمو زوڵمـەی کەلـەم ئایەتـەدا هەیـە شیرکو هاوبـەش دانانــە بــۆ خــوداو، لــەو چەشــنە زوڵــمو ســتەمەیە کــەلوقمان ئامۆژگـاری کوڕەکــەی خــۆیی دەکــرد کــەتوخنی نەکــەوێ، کــەقورئان دەیگێڕێتــەوەو دەفەرموێ: (يابنيَّ لاتشرك بالله إن الشرك لظلم عظـيم)(١٣/٣١) واتـە: ڕۆڵـەی خۆشەویـستم! نەکـەی هەڵـەی واگـەورە بکـەی، هاوبـەشو هـاوڕێ بـۆ خـودا بڕیار بدەی، چونکی شتی وا زوڵمێکـی زۆر گەورەیـە، زوڵـمو زۆرو ناهـەقیش لەموسوڵمانی باش ناوەشێتەوە، پیشەی ملهوڕە ستەمکارەکانە).

## راڤەو لێکۆڵینەوە:

هەتا بزانین کەپیاوانی صەحیحی بوخاری چۆن پیاوانێ بوون، لێرەدا کورتەیەکی پوخت لەژیاننامەی ئیمامی ئەعمەش تۆمار دەکەین، کەیەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە، کە ئاوایە: بوخاری، ئەبووەلید، شوعبە، سولەیمان واتە: (ئەعمەش) ئیبراهیم، عەلقەمە ئیبنومەسعود، ئیمامی ئەعمەش چوار هەزار فەرموودەی هەیە، کتێبی نەبوو، فەصیح بوو، هەرگیز لەحنی نەدەکرد، لەحن ئەوەیە کەقسە بەغەیری عەرەبی فەصیح بکەی، ئیمامی ئەنەسی دیوە، کەواتە: تابیعی یە، تابیعی موسوڵمانێکە لەچینی دوەمی میللەتی ئیسلام بێ، پێغەمبەری نەدیبێ، بەلام هاوڕێی پێغەمبەری دیبێ، ئەعمەش ئەم زاتانە مامۆستای بوون، واتە: شێخی بوون، شێخی راوی یاموحەددیث ئەو کەسەیە کەفەرموودەی لێ وەردەگیرێ، ئەبو وائیل‌و مەعرورو موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعی‌و تەیمی‌و شەعبی شێخی ئەعمەش بوون، سوبەیعی‌و ئیبراهیمی تەیمی‌و ثەوری‌و شوعبەو یەحیای قەطان‌و سوفیانی کوڕی عویەینە فەقێ ی بوون، واتە: فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، یەحیای کوڕی قەططان دەفەرموێ: (ئەعمەش سۆفیلکەیەکی وابوو بەردەوام لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا ئامادە بوو، زانایەکی پایەبەرزی ئیسلام بوو). وەکیع دەفەرموێ: (ئەعمەش نزیکەی حەفتا ساڵ ئەڵلاهو ئەکبەری یەکەمی جەماعەتی نەفەوتاوە!) شوعبە پێ ی دەگوت: موصحەف، واتە: وەك موصحەف ڕاست‌و بێ گەردە، پێیان دەگوت: سید المحدّثین، واتە: گەورەی فەرموودە زانەکان، بۆنی شیعەیی لێ دەهات، جاروبار تەدلیسی دەکرد تەدلیس ئەوەیە کە فەرموودەکە لەکەسێکەوە بگێڕێتەوە کەهاوچەرخی خۆی بێ، بەلام ئەو فەرموودەیەی لەو نەبیستبێ، لەهەمان کات دا واپیشان بدا کەئەو فەرموودەیەی لەو بیستووە، مەبەستیشی لەمە ئەوەیە کەشێوەی فەرموودەکە جوان بکا، یا ئەوەیە: کەفەرموودە زانەکە

ماموٚستاکەی خوٚی، یاکەسێکی تر لەپیاوانی ڕشتەی فەرموودەکە، بەناوێ ناوبیا کەبەو ناوەوە نەناسرابێ، ئەعمەش (سلاوی خوای لێ بێ) لەساڵی شەستی کوٚچی دا لەدایك بووە، لەسەدوچل‌و هەشت دا مردووە، هەشتاو هەشت ساڵ ژیاوە: (ت/٦ ل/١٥٥ ز/٧ ف/٥ = تاج/٤ ل/٢١٥ ژ/٣٨٦٥).

## باسی: نیشانەی مرۆی ناپاك (مونافیق)

٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذا اؤْتُمِنَ خَانَ). (الحديث ٣٣ ـ أطرافه في: ٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥)[٣١]

لەئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی مرۆڤی ناپاك سێ شتە،: کەقسەی کرد بەقەستی درۆبکا، کەبەڵێنی شتێکی دا بەکەسێ بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنێ، کەسپاردەییێکیان پێ سپارد گزی تیابکا).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

واتە خراپی کردارو گوتارو نیاز نیشانەی مرۆی ناپاکە، تەماشای راڤەی فەرموودەی ژمارە (١٧) بکە، بۆتێگەیشتن لەواتای ناپاك. (ریاض/١ ل/٢٢٩ ز/٢٥) + (چاپی/٢/١٨٢ ژمارە/ ١٩٩).

٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا إِذا اؤْتُمِنَ خَانَ وَإِذا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذا خَاصَمَ فَجَرَ). (الحديث ٣٤ ـ طرفاه في: ٢٤٥٩، ٣١٧٨).[٣٢]

---

(٣١) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان خصال المنافق، رقم: ٥٩=٢٠٨ شيحا.

(٣٢) أخرجه مسلم في الايمان باب: بيان خصال المنافق، رقم: ٥٨=٢٠٧.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ خوو بگرێ بەم چوار شتەوە ئەوە مەنافیق‌و ناپاکی تەواوە، وەهەرکەسێ خوو بگرێ بەیەکێ لەم چوار شتەوە ئەوە ڕەگێکی ناپاکی‌و نیفاقی تیاداهەیە تاوازی لێ دێنێ، کاتێ بوو بەئەمیندار گزی‌و ناپای بکا، دووەم: کاتێ قسە دەکا بەقەستی درۆی تیابکا، سێیەم کاتێ پەیمان دەدا بەکەسێ بیشکێنێ‌و بێ پەیمان دەربچێ، چوارەم : کاتێ داوایەکی هەبوو لەسەر کەسێ ناهەقی لێ بکاو بەهەق ڕازی نەبێ‌و بەهەق‌و ناهەق بیەوێ قسەی خۆی سەرکەوێ).(ریاض/٥٩٩ ز/٨٦ ف/٢)+(چاپی دووەم ز/٨٦ ل/٢٠٧ ژمارە ٦٩٠/٢).

## ڕاڤەو شەرح:

بۆلابردنی هەندێ ڕەخنە لەم جێگەیەدا تەماشای کوردییەکەی (ریاض الصالحين) بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٠٧ ژ/ ٦٩٠) بکە. نیفاق - واتە: ناپاکی، جۆری زۆرە، هەروا نیشانەکانیشی زۆرن، وەك ئەم پێنج نیشانەی کەلەم دوو فەرموودەیەدا دیاری کراون، وەك کینە کێشان لەئەنصار، ناپاکیش چەند جۆری هەیە، وەك ناپاکی ی ناپاکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، هەیە خۆی موسوڵمانە بەڵام بەڕەفتار لەوان دەکا، هەیە مونافیق‌و ناپاکی عورفی یە نەك شەرعی، وەك دەستوورێکی گشتی دەڵێین: ئەم جۆرە تەعبیرانە بۆ حەصری حەقیقی نین، بەڵکوو بۆ هەڕەشەو خەڵك هۆشیار کردنەوەیە.

## کردنی تەراویح لەشەوی ليلة القدر دا نیشانەی ئیمانە

٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ يَقُمْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). (الحديث ٣٥ - أطرافه في: ٣٧، ٣٨، ١٩٠١، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤).[٣٣]

---

(٣٣) اخرجه مسلم في صلاة المسافر، باب: الترغيب في قيام رمضان، رقم: ٧٦٠.

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسێ ساخ لەبـەر ڕەزای خـودا شـەونوێژی شـەوی لەیلەتولقـەدر بکـا، باوەڕی پێی هەبێ کە تاعەتێکی هەقە، خودا لەهەرچی گونـاهی لـەوەو پێشی هەیە خۆش دەبێ) (ت/٢ ل/١١٤ + ریاض/٣ ز/٢١٤ ل/٨٩١ = ژ/١١٨٩).

## باسی: غەزا کردن لەباوەڕە

٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: (انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَلَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ). (الحديث ٣٦ - أطرافه في: ٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٥٧,٧٤٦٣) [(٣٤)]

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (کەسێ بڕوا بۆ غەزاو تێکۆشـان لەڕێ ی خودادا، خودای بالادەستو شکۆمەند بۆخۆی دەبێ بەدەستەبەریو، دەفەرموێ: خۆم کەفیلی ئەوم کەیەکێ لەم دوو خەڵاتـە گەورەیەی پێ بدەم: یابیبەمە ناوبەهەشت، یابیبەمەوە بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو پاداشی گەورەو تاڵانییە زۆرەی کەدەستی دەکەوێ! بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کەدەچێ بۆ ئەو غەزاو کۆششە مەبەستی تـەنیا ڕەزامەنـدیی خودابێو باوەڕی بـەمنو بـە پێغەمبـەرانی مـن هـەبێ، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: دەترسـم کەموسـوڵمانان تووشـی ڕەنـجو سـەخڵەتی بکـەم دەنـا لەگـەڵ هـەموو تاقمـە موسـوڵمانێکا کەدەچن بـۆ غـەزا خۆشم دەچووم بـۆ ئـەو غەزایـە، بـەڵام ئەمـەناکرێ: چـونکە نـەخۆم ئـەو توانایيـەم هەیـە کـەوڵاخی سـواری بـۆ

(٣٤) أخرجه مسلم في الجهاد، باب: فضل الجهاد والخروج في سبيل الله، رقم: ١٧٨٦.

هـەموویان پەیـدا بکـەمو، نەخۆشـیان ئـەو دەسـتەیان دەڕوا، لەهـەمان کاتـا زۆریش بەزەحمەتی دەزانن‌و لەشانیان گرانە ئەگەر من بچم بۆ غـەزاو ئـەوان نەیەن! بەوخودایە کەگیانی موحەممەدی لەدەست دایە، بەحەزی دڵ پڕبـەدڵ حەز دەکەم کەلەڕێگەی خودادا بچم بۆ غەزاو لـەو غەزایـەدا بکوژرێم، دیـسان زینـدوو ببمـەوەو بـچمەوە بـۆ غـەزاو دیـسان بکوژێمـەوە، هەمدیـسان زینـدوو ببمـەوەو بـچمەوە بـۆ غـەزاو هەمدیـسان بکوژرێمـەوە). (تـاج/٨ ل/٤٦ ف/٢ = تاج/٤ ژ/٤٢٨٩ ز/١١).

## باسی: شەونوێژی ڕەمەزان نیشانەی باوەڕی ساخە

٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ صَامَ رَمَضانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ). (الحديث ٣٧ طَرَفُهُ٣٥).[٣٥]

دیـسان فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کەسـێ ڕۆژووی ڕەمـەزان بگـرێ، بـەئیمان‌و بـاوەڕەوە سـاخ لەبـەر ڕەزای خـودا، خـودا لەگوناهـەکانی لەوەوپێـشی خـۆش دەبـێ) (ت/٢ ل/٧١ = تـاج/٢ ز/٢٦ ژ/١٣٠٠ + ریاض الصالحين/٣ ل/٩٠٩ ز/٢١٧ ژ/١١١٩).

٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: (مَـنْ قَـامَ رَمَـضانَ إِيمَانًـا وَاحْتِـسَابًا غُفِـرَ لَـهُ مَـا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذنْبِـهِ) (الحـديث: ٣٨ طَرَفُهُ٣٥)[٣٦]

دیسان فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسـێ بـەباوەڕی تەواوەو بەنیازێکی پاکەوە لەبەر ڕەزای خـودا شـەونوێژی ڕەمـەزان بکـا، خـودا لەگوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێ). (ریاض/٣ ل/٨٨٩ ف/١ ز/٢١٣ ژ/١١٨٧).

---

(٣٥) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين، باب: الترغيب في قيام رمضان، رقم: ٧٥٩ = ١٧٧٦.

(٣٦) اخرجه مسلم في المسافرين، باب: الترغيب في قيام رمضان‌رقم: ٧٦٠ = ١٧٧٧.

٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلَّا غَلَبَهُ فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنْ الدُّلْجَةِ). (ت/١ ل/٦٢ ز/١٠ ف/٤ ذ/٧٩): (من افراد البخاري. عيني/١-٢٣٦- المترجم) (الحديث ٣٩ أطرافه في: ٥٦٧٣، ٦٤٦٣، ٧٢٣٥)[٣٧]

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایین ئاسانە ئەگەر کەسێ لەخۆی گران نەکا، هەرگیز نەبوە کەسێ ئایین لەخۆی گران بکاو بەتوندی باوەشی پیا بکاو هەتا سەر بیباتەسەر! بەڵکوو ئەو کەسانە لەئەنجام دا ئایین بەزاندوونیو کۆڵی پێ داون، جا کەواتە: هەر لەسەرەتاوە ملی ڕێگەی ڕاست بگرنو ئەوەندەی بۆتان دەلوێ دریغی لەکردنی کاری باش مەکەنو مزگێنی خۆتان وەربگرن، ئێوەیش وەك ڕێبواری چالاك لەم سێ کاتەدا تێکۆشنو خوداپەرستیو بەندەگی خۆتان بکەنو بیکەن بەدەسمایەی خۆتان: سەر لەبەیانیانو سەر لەئێواران و دەمەو پارشێو!).

## باسی: نوێژ لەئیمانە

٣٨-عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَوَّلَ مَا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَزَلَ عَلَى أَجْدَادِهِ أَوْ قَالَ أَخْوَالِهِ مِنْ الْأَنْصَارِ وَأَنَّهُ صَلَّى قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا وَكَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ تَكُونَ قِبْلَتُهُ قِبَلَ الْبَيْتِ وَأَنَّهُ صَلَّى أَوَّلَ صَلَاةٍ صَلَّاهَا صَلَاةَ الْعَصْرِ وَصَلَّى مَعَهُ قَوْمٌ فَخَرَجَ رَجُلٌ مِمَّنْ صَلَّى مَعَهُ فَمَرَّ عَلَى أَهْلِ مَسْجِدٍ وَهُمْ رَاكِعُونَ فَقَالَ أَشْهَدُ بِاللَّهِ لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قِبَلَ مَكَّةَ فَدَارُوا كَمَا هُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ وَكَانَتْ الْيَهُودُ قَدْ أَعْجَبَهُمْ إِذ كَانَ يُصَلِّي قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ وَأَهْلُ الْكِتَابِ فَلَمَّا وَلَّى وَجْهَهُ قِبَلَ الْبَيْتِ أَنْكَرُوا ذَلِكَ).(الحديث ٤٠ أطرافه في: ٣٩٩,٤٤٨٦,٤٤٩٢,٧٢٥٢).[٣٨]

---

(٣٧) من افراد البخارى عن المسلم. (عين/١/ ٢٣٦)- المترجم.

(٣٨) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: تحويل القبلة من القدس إلى الكعبة،رقم:٥٢٥ = ١١٧٦، ١١٧٧.

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەکەمجار کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ مەدینە، لەلای خاڵوانی دابەزی کەئەنصار بوون، تا شازدە مانگ، یا فەرمووی تاحەڤدە مانگ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە لەنوێژدا ڕوی دەکردە بەیتوولەقدیس لەدڵیشەوە حەزی لەوەبوو کەکابەبێ بەڕووگەی ئیسلام، جاکاتێ کەخودا ئەم ئاواتەی هێنایەدیو بەیتوڵڵا بوو بەقیبلەی موسوڵمانان یەکەم نوێژ کەموسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا بەرەو کەعبە کردیان نوێژی عەصر بوو، جا پیاوێ لەم کۆمەڵەی کەلەگەڵ پێغەمبەردا نوێژیان بەرەو کابە کردبوو، هەمان ڕۆژ ڕێ ی دەکەوێتە مزگەوتی مەدینە، تەماشا دەکا نوێژکەرەکان نوێژی عەصر دەکەن، بەڵام بەوەیان نەزانیوەو وەك جاران رویان لەبەیتولەقدیسەو وان لەروکوع دا، جاپێیان دەفەرموێ: سوێند دەخۆم ئەم عەصرە بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە بەرەو کەعبە نوێژی عەصرم کرد، ئیتر ئەوانیش لەسەر شایەتییەکەی ئەو هەر لەناو نوێژەکەدا بەرەو کابە، کەوا لەمەککە، روویان وەرچەرخاندو باقی مەندەی ئەو نوێژەیان ڕوەو کابە تەواو کرد. خاوەن نامەکان - واتە: جوولەکەو گاورەکان - ئەوەیان پێ خۆش بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووەو بەیتولەقدیس نوێژی دەکرد، بەڵام کاتێ کەڕوی کردە کابە ئەوەیان پەسەند نەکرد!).

## ڕاڤەو لێکۆڵینەوە:

کابە: کەعبە: رووگە: قیبلە، ئەم پیاوەی کەئەم شایەتییەی دا عەببادی کوڕی نەهیك بوو، کاتێ کە ڕووگە گۆڕا یەکێ بوو لەوتاقمەیە کەلەگەڵ پێغەمبەردا دوو رکاتیان بەرەو قودس کردو دوو رکاتیان بەرەو مەککە کرد، ئەو مزگەوتەش کەهەواڵەکەی پێدان مزگەوتی بەنی سەلەمە بوو، کەوا لەمەدینە، ناسراوە بەمەسجیدولقیبلەتەین، واتە: مزگەوتی دوو قیبلە،

لەگێڕانـەوەی ئیبنوعومـەرو ئەنـەس دا (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەیـە کەجێگەکـە قوبـاء بـووە، نوێژەکـەیش بـەیانی بـووە، کەپیاوەکـە هـات گوتی: ڕووگـە گۆڕاوە، جا لەســەر یاسـای دوو دەق، یـادوو بەڵگـە ئەگــەر بەرامبــەر یـەکتر وەسـتان‌و بەتـەئویلیش پێکـەوە نەدەسـازان، ئـەوا بەهێزەکـەیان پەسـەند دەکـرێ‌و بـێ هێزەکـەیان ئایـەخ دەکـرێ، هەنـدێ زانـا فەرموویانـە: گێڕانــەوەی ئەنـەس‌و ئیبنوعومــەر (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) پەســەندە، چــوونکە دووکــەس گێڕاویانەتــەوە، گێڕانــەوەی بــەراء ئایــەخ دەکــرێ، بــەڵام هــەردوو گێڕانەوەکــە پەســەندن، ڕێگەچارەی یەکگرتنەوەیان‌و پێکەوە سازانیان ئاوایە: هـەر گێڕانـەوەیێ باسی ڕووداوێ دەکـا، لەگێڕانـەوەی بـەراء دا پیـاوێ لەخزمـەت پێغەمبـەردا نوێـژی عەصر دەکاو دەچێ بۆ مزگەوتی بەنی سەلەمە تەماشا دەکا نوێـژی عەصری هــــەمان ڕۆژ دەکــــەن‌و هەواڵەکــــەیان دەداتــــێ، لەگێڕانــــەوەی ئەنــــەس‌و ئیبنوعومەردا نوێژی عەصری لەگـەڵ دا دەکاو بۆسـبەینێ بـەیانی دەچێ بۆ قوباءو هەواڵەکەیان دەداتێ، بەم شێوەیە هەردوو گێڕانەوەکە کۆ دەکرێنـەوەو بەرابـەر ناوەسـتن، ئیمـامی نـەوەوی (سڵاوی خوای لێ بێ) دەفـەرموێ: (بەهـەر شێوەیێ دەگونجا کەدوو فەرمووده کۆبکرێنەوەو جیاوازی لـەنێوانیان دا نـەمێنێ ئـەوە باشــترە لــەوەی کەفــەرموودەیێ ئایــەخ بکــرێ کــەپیاوانی ڕاســت‌و دروســت لەصەحیح دا گێڕاویانەتـەوە!) لەهەنـدێ گێڕانـەوەکانی بوخاری دا جیـاوازیی لەنێوانی گێڕانەوەی بـەراءو ئیبنوعومـەردا هەیـە، کەسـێ شـارەزای مەشـرەبی بوخاری نـەبێ بەهەڵەدا دەچێ‌و گومانی ئـاڵۆزی‌و شـێواوی بەگێڕانـەوە جۆراو جۆرەکانی بوخاری شـەریف دەبا، بەڵام دەبێ بزانین کەئەم جۆرە جیـاوازی یـە لەصـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیم دا، ئەگــەر هــەبوو، مەبەسـت لێـی شـتێکی تایبەتییە، کەفەرموودەزانەکان دەرکی ئـەو مەبەسـتە دەکـەن. خوایاربێ لـەم کتێبە پیرۆزەدا بەپێ ی توانا لەم جۆرە بابەتانە دەدوێین، بەڵکوو لەبەخشش خوداوە سەردەقی ئەم کارە پیرۆزە بشکێ‌و ئەم هەنگاوە ببێ بە ڕچەشکاندنی

لەم بوارەدا، شت هەر ئەوەندەی زەحمەتە هەتا دەستی پێ دەکەی، ئیتر بەرە بەرە رەورەوەی پێشکەوتن بەرەوپێشی دەبات. شت بەپەلە نابێ، مرۆڤ لەپڕێ نابێ بەکوڕێ، زمانی کوردی هێشتا زۆری ماوە کە موفرەدات و زاراوە تازەکانی جێ ی خۆیان بگرن و بەتەواوی لەجێگەی پێویستی خۆیان دا بچەسپێن! بەڵام گومانم نییە کەزمانی ئەدەبی یەکگرتووی کورد لەسەدەی ئاییندەدا لەدایك دەبێ، ومئەم ئەدەبییاتەی ئێستە هەیە بۆی دەبێ بەسەرچاوەیەکی رۆشن و پرشنگدار. لەسەردەمی پێغەمبەردا لەناو شاری مەدینەدا نۆ مزگەوتی تر هەبوە: (ت/١ ل/٢١٠ ف/٤+٢+٣ ژمارە/٣٨٧،٣٨٨،٣٨٩).

## باسی بەجوانی موسوڵمان بوون

٣٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ يُكَفِّرُ اللَّهُ عَنْهُ كُلَّ سَيِّئَةٍ كَانَ زَلَفَهَا وَكَانَ بَعْدَ ذلِكَ الْقِصَاصُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهَا). (الحديث ٤٢ في فتح الباري).[٣٩]

ئەبوسەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (کاتێ بەندەیێ موسوڵمان بوو، لەسەر شێوەیەکی جوان، ئیتر هەرچی گوناهێ لەوەپێش لەحاڵی بێ بڕوایی دا کردوویەتی، گەورەو بچووکی خوا لێی خۆش دەبێ، جا لەوەدوا هەرکارێ بکا بەپێی خۆی تۆڵەی هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە: چاکە لەیەك بەدەوە تا یەك بەحەوت سەد بۆی دەنووسرێ، خراپەیش یەك بەیەك بۆی دەنووسرێ، مەگەر خودا چاوپۆشی لێ بکاو لەسەری نەنووسێ).

---

(٣٩) تعليق بلفظ جازم، وصلة الاسماعيلى والنسائي (عينى/ ١-٢٥٠)- المترجم.

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرمودەیە موعەللەقە، لەبوخاری دا لەهیچ شوێنێکا بەموتتەصیلی ریوایەت نەکراوە، بۆیە بەموعەللەق دادەنرێ چونکە رشتە (سەنەد)ەکەی ئاوایە: مالیك فەرموویەتی: زەیدی کوڕی ئەسلەم هەواڵی پێم دا کە عەطای کوڕی یەسار هەواڵی پێ داوە، کەئەبو سەعیدی خودری هەواڵی پێداوە کەلە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو، جا لەبەرئەوەی بوخاری بەخزمەت مالیکی کوڕی ئەنەس نەگەیشتووە فەرموودەکە بەموعەللەق دادەنرێ، بەڵام وەکوو دەبینین شێخی بوخاری (رەزای خوای لێ بێ) بەصیفەتی جەزم رێوایەتی کردوە لەبەر ئەوەی بوخاری بەخزمەت مالیکی کوڕی ئەنەس نەگەییشتووە فەرموودەکە بەموعەللەق دادەنرێ، بەڵام نەسائیو حەسەنی کوڕی سوفیانو ئیسماعیلی بەمەوصولی گێڕاوویانەتەوە. کردەوەی چاکەی سەردەمی بێ بڕوایی کوێر نابێتەوە، دەخرێتە سەر کردەوەی چاکەی کاتی موسوڵمانەتی، لەبوخاریو موسلیم دا هەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەحەکیمی کوڕی حیزام دەفەرموێ: (لەسەر بناغەیەکی چاكو باش ئیسلام بوویت). تەماشای بەرگی شەشەمی تاجولئوصول، لاپەڕە ١٨٨ بکە، فەرموودەی (١١)و (١٢) = (ت/٦ ل/١٨٨ ف/١١ + ف/١٢ = تاج/٤ ز/٩ ژ/٣٨٨٥، ٣٨٨٦) لەهەمووشوێنێکی تریش ئەوم هێمایانە بەم مەبەستەن.

## باسی باشترین ئاینداری..

٤٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ فقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ فُلَانَةُ تَذكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا قَالَ مَهْ عَلَيْكُمْ بِمَا تُطيقُونَ فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَادَامَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ).
(الحديث ٤٣- طرفه في: ١١٥١) [٤٠]

---

(٤٠) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين، باب: أمر من نعس في صلاته او استعجم رعليه القرآن، رقم: ٧٨٥ = ١٨٣٠ شيحا.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە، لەو دەمەدا ئافرەتێکم لەلا بوو، فەرمووی: ئەم ژنە کێیە؟ گوتم: ئەمە فیسارە ئافرەتە، بۆ نوێژ کردن و خواپەرستی مانەندی کەمە! فەرمووی: (وسبە! ئەوەندە خواپەرستی بکەن کەلەتواناتاندا بێ، چوونکە بەخودا هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەڕس نابێ، واتە: پاداشدانەوەی خودا بۆ ئێوە بەردەوام دەبێ تائێوە لەتاعەتکردن سارد دەبنەوە، وەباشترین ئاییندارى لەلای خودا ئەوەیە کەخاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

گفت و گۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی روون کردنەوەی بابەتەکانی ئاییندا، بالەگەڵ ئامادەبوانی کۆڕەکەیش بێ، بەڵام مەبەست لێی سەرجەمی گەلی ئیسلامە چونکە بڕیاری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ تاك یالەسەر تاك بڕیاریشە بۆ کۆمەڵ یا لەسەر کۆمەڵ، مەگەر بەلگەیەکی سەربەخۆ هەبێ، کەڕێگە لەوە بگرێ، هەروا بڕیار لەسەر پیاو، ژنیش دەگرێتەوە، کەواتە: ئەم رستەو وشەو زاراوانە هەموو موسوڵمانێ لەهەموو چەرخ و سەردەمێکادەگرنەوە، مەگەر بەلگەی تایبەتی هەبێ: بەندە، پیاو، کەسێ، لەزمانی عەرەبیی دا جیاوازی زۆرە لەنێوان دارشتە (صیغە) ی نێرو مێ دا، بەڵام لەکوردی دا ئەمە زۆر کەمە، بۆ نموونە ئەم ڕستەو دارشتەیانە لەعەرەبی دا بۆ نێرینەن: (یأیها الذین أمنوا، أحدكم، یاعبادي، صاحبه، فلان) بەرابەری ئەمانە ئەمانەن، کەبۆ مێینەن: (یا أیها اللائي آمن، إحداكن، یا إمائي، صاحبته، صاحبتها، صاحبها، فلانة) لەسەر ئەم بنیاتە: وشەی (علیكم) لەم فەرموودەیەدا گەرچی بۆ پیاوانەو، لەکاتی خۆی دا گفت و گۆکە لەگەڵ هاوڕێیان دا بووە، بەڵام ژنانیش دەگرێتەوە، چوونکە بەلگەیێ نیە کەبیبڕێ بەسەر پیاواندا، هەر وەك هەموو موسوڵمانێ چ پیاو چ ژن، لەهەموو چەرخ و

چاخێکا دەگرێتەوە، چونکە بەڵگەیێ یا نیشانەیێ نییە کە بیبڕێ بەسەر کاتێکی تایبەتدا. مەبەست لە (دین) ئایین نیە، چوونکە خاوەن ئایین ئەبێ بەردەوام بێ لەسەری هەتا مردن، بەڵام مەبەست ئایینداریی‌و خوداپەرستی کردنە، لەتەرجەمە کوردییەکەدا، وەك زۆربەی کات، مەبەستە سەرەکییەکە چەسپێندراوە، نەك واتەی پیت بەپیتی لەفظو بێژەکە، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە یاسایەك لەکاتی وەرگێڕان‌و ڕاڤەکردن‌و لێکدانەوەدا، کەدەبێ وەرگێڕو لێکۆڵەرەوە بەباشی ئاگای لێیان بێ، یەکێ لەو یاسایانە ئەم گوتەیەیە: (إن القرآن يفسر بعضه بعضاً): ئایەتەکانی قورئان لەناو خۆیان دا، دەبن بە تەفسیرو ڕاڤە بۆ یەکتری) دیارە کەفەرموودەیش هەروایە، کەسێ دەیەوێ لەتەرجەمەو شەرحی حەدیثدا بەهەڵەنەچێ دەبێ هەردوو زمانەکە بەباشی بزانێ، ئاگایەکی چاکی لەزانستە ئیسلامییەکان‌و عولومی عەرەبی هەبێ، سەرەڕای ئەمەش هەموو ڕیوایاتی جۆر بەجۆری ئەو حەدیثە کۆبکاتەوە، ئەوجا بەپێی ئەوانە تەرجەمەو شەرحەکە وادابرێژێ کەبگونجێ لەگەڵ کاکڵەی ناوەڕۆکی هەموو گێڕاوەکاندا، لەلایەنی ڕەوانبێژیشەوە وەرگێڕ بۆی هەیە ئەگەر بتوانێ ڕستەی ڕەسای ڕەوانبێژ بەکاربێنێ، زاناکان دەفەرموون (مەلەل) و وەڕسبوون لەخودا ناوەشێتەوە، کەواتە ئەم جۆرە تەعبیرە (لايمل الله حتى تملّوا) بۆ موشاکەلەو ئیزدیواجە، بۆیە بەندەیش موشاکەلەم بەکارهێنا، ئەوجا مەبەستی سەرەکی وەڕسبوونی خودام لێکدایەوە. ئەم جۆرە شیکردنەوەیە لەکوردیدا، لەم جۆرە بابەتەدا هێشتا زۆر نۆبەرەیە، لەبەرئەوە زۆر تێرو تەسەل نابێ:(ت/١/ل٦١/ف١/ز/١٠ = ز/١٠ ژ/٧٦).

## باوەڕ زیادو کەم دەکا

٤١ – عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ

قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ قَالَ أَبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِيمَانٍ مَكَانَ مِنْ خَيْرٍ). (الحديث ٤٤ ـ أطرافه في: ٤٤٧٦، ٦٥٦٥، ٧٤١٠، ٧٤٤٠، ٧٥٠٩، ٧٥١٠، ٧٥١٦)[٤١].

**لەئەنەسەوە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (ئەوەی بڵێ (لا الـه الا الله)و سەنگی دەنکەجۆیێ، یا دەنکە گەنمێ، یامێرووچەیێ، لەخێر، لەدڵیابێ، لەئاگری دۆزەخ دەردەچێو لەدۆزەخا هەمیشەیی نابێ).**

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**مەبەست لەخێر باوەڕە، سەنگی دەنکە جۆ کەمترە لەسەنگی دەنکێ گەنم، کەواتە: باوەڕ زیادو کەمی هەیە، هەروا لەفەرموودەکەوە دەردەکەوێ کەدەبێ باوەڕ بەدەمو دڵ بێ، دەنا قەبووڵ نییە، کەواتە: هەرکەسێ بەزمان بڵێ (لا اله الا الله)و بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، ئەوە موسوڵمانە، ئیتر باوەڕەکەی کزە یابەهێزە ئەوە بابەتێکی ترە، دیارە کەموسوڵمانیش زوو یادرەنگ لەدۆزەخ ڕزگاری دەبێو شاد دەبێ بەبەهەشت. بزانن مەبەست لەم جۆرە ڕستانە: (ئەوەی بڵێ: لا اله الا الله) شایەتمانهێنانە بەتەواویو باوەڕ کردنە بەئایینی پیرۆزی ئیسلام بەتەواوی، ئەمە لەچەشنی ئەوەیە کەدەڵێ: (قل هو الله أحد)م خوێند. واتە: تەواوی سورەتەکەم خوێند، دووریش نییە مەبەست ئەوەبێ لەهەموو چەرخێکا، بەشی سەرەکی باوەڕ: ئیمانو باوەڕە بەخوایەتی خوای تاكو تەنیا، جا ئەگەر خاوەنی ئەم باوەڕە لەبەر بەهانەیەکی ڕەوا، وەك دووری لەئاوەدانیو دووری لەکۆڕی زاناو کۆمەڵگای موسوڵمانان، ئاگای لەئایینی ڕاستو دروستی سەردەمی خۆی نەبوو، ئەوە بەهانەدارەو بەر**

---

(٤١) أخرجه مسلم في الايمان، باب: أدنى أهل الجنة منزلة فيها رقم: ١٩٣ = ٤٦٨، ٤٧٧.

ظاهیری ئـەم فەرموودەیـە دەكـەوێو سـەرەنجامی لەدەسـتەی ڕزگارییـە، واتـە: لەئەهلی نـەجاتە: (ت/١ ل/٣٢ ز/٤ ف/٧ = ژ/٢٩).

٤٢- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا مِنْ الْيَهُودِ قَالَ لَهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لَاتَّخَذنَا ذلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا قَالَ أَيُّ آيَةٍ هي؟ قَالَ: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي، وَرَضِيتُ لَكُمْ الْإِسْلَامَ دِينًا}، فقَالَ عُمَرُ: قَدْ عَرَفْنَا ذلِكَ الْيَوْمَ وَالْمَكَانَ الّذي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ يَوْمَ جُمُعَةٍ). (الحديث ٤٥ - أطرافه في: ٤٤٠٧، ٤٦٠٦، ٧٢٦٨).[٤٢]

پیاوێكی جوولەكە بەعومەری گوت: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئایـەتێ لەقورئانەكەتاندا هەیە دەوری دەكەنەوە، ئەگەر ئەو ئایەتە بۆ ئێمـە بهاتبایـە كەكۆمـەڵی جوولەكـەین، ڕۆژی هـاتنی ئـەو ئایەتـەمان هـەموو ساڵێ دەكـرد بەجەژن. عومـە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: كام ئایەتە؟ گوتی: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي، وَرَضِيتُ لَكُمْ الْإِسْلَامَ دِينًا} عومەریش فەرمووی: ئێمەیش زۆر بەباشی دەزانـین كەئـەو ڕۆژەو ئـەو شـوێنەو ئـەو حاڵەی كەئـەم ئایەتەی تیا هاتەخوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەی بـوو، وەچۆن بـوو، ڕۆژ ڕۆژی هـەینی بـوو، كـات كـاتی جـەژنی قوربـان بـوو، شـوێن سـەر كێـوی عەرەفـە بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەوێ ڕاوەسـتابوو خـەریكی كردنـی حەجی ماڵئاوایی بوو). (تاج-١ ل-٣٣ ف-٨ ژ-٣٠ چ-٤).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

واتە ئێمەیش ئەو ڕۆژەمان كردوە بەجەژن لەدوولاوە، چوونكە هـەم ڕۆژی عەرەفەو هەم ڕۆژی هەینی جەژنی گەلی ئیسلامن، ئـەم فەرموودەیـە ئـەوەی لێ وەردەگـیرێ كـە: هـەر ڕۆژێ، یاهەرشـوێنێ، ڕووداوێكـی گرنگـی وای تێـدا

---

(٤٢) أخرجه مسلم في اوائل كتاب التفسير، رقم: ٣٠١٧ = ژمارە/٧٤٤٠.

رووبدا کەببێ بەهۆی بەهرەی گەورە بۆ گەلی ئیسلامو بەمایەی شانازیی‌و سەربەرزیی موسوڵمانان دروستە بکرێ بەجەژن‌و هەموو ساڵێ یادی بکرێتەوە. پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەسەر باسەکەوە لەوشەی (أكملت لكم دينكم)دا دەردەکەوێ، چوونکە ئەوە دەگەیەنێ کەئیسلامی تەواوی بێ کەم‌و کوڕی لەوکاتەدا هاتۆتەدی، ئەویش ئەوە دەچەسپێنێ کەباوەڕ کەم‌وزیاد دەکا.

## باسی: زەکات لە ئیسلامە

٤٣–عَنْ طلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثائِرَ الرَّأْسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلَا يُفْقَهُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا فَإِذا هُوَ يَسْأَلُ عَنْ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لَا إِلَّا أَنْ تَطوَّعَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصِيَامُ رَمَضانَ قَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطوَّعَ قَالَ وَذكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الزَّكَاةَ قَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطوَّعَ قَالَ فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ وَاللَّهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذا وَلَا أَنْقُصُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ). (الحديث ٤٦ ـ أطرافه في : ١٨٩١، ٢٦٧٨، ٦٩٥٦).[٤٣]

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی قژ ئاڵۆسکاوی خەڵکی نەجد دەهات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوورەوە گرمەی دەنگی دەهات بەڵام نەمان دەزانی دەڵێ چی، جا کەهاتە پێشەوە بۆمان دەرکەوت کەلەبارەی ئیسلامەوە پرسیاری هەیە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێ ی فەرموو: (لەشەوو رۆژێك دا دەبی پێنج نوێژ بکەی، پیاوەکە گوتی: باشە نوێژی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەء، نوێژی ترت لەسەر نییە،

(٤٣) اخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان الصلوات التى هي أحد أركان الاسلام، رقم: ١١=١٠٠.

مەگەر بەئارەزووی خۆت نوێژی سوونندەت بکەی، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژووی رەمەزانیش دەبێ بگری، پیاوەکە گوتی: باشە رۆژوی ترم لەسەرەیانا؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بەئارەزووی خۆت رۆژووی تر بگری، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی زەکاتیشی بۆ کرد، پیاوەکەیش گوتی: باشە لەمە زیاتر زەکاتی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بەئارەزووی خۆت خێری تر بکەی، لەپاشا پیاوەکە رۆیشت و گوتی: بەخودا نەلەمە زیاتر دەکەم و نەلەمە کەمتر دەکەم. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر راست بکا رزگاری دەبێ!).

## راڤەو شیکردنەوە:

طەلحە یەکێکە لە دە مژدە پێدراوەکان، ئەویش وەکوو ئەبوبەکری صەدیق لەباپیرەی حەوتەما، کەموررەیە، سەرجەلەی دەگاتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایکی لە موسوڵمانە کۆچکارەکانە، لەهەموو نەبەردەکانی پێغەمبەردا ئامادە بووە، لەغەزای بەدردا نەبێ، هەتا لەم غەزایەیش دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشە پشکی خۆیی بۆ داناوە، یەکێکە لەو هەشت کەسە کەزۆر زوو ئیسلام بوون، یەکێکیشە لەو پێنج کەسەی لەسەر دەستی ئەبوبەکری صەدیق دا ئیسلام بوون، یەکێکە لەو شەش کەسەیش کە عومەر هەڵی بژاردبوون کەلەسەر راوێژی موسوڵمانان لەپاش مەرگی خۆی یەکێکیان بکرێ بەفەرمانڕەوای موسوڵمانان، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا مرد لێیان رازیی بوو، لەرۆژی ئوحوددا پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەکرد، شمشێرێکیان داهێنایەوە بۆ روخساری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی نابوو ، طەلحەی خێرو طەلحەی زۆر بەخشندە، سی و هەشت فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دوویان پەسەندی هەردوولایە لەبوخاری دا دوو فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا سێ. لەرۆژی رووداوی ئەلجەمەل دا بەتیری وێڵ کوژرا، لەدەی جومادی یەکەمی

سالی سیی‌و شەشی کۆچی، لەتەمەنی شەستو چوار سالی دا، گۆڕی لەبەصرەیە، کچێکی لە پاش سیی سالْ خەوی پێوە بینی، سکالای لەدەست شێداریی گۆڕەکەی دەکرد، جا لەسەر فەرمانی کچەکەی تەرمەکەیان دەرهێنا، کەچی هێشتا جەستەی هەر تەڕو نەرمو شل بوو، ئەوسا لەدارولهیجرەتەین لەبەصرە نێژدرایەوە، گۆڕەکەی شۆرەتدارە (ڕەزای خوای لێ بێ)، حاجی مەلا شەریفی سەعاتچی هەبوو، پیاوێکی باش بوو، مەنسووبی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ بوو، حاجی کاك ئەحمەد دەچێتە خەوی دەفەرموێ: حاجی مەلاشەریف! لەژێرابی مالە مەسیحییەکەی تەنیشتمەوە خەریکە ئاو ئەدزێتە ناو گۆڕەکەمەوە، فریام کەون! ئەویش دەچێ بۆ داریکەلی بۆلای شێخ مەحموودی حەفید، شێخ موافەقە دەکا، حاجی مەلاشەریف گۆڕەکەی هەلدایەوە، من بەچاوی خۆم دیم کەلەلای سەریەوە خەریك بوو ئاوەزێکە بگاتە گۆڕیچەکەی، دیم بەجام ئاوو لیتەکەیان دەردەدا، لەپاشا بەچیمەنتۆ دایانڕشتو ئاوەڕۆگەکەشیان گواستەوەو لەگۆڕەکە دووریان خستەوە، جارێ ئەمەم گێڕایەوە، حاجی مەلا عەبدوللای سێتەلانی فەرمووی: منیش بەدیار ئەم ڕووداوەوە بووم! (وەرگێڕ) (تاج-١ ل-١٨١ ف-٢ = ژ-٣٢٣ ز-٤٣)+(تاج-٥ ل-٨٤).

## باسی: شوێن کەوتنی تەرم لەباوەڕە

٤٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا وَيَفْرُغَ مِنْ دَفْنِهَا فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الْأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ). (ت-١ ل-٥٥٧ ف-١ ز-٢١٠ ذ-١٠٩٧ ض-٤). (الحديث ٤٧ ـ طرفاه في: ١٣٢٣، ١٣٢٥).[٤٤]

---

(٤٤) أخرجه النسائي في الايمان (عيني ـ ١ ـ ٢٧١) رقم: ١ المترجم.

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: هەرکەسێ لەبـەرخاتری خـوا شـوێن تـەرمی موسـوڵمانێ بکـەوێو لەگەڵی دا بێ هەتا نوێژی لەسەر دەکاو لەناشتنی دەبێتـەوە، لەهـەمان کات دا باوەڕی بەوە هەبێ کەئەوە تاعەتێکی باشەو مایەی پاداشی چاکە، ئەوە بـەدوو قیراط پاداشەوە دەگەڕێتەوە، هەر قیراتەیان بەقەد کێوی ئوحـود دەبـێ، بـەڵام ئـەو کەسـەی کەنوێـژی لەسـەربکاو پـێش ئـەوەی بنێـژرێ بگەڕێتـەوە ئـەوە بەیەك قیراط پاداشەوە دەگەڕێتەوە.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

قـیراط بـەپێ ی وڵات دەگـۆڕێ، لـەلای خـەڵکی مەککـە دەکاتـە ٢٤/١ ی دینـارێکی زێـڕ، لـەلای خـەڵکی عێـراق دەکاتـە ٢٠/١ ی دینـارێ، هـەروا لـەلای شەرعزانەکان، هەروا لەحەدیثیشا بەپێی شوێن دەگۆڕێ، تەماشای ئـەم شـوێنە بکە (ج/١ ص٢٧٢ عمدة القاريء ط/ ١ بيروت).

٤٥- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ. قَالَ: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُـسُوقٌ وَقِتَالُـهُ كُفْـرٌ). (الحـديث ٤٨ ـ طرفـاه في: ٦٠٤٤، ٧٠٧٦).[٤٥]

لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لـێ بـێ) حـەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شەڕە جنێو کـردن لەگـەڵ موسـوڵمان دا فوسـوقو لەڕێگـەی هەق دەرچوونەو، شەڕتێبەستنیشی کوفرە!).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەم فەرموودەیـە: هەڕەشـە کردنـە لەکەسێ کەبـەناڕەوا بەدەسـت یابـەزبان ئـازاری موسـوڵمان بـدا، چـونکە شـتی وا لەموسـوڵمان ناوەشـێتەوە،

---

(٤٥) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان قول النبيُ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ): بـاب المسلم، رقم: ٦٤ = ٢١٨ شيحا.

بەڵکوو پیشەی پیاوی خراپی لەڕێ دەرچووە، ڕەفتای مرۆی بێ بڕوایە. (ریاض-٤ ل-١١٥٩ ف-١ ز-٢٢٦ ژ-١٥٥٩).

٤٦-عَنْ عُبَادَةُ بْن الصَّامِت (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يُخبِرُ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنْ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ إِنِّي خَرَجْتُ لِأُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ وَإِنَّهُ تَلَاحَى فُلَانٌ وَفُلَانٌ فَرُفِعَتْ وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا لَكُمْ الْتَمِسُوهَا فِي السَّبْعِ وَالتِّسْعِ وَالْخَمْسِ).(الحديث٤٩ طرفاه في: ٢٠٢٣,٦٠٤٩).

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ هاتە دەرەوە، تاهەواڵی لەیلەتولقەدر رابگەیەنێ، لەوکاتەدا دوو پیاو لەموسوڵمانان بوو بەدەمەقاڵەیان، جا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): من بۆئەوە لەماڵەوە هاتم بۆ ئێرە تاهەواڵی شەوی لەیلەتولقەدرتان پێ رابگەیەنم کەکام شەوەیە لەمانگ، بەڵام فیسارو فیساربوو بەدەمەقاڵەیان، ئیتر لەبیرم نەما بەهۆی ئەو دەمەقاڵەوە، سابەشکوو ئەم لەبیرنەمانە خێری پێوەبێ بۆ ئێوە، جاهەرچۆن بێ ئێوە لەشەوی بیستو حەوت، یابیستو نۆ، یابیستو پێنجی ڕەمەزان دا بۆشەوی لەیلەتولقەدر بگەڕێن!.

**سەرنجێ:**

دەمەقاڵێو قسەی بێ هوودە گەلێ جار دەبن بەهۆی ڕێگرتن لە خێر، بەتایبەتی لەشوێنی پیرۆزی وەك مزگەوتدا، یا لەخزمەت پیاوی زاناو پێشەوادا، کەواتە هەق وایە موسوڵمان خۆی لەشتی وا بپارێزێ. بەپێی ئەم فەرموودەیە بەهۆی هەڵەی ئەم دووکەسەوە بەهرەیەکی گەورە لەکیس هەموو مووسوڵمانان چووە، دەی دەبێ بەهۆی ئەم هەمکە شەڕە جنێوو شەڕە دەمێو قسە سووكو درۆ شاخ دارانەوە، کەخۆیان لەکاتی شەڕی براکوژیدا، پێی دەفەرموون: (شاڵاوی بەرواڵای ڕاگەیاندن) کەدەق لەشەڕە جنێوی سەر

كانى ژنانى لادێ دووره دەستەكان دەكا، چەندە خێرو بير لەكيس ئەم نەتەوە ستەمديدەيە چووبێ؟! مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ.

## باسی هاتنی جوبرائيل بۆلای پێغەمبەر بۆ روونكردنەوەی ئيمان‌و ئيسلام‌و ئيحسان

٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَبِلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْث قَالَ مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ. قَالَ مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ وَسَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا وَإِذا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الْإِبِلِ الْبُهْمُ فِي الْبُنْيَانِ فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ ثُمَّ تَلَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ الْآيَةَ ثُمَّ أَدْبَرَ فَقَالَ رُدُّوهُ فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا فَقَالَ هَذا جِبْرِيلُ جَاءَ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُمْ).(الحديث ٥٠ طرفه في:٤٧٧٧)[٤٦].

ئەبوهورەيرە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: رۆژێ پێغەمبەری خوا (درودی خودای لەسەر بێ) تەشريفی هات لەشوێنێكی بەرچاودا لەناومانا دانيشت لەو كاتەدا پياوێ هات بۆ خزمەتی گوتی: ئەی موحەممەد! ئيمان‌و باوەڕم بۆ روون بكەرەوە. فەرمووی: ئەوەتا كەباوەڕ بكەی بەخوداو بەفريشتەكانی‌و بەگەيشتن بەديداری لەقيامەتداو بە پێغەمبەرەكانی‌و بەرۆژی زيندوبوونەوە. پياوەكە گوتی: ئەی ئيسلامەتی چييە؟ فەرمووی: ئيسلامەتی ئەوەتانێ كەخودا بپەرستيت‌و هاوبەشی بۆ بڕيار نەدەيت‌و نوێژ بەدروستی بكەيت‌و زەكاتی فەرز بدەيت‌و

---

(٤٦) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان الايمان والاسلام والاحسان، رقم: (٩) و (١٠)=٩٧ شيحا. وأخرجه عن عمر (رَضي اللهُ عَنهُ) في لباب نفسة، رقم:٨=٩٣.

ڕۆژووی ڕەمەزان بگری‌و (حەجی ماڵی خودا بکەی). گوتی: ئەی چاکە چییە؟ فەرمووی: چاکە ئەوەیە کەبەچەشنێ خودا بپەرستیت کەوەك: چاوت لەخودابێ وابێ، خۆ ئەگەر تۆیش ئەو نەبینیت. بێ گومان کەئەو تۆ دەبینێ، ئینجا گوتی: قیامەت کەیە؟ فەرمووی: منیش لەتۆی باشتر لێ نازانم، بەڵام وانیشانەکانیت پێ دەڵێم: ئەوەتە کەمناڵ بەچاوی کارەکەرو نۆکەر تەماشای دایك‌و باوکی خۆیان بکەن، وەئەوەتە بەچاوی خۆت ببینی: کەشوانە وشتری ڕەشکەڵەو پێخاوس‌و ڕەش‌و رووت‌و ڕەجاڵ‌و شوان‌و گاوان‌و بیابان نشینەکان ببن بەخاوەن موڵك‌و سامان‌و خان‌و بەرەو کۆشك‌و تەلاری لێ ڕابکێشن‌و فیزو دەعیەی پێوەبکەن. زانینی کاتی قیامەت یەکێکە لەو پێنج شتانە کەخوا نەبێ کەس نایان زانێ، کەبریتین لەم پێنج شتانە کەخوا نەبێ کەس نایانزانێ، کەبریتین لەم پێنج شتە کەوان لەم ئایەتەدا کەدەفەرموێ: (إن الله عنده علم الساعة وينزل الغيث ويعلم مافي الارحام وماتدري نفس مادا تكسب غداً وماتدري نفس بأى أرض تموت إن الله عليم خبير) (لوقمان/٣١-٣٤) مەبەست لەئایەتەکە زانینی ئەم پێنج شتە لەعیلمی غەیبە، لەو زانستە نهێنی یەیە کەهەر خوا خۆی دەیزانێ‌و بەس: قیامەت کەی دەبێ، باران کەی دەبارێ، چی والەناو منداڵدانەکانا، کەس نازانێ سبەینێ چی دەکا، کەس نازانێ کەلەکوێ دەمرێ).

جا لەپاشدا کاتێ پیاوەکە ڕۆیشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی بیگێڕنەوە بۆلام، ئەوانیش کەچووون بیهێننەوە بۆلای کەسیان نەدی، پیاوەکە غەیب بوو بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی لەکارەکە حاڵییان بکا، فەرمووی: (ئەوە جوبرائیل بوو هاتبوو کەخەڵکەکە فێری یاسا سەرەکییەکانی ئاینی ئیسلام بکا). (ت-١ ل-١٨ ف-٢ = تاج-٢ ل-١٢ ز-١ ژ-٢ چ-٤).

**شیکردنەوە:**

لەم فەرموودەیەدا پێناسەی باوەڕو ئیسلام‌و چاکەی تێدایە، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کەپێناسە سوننەتە، هەروا لەفەرموودەکەدا دەردەکەوێ

کەجوبرائیل‌و پێغەمبەر (درودی خودایان لەسەر بێ) جۆرە نواندنێکی شانۆ گەریی یان نیشان داوەو ڕۆڵێکی گرنگیان داناوە بۆ هونەری نواندن‌و بۆ هۆکاری روون کردنەوە. کەواتە: ئەم جۆرە هونەرانە لەزاتی خۆیاندا، کارێکی رەواو بەجێن، بەمەرجێ بۆ کاری نابەجێ بەکار نەهێنرێن!

## باسی: کەسێ ئایینی خۆی لەنەنگ بپارێزێ

٤٨- عَنْ نُعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الْحَلَالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ فَمَنْ اتَّقَى الشبهات فقد اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلَا وإِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ). (الحديث ٥٢ ـ طرفه: ٢٠٥١).[٤٧]

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شتی حەلاڵ دیارو ئاشکرایە، هەروەها شتی حەرامیش دیارو ئاشکرایە، بەڵام لەم بەینەدا هەندێ شت هەن دوو بەینین‌و لەهەردوولا دەچن، لەبەرئەوە گەلێ کەس سەریان لێ دەرناکەن‌و حوکمەکەیان لەشەرعا نازانن، بەڵام زانایانی ئایین لەپاش پەیجۆری‌و لێکۆڵینەوەیەکی باش حوکمەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کەحەلاڵن یاحەرامن، ئەوسا بۆ خەڵکی تریش هەیە لەسەر بڕیاری ئەوان شتەکە بکەن، یانەیکەن، جا ئەوەی کەخۆی بپارێزێ لەشتی شوبهەدارو گومان لێکراو، ئەوە ناموس‌و ئایینی خۆی لەنەنگ‌ولکە دەپارێزێ).

بەڵام ئەوەی کەتوخنی شوبهەدارو گومان لێکراو دەکەوێ، خوا نانخوا تووشی دەبێ بەتووشی شتی حەرامیشەوە، وەك چۆن شوان ئەگەر ران

(٤٧) اخرجه مسلم في المساقاة، باب: أخذ الحلال وترك الشبهات، رقم: ١٥٩٩=٤٠٧٣.

لەدەوروبەری پاکژو پاوەند بلەوەڕێنێ بەرە بەرە ڕانەکە لەپاوەندەکەیش دەلەوەڕێ. باش ئاگاداربن! کەهەموو پادشایێ بەستو پاوەندێکی تایبەتی خۆی هەیە، بزانن کەبەستو پاوەندی خودایش لەم گۆی زەوییەدا، ئەو شتانەیە کەحەرامی کردوون!

باش ئاگادار بن! کەگولمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا، ئەگەر ئەو گولمە گۆشتە سازو باش بوو ئەوا جەستەیش هەمووی سازو باش دەبێ، بەلام ئەگەر ئەو گولمەیە خراپ بوو ئەوا جەستەیش هەمووی خراپ دەبێ، بزانن کەئەو گولمەیە برێتی یە لە دڵ، کەواتە: دڵی پاكو لەشی چاك، دڵی پیسو لەشی چەپەڵو پیس).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیەیش (لەسەر فەرمایشتی زاناکان) یەکێکە لەو فەرموودانە کەبوون بەسووڕگەو مەدار بۆ ئیسلام. باشترین نموونە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدابۆ شتی گومان لێکراو ئەو خواردەمەنیو خواردنەوەو داوو دەرمانو شتە تازە بابەتانەیە کەلەدەرەوەی ولاتەوە دەهێنرێن، وەك: مریشکی سەربڕاوو گۆشتی پاکەت. ئەمانەو وێنەی ئەمانە جێگەی گومانن. دەبێ مەردوم لەم جۆرەشتانەدا رای زاناکان وەربگرن، وەبەپێی فەرمایشتی ئەوان لەم بارەیەوە رەفتار بکەن، چونکە موسوڵمان ئەو موسوڵمانەیە کە لەهەڵەو تاوانو گوناه دا چاو لەڕەشە خەڵك نەکا، بەڵکوو چاوی لەدەمی مامۆستای مەلا بێ، ئەو چی فەرموو ئەوە تەواوە، دەنا بەڕاستی گەلێ خەڵکی خوانەناس پەیدا بوون گەلێ لەدەهریو زەندەقە کۆنەکان خراپتر، ئەوانەی کۆن هەر هیچ نەبێ شەرمو شکۆیان لەموحاسەبەی ویژدانو مێژوو رەخنەی کۆمەڵ دەکرد، بەلام ئەمڕۆ کەسانێ پەیدا بوون، پەروەردەی ژێردەستی عەلمانییەتن بەئارەق گۆش کراون، گەل بەگەلە دەزانن، میللەت وەك دەواجینی خۆیان تەماشا دەکەن، هەر بیر لەقازانجی خۆیان دەکەنەوە، نەبەتەنگی ئایینی خەڵکەوە دێن، نەدەربایستی

تەندروستیو بەرژەوەندی کۆمەڵ دێن، بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەست لەگەڵ شەیتان تێکەڵ دەکەن، بازرگانی بەئاگرو بارووتو تی ئێن تیو میکرۆبی سیلو دیقو سەرەتانەوە دەکەن!

ئەم فەرموودەیە موسلیمو ئەبوداوودو تیرمیذیو نەشائیش گێڕاویانەتەوە، ئەوان لە (البیوع) دا گێڕاویانەتەوە. نوعمانی کوڕی بەشیر خۆیو باوکیو دایکی صەحابی بوون. ئەنصاری یە، لەهۆزی خەزرەجە، دایکی ناوی عەمرەیە، خوشکی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەیە، یەکەم منداڵی ئەنصارە کەلەپاش کۆچ لەدایك بووە، سەدو چواردە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەدەستەی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر بوو، سەرکاری ئیبنوزوبەیر بوو لەسەر شاری حیمص، لەو ماوەیەدا کەخەڵکی حیمص هەڵگەڕانەوە هەڵهات، بەڵام لەڕۆژەکەی واسیط دا کوژرا، لەساڵی شەستو پێنجی کۆچی دا، تەمەنی دەوری شەستو سێ ساڵ بوو.

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لەبوخاری شەریف دا، لەم شوێنەدا ئاوایە: (حدثنا أبو نعيم حدثنا زكريا عن عامر قال سمعت النعمان بن بشير يقول سمعت رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول..) هەتا کۆتایی فەرموودەکە. حەزدەکەم هەندێ لەناسککاری ئەم ڕشتەیە قسە بکەین، چونکە زوو یادرەنگ ڕەورەوەی هونەری وەرگەڕان، لەکوردیش دا، بەرەو هەموو مەوداو مەیدانو کونو قوژبنێکی زانستیو هونەریو ئایینیو کۆمەڵایەتی ملی ڕێگە دەگریو بزافی وەرگەڕان هەموو بابەتەکان دەگرێتەوە. گەرچی لەم قۆناغەدا، لەبەر بێ هێزیو لاوازیی نووسەرەکانمان، وەرگێڕەکانمان خەریکی وەرگێڕانی شتی کەم بایەخن، بەڵام ئەم قۆناخە خوایاربێ، زۆر ناخایەنێ، ئەم ڕشتەیە لەڕشتە چوارکەسییەکانی بوخاری یە، وەئەم جۆرە ڕشتەیە زۆر دانسقەو نایابو بڵندە. لەم ڕشتەیەدا تەحدیثو عەنعەنەو سەماعی تێدایە، تەحدیث ئەوەیە راوی بڵێ: حدثنا، یاحدثنی. عەنعەنە ئەوەیە بڵێ: فلان عن فلان، سەماع ئەوەیە لەباتی ئەم جۆرە تەعبیرانە بڵێ: سمعت، لەم فەرموودەیەدا ئەوەی

تیادایە کەنوعمان شتی لە پێغەمبەر خۆی بەمندالّی بیستووەو، کاتێ گەورەبووە رایگەیاندووەو گێڕاویەتیەوە، شتی وادروستە، کورد گوتەنی خۆمان: بیری مندالّی تیژە. بەندە خۆم لەیادمە زۆر بەباشی جارێ باوکم لەبرایماواوە بردمی بۆخزمەت شێخ مەحموودی حەفید لەداریکەلی، باوکم عەرزی کرد کەنووشتەم بۆ بکا، شێخ بەم بۆنەیەوە بەدەق بەباوکمی فەرموو: ئێمە لەگەلّ جنۆکەکانا خزمین چۆن دەبێ بیانسووتێنم، بەلاّم نووشتەیەکی بۆ نووسیم: (ت-٢ ل-٢٩٦ ف-١ ز١٤٥ تاج-٢ ژ-١٧٥٦ ز-١٤٥).

## دانی پێنج یەك لەباوەڕە

٤٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ:(إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ لَمَّا أَتَوْا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ الْقَوْمُ أَوْ مَنْ الْوَفْدُ قَالُوا رَبِيعَةُ قَالَ مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ أَوْ بِالْوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيكَ إِلَّا فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرْ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا وَنَدْخُلْ بِهِ الْجَنَّةَ وَسَأَلُوهُ عَنْ الْأَشْرِبَةِ فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ أَمَرَهُمْ بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ وَحْدَهُ قَالَ أَتَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ وَإِقَامُ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ وَصِيَامُ رَمَضَانَ وَأَنْ تُعْطُوا مِنْ الْمَغْنَمِ الْخُمُسَ وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ عَنْ الْحَنْتَمِ وَالدُّبَّاءِ وَالنَّقِيرِ وَالْمُزَفَّتِ وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ وَقَالَ احْفَظُوهُنَّ وَأَخْبِرُوا بِهِنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ). (ت-٤ ل-٨٥ ف-٣+٤ ز-٢٥ = تاج-٣ ل-٢٣٢ ز-٢٥ ذ-٢٧٣٨، ٢٧٣٩) (الحديث ٥٣ - أطرافه في: ٨٧، ٥٢٣، ١٣٩٨، ٣٠٩٥، ٣٥١٠، ٤٣٦٨، ٤٣٦٩، ٦١٧٦، ٧٢٦٦، ٧٥٥٦).[٤٨]

---

(٤٨) أخرجه مسلم في الايمان، باب: الامر بالايمان بالله تعالى ورسوله (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) وشرائع الدين، رقم: ١٧ = ١١٥-١١٨.

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموووی: کەنوێنەرەکانی هۆزی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموووی: ئەم خزمانە کێن؟ یا فەرموووی: ئەم نوێنەرانە کێن؟ گوتیان: لەخێڵی عەبدولقەیسن کەدەچێتەوە سەرهۆزی ڕەبیعە، فەرموووی: ئەم خزمانە بەخێربێن، ئێوە لەئیسلام بوون دوانەکەوتوون، هەتا بەهۆی ئەوەوە تەریقیتان بەسەربێ، وەکارێکی واتان لەدژی ئیسلام نەکردووە کەپەشیمانی لەدوابێ، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەرئەوەی ئێمە کەدێین بۆ خزمەتی تۆ، بەسەر ئەم هۆزەدا دێین، کەلەکافرەکانی هۆزی موضەرن، ناتوانین بێ ین بۆ خزمەتت، مەگەر لەمانگە حەرامەکانا، تەنیا لەو مانگانەدا کەشەڕو شۆڕیان تیادا قەدەغەیە دەتوانین بێین بۆ خزمەتت، دەی بفەرموو ئامۆژگارییەکی ڕوونو ئاشکرامان پێ بفەرموو کەگەڕاینەوە بۆ وڵاتی خۆمان بەمەردومەکەی ڕابگەیەنینو هەموو پابەندی بینو ڕەفتی پێ بکەین، هەتا بەهۆی جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانەی تۆوە بچینە بەهەشت. وەلەبارەی ئەو دەفرانەوە کەخواردنەوەیان تێ دەکرێ پرسیاریان لێ کرد، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردن بە چوارو نەیی لێ کردن لە چوار: یەکەم فەرمانی پێ کردن بەباوەڕهێنان بەخودای تاقو تەنیا. فەرموووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئایا دەزانن بڕوا هێنان بەخودای تاکو تەنها چییەو چۆنە؟) گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا باشی دەزانن. فەرموووی (درودی خودای لەسەر بێ): (بریتییە لەشایەتمان لەسەر ئەم شێوەیە: أشهد أن لاإلـه الا الله وحـده لاشـريك لـه وأشـهد أن محمـداً رسـول الله: بەزمان شایەتی دەدەمو بەدڵ باوەڕ دەکەم کەبێجگە لەیەزدانی پاك هیچ خودایەکی تر نییە، خوایەکی تاكو تەنهایە، بێ هاوەڵە، هیچ هاوبەشی نییە، بەهەمان شێوە شایەتی دەدەمو باوەڕم هەیە کەموحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا فروستادەو پێغەمبەری خوایە. دووەم: فەرمانی پێ کردن بەڕاگرتنی نوێژو کردنی بەڕێكو پێکی، سێیەم: فەرمانی پێ کردن بەدانی زەکات، چوارەم: فەرمانی پێ کردن بەگرتنی ڕۆژووی مانگی

رەمـەزان. وەفەرمانیـشی پێیـان کـرد کەلەدەسـت کـەوتی تـالآنی جـەنگیش پێـنج یەك بدەن، وەنەییشی لێ کردن لـەم چـوار شـتە کەبـەکاریان نـەهێنن بـۆ دروسـت کردنـی خۆشـاوو سـرکەو دۆشـاو، چـونکە شـتی ناویـان زۆر زوو دەترشـێو تونـد دەبێو دەبێ بـەئارەق: کووپەڵەو کوولەکەو بەستووی زفـت دراوو کۆتکەی بنکـی دارخورمـا. فەرمووشـی (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) (ئـەم فەرمایـشتانەیش کەلـەم ماوەیـەدا لەمنتان بیستووە باش لەبەر بکەنو رایان بگەیەنن بەخەڵکی وڵاتی خۆیشتان).

## راڤەو شیکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا مامۆستا (شێخ)ە کەی بوخاری ناوی عەلی کوڕی جەعدە (رەزای خوای لێ بێ) عەلی خۆی فەقێ ی ئیمامی ئەوریو ئیمامی مالیكو گەلێ زانای تری وێنەی ئەمان بووە، پیاوی وەك ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی بوخاریو ئیمامی ئەبوداودو کەسانی تری وێنەی ئەم زاتانە قوتابی ئەو بوونو فەرموودەیان لێ وەرگرتوو. مووسای کوڕی داوود دەفەرموێ: کەسم نەدیوە کە وەك ئەو زەینی رۆشن بێو فەرموودەی بەباشی لەبەربێ، ئیمامی ئەحمەد هانی خەڵکی دەدا: کە فەرموودەکانی بنووسنەوە لەموسنەدو کتێبەکانی حەدیث دا. یەحیای کوڕی معین دەفەرموێ: (زانستەکەی رەببانی بوو، پیاوێکی راستگۆو باوەڕپێکراو بوو) ئیبنوئەثیر لە نیهایەدا دەفەرموێ: رەببانی زانای گەورەی دامەزراوە لەزانستو ئایین دا. نزیکەی نەوەدوچوار ساڵ ژیاوە، لە (١٣٠) کۆچی دا لەدایك بووە، لە (٢٣٠) دا مردووە، لەگۆڕستانی بابوحەرب لەبەغدا نێژدراوە. حەفتا ساڵ رۆژنارۆژێ بەڕۆژوو بووە!

٥٠- عن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) حديث إنما الأعمال بالنيات وقد تقدم في أول الكتاب وزاد هنا بعد قوله وإنما لكل امريءٍ مانوى: (فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله فهجرته إلى اللهِ ورسوله) وسرد باقي الحديث:

تەماشای فەرموودەی ژمارە یەکی زنجیرە یەکی ئەم بەرگە بکە. لێرەدا: زیادەیێ هەیە من لەپێشەوە ئەم گێڕانەوەی ئێرەم لەوێ نووسی.

## باسی: کردەوە هەیە بەهۆی نیازەوە دەبێ بەصەدەقە

٥١- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ). (الحديث ٥٥ ـ طرفاه في: ٤٠٠٦، ٥٣٥١).[٤٩]

ئەبومەسعو (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەبەر ڕەزای خوا مەسرەفی ماڵو منالی خۆی بکا، هەرچییان بۆ خەرج بکا کەمو زۆری بەخێرو خێرات دادەنرێ بۆی!).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەبومەسعوود ناوی عوقبەی کوڕی عامیرە، ئەنصاری یە، خەزرەجی یە، بەدری یە، لەگەڵ حەفتا کەسەکەدا ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە، لەهەموویان بەتەمەن بچووکتر بووە، ئامادەی جەنگی ئوحودیش بووە، سەدو دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا دە فەرموودەی هەیە، لەموسلیم دا شازدەی هەیە، نۆیان پەسندی هەردوولان، لەکووفە نیشتەجێ بوو هەر لەوێش مردووە.

٥٢-عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ البجلي (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ). (الحديث ٥٧ ـ أطرافه في: ٥٨، ٥٢٤، ١٤٠١، ٢١٥٧، ٢٧١٤، ٢٧١٥، ٧٢٠٤)[٥٠]

---

(٤٩) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل النفقة والصدقة على الأقربين، رقم: ١٠٠٢=٢٣١٩.

(٥٠) أخرجه مسلم في الايمان، انظر (عمدة القارئ/ العينى/ج/١/٣٢٤/رقم/٢ـ المترجم)=١٩٩.

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای ئەل‌بەجەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵێن‌و پەیمانم دا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەوە کەنوێژ بەڕێکو پێکی بکەم‌و، زەکات بدەم‌و، ئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێکیش بکەم).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

جەریر سەد فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا نۆی هەیە، لەموسلیما چواردەی هەیە، هەشتیان پەسندی هەردوولایانن.

٥٣- وعَنهُ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (إنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْإِسْلَامِ فَشَرَطَ عَلَيَّ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ فَبَايَعْتُهُ عَلَى هَذا (الحديث٥٨).

دیسان لەوەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: قوربان! دەمەوێ پەیمانت بدەمێ لەسەر ئیسلامەتی، ئەویش ئەم مەرجەیشی بۆ دانام: کەئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێکیش بکەم. جا منیش پەیمانم دا پێی لەسەر ئەوە).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣) نامەی زانین (كتاب العلم)

٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّث الْقَوْمَ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ مَتَى السَّاعَةُ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّث فَقَالَ بَعْض الْقَوْمِ سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ وَقَالَ بَعْضهُمْ بَلْ لَمْ يَسْمَعْ حَتَّى إِذا قَضَى حَدِيثهُ قَالَ أَيْنَ أُرَاهُ السَّائِلُ عَنْ السَّاعَةِ؟ قَالَ هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَإِذا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ قَالَ كَيْفَ إِضاعَتُهَا قَالَ إِذا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ). (الحديث ٥٩ ـ طرفه في: ٦٤٩٦).

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو کۆڕێکدا قسەی بۆ یاران دەکرد، پیاوێکی دەشتەکی هات گوتی: ئەی کەی قیامەتە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر فەرمووەدەکەی خۆی رۆیشتو قسەکەی خۆی نەبڕی بۆ وەڵامی پرسیاری کابرا. یارانیش هەندێکیان گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێ ی لەقسەکەی بوو، بەڵام قسەکەیی بەدڵ نەبوو بۆیە وەڵامی نەدایەوە، هەندێکی تریشیان گوتیان: نانەیبیست. کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمایشتە کەی تەواو کرد فەرمووی: ئەوە کێ بوو لەقیامەتی پرسی؟ کابراکە گوتی: ئەوە من بووم، ئەمەتام لەخزمەتتا ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): هەرکاتێ سپاردە ـ واتە: ئەمانەت ـ پامالْ کرا ئیتر چاوەڕوانی داهاتنی رۆژی قیامەت بکە.

ئەعرابی یەکە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن چۆنی سپاردە پامالْ دەکرێ؟ فەرمووی: (هەرکاتێ کاروباری میللەتو فەرمانڕەوایی موسوڵمانان سپێردرا بەدەستی ناکەس ئیتر چاوەنواڕی قیامەت بکە) (ریاض الصالحین/ کوردی بەرگی چوار لاپەڕە/١٣٣٠ ز ـ ٣٧٠ف ـ ٣٠ ژ-٣٠/١٨٣٧-٣٠١).

٥٤ـ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: (تَخَلَّفَ عَنَّا النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا الصَّلَاةُ وَنَحْنُ نَتَوَضَأُ فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا). (الحديث ٦٠ ـ طرفاه في: ٩٦، ١٦٣)[٥١]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتە دواوە، کەپێمان گەیشتەوە گەرمەی نوێژ بوو، ئێمەیش سەرگەرمی دەستنوێژ گرتن بووین، بەڵام قاچمان پشیلە شۆر دەکرد، وەك دەستی تەڕی پیابێنی ئاوا، کاتێ پێغەمبەر

(٥١) اخرجه مسلم في الطهارة باب: وجوب غسل الرجلين بكما لهما رقم:٢٤١، ٥٧١، ٥٧٥، ٥٧٢.

(دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، سێ جار بەهەموو دەنگی خۆی بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: (وای لەدەستی ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی کەبەباشی پاژنەی پێی ناشۆرێ!) (ت ١ل ـ ١٣٨ ز-٢٨ ژ-٢٤٢ ج-٤).

٥٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنهُما) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ مِنْ الشَّجَرِ شَجَرَةً لَا يَسْقُط وَرَقُهَا وَإِنَّهَا مَثلُ الْمُسْلِمِ فَحَدِّثونِي مَا هِيَ؟؟ فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ الْبَوَادِي قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ فَاسْتَحْيَيْتُ ثمَّ قَالُوا حَدِّثنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ هِيَ النَّخْلَةُ). (الحديث ٦١ ـ أطرافه في ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٢٢، ٦١٤٤) [٥٢]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درەختێ هەیە گەڵاکەی هەڵناوەرێ، هەمیشە سەوزە، نموونەی موسوڵمانە، وەك ئەو بەپیتو فەڕە، ئادەی کێ دەزانێ کەئەو درەختە چییە؟ خەڵکەکەیش پەلاماری دارو درەختی ئەو دەشتەیان دا بەڵام هەڵیان نەهێنامنیش هات بەدڵما کەئەوە دارخورمایە وە ویستم بڵێم: ئەوە دراخورمایە، بەڵام کەسەرنجم دا بەمنەوە دە کەس بووین، وەمن لەهەمووشیان منداڵتر بووم، لەبەرئەوە شەرمم کردو قسەم نەکرد، جا خەڵکەکە عەرزیان کرد: قوربان! پێمان بفەرموو چییە؟ فەرمووی: (ئەوە دارخورمایە) (ت-٤ ل-٧٤ ف-٧ ز-٢١ تاج-٣ ژ-٢٧١٣).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مەتەڵ داهێنان بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەستی جوان سوننەتە: (تاج/٤ ل-٧٤ = تاج-٣ ژ-٢٧١٣) لە هەر شوێنێ هێمای لاپەڕە (ل) بوو مەبەست بەرگی تەرجەمە کوردییەکەیە لە

---

(٥٢) أخرجه مسلم في صفات المنافقين وأحكامهم، باب: مثل المؤمن مثل النخلة، رقم: ٢٨١١=٧٠٢٩.

تاج الأصول یا لـه ریاض الصالحین، بـەڵام ئەگـەر ڕەمزەکـه (ص) بـوو ئـەوە مەبەست ئەصڵە عەرەبیەکەیانە.

٥٦- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ ثُمَّ عَقَلَهُ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ فَقُلْنَا هَذَا الرَّجُلُ الْأَبْيَض الْمُتَّكِئُ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطلِبِ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَجَبْتُكَ فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ فَلَا تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ فَقَالَ سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ فَقَالَ أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ فَقَالَ اللَّهُمَّ نَعَمْ قَالَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ قَالَ اللَّهُمَّ نَعَمْ قَالَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنْ السَّنَةِ قَالَ اللَّهُمَّ نَعَمْ قَالَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ أَاللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّهُمَّ نَعَمْ فَقَالَ الرَّجُلُ آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ). (الحديث ٦٣).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جارێ لەخزمـەتی پێغەمبـەردا لـەناو مزگـەوت دا دانیـشتبووین، پیـاوێ بەسـواری وشـترە نێرەیـەك هـات، لەحەوشـەی مزگـەوتـدا وشـترەکەی یـیخ داو بەئەشـکێل ئەشـکێلی کـرد. ئـەوجا خـۆی هاتـە ژوورەوەو گوتی: کامتان محمدن؟ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەنێوانیانا پاڵکـەوتبوو، گوتمـان ئـەم پیـاوە سـوورو سـپییە یـە کـە پاڵکـەوتووە. گـوتی: ئـەی کـوڕی عەبـدولموطـەلیب! پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (بـەڵێ پرسـیارت چییە باوەڵامت بدەمەوە) گوتی: مـن چـەند پرسیارێکت لێ دەکـەم، پرسیارەکانم توندو ڕەقن، پێت ناخۆش نەبن، مەبەسـتم ڕوونکردنـەوەی باسـەکەیە، فـەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (پرسیارت چییە فـەرموو بیکـە) گوتی: تـو ئەوخوایـەی کـەخوای

هەموانە! ئایا خودا تۆی کردوە بە پێغەمبەری خۆی‌و ڕەوانەی کردووی بۆسەر سەرجەمی بەرەی ئادەمیزاد هەتا پەیامی ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنی؟ فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە کە بەڵێ ئەم قسەیە وایە) گوتی: باشە، توخودا ئایا خودا فەرمانی بەتۆ کردووە کەهەموو شەوو ڕۆژێ ئەم پێنج نوێژە فەرزە بکەی؟ فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە ئەمەیش وایە) گوتی: باشە، توخودا ئایا خودا فەرمانی بەتۆ کردووە کەهەموو ساڵێ مانگی ڕەمەزان بەرۆژوو بی؟ فەرمووی: (ئەی خودا! تۆ بەشایەد بە کەئەمە وایە) گوتی: باشە، توخودا ئایا خودا فەرمانی بەتۆ کردوە کەئەم زەکاتە لەدەوڵەمەندەکانمان وەربگریت‌و ئەوجا دابەشی بکەیتەوە بەسەر هەژارەکانمان دا؟ فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە کەئەمە وایە). جا پیاوەکە گوتی: من باوەڕم هێناوە بەم ئایینەی کەتۆ هێناوتە، وەمن نوێنەری هۆزەکەمم کەلەلای خۆمان چاوەنواڕی من دەکەن هەتا هەواڵی تۆیان بۆ بەرمەوە، وەمن ضیمامی کوڕی ثەعلەبەم لەخێڵی بەنی سەعدی کوڕی بەکرم. (تاج - ٢ل - ٦٧ ز-٢٥ ژ-١٢٩٥).

## باسی پەخشی زانین

٥٧- عَنْ إِبْنَ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَخْبَرَهُ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَث بِكِتَابِهِ رَجُلًا وَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظيمِ الْبَحْرَيْنِ فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ). (الحديث ٦٤ - أطرافه في: ٢٩٣٩، ٤٤٢٤، ٧٢٦٤).[٥٣]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نامەیەکی بەناوی خۆیەوە نووسی‌و بەپیاوێکا ناردی بۆ سەر گەورەی وڵاتی بەحرەین،

(٥٣) من افراد البخاري عن المسلم، اخرجه النسائي في السير (عيني-٢-٢٧-رقم:٦) المترجم.

کەمونـژیری کوڕی ساوا بـوو، هـەتا ئـەو بیگەیـەنێ بەکیـسرای شـای ئێرانـی ئەوکاتە، جاکاتێ کیسرا نووسراوەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەخوێنێتـەوە دەیدڕێنێ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) نـزای لێ کردن: کەشەق و پەق کرێن.

## راڤە و شیکردنەوە:

ئەو پیاوەی کاغەزەکەی پێغەمبەری برد بۆ گەورەی بـەحرەین عەبـدوڵڵای کوڕی حوژافەی سەهمی بوو، کیسرا نازناوی شای ئێرانـە قەیـسەریش نازنـاوی هەموو پادشایەکی ڕۆمـە، ئـەم کیـسرایە نـاوی (پرویـزی کوڕی هوفری کوڕی ئەنوشیروان)ە، نزاکەی پێغەمبەری لێ گیرا بوو کوڕێکی هەبوو ناوی شیرۆ بـوو، خودا زاڵی کرد بەسـەریدا، بەخەنجـەر سکی دڕی و کوشـتی: (تـاج - ٨ ل - ١١٣ = تاج-٤ ز-٤٢ ژ-٤٤٥١ ج-٤).

٥٨-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَتَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِتَابًا أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ فَقِيلَ لَهُ إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلَّا مَخْتُومًا فَاتَّخَـذَ خَاتَمًـا مِـنْ فِضةٍ نَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ كَأَنِّي أَنْظـرُ إِلَـى بَيَاضِـهِ فِـي يَـدِهِ ). (الحديث ٦٥ - أطرافه في: ٢٩٣٨، ٥٨٧٠، ٥٨٧٢، ٥٨٧٤، ٥٨٧٥، ٥٨٧٧، ٧١٦٢)[٥٤]

ئەنـەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نامەیـەکی نووسـی: یـا ویـستی نامـە بنێـرێ بـۆ کیـسراو قەیـسەری ڕۆم و بـۆ نەجاشـی پادشـای حەبەشە، هەتا بانگیـان بکا بۆسـەر ئـایینی پیرۆزی ئیسلام، یـارانی عـەرزیان کرد: هەر نامەیێ مۆر نـەکرابێ ئەمانـە وەری نـاگرن، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوسـتیلەیەکی زیـوینی دروسـت کـرد، مـۆری (محمـد رسـول الله) ی لێ هەڵکەند، هەر نامـەیەکی دەنارد بۆ کەسێ بـەو ئەنگوسـتیلەیێ مـۆری دەکـرد، ئەنـەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئێستایش دەڵێ ی بریسکەی ئـەو ئەنگوسـتیلەیە لەبەرچاومە کەلەپەنجە تووتەی دەستی چەپی پێغەمبەردا بوو.

---

(٥٤) أخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: خاتم الذهب على الرجال، رقم: ٢٠٩٢=٥٤٤٧.

## راڤەو شیکردنەوە:

١- ئەنگوستیلەی زیو بۆ پیاو سوننەتە. ٢- مۆرکردنی نامەو شتی وا سوننەتە. ٣- نووسینەوەی عیلمو زانستو ناردنی بۆ خەڵکی تر لەموسوڵمانو غەیری موسوڵمان بەمەرجی خۆی دروستە. ٤ - نەخشی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سێ دێڕ بوو، دێڕی یەکەم (محمد) بوو، دێڕی دوەم (رسول) بوو، دێڕی سێیەم (الله) بوو، لەخوارەوە دەخوێندرایەوە بۆسەرەوە ئاوا:

الله

رسول

محمد

٥- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جاروبار ئەنگوستیلەکەی دەکردە پەنجە تووتەی دەستی چەپی، جاروباریش دەیکردە پەنجە تووتەی دەستی راستی، کەدەچوو بۆ سەراو دایدەکەند: (تاج-٤ ل-١١٨ = تاج-٣ ز-٣٥ ژ-٢٨٠٩ هەتا ژمارە ٢٨٢١).

## باسی: دانیشتن لەو شوێنەدا کەریزی کۆڕەکە کۆتایی دێ

٥٩- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِي (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَمَا (هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذ أَقْبَلَ ثلَاثةُ نَفرٍ فَأَقْبَلَ اثنان إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذهَبَ وَاحِدٌ قَالَ فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ وَأَمَّا الثالِث فَأَدْبَرَ ذاهِبًا فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَلَا أُخبِرُكُمْ عَنْ النَّفرِ الثلَاثةِ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَض فَأَعْرَض اللَّهُ عَنْهُ). (الحديث ٦٦ طرفه في: ٤٧٤).[٥٥]

---

(٥٥) اخرجه مسلم في السلام، باب:من اتى مجلسا فوجد فرجة فجلس فيها،رقم:٢١٧٦=٥٦٤٥.

ئەبو واقیدی لەیثی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمزگەوت دانیشتبوو، خەڵکەکەیش لەدەوری دانیشتبوون، خەریکی تاعەتی خودا بوون، لەوکاتەدا سێ کەس هاتن، دوانیان هاتنە بەرەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە یەکێکیان ڕۆیشت، گوتی: جا دووکەسەکە لەدیار پێغەمبەر ڕاوەستان تایەکێکیان کەلێنێکی لەئەڵقەی کۆڕەکەدا بەدی کردو تیا دانیشت، وە ئەوی تریشیان لەپشتیانەوە دانیشت، وەسێهەمیشیان هەڵی تورپاندو ڕۆیشت. جاکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێ بۆوە فەرمووی: با باسی حاڵی ئەم سێ کەسەتان بۆ بکەم: یەکێکیان هانای بردەبەر خوداو خودا هانای دا، یەکێکیشیام شەرمی کردو خودایش شەرمی لەو کرد، ئەوی تریشیان پشتی هەڵکردو بەکۆڕی مەجلیسی ئێمە ڕازی نەبوو، خودایش پشتی لەو هەڵکردو لێی تووڕە بوو.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەبو واقیدی لەیپی (٢٤) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە یەکێکیان ئەم فەرموودەی ئێرەیە کەپەسەندی هەردوولایە لەبوخاریدا تەنها ئەم فەرموودەیەی هەیە، لەساڵی (٦٨) دا مردووە، حەفتاو پێنج ساڵ ژیاوە، لەمەککە وەفاتی کردووە، گۆڕەکەی لەگۆڕستانی موهاجیرینە: (ت ـ ال ـ ٧٦ف ـ ٢ز ـ ١٤ ژ-٩٩).

٦٠- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضي اللهُ عَنْهُما) ذَكَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَعَدَ عَلَى بَعِيرِهِ وَأَمْسَكَ إِنْسَانٌ بِخِطَامِهِ أَوْ بِزِمَامِهِ قَالَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوَى اسْمِهِ قَالَ أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ قُلْنَا بَلَى قَالَ فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ فَقَالَ أَلَيْسَ بِذِي الْحِجَّةِ قُلْنَا بَلَى قَالَ فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا لِيُبَلِّغ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ مِنْهُ).

(الحديث ٦٧ ـ أطرافه في: ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧).[٥٦]

ئەبوبەكرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی جەژنی قوربان دا، لەمینا، لەحەجیماڵئاوایی دا بەسەر پشتی وشترەكەی پێشیەوە وتارێكی بۆ جەماوەرەكە دا. پیاوێ جڵەوی وشترەكەی گرتبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر پشتی وشترەكە دانیشتبوو، لەوتارەكەیدا فەرمووی: ئەی موسوڵمانەكان! ئەم رۆژە چۆن رۆژێكە؟ ئێمەیش بێ دەنگ بووین، پێغەمبەریش تاماوەیێ مات بوو، لەدڵی خۆمان دا گوتمان: لەوانەیە ناوێكی تری تویی لێ بنێ، بەلام فەرمووی: دیارە كەئەمە رۆژی جەژنی قوربانە، كەقوربانی تیا دەكرێ، گوتمان: بەڵێ خۆیەتی. فەرمووی: ئەی ئەم مانگە چۆن مانگێكە؟ ئێمەیش دیسان بێ دەنگ بووینەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان ماوەیێ تر بێ دەنگ بوو، هەتا گومانمان بۆ ئەوە رۆیشت كەناوی ئەم مانگە دەگۆڕێو ناوێ تری لێ دەنێ بەلام فەرمووی: دیارە ئەمە مانگی نۆمینەیە كەحەجی تیا دەكرێ. گوتمان: چۆن دەفەرمووی وایە. فەرمووی: دەبزانن كەسەرو ماڵو خوێنو ناموستان لەیەكتری حەرامە، وەك چۆن تاوان كردن گەلێ حەرامەو ناڕەوایە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو تاوانە لەم رۆژە زۆر بەڕێزەتانا بكرێ كەوا لەم مانگە پیرۆزەتانا، نەخوازەلا لەم شارە پیرۆزەیشتانا بكرێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئاگاداربن! بائامادەبوانی ئەم فەرمایشتە رایان بگەیەنن بەناودیاران، لەناوخۆتانا هەرچی دەژنەون لەم فەرموودەو وتارو روون كردنەوەی شەریعەتە بەپێی ئەوانا رایان بگەیەنن بەیەكتری، سا بەشكوو حازرەكە ئەم زانستو فەرمایشتانە رابگەیەنێ بەكەسێ كەئەو باشتر لێیان تێ بگاو چاكتریش لەبەریان بكا). (ریاض الصالحین ـ ٢٥٠ + تاج-٢ ل-٢١٩ = ژ-١٦١٠ ز-١١٢).

---

(٥٦) أخرجه مسلم في الديات، انظر (عيني ـ ٢ ـ ٣٥ ـ رقم: ٩)- المترجم=٤٣٥٩ شيحا.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر:

١- بایەخدان بەلەبەرکردن و راگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەڵکوو ئەرکی واپیرۆز ئەگەر خودفەرز (فرض العين) نەبێ سوننەتێکی گەورەیە.

٢- مژدەی ئەوەی تێدایە کەفەرمووده زانی گەورەو شەریعەتزانی چاك لەهەموو چین و چەرخێکا دەبن.

بیشری کوڕی موفەضضەل، کەیەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە گشت رۆژێ چوارسەد رکات نوێژی دەکرد، هەر رۆژنا رۆژێ بەڕۆژوو دەبوو. عەبدوڵڵای کوڕی عەونیش کەیەکێکی تریانە، خاریجە لەبارەیەوە دەفەرموی: (بیستو چورا ساڵ هاوڕێ یەتی ئیبنو عەونم کردووە بەپێ ی ئاگاداریی من باوەڕ ناکەم کەلەو ماوە دوورو درێژەدا فریشتەکان گوناهیان لەسەری نووسیبێ).

٦١- عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الْأَيَّامِ كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا). (الحديث ٦٨ - طرفاه في: ٧٠، ٦٤١١).[٥٧]

ئەبووائیل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەستووری وابوو هەموو رۆژی پێنج شەموانێ تەمێ و ئامۆژگاری دەکردین و وەعزی دەخوێندەوە بۆمان، رۆژێ پیاوێ پێی گوت: ئەی باوکی ئەوڕەحمان! خۆزگەم هەموو رۆژێ ئەم پەندو ئامۆژگارییەت بۆمان دەخوێندەوە. فەرمووی: ئەدی من لەبەرئەوە واناکەم چونکە حەزناکەم وەڕستان بکەم، منیش وەك جارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکەم، ئەو جاران ناوبەناو پەندی ئێمەی دادەداو ئامۆژگاری بۆ دەخوێندینەوە نەبادا ئەگەر هەموو

(٥٧)أخرجه مسلم في صفات المنافقين واحكامهم، باب: الاقتصاد في الموعظة، رقم: ٢٨٢١=٧٠٥٨.

رۆژێ پەندمان دابداو وەعزمان بۆ بخوێنێتەوە جارس ببین. (ریاض-٢ ل-٦١١ ژ-٦٩٩ ز-٩١ + تاج-١ ل-٩١ = ژ-١٢٣٠ ز-١٧).

٦٢-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:( يَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا وَبَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا). (الحديث ٦٩ ـ طرفه في: ٦١٢٥) [٥٨]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کار ئاسان بکەن کار گران مەکەن، مژدەی خۆش بەخەڵك بدەن و بەهەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەدین مەتەکێننەوە) (ریاض-٢ ل-٥٦٥ ز-٧٤ ژ-٦٣٧).

٦٣- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللَّهُ عَزَوَجَلْ يُعْطِي وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الْأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ). (الحديث ٧١ ـ أطرفاه في: ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠) [٥٩]

مەعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ کەخودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە کەئەم فەرمایشتو شەریعەتە دابەش بکەمو بەس، بەڵام بەشی گەورە یابچووك ئەوە بەدەست خودا خۆیەتیو خودا خۆی ئەو بڕیارە دەدا، وەئەم ئۆمەتی ئیسلامەیش هەر بەردەوام دەبن لەسەر ئەم ئایینی خودایە هەتا نزیکی رۆژی قیامەت، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ.

## راڤەو شیکردنەوە:

موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیان ئەمەوی یە، ساڵی فەتحی مەککە موسوڵمان بووە؛ زنبرای پێغەمبەر بووە، نووسەری سرووش بووە، تەمەنی (٧٨) ساڵ

---

(٥٨) أخرجه مسلم في الجهاد والسِّيَر، باب: في الامر بالتيسير وترك التنفير، رقم: ١٧٣٤=٤٥٠٣.

(٥٩) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: النهى عن المسألة،رقم: ١٠٣٧=٢٣٨٦.

بووه، لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی دەمخواریی بووه، سەدو شەستو سێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوه گێڕاوەتەوه، هەشت فەرموودەی لەبوخاریدا هەیه، پێنجیشی لەموسلیم دا هەیه، چواریان پەسندی هەردوو پیره: (ت-١ ل-٧٧ ز-١٤ ف-١ ژ-٩٨) + (ت-٥ ل-١٤٥ = تاج-٣ ل-٦٦٦ ز-٢٣ ج-٤).

٦٤- بڕوانه (ز-٣ ف-٥٥) لەگێڕانەوەی ئێرەدا: ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتبووین، کورۆکی دارخورمایان هێنا بۆی، فەرمووی: درەختێ هەیه گەڵاکەی هەڵناوەرێ .. تا کۆتایی فەرموودەکه.

٦٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَسُلِّط عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا). (الحديث ٧٣ ـ أطرافه في: ١٤٠٩، ٧١٤١، ٧٣١٦).[٦٠]

ئیبنوومەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (حەسوودیو بەخیلی پێ بردن بەکەس دروست نییه بەم دوو کەسه نەبێ: بەپیاوێ خودا ماڵی پێ بداو خۆشی دەستی تێ بچێ لەڕێگەی ڕاست دا داغانی بکا، دووەم بەپیاوێ کەخودا داناییو زانستی بەسوودی پێ بدا، جا هەم خۆی ڕەفتاری پێ بکاو هەم لەنێوانی خەڵکا حوکمی پێ بکاو هەم فێری خەڵکی تریشی بکا، بەتایبەتی لەگەڵ فێرخوازانی ئەو زانستە درێغی نەکا ) مەبەست لەحەسوودیو بەخیلی پێ بردن خۆزگه پێ بردنه.

(٦٠) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين، باب: فضل من يقوم بالقرآن ويعلمه، رقم: ٨١٦=١٨٩٢.

٦٦- عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ:( ضَمَّنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ). (الحديث ٧٥ ـ أطرافه في: ١٤٣، ٣٧٥٦، ٧٢٧٠).[٦١]

**ئیبنوعەبباس** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **گوشیمی بەسینگیەوەو فەرمووی: ئەی خودایە! فێری زانستی قورئانی بفەرموو** (ت ـ ٥ل ١٢١ف ـ از ـ ٢١ = تاج-٣ ل-٦٤٢ ژ-٣٣٨١، ٣٣٨٢، ٣٣٨٣).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عیکریمە یەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە، فەقێ ی ئیبنوعەباس بووە، بەندەیشی بووە، بەڕەگەز بەربەرە، خەڵکی مەغریبە، حەدیثی لەزۆر لەهاوڕێیان وەرگرتووە، یەکێکە لەزانا گەورەکانی سەردەمی خۆی، قورئانزانێکی چاك بووە، ئەیوبو خالیدولحەذذاء فەقێ ی بوون، دەڵێن گوایە لەبیرو باوەڕدا هەوا خوای خەواریج بووە، نافیعو کەسانی تر تۆمەتی درۆیان لێ دەدا، جێگەی متمانەی بوخاری یە، بەڵام موسلیم بەمەرجێ فەرموودەی عیکریمە دەگێڕێتەوە کە طاووسو سەعیدی کوڕی جوبەیری لەگەڵ دابێ، بۆرە گلەیی لەبوخاری دەکرێ لەسەر عیکریمە کەنەدەبوو حەدیثی عیکریمە لەبوخاری دا ڕیوایەت بکا، واتە عیکریمە لەپیاوانی مەرجی بوخاری یە بەڵام لەپیاوانی مەرجی موسلیم نییە، بەڵام بەسە بۆ فەضلی عەکرەمە کەجێگەی متمانەی إمامی بوخاریە، عیکریمە گەڕیدە بوو، بەوڵاتانا دەسووڕایەوە، کاتێ ئیبنوعەبباس دەمرێ عیکریمە هێشتا ئازاد نەبوو، عەلی کوڕی ئیبنوعەباس دەیفرۆشێ بەخالیدی کوڕی مەعاوییە بەچوار هەزار دینار! عەکرەمە پێی دەفەرموێ: (هەموو عیلمەکەی باوکتت فرۆشت

---

(٦١) أخرجه مسلم في فضائيل الصحابة، باب: فضائل عبدالله بن عباس (رضي الله عنهما) رقم: ٢٤٧٧=٦٣١٨.

بەچوار هەزار دینار!) ئەویش پەشیمان دەبێتەوەو سەوداکە هەڵدەوەشێنێتەوەو ئازادی دەکا، لەمەدینە لەتەمەنی هەشتا ساڵی دا مردووە، رەحمەتو رەزای خودای لێ بێ.

٦٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الِاحْتِلَامَ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ وَأَرْسَلْتُ الْأَتَانَ تَرْتَعُ فَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ فَلَمْ يُنْكَرْ ذَلِكَ عَلَيَّ). (الحديث ٧٦ ـ أطرافه في: ٤٩٣، ٨٦١، ١٨٥٧، ٤٤١٢).[٦٢]

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: مێردمناڵ بووم، خەریکبووم باڵق دەبووم، بەسواری گوێدرێژێ هاتم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا لەمینا بەرنوێژیی بۆ خەڵکەکە دەکرد، هیچ روی لەدیوارو شتی وایش نەبوو کەبیکا بە بەربەست (سوترە)، منیش بەسواری گوێ درێژەکە، کەدێڵەکەر بوو، چوومە پێشەوە، تەنانەت بەبەردەمی هەندێ ڕیزیش دا رۆیشتم، ئەوجا دابەزیمو دێڵە کەرەکەم بەرەڵا کرد بۆ لەوەڕانو خۆم چوومە ناو ڕیزی نوێژەکەوە، وەکەسیش بۆئەمە رەخنەی لێ نەگرتم! لەگێرانەوەیەکی موسلیمو تیرمیذیدا: ماکەرەکە بەبەردەمیشیاندا تێپەڕیو هیچ نوێژەکەشی نەبڕین، ئیتر هەندێ کەس ئێستا لەسەر چ بیروباوەڕێ لەخۆیانەوە دەڵێن: کەرو سەگو ژن بەبەر نوێژدا بڕۆن دەیبڕن؟! (ت ـ ال ـ ٢٤٣ = ز-٧١ ژ-٤٦٥، ٤٦٣، ٤٦٤، ٤١٦، ٤٦٧، ٤٦٨).

وەك لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ رەسیدە بوون مەرج نییە بۆ هەڵگرتن (تحمل) ی فەرموودەو زانست، گرنگ ئەوەیە راوی لەکاتی وەرگرتنو بیستن دا فامیدە (ممیز) بێ.

---

(٦٢) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: سترة المصلى، رقم: ٥٠٤ = ١١٢٤.

٦٨- عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (عَقَلْتُ مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي وَأَنَا ابْنُ خَمْسِ سِنِينَ مِنْ دَلْوٍ). (الحديث ٧٧ - أطرافه في: ١٨٩، ٨٣٩، ١١٨٥، ٦٣٥٤، ٦٤٢٢).

مەحموودی کوڕی رەبیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەبیرمە جارێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) قومێ ئاوی لەدۆڵچەیێ کردە دەمیو پرژاندی لەدەمو چاوم، ئەو دەمە پێنج ساڵان بووم.

لەم فەرموودەیەدا ئەمەی تێدایە: گاڵتە لەگەڵ مناڵدا دروستە، مەحموود پیتو فەڕو مووفەڕکی لەو ئاوە وەرگرتووە، مەحموود حەزرەتی دیوە کەواتە دادەنرێ بەهاوڕێی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) گەرچی زۆر مناڵیش بووە کەدیویێتی، مەحموود نەوەدوچوار ساڵ ژیاوە.

٦٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ(مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ مِنْ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْث الْكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضا فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتْ الْمَاءَ فَأَنْبَتَتْ الْكَلَأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتْ الْمَاءَ فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ مَاءً وَلَا تُنْبِتُ كَلَأً فَذلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذلِكَ رَأْسًا وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذي أُرْسِلْتُ بِهِ). (الحديث: ٧٩).[٦٣]

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم هیدایەت و ڕێنموونیو و زانستە کەخودا بەمندا ناردوویەتی بۆ ئەو خەڵکە، وەك بارانێکی زۆری بەفەڕ وایە کەبباری لەخاکێ، بەشێکی خاکێکی پاك و بەپێز بێ و باراناوەکە بگرێتە خۆی و

(٦٣) اخرجه مسلم في النضائف، باب: بيان مثل مابعث به النبيُ (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) من الهوى والعلم رقم (٢٢٨٢) = ٥٩١٢.

لەوەڕوگیایەکی زۆری پێ سەوزببێ، وەبەشێکی تری زەوییەکی رەقەن و رووتەن بێ، شینایی و سەوزایی نەڕوێنێ، بەلام ئاوەکە قووت نەداتەوە، بەلکوو گلی بداتەوە و ببێ بە ئەستێر و گۆماو و کانیاو و خودا بیکاتە مایەی خێر و خۆشی و سوود بۆ مەردوم، بەم ڕەنگە: هەم خۆیان لێی بخۆنەوە و هەم ئاژەل و مالاتی پێ ئاوبدەن و هەم کشتوکالی لەبەرابکەن، وە بەشێکی تریشی دەشتانی و شۆرەکات بێ، نەئاو گل بداتەوە و نەلەوەریش بڕوێنێ. جا ئەم خاك و بارانە نموونە و وێنەن بۆ ئەوکەسە خودا پێداوانە کە لەئاینی خودا شارەزادەبن و بەفەرمانی خودا لەم ئایینی منە سوود وەردەگرن و هەم خۆیان فێری زانین دەبن و هەم خەلکی تریش فێر دەکەن، بەهۆی ئەوەوە لەهەردوو جیهانا سەریان پێی بەرز دەبێتەوە، هەروەك نموونەو وێنەشن بۆ ئەو کەسانەیش کەسەریان پێ ی بەرزنابێو، ئەو هیدایەتو دینە راستەی کەخودا بەمانا ناردوویەتی ئەوان نایانەوێو وەری ناگرن) : (ریاض-١ ل-١٨٨ ف-٧ ز-١٦ ژ-١٦٢/٧ + تاج-١ ل-٨٥ ف-٤ ز-١٥ ژ-١١٢).

٧٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ وَيَظْهَرَ الزِّنَا). (الحديث ٨٠ - أطرافه في: ٨١، ٥٢٣١، ٥٥٧٧، ٦٨٠٨) (٦٤)

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا فەرموودەیێ دەگێڕمەوە بۆتان، کەلەپاش من کەس نەیگێڕێتەوە بۆتان: خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): یەکێکە لەنیشانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت: کەبەرەبەرە زانینو عیلمی دینی هەلدەگیرێو نامێنێو جەهلو نەزانی بەکاروباری ئاایینی پەرەدەستێنێو بلاودەبێتەوەو ئارەق بەزۆرێو بەئاشکرا دەخورێتەوەو شەروالپیسی دەبێ بەباوو ئاشکرا دەبێ، وەبەهۆی شەڕو شۆڕو

(٦٤) أخرجه مسلم في العلم، باب: رفع العلم وقبضه، رقم: ٢٦٧١ = ٦٧٢٦.

ئاشووبەوە پیاو کەم دەبێو ژن زۆر دەبێ، هەتا وای لێ دێ کەپەنجا ژن یەك پیاو دەبێ بەسەرپەرشکاریان!) (ت-٣ ل-٢٣٧ ژ-٢٣٥١ ز-٩٢).

٧١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (لَأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثا لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مِنْ أَشْرَاط السَّاعَةِ أَنْ يَقِلَّ الْعِلْمُ وَيَظهَرَ الْجَهْلُ وَيَظْهَرَ الزِّنَا وَتَكْثرَ النِّسَاءُ وَيَقِلَّ الرِّجَالُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً الْقَيِّمُ الْوَاحِدُ). (ف ـ برِوانة: ذمارة/ ٧٠).

٧٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ حَتَّى إِنِّي لَأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ فِي أَظفَارِي ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضلِي عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ قَالُوا فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الْعِلْمَ). (الحديث ٨٢ ـ أطرافه في: ٣٦٨١، ٧٠٠٦، ٧٠٠٧، ٧٠٢٧، ٧٠٣٢)[٦٥]

ئیبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: جارێ خەوتبووم، لەخەما کاتێکم زانی پیالەیێ شیریان بۆهێنام، جا خۆم لێم خواردەوە هەتا تەواو پاراو بوومو شیر لەسەری پەنجەکانمەوە سەری دەکردو لەلووتمەوە دەهاتەوە، ئینجا پاشماوەکەی خۆمم دا بەعومەری کوڕی خەطاب. عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە بەچی لێ دەدەیتەوە؟ فەرمووی بەزانین. (ت-٥ ل-٢٠ = ز-٤ تاج-٣ ژ-٣٢٤٦، ٣٢٤٥).

٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضي اللهُ عَنْهُما) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذبَحَ فَقَالَ اذبَحْ وَلَا حَرَجَ فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ قَالَ ارْمِ وَلَا حَرَجَ فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلَا أُخِّرَ إِلَّا قَالَ افْعَلْ وَلَا حَرَجَ). (الحديث ٨٣ ـ أطرافه في: ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥).[٦٦]

---

(٦٥) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة: باب: فضائل عمر (رَضي اللهُ عنهُ) رقم: ٢٣٩١ = ٦١٣٩.

(٦٦) اخرجه مسلم في الحج، باب: من حلق قبل النحر او نحرَ قبل الرمي، رقم:١٣٠٦ = ٣١٤٣.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجیماڵئاوایی دا، لەمینا، ڕاوەستا هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن. پیاوێ هات گوتی: قوربان! نەمزانی لەپێش قوربانی کردندا سەرم تاشی؟ فەرمووی: قوربانیەکەت سەر ببڕە قەیناکە. پیاوێکی تر هات گوتی: نەمزانی لەپێش ڕەجم کردنی شەیتاندا قوربانیم سەربڕیوە؟ فەرمووی: ڕەجمی شەیتان بکە قەیناکا، ئیتر ئەو ڕۆژە هەرچی یان لێ ی دەپرسی لەبارەی هەر شتێکەوە بوایە، کەپێش خرابوو بێ، یادوا خرابووبێ، هەر دەیفەرموو: بیکە قەیناکە : (ت-٢ ل-٢١٨ ف-٤ ز-١١١ ژ-١٦٠٦).

٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُقْبَضُ الْعِلْمُ وَيَظْهَرُ الْجَهْلُ وَالْفِتَنُ وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ) قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَمَا الْهَرْجُ؟ فَقَالَ: هَكَذَا بِيَدِهِ فَحَرَّفَهَا كَأَنَّه يُرِيدُ الْقَتْلَ. (الحديث ٨٥ ـ أطرافه في: ١٠٣٦، ١٤١٢، ٣٦٠٨، ٣٦٠٩، ٣٦٤٣، ٤٦٣٥، ٦٠٣٧، ٦٥٠٦، ٦٩٣٥، ٧٠٦١، ٧١١٥، ٧١٢١).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەرە بەرە زانستو عیلمی ئایینی هەڵدەگیرێو نامێنێو جەهلو نەزانی بەکاروباری ئایینی پەرەدەستێنێو بڵاودەبێتەوەو، فەرتەنەو ئاژاوە پەرەدەستێننو ڕاورووتو تاڵانیو بڕو زۆر دەبن! دنیا دەبێ بەئاخورانو بوخوران. عەرزیان کرد: قوربان! ئاخورانو بوخوران چییە؟ بەدەستی فەرمووی: (مەبەست ئەمەیە) ڕاوی دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەی بۆ کوشتن کرد) : (ب ـ ال ـ ٩١ف ـ ٦ = ز-٩١ ژ-١٢٦).

٧٥- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضي اللهُ عَنها) قَالَتْ: (أَتَيْتُ عَائِشَةَ وَهِيَ تُصَلِّي فَقُلْتُ مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ فَإِذا النَّاسُ قِيَامٌ فَقَالَتْ سُبْحَانَ اللَّهِ قُلْتُ آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ نَعَم فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلَّانِي الْغَشْيُ فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَى رَأْسِي الْمَاءَ فَحَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثمَّ قَالَ مَا مِنْ

شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ مِثْلَ أَوْ قَرِيبَ لَا أَدْرِي أَيَّ ذلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ يُقَالُ مَا عِلْمُكَ بِهَذا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ أَوْ الْمُوقِنُ لَا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ فَيَقُولُ هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا هُوَ مُحَمَّدٌ ثَلَاثًا فَيُقَالُ نَمْ صَالِحًا قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ وَأَمَّا الْمُنَافِقُ أَوْ الْمُرْتَابُ لَا أَدْرِي أَيَّ ذلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ فَيَقُولُ لَا أَدْرِي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ). (الحديث ٨٦ ــ أطرافه في: ١٨٤، ٩٢٢، ١٠٥٣، ١٠٥٤، ١٠٦١، ١٢٣٥، ١٣٧٣، ٢٥١٩، ٢٥٢٠، ٧٢٨٧) [٦٧]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای عائیشەی خوشکم، نوێژی رۆژگیرانی دەکرد، گوتم ئەو خەڵکە چییانە بۆچی وا شڵەژاون؟ عائیشەیش ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان کەخۆرگیراوە، سەیریشم کرد کەوا خەڵکەکە لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژی خۆرگیران دەکەن، عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) گوتی: (سبحان الله). منیش گوتم ئەم خۆرگیرانە ئایەتو نیشانەیە بۆ سزایێ کەوا بەڕێوە، هەتا بەندەکان هۆشیار ببنەوە پێی؟ ئەویش بەسەری ئاماژەی کرد: بەڵێ وایە (و ئەمە سەرەتای سزایە، خوای گەورە دەفەرموێ: (وما نرسل بالآيات إلا تخويفاً) ئیتر منیش لەگەڵیان دا دەستم کرد بەنوێژ، نوێژەکە درێژەی کێشاو رۆژەکەیشی زۆر گەرم بوو، لەبەرئەوە بوورانەوە زۆری بۆهێنام‌و دڵم لەسەرخۆ چوو، هەتا دەستم کرد بەئاوپرژان لەڕوم‌و هەندێ ئاوم کرد بەسەر سەرماو هۆشم هاتەوە. لەپاش نوێژەکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی خوێندەوە، لەسەرەتاوە سوپاس‌و ستایش‌و وەسپێکی جوانی خودای گەورەی کردو فەرمووی: ئەوەیشی کەنەمدیبوو لەم شوێن‌و مەقامەم دا بینیم، هەتا بەهەشت‌و دۆزەخیشم بینی!

---

(٦٧)أخرجه مسلم في الكسوف، باب: ماعرض على النبيُّ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) في صلاة الكسوف، رقم: ٩٠٥=٢١٠٠.

وەسرووشم بۆ هات: کەئێوە لەناو گۆڕەکانتاندابەسەختی تاقی دەکرێنەوە، وەك ئەو تاقیکردنەوە سەختو ناخۆشەی کەلەسەردەمی جەجاڵە کوێرەی جادووگەردا روو دەدات. فاطیمە کەئەم فەرموودەیە لەئەسمای نەنکیەوە دەگێڕێتەوە فەرمووی: نەنکم یاوای گوت یاگوتی: فەرمووی: لەچەشنی تاقیکردنەوەی جەجاڵەکوێرەی جادووگەر هەر کەسەتان لەناو گۆڕی خۆی دا تاقی دەکرێتەوە: دوو فریشتە کەناویان نەکیرو مونکەرە، دەچنە ناوگۆڕەکەوەو مردووەکە دادەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: باوەڕت چیە دەربارەی ئەم پیاوە، واتە: چی لەبارەی موحەممەدەوە دەزانی؟ جا ئەوەی بڕوادارو موسوڵمان بێ، یا فەرمووی: ئەوەی باوەڕداری متمانەداربێ دەڵێ: ئەمە موحەممەدە پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، بەڵگەی رۆشن‌و ڕێگەی راستی پێ نیشان داوین، بۆیە ئێمەیش باوەڕمان پێی هێناوەو شوێن ئایینەکەی کەوتووین، ئەمە موحەممەدە، سێ جار باوەڕ بەموحەممەد تازە دەکاتەوە (چونکە لەسەرەتای وەڵامەکەیەوە دەڵێ: ئەمە موحەممەدە، دووەم دەڵێ: پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، سێیەم لەکۆتاییدا دیسان دەڵێتەوە: ئەمە موحەممەدە) ئەوجا فریشتەکان پێی دەفەرموون: بەخۆشی بخەوە خەوی خێرت بێ، ئێمە خۆشمان دەمانزانی کەتۆ بەڕاستی بەبێ گومان باوەڕت پێی هەیە، فەرمووی: بەڵام ئەوەیشی ناپاك بێ، یاگوماندار بێ ـ واتە: دوودڵ بێ ـ دەڵێ: نازانم ئەم پیاوە چیەو چی نییە، چاوم لەدەمی خەڵك بووە، ئەوان چییان گووتووە منیش بۆ چاولێکەری گوتوومە!).

شیکردنەوە: ئەسماء کچی ئەبوبەکری صدیقە (ڕەزای خوایان لێ بێ)، خوشکی باوکی ی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرە، خوشکی هەقی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرە، ژنی حەزرەتی زوبەیرە، ناوداره بە (ذات النطاقين) لەپێش کۆچ دا بەبیست‌و حەوت ساڵ لەدایك بووە، هەژدەهەم کەس بووە کەموسوڵمان بووە، پەنجاوشەش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە،

هـەژدە فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، هەژدەیـشی لەموسـلیم دا هەیـە، چـواردەیان پەسـەندی هەردوولایـە، کەواتـە سـەرجەمی فـەرموودەکانی لەبوخاریو موسلیم دا دەکاتـە ١٤+ ٤+٤=٢٢ فـەرموودە. لـەپاش شـەهید بـوونی عەبـدوڵلای کـوڕی، لەمەککە، لەساڵی حەفتاوسێ ی کۆچیدا لەتەمـەنی سـەد ساڵی دا کۆچی دوایی کـرد، کـەوەفاتی کـرد هـیچ ددانـی نەکـەوتبوو، ئەقڵیـشی ساغو تەواو بوو (رەزای خوای لێ بێ).

ئەم حوکمو بڕیارانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- بەهەشتو دۆزەخ ئێستا هەنو دروست کراون.

٢- سـزای گـۆڕ هەیـەو ڕاسـتەو مـردوو لـەناوگۆڕدا زینـدوو دەکرێتـەوەو قـسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دا دەکرێو خەوی لێ دەکەوێ!

٣- پرسیاری نەکیرو مونکەر لەگۆڕدا لەمردوو ڕاستەو هەقـە، کەلـەبارەی خـواو پێغەمبەری خوداوە پرسیاری لێ دەکەن.

٤- هەڵسانی جەجاڵو پەیدا بوونی چەسپاوەو ڕۆژێ لەڕۆژان ڕوودەدا.

٥- نوێـژی خـۆرگیران سـوننەتەو سـوننەتە قورئـانی بـەدوورو درێـژی تیـادا بخوێندرێ.

٦- نوێژی خۆرگیران بۆ ژنیش سوننـەتە، وەك هـەموو جەماعـەتکردنێ لـەپاش ریزی پیاوانەوە دەبن.

٧- دروستە پرسیار لەنوێژکەر بکرێ لەناو نوێژەکەیدا.

٨- قسەکردن لەناو نوێژدا قەدەغەیە.

٩- ئاماژە کردنو شت پێ نیشاندان لەناو نوێژدا ئەگەر لەبـەر پێداویـستی بـوو دروستەو کەراهەتو ناباشی نییە.

١٠- کاری سووکەڵەو کەم نوێژی پێ پووچ نابێتەوە.

١١- لەدوا نوێژی رۆژگیرانەوە وتار سوننەتە.

١٢- تەنیا ئەهلی یەقین ئەهلی نەجاتن، مرۆی ناپاك‌و دوودڵ‌و بێبڕوا حاڵیان چون یەكەو هەرسێ لا بەبێبڕوا دادەنرێن: (ت-١ ل-٤١١ هەتا ل-٤٧٠ + ت-١ ل-٥٨٠ ف-٢ +ف-٣ +ف-٤=ز-٢٢٤ ژ-١١٤٥ هەتا ١١٥٤)هەروا بڕوانە عومدە(ج/١ ل-٩٣).

جا كاتێ بەوردی سەرنجی هەموو گێڕانەوەكانی ئەم فەرموودەیەت دا لەو كتێب‌و بابانەدا كەتیایانا ریوایەت كراوە، بۆت دەردەكەوێ كەعیلمی حەدیث چ دەریایەكی بێ پەیە، وەزوربەی مەلاكانی ئەم سەردەمە چەندە لێ ی بێ ئاگان!

٧٦- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِث (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ تَزَوَّجَ ابْنَةً لِأَبِي إِهَابِ بْنِ عَزِيزٍ فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ بها فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ مَا أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرْضَعْتِنِي وَلَا أَخْبَرْتِنِي فَرَكِبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ فَسَأَلَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ فَفَارَقَهَا عُقْبَةُ وَنَكَحَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ). (الحديث ٨٨- أطرافه في: ٢٠٥٢، ٢٦٤٠، ٢٦٥٩، ٢٦٦٠، ٥١٠٤).

عوقبەی كوڕی حارث (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنێكم مارەكرد، كچی ئەبوئیهابی كوڕی عەزیز بوو، ئافرەتێكی رەشمان لێ پەیدا بوو دەیگوت: مەمكم داوە بەهەردووكتان، منیش پێیم گوت: من ئاگام لەشتی وانییە كەتۆ مەمكت دابێ بەمن، هەتا ئێستایش قسەی وات بەمن نەگوتووە، ئەوجا سوار بووم‌و چووم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەو لێیم پرسی، فەرمووی: چۆن دەبێ، تازە گوتراوە كەشیرتان بەیەكەوە خواردووە، ئەو ژنە بەقسەی خۆی دەڵێ گوایە مەمكی داوە بەهەردووكتان واز لەو ئیشە بێنە، عوقبەیش لێی جیادەبێتەوەو ژنەكە شوودەكات بەمێردێكی تر.

### راڤەو شیكردنەوە:

عوقبە (رەزای خوای لێ بێ) صەحابی یە، رۆژی ئازادكردنی مەككە موسوڵمان بووە، سێ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە لەموسلیم دا فەرموودەی نییە، ئەبوداوودو

نەسائیو تیرمیزی فەرموودەی عوقبەیان گێڕاوەتەوە: (ت-٣ ل-٧١ ف-٤ = تاج-٢ ز-٢٠ ژ-٢٠٧٩ ج-٤).

٧٧- عَنْ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنْ الْأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ وَهِيَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِخَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنْ الْوَحْيِ وَغَيْرِهِ وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ فَنَزَلَ صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا فَقَالَ أَثَمَّ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي فَقُلْتُ طَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ لَا أَدْرِي ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ قَالَ لَا فَقُلْتُ اللَّهُ أَكْبَرُ). (الحديث ٨٩ ـ أطرافه في: ٢٤٦٨، ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥١٩١، ٥٢١٨، ٥٨٤٣، ٧٢٥٦، ٧٢٦٣)[٦٨]

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منو دراوسێیەکی ئەنصاریم لەناو خێڵی بەنو ئومەیەی کوڕی زەیدا بووین، کەئەم خێڵە گوندێکن لەگوندەکانی دەوروبەری مەدینە، کەچەند گوندێکن لەلای سەرووی مەدینەوە، لەلای خۆرهەڵاتیەوە، ناسراون بە (عەوالی مەدینە) هەیانە دوو میل لەمەدینەوە دوورە، هەیانە هەشت میل لێ یەوە دوورە، منو ئەم هاوسێیەم بەسەرە دەچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەواڵ زانینو دەنگوباسی سرووشو شتی وا، دراوسێکەم کەناوی عوتبانی کوڕی مالیك بوو، ڕۆژێ ئەو دادەبەزی بۆناو شارو ڕۆژێ من دادەبەزیم، ئەو ڕۆژەی کەمن دادەبەزیم هەواڵی ئەو ڕۆژەم بۆی دەبردەوە لەبارەی سرووشو شتی واوە، کەئەویش دادەبەزی هەمان شتی دەکرد.لەو سەردەمەدا مەترسیمان لەپاشایێ لەپاشاکانی غەسسان هەبوو، وامان بیستبوو کەدەیەوێ بەلەشکرەوە بێتە

(٦٨) أخرجه مسلم في الطلاق (عينى - ٢- ١٠٤ رقم: ٣١) - المترجم = رقم-٣٦٧٩ شيحا.

سەرمان، زۆر لێی دەترساین، ئەو لەسەرەی خۆیا دابەزیو هاتەوە لەناکاو تەماشام کرد ئەو هاوڕێ ئەنصارییەم بەتوندی دای لەدەرگاو گوتی: بیکەرەوە، بیکەرەوە! ئەرێ خۆی لەوێ یە؟ منیش شەڵەژامو دەرچووم بۆلای، گوتم: دیارە کابرای غەسسانی هاتۆتە سەرمان! گوتی: بەڵکوو لەوە خراپتریش رووی داوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەناری لەخێزانەکانی گرتووە!

منیش رۆیشتم بۆ مەدینەو چووم بۆلای حەفصەی کچم تەماشام کرد وادەگری، گوتم: ئەوە چییە؟ پێغەمبەر تەلاقی داون؟ گوتی: نازانم. ئینجا چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرلەوە دابنیشم هەر بەپێوە لێیم پرسی: ئایا ژنەکانتت تەلاق داوە؟ فەرمووی: (نەخەیر) لەخۆشی یاندا گوتم: (الله اکبر). (ت-٧ ل-٢٠٦ ف-٢ تاج-٤ ز-٤٧ ژ-٤١٧٩ ج-٤).

٧٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَا أَكَادُ أُدْرِكُ الصَّلَاةَ مِمَّا يُطَوِّلُ بِنَا فُلَانٌ، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْ يَوْمِئِذ، فَقَالَ أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مُنَفِّرُونَ فَمَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ فِيهِمْ الْمَرِيض وَالضعِيفَ وَذا الْحَاجَةِ. (الحديث ٩٠ ـ أطرافه في: ٧٠٢، ٧٠٤، ٦١١٠، ٧١٥٩) [٦٩]

ئەبومەسعوودی ئەنصاری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەر فیسارەکەس لەجەماعەت دوا دەکەوم چونکە ئەوەندەی درێژ دەکاتەوە بۆمان، منیش زەبوونم توانای ئەوەم نییە! ئەبومەسعود فەرمووی: هەرگیز لەئامۆژگاری کردندا وەك ئەو رۆژە ئاوا پێغەمبەرم بەتوڕەیی نەبینیوە. ئنجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی موسوڵمانینە! هەندێ لەئێوە مەردوم دەرەوێننەوەو بەنوێژی دوورو درێژ خەڵك لەمزگەوتو نوێژی جەماعەت دەتەکێننەوە، جاهەرکامێکتان

(٦٩) أخرجه مسلم في الصلاة. (عينى ـ ٢ ـ ٣٢)- المترجم = رقم-١٠٤٤ شيحا.

پێشنوێژی هەر نوێژێ دەکا بۆ ئەم خەڵکە بانوێـژێکی کورتی رێکوپێکیـان بـۆ بکا، چونکە ئەو خەڵکە هەیانە لازەبوونە، هەیانـە پـیرە، هەیانـە ئـیش‌و کاری تری هەیەو پەلەیەتی، بـەڵام ئەگـەر یـەکێکتان بەتـەنها خـۆی نوێـژی دەکـرد، ئەوە چەندێ ئارەزوو دەکـا بائەوەنـدەی درێـژ بکاتـەوە (ش/ د/ ت/ ن: تــ ال ـ ٣٨٤ ف ـ ٢ز ـ ١٢٧ ژ-٧٦٣) واتـە: لەسـەر فەرمایـشتی تـاجول ئوصـوول بـەرگی یەکەم، بەکوردی، لاپەڕە سێ سەدو هەشتاو چوار، فـەرموودەی دوەم، زنجـیرەی سەدوبیـستو حـەوت ژمـارە: ٧٦٣ چاپی چـوارەم، ئـەم فەرموودەیـە شـەیخان‌و ئـەبوداوودو تەرمـەزی‌و نەسـائیش گێڕاویانەتـەوە. ئـیتر لەهـەر شـوێنێ ئـەم هێمایانە هەبوو هەروا).

٧٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ اللُّقَطَةِ فَقَالَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اعْرِفْ وِكَاءَهَا أَوْ قَالَ وِعَاءَهَا وَعِفَاصَهَا ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً ثُمَّ اسْتَمْتِعْ بِهَا فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ قَالَ فَضَالَّةُ الْإِبِلِ؟ فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ أَوْ قَالَ احْمَرَّ وَجْهُهُ فَقَالَ: وَمَا لَكَ وَلَهَا مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا تَرِدُ الْمَاءَ وَتَرْعَى الشَّجَرَ فَذَرْهَا حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا قَالَ فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ قَالَ: لَكَ أَوْ لِأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ). (الحديث ٩١ ـ أطرافه في: ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢).[٧٠]

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیـاوێ لـەبارەی شـتی دۆزراوەوە لە پێغەمبەری پرسی: حوکمی ماڵی دۆزراوە چییە؟ فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): دەمـبین‌و پریاسـکەو بوخـچەو توورەکەکـەی نیـشانە بکـە، وەهـەتا ساڵێ ناونیشانی هەڵبدە، جا ئەگەر لەو ماوەیەدا خاوەنەکەی پەیـدا بـوو ئـەوە بیدەرەوە پێی، ئەگینا چی لێ دەکەی بیکە.

---

(٧٠) أخرجه مسلم في القضاء: (عينى ـ ٢ ـ ١٠٨ رقم: ٣٣) — المترجم = رقم-٤٤٧٣ شيحا.

گوتی: ئەی بڕیاری وشتری بزر چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): دەخڵت نەبێ بەسەریەوەو دەغڵی مەکە، ئەوکوندەو پێڵاوی خۆی پێیە، بۆخۆی ئاودەخواتەوەو لەوەڕدەخوا هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە.

گوتی: ئەی بڕیاری بزنو مەڕی گومبوو چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر تۆ نەیبەیتەوەو خاوەنەکەشی نەیدۆزێتەوە دیارە کەگورگ دەیخوا! :

(ت ـ ٢ل ـ ٣٧٨ز ـ ١٨٤ف ـ ٢+٣+٤ = ژ-١٩٦٠، ١٩٦١، ١٩٦٢).

## شیکردنەوە:

زەید (٨١) فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا پێنجی هەیە لەتەمەنی (٨٥)ساڵیدا لەکووفە مردووە.

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباسی زانستەوە لەوێدایە کەدەفەرموێ: (فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ) پیاوەکە کەلە پێغەمبەری پرسی: ئەی بڕیاری وشتری بزربوو چییە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) واتووڕەبوو هەردوو سەرکوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): دەخڵت نەبێ بەسەریەوە ...تاد. چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەزاناو ئامۆژگار بۆی هەیە لەکاتی فێرکردنو مامۆستاییو ئامۆژگاری کردندا لەسەر حەق تووڕەببێ.

٨٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ قَالَ رَجُلٌ مَنْ أَبِي؟ قَالَ: أَبُوكَ حُذَافَةُ. فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (الحديث ٩٢ ـ طرفه في: ٧٢٩١).[٧١]

---

(٧١) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: توقيره (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) وترك إكثار سؤاله، رقم: ٢٣٦٠ = ٦٠٧٨.

ئـەبو موسـای ئەشـعەری (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: رۆژێ لـەبارەی چـەند شـتێکەوە لەپێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسـیارکرا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حـەزی لـەباس کردنـی ئـەو شـتانە نـەبوو، جاکـاتێ پرسـیارێکی زۆری لێکـرا تووڕەبوو، چونکە پرسیارەکان پێویست نەبوون، بگرە بۆ بەربـەرەکانی بـوون، بەڵام فـەرمووی: (بـەئارەزووی خۆتـان پرسـیارتان چییە لـێم بکـەن وەڵامتـان دەدەمـەوە، بـۆ وەڵامەکـەی دانـامێنم، چـونکە خـودا ڕێگـەی ئـەوەی پێـداوم) عەبـدوڵڵای کـوڕی حـوذافـە، کەلـەکاتی دەمـەقاڵێ دا تانـەی ئـەوەیان لێ دەدا کـەکوڕی بـاوکی خـۆی نییـە، بـۆ راسـتیو دروسـتی ئـەم تۆمەتـە عـەرزی پێغەمبـەری کـرد: قوربـان! مـن حاڵەکـەم وایـە، ئـەو خەڵکـە وام پـێ دەڵێن: بفەرموو بۆم ساخ بکەرەوە: باوکی من کێیـە؟ حوذافـەیە کەباوکی شـەرعیمە یاکەسـێکی تـرە؟ فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): تـۆ کـوڕی حـوذافـەیو حـوذافـە باوکتە) پیاوێ تریش هەڵساو گوتی: قوربان! ئەی باوکی مـن کێیـە؟ فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) سالمەکە ئازادکراوی شەیبەیە).

جاکـاتێ ئیمـامی عومـەر (رەزای خـوای لـێ بـێ) تەماشـای تـووڕەیی کـرد لـەرووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیارە، مەترسـی ئـەوەی لێ پەیـدا بـوو کەپرسـیارەکان سەربکێـشن بـۆ پێنـاخۆش بـوونی خـواو پێغەمبـەر، لەبەرئـەوە عـوزری بـۆی هێنایـەوەو عـەرزی کـرد: قوربـان! لەسەردەسـتی خـودای گـەورەو مـەزن دا پەشیمانین لەهەر پرسیارێ کەتۆ پێت ناخۆش بێ!

٨١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ (أَنَّـهُ كَـانَ إِذا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثلَاثا). حَتىَّ تفهم عنه، وإذا أتى على قـوم فـسلم علـيهم سـلم عليهم ثلاثا (الحديث ٩٤ ـ طرفاه في: ٩٥، ٦٢٤٤).

ئەنـەس (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەگوتەیـەکی دەفەرموو لـەبارەی رون کردنـەوەی ئاییینـەوە، سـێ جار دووبـارەی دەکـردەوە

هەتا موسوڵمانان بەجوانی لێ ی تێ بگەن. (ت/ ئەحمەد ـ تاج-٤ ل-٢٦٢ = تاج-٣ ز-٨٦ ژ-٣١٠١ هەتا ٣١٠٥) کاتێکیش دەچوو بۆلای کۆمەڵێ‌و، سلاوی لێ دەکردن، سێ جار سلاوی لێ دەکردن، یەکەمجار بۆ داوای ڕێگەپێدان، دوەمجار بۆ چاکوچۆنی، سێیەمجار بۆ خواحافیزی.

٨٢- عَنْ أبي موسى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَان رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذا أَدَّى حَقَّ اللّٰهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يطؤها، فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ). (الحديث ٩٧ ـ أطرافه في: ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣).[٧٢]

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم سێ کەسە دوو پاداشیان بۆ هەیە:

یەکەم: پیاوێ کەلەسەر ئایینی جوولەکە یاگاوربێ‌و پاشان موسوڵمان بێ،

دووەم: کۆیلەیێ کەهەم مافی خوداو مافی ئاغاکانی بەجوانی بەجێ بهێنێ،

سێیەم: پیاوێ کەنیزەکێکی وای هەبێ، کەبۆی حەلاڵ بێ، بەجوانی تەمێی بکاو، فێری خوێندەواری‌و زانستی بکا، ئنجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆخۆی، وەمەبەستی لەم کارەیش ساخ ڕەزامەندی خودابێ).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوە کەخوێندن‌و فێربوون‌و زانستێ کەشەرعی پیرۆز پەسەندی بکا، کەبرێتی یە لەهەر زانستێ کەبەرژەوەندی ڕەوای موسوڵمانانی تیابێ: (تاج-٣ل-٨٣ = تاج-٢ ز-٣٤ ژ-٢١٠١ج-٤).

---

(٧٢) أخرجه مسلم في لإيمان، باب: وجوب الإيمان برسالة محمد ... رقم:١٥٤ = ٣٨٥ شيحا.

٨٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهما) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَظَنَّ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعْ النساء فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ فَجَعَلَتْ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْقُرْط وَالْخَاتَمَ وَبِلَالٌ يَأْخُذ فِي طَرَفِ ثَوْبِهِ). (الحديث ٩٨ ـ أطرافه في: ٨٦٣، ٩٦٢، ٩٦٤، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ٤٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨١، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥).[٧٣]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیلالی لەگەڵ خۆی بردو لەناو پیاوانەوە ڕۆیشت بۆناو ژنان بۆ تەمێو ئامۆژگارییان، بەزەینی خۆی ژنان وەعزەکەیان نەبیستووە، جا وتاری بۆیان داو مەوعیزەی بۆیان خوێندەوەو ئامۆژگاری کردنو لەناو توێژەی ئەوەدا فەرمانی پێکردن بەخێرکردن، ئیتر ژنەکان فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاری تێ کردنو دڵیان گەرم بوو، دەستیان کرد بەخێر کردن، ئافرەتی وایان تیادا هەبوو گوارەکەی لەگوێی خۆی دادەکەندو دەیکرد بەخێرو هەڵی دەدایە ناو کۆشی بیلالەوە، هەیشیان بوو ئەنگوستیلەکەی لەپەنجەی خۆی دادەکەندو هەڵی دەدایە ناو چاکی بیلالەوە، چونکە بیلال چاکی خۆی گرتبۆوە، ژنەکان هەرخێرێکیان دەکرد دەیانکردە کۆشی ئەوەوە).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەطای کوڕی ئەبو ڕەباح لەئیبنوعەبباسەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، عەطا یەکێکە لەگەورە پیاوە ناودارەکانی تابیعین، لەهەر چوار عەبدوڵڵاکان گێڕانەوەی ئەنجام داوە،لەئاخرو ئوخری جێنشینیی عوثماندا لەدایك بووە، عەطا دەفەرموێ: لەبیرمە کە عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) کوژرا، لەمەککەدا پەروەردە بووە، لەسەرەنجاما بوو بەموفتی شاری مەککە، بەئیتتیفاق پیاوێکی شکۆمەندی زۆر بەدینی بتمانەپێکراو بووە، حەفتا حەجی کردووە، بەڕەگەز

(٧٣) أخرجه مسلم في اول العيد، وفى باب: ترك الصلاة قبل العيد وبعدها رقم: ٨٨٤.=٢٠٥٤.

حەبەشی بووە، پیاوێکی ڕەشی یەکەڵە چاوی لووت فسی دەست گۆجی پێ شەل بووە، لە ئاخرو ئۆخری تەمەنی دا کوێر بووە، بەڵام بەهۆی عیلمو عەمەلەوە گەیشتۆتە ئەوپەڕی پایەبەرزی، فەقێی ئیبنوعەبباس بووە کاتێ ئیبنوعەبباس گیانی سپارد عەطا لەجێگەکەی دانیشتو سەر روشتەی ئەڵقەی کۆڕی زانستەکەی درا بەعەطا، ئیمامی لەیث فەقێ ی بووە. لەتەمەنی هەشتا ساڵی دا لەساڵی سەدوپازدەی کۆچی دا کۆچی دوایی کردووە. هەندێ لەفەتواکانی غەریبە، وەك ئەوە دەفەرموێ: هەرکەسێ بیەوێ بچێ بۆسەفەر، لەپێش ئەوەدا لەشارەکەی خۆی دەربچێ هەقی کۆکردنەوەی نوێژی هەیە. واتە: هەقی جەمعی نوێژی هەیە.

٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلُنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيث أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيث، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ). (الحديث ٩٩ ـ طرفه في: ٦٥٧٠).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ شادمانترین کەسە بەشەفاعەتو تکای تۆ لەرۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: ئەبوهوڕەیرە! خۆشم گومانم هەروا بوو کەکەس لەپێش تۆدا ئەمەم لێ نەپرسێ وەتۆ یەکەم کەس بی کەئەم پرسیارەم لێ بکەی، چونکە دەتبینم ئەوەندە حەریسو سووریت لەسەر فەرموودەو حەدیث: لەرۆژی قیامەتدا بەختەوەرترین کەس بەتکای من ئەو کەسەیە کەبەدڵێکی سافو بێگەرد، یافەرمووی: کەبەسینەیەکی ساف بڵێ: لاإله الا الله: هەرخودا خودایەوبەس).

٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِض الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنْ الْعِبَادِ

وَلَكِنْ يَقْبِضِ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا). (الحديث ١٠٠ ـ طرفه في: ٧٣٠٧) [٧٤]

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەنەبێ کەخودا لەپڕ عیلمو زانین لەبەندەکانی خۆی بگرێتەوە، بەسڕین بیسڕێتەوە لەسینگیان، بەڵام خودا بەرودوا زاناکان دەباتەوە بۆلای خۆی، تاوای لێ دێ عیلمو زانین نامێنێو هەڵ دەگیرێ، جاکاتێ نەزانین ماو نەزانا ما، ئەوجا ڕەشە خەڵکەکە سەرۆکی نەزانو نەدان بۆ خۆیان دادەنێنو دەست دەکەن بەپرسیار کردن لێیان، جائەوانیش بەنەزانیو نادانی فەتوایان بۆ دەدەن، ئیتر هەم خۆیان لەڕێ دەردەچنو هەم خەڵکی تریش لەڕێ دەردەکەن!). (ش/ت/ تاج ـ ال ـ ٩٢ = ز-١٧ ژ-١٢٦).

٨٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (قَالَتْ: النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِنْ نَفْسِكَ فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ فكَانَ فِيمَا قَالَ لَهُنَّ مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ ثَلَاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلَّا كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنْ النَّارِ فَقَالَتْ امْرَأَةٌ وَاثْنَتَيْنِ فَقَالَ وَاثْنَتَيْنِ وفي ريواية عن أبي هريرةَ (لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ). (الحديث ١٠١ ـ طرفاه في: ١٢٤٩، ٧٣١٠) (الحديث ١٠٢ طرفه في: ١٢٥). [٧٥]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتان عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەر پیاوان خزمەتی تۆ بەرئێمە ناکەوێ، زۆرتر ئەوان لەخزمەتتا فێری زانستو کاروباریی ئایین دەبن، بفەرموو ڕۆژێکمان لەخزمەتتا بۆ دیاری بکە هەتا فێری زانستی ئایینیمان بکەی.

---

(٧٤) أخرجه مسلم في العلم، باب: رفع العلم وقبضه، رقم: ٢٦٧٣ = ٦٧٣٧ شيحا.

(٧٥) أخرجه مسلم في البر والصلة والآداب، باب: فضل من يموت له ولد فيحتسبه، رقم:٢٦٣٤ = ٦٦٣٩ هەتا ٦٦٤٦.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵێنی رۆژێکی پێیان داو لەو رۆژە دیاری کراوەدا چوون بۆ خزمەتی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بەپەندو ئامۆژگاری کردنیان‌و، لەبارەی کاروباری ئایینی‌و کۆمەڵایەتییەوە فەرمانی پێ کردن، بۆ نموونە پێ ی فەرموون: هەرژنێ سێ جگەر گۆشەی لەپێش خۆیەوە بمرن دەبن بەشووراو پەرژین بۆی بەدەوری ئاگری دۆزەخ دا. ئافرەتێکیش گوتی: ئەی ئەگەر کەسێ دوو منداڵی لەپێش خۆیەوە بمرێ چۆنە؟ فەرمووی: ئەگەر دوانیشی بمرێ هەروا) (ش/ ن/ تاج ـ ال ـ ٥٣٦ف ـ ٣زـ ١٩٩+ف ـ ١ + ف ـ ٢ + ف ـ٤ + ف ـ ٥+ ٦ + ٧ = ژ-١٠٤٦ هەتا ١٠٥٢).

## راڤەو شیکردنەوە:

پیاویش لەم بڕیارەدا ڕێك وەك ژن وایە، چونکە گشت بڕیار (حوکم) ێکی شەرع هەموو موکەللەڤ دەگرێتەوە، چ نێرینەبێ چ مێیینە، مەگەر بەڵگەو نیشانەیێ هەبێ کەببڕێ بەسەر لایەکیاندا.

٨٧– عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قالت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ حُوسِبَ عُذبَ قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ أَوَلَيْسَ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا قَالَتْ فَقَالَ إِنَّمَا ذلِكِ الْعَرْض وَلَكِنْ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَهْلِكْ). (الحديث ١٠٣ ـ أطرافه في: ٤٩٣٩، ٦٥٣٦، ٦٥٣٧).[٧٦]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا بمکا بەقوربانت! ئەی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێ: (فأما من أوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حساباً يسيرا) (٨٤/٧-٨) واتە: هەرکەسێ بەدەستی ڕاستی نامەی کرداری خۆی لەقیامەتدا وەربگرێ بەئاسانی حیساب‌و لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ). ئەویش فەرمووی (دروودی

---

(٧٦) أخرجه مسلم في الجنة وصفة نيعمها وأهلها، باب: إثبات الحساب، رقم: ٢٨٧٦=٧١٥٦ شيحا.

خودای لەسەر بێ): ئەوەی کەلێرەدا وادەفەرموێ مەبەس دەور کردنەوەو رانواندنێکی سەرەتایی یە کەخودا لەگەڵ بەندەکەدا دووبەدوو چاوێ بەنامەی کرداریدا دەخشێنێو پێی دەفەرموێ: ئایا پێ دەنێیت لەم گوناهە، ئەویش عەرزی دەکا: بەڵێ: خودایش دەفەرموێ: مەترسێو من لەجیهاندا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئەوا ئەمڕۆ کەیش خۆش دەبم لێت لەو گوناهانە، ئەمەیش بەس بەدیمەن حیسابو لێپرسینەوەیە، ئەگینا هەرکەسێ لەحیسابو لێپرسینەوەدا لەگەڵیدا بکۆڵنەوە بەرباد دەبێ). (ش/ت/ تاج ـ ٧ل ـ ٢٤٠ تاج-٤ ز-٦٧ ژ-٤٢٠٧).

٨٨- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: سمعت رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) (يَوْمِ الْفَتْحِ يقولُ قولاً سَمِعَتْهُ أُذنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَأَبْصرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ حَمِدَ اللَّهَ تعالى وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ تَعالى وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ فَلَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا وَلَا يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا فَقُولُوا إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ وَإِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ وَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ). (الحديث ١٠٤ ـ طرفاه في: ١٨٣٢، ٤٢٩٥) [٧٧]

عەمری کوڕی سەعید خەریك بوو لەشکری دەنارد بۆسەر ئیبنوزوبەیر لەمەککە، ئەبوشورەیحی ئەل ـ عەدەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی فەرموو: ڕێگەم بدە ئەی میر! تافەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کەلەپاش فەتحی مەککە بەدوو ڕۆژ، لەوتارا لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیم بیست، بەهەردوو گوێی خۆم گوێم لێ ی بوو، وەبەدڵ دڵم لەلای بوو، وەبەچاوی خۆم سەیریم دەکرد، لەوکاتەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم فەرموودەیەی دەفەرموو کەسوپاسو ستایشی خودای کردو ئنجا فەرمووی: مەککە خودای گەورە خۆی

---

(٧٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: تحريم مكه و صيدها وخلاها وشجرها ولقطعتها، رقم:١٣٥٤ = ٣٢٩٣ شيحا.

کردوویەتی بەبەستو حەرەمو ئەم کارانەی تیادا حەرام کردووە، وەخەڵك لەخۆیانەوە نەیان کردووە بەبەستو حەرەمو ئەو کارانەی تیادا قەدەغە بکەن، جا کەوا بوو دروست نییە بۆکەسێ کەباوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دواڕۆژ هەبێ کەخوێنی بەناهەق تیابڕێژێ، یادارو درەختی داپاچێ، وەئەگەر دنیابوو کەسێ کوشتارەکەی ڕۆژی فەتحی مەککەی پێغەمبەری کرد بەبەهانە بۆئەوەی شەڕو شۆڕی تیابەرپا بکا، ڕێگەی مەدەنو بیانووی ببڕنو پێی بڵێن: کەوا خوا ڕێگەی پێغەمبەری خۆی بۆئەوەدا بوو، بەڵام ڕێگەی ئێوەی بۆ ئەمە نەداوە، تەنانەت بۆ منیش لەو ڕۆژەدا بۆ ماوەیەکی کەم ڕێگەی دا، کەمەوداکەی لەبەیانەکییەوە بوو هەتا عەسر، بەڵام ئێستا وەك سەردەمی پێشوو مەککە قەدەغە بۆتەوەو بۆتەوە بەبەست (حەرەم، کوشتو بڕی تیا ناڕەوایە).

جابا ئەوەی کەئێستا لێرەیەو حازرەو بەدیارەوەیەو بەگوێ ی خۆی ئەم فەرمایشتانە لەخۆم دەبیستێ باریان بگەیەنێ بەوکەسانەی کەئێستا لێرەنین!

جا گوترا بەئەبو شورەیح: ئەدی وەڵامی عەمر چی بوو؟ فەرمووی: عەمریش گووتی: من ئەمە لەتۆ باشتر دەزانم ئەی ئەبو شورەیح! بەڵام یەست (حەرەم) ی مەککە پەنای پیاوی یاخیو پەنای پیاوی خوێنڕێژی هەڵهاتوو هەروا پەنای کزیکاری دزیکاری راکردوو نادات!). (فەرموودەی شەستو یەك لەم کتێبە پیرۆزە تەماشا بکە، تاج ـ ٢ل ـ ٢٦٣ = ژ-١٧٠ ز-١٣٠).

### راڤەو شیکردنەوە:

بەپێی ئەم فەرموودەیە راگەیاندنی زانست چین بەچین خودفەرزە (فەرزی عەینە) لەسەر خودی زاناو فەرزی کیفایەیە لەسەر نەتەوەی ئیسلام.

ئەبوشورەیح بیست فەرموودەی هەیە، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرە، یەك فەرموودەیشی لەبوخاریدا هەیە لەموسلیم دا نییە، یەکێ بووە لەهۆشمەندەکانی شاری مەدینە، ساڵی (٦٨) ك وەفاتی کردووە.

٨٩- عن علي (رَضي اللهُ عَنهُ) قال: سمعت رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقولُ: ( لاتكذبوا عليَّ فأنه من كذب علي فليتبوء مقعده من النار). (الحديث ١٠٦).[78]

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرزی پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: درۆ بەدەم منەوە مەکەن، چونکە هەرکەسێ بەئارەزوو درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێ باجێگەی خۆی لەدۆزەخا خۆش بکا (ب/ت/ تاج - ال - ٨٤ ز-١٥ ژ-١١٠).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ربیعی کوڕی حیراش دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەم لەعەلی بیستووە، ربیع کووفەیی یە تابیعی یە، پیاوێکی خواپەرستی وەرعداری ڕاستگۆ بووە، قەت درۆی نەدەکرد، دوو کوڕی هەبوو لەحەججاج یاخی بوون، بەحەججاجیان گوت: باوکیان قەت درۆ ناکا، هەواڵی کوڕەکانی لێ بپرسە ڕاستت پێ دەڵێ کەلەکوێن، کەسێکی نارد لێی پرسی، گوتی: وان لەماڵەوە، حەججاجیش گوتی: لەبەر ئەم ڕاستگۆی یەی تۆ والەهەردوکیان خۆش بووم. سوێندی خوارد کەنابێ پێ بکەنێ هەتا جێگەی خۆی نەزانێ کەبەهەشتی یە یادۆزەخی یە، ئیتر پێ نەکەنی تاپاش مردن، لەپاش مردن پێکەنی، ڕەبیعی برایشی هەروا، برایەکیشی هەبوو ناوی مەسعوود بوو لەپاش مردن قسەی

(٧٨) أخرجه مسلم في المقدمة، باب: تغليظ الكذب على رسول الله (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) رقم: ١=٢شيحا.

كـردا مـردوو شۆرەكەی كەشـۆردی دەیگـوت: (هـەتا لەشـۆردنەكەی بووینـەوە هەردەمی بەزەردەخەنەوە بوو) (بڕوانە/ عەینی/ ١٤٧/٢).

ئەمیرولموئمینین ئیمامی عەلی هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، زاوای پێغەمبـەرە، مێـردی فـاطیمـەی كـچیەتی، بـاوكی حەسـەنو حوسـەینە، بـەپێی پـەیمانی برایەتی بەستن (المواخاە) بـوو بـەبرای پێغەمبـەر، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (تۆ لەدونیاو قیامەت دا برای منی!) یەكێ بوو لـەو دەكەسـە كـە پێغەمبـەر مـژدەی بەهەشـتی پـێ دابـوون، خەلیفـەی چـوارەم بـوو، پیـاوێكی زاهیـدی دنیـا نەویستی خواپەرسـت بـوو، هـەتا بلێ ی زانـاو دانـاو هـەقانیو رەوانبێژ بـوو، نەهجولبەلاغەكەی بەلگەی ئـەم قسەیەیە، لەهـەموو جـەنگو غەزاكاندا لەخزمەت پێغەمبەردا بوو، جگە لەغـەزای تـەبووك، زۆر بەمنـداڵی موسوڵمان بووە، لـەماڵی پێغەمبـەردا پـەروەردە بـووە، لـە پێغەمبـەرەوە (٥٨٦) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، بیـستیان پەسـەندی شـەیخەینە، بوخـاریش بـەبێ موسلیم نـۆی تریـانی لەصـەحیحی بوخاریـدا گێڕاوەتـەوە، موسـلیمیش بـەبێ بوخـاری پـازدەی تریـانی گێڕاوەتـەوە. كەواتـە (٢٩) فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، وە (٣٥) فـەرموودەی لەموسـلیم دا هەیـە، سـەرجەمی فـەرموودەكانی لەصـەحیحەین دا دەكاتـە: ٢٠+ ٩+ ١٥= ٤٤ چلو چـوار فـەرموودە. پێـنج سـاڵ جێنـشینی كـردووە، بەشـەهیدی مـردووە، تەمـەنی شەسـتو سێ ساڵ بـووە، لەشـەوی یـەك شـەمە لـەنۆزدەی رەمـەزانی سـاڵی چـلی كۆچـی دا، لەكووفـە وەفاتی كردووە، پیاوێكی گـەنم رەنـگ بـوو، سـەرو ڕیشی پـاك سـپی بووبـوون، چوارشانەیەكی تێكسمڕاو بـوو، دەتگـوت مـانگی چـواردەیە، تـەنیا خـۆی لـەناو یـارانی پێغەمبـەردا نـاوی عـەلی كـوڕی ئـەبوطالیبـە، بـەلام لـەناو فـەرموودە گێڕەوەكانـدا هەشت كەسی تر بەم ناوە هەیـە: لـە (تـاج ـ ٥ل ـ ٥٩ تـاج-٣ ز-٩ ل-٥٨٣ ژ-٣٢٨٨ هەتا ٣٣١١ ج-٤) بەكوردی باسی مناقیبی كراوە.

٩٠- عن سلمة بن الأكوع (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: سمعت رسول الله (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يقول: ( من يقل على مالم أقل فليتبوء مقعده من النار). (الحديث ١٠٩)

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): هەرکەسێ شتێ کەمن نەیم گوتبێ بەدەم منەوە بیلێ، خودا لەناو ئاگری دۆزەخا دەیگەوزێنێ).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم ڕشتەیە لەڕشتە سێ کەسیەکانی بوخاری یە، کەبرێتین لەمامۆستاکەی بوخاریو تابیعی یەكو صەحابی یەك، کەئەم سێ کەسەن: مەککی کوڕی ئیبراهیمو یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەیدو سەلەمە، ئەم جۆرە ڕشتەیە زۆر دەگمەنو نایابە، لەبوخاریدا پتر لەبیست فەرموودەی ڕشتە سێکەسی هەیە، ئەم فەرموودەیە یەکەمیانە، لەڕشتەی سێ لایی (سند ثلاثي) بڵندتر لەبوخاریدا نییە، سەلەمە ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، کەناوداره بە(بیعة الرضوان) حەفتاوحەوت فەرموودەی هەیە، شازدەیان پەسەندی هەردوولان، بیستو یەکیان وان لەبوخاریدا بیستو پێنجیان وان لەموسلیم دا، سەرجەمی فەرموودەکانی لەصەحیحەین دا دەکاتە: ١٦+ ٥+ ٩= ٣٠ فەرموودە. سەلەمە پیاوێکی ئازای تیر ئەندازی تیژڕەوبوو، لەڕاکردندا وڵاخی بەرزەی بەجێ دەهێشت، پیاوێکی بەهرەمەندی خێرکەر بوو، کۆمەڵەی فەرموودە زانەگەورەکان کەناودارن بە (الجماعة) فەرموودەیان لەسەلەمەوە گێڕاوەتەوە، وەك: شافیعیو ئیمام ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو ئەبوداوودو تیرمیذیو نەسائیو بەیهەقیو دارەقوطنیو..تاد.

دەڵێن گورگ قسەی لەگەڵ دا کردووە، سەلەمە دەفەرموێ: لەپێش ئیسلام بوونما جارێ گورگێ ئاسکێکی ڕفاند، نیشتمە سەری لێیم سەندەوە، گورگەکە گوتی: خانە خراپ چیتە بەسەر منەوە ڕزقم دەبڕی، خۆ ئەمە ماڵی تۆ نییە،

رزق‌و رۆژی یەکە، خوا ڕەخساندویەتی بۆم کەچی تۆ لێم دەسەنێتەوە. منیش گوتم: ئەی بەندەکانی خودا! بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە، خۆ ئەوەتە گورگ قسە دەکا! کەچی گورگەکە گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا والەناو ئەو بنکە دارخورمایانەدا بانگتان دەکا بۆسەر خواپەرستی کەچی ئێوە هێشتا هەر دەست لەبتپەرستی هەڵناگرن!! ئیتر منیش ڕێك چووم موسوڵمان بووم، سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا ، لەمەدینە لەساڵی حەفتاو چواری کۆچی دا مردووە. (عینی/٢/١٥٣).

٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي وَمَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ فِي صُورَتِي وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ). (الحديث ١١٠ ـ أطرافه في: ٣٥٣٩، ٦١٨٨، ٦١٩٧، ٦٩٩٣).[٧٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ناوەکەم بکەن بەناو بۆخۆتان بەڵام کەسناوەکەم مەکەن بە کەسناو بۆخۆتان، واتە: موحەممەدو ئەحمەد کەناوی منن بیانکەن بەناوی خۆتان. وەهەر کەسێکیش لەخەویدا من ببینێ ئەوە بەڕاستی لەو خەوەدا بەخەو منی دیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بەمن‌و ناتوانێ خۆی بگۆڕێ‌و خۆی بباتە شێوەی منەوەو بچیتە خەوی خەڵکەوە بەناوی منەوە. هەرکەسێکیش بەئارەزوو درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێ باجێگەی خۆی لەدۆزەخا خۆش بکا).

## شیکردنەوە:

فەرموودەی: (من کذب علی) موتواتەرە، هەر لەم شوێنەدا بوخاری لەپێنج سەحابەوە دەیگێڕێتەوە، حەدیثی موتەواتەر ئەوەیە لەهەموو قۆناغێکا

(٧٩) اخرجه مسلم في المقدمة، باب: تغليظ الكذب على رسول الله (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) رقم: ٢ = ٤ شيحا.

خەڵکێکی زۆر بیگێڕنەوە، بەشێوەیەکی وا کەعەقڵ قەبووڵ ناکا کەئەو گشتە خەڵکە لەو هەواڵەدا درۆبکەن. ئەم چەند بەهرەیە لەم فەرموودەیەدا هەیە:

١- درۆ کردن بەدەم پێغەمبەرەوە بەتاوانێکی گەورە دادەنرێ، هەتا درۆکەی خەونیش بێ هەر وایە، وەك ئەوە کەسێ بەدرۆ بڵێ: لەخەوما بەخزمەت پێغەمبەر گەییشتم، یالەخەوما دێنی گۆڕی پێغەمبەرم کرد، یا گوێم لەقسەی بوو.

٢- بینینی پێغەمبەر لەخەوندا دروستەو روودەدا، بەڵام کاتێ ئەو خەونە بەڕاست دادەنرێ، کەخەوبین پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەیێ ببینێ کەلەشێوەی راستەقینەی کاتی ژیانی خۆی بچێ، وەك لەسوننەت دا روون کراوەتەوە. دەنا ئەوە باسێکی دوورو درێژە: (عەینی ـ٢/ ١٥٣ ـ ١٥٨).

٣- کەسێ بەخەو بەخزمەت پێغەمبەر بگابەهرەیەکی گەورەیە، بەڵگەی خێرو خۆشی یە، بەڵام بەوە نابێ بەسەحابە، ئەو فەرموودەیەیشی کەلەو خەونەدا لە پێغەمبەری دەبیستێ سودو بەهرەی لێ وەردەگیرێو بەپێی شوێن راڤەو واتا دەکرێ، مەرج نییە لەسەر ظاهیری خۆی بێ، وەك ئەوە بەکەسێ لەخەوندا بفەرموێ: ئەو مەلایە بکوژە، مەلاکەیش پیاوێکی باش بێو کوشتنی ناڕەوابێ، ئەوە شتی وا نابێ بە (حوججە)و ناکرێ بەبەڵگە لەسەر رەوا بوونی ئەو تاوانە، بەهەرحاڵ مرۆڤ لەکاتی خەودا زەبتی نامێنێ، زەبتو کۆنترۆڵیش مەرجە بۆ راوی: (تاج ـ ٨ ل ـ ٢٣ تاج ـ٤ ل-٦٢٣ ز-٧ ژ-٤٢٦٧ هەتا ٤٢٦٩).

٩٢- وَعَنْهُ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أنَّ، النَبيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: (إنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ او القتل وَسَلَّط عَلَيْهِمْ رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ أَلَا وَ إِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَلَا تَحِلُّ لِأَحَدٍ بَعْدِي أَلَا وَإِنَّها أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ أَلَا وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ لَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا وَلَا يُعْضَدُ شَجَرُهَا وَلَا يَلْتَقِط سَاقِطَتَهَا إِلَّا لِمُنْشِدٌ وَمَنْ

قُتِلَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظرَيْنِ إِمَّا أن يَعْقَلْ وَإِمَّا أَنْ يُقَادُ أهل القتيلِ فَجاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ (يُقَالُ لَهُ أَبُو شَاهٍ) فَقَالَ اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اكْتُبُوا فُلانْ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ: إلاَّ الإذخَرَ يا رسول الله فإنا نَجْعَلَهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنا؟ فَقال النبي (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إلا الإذخر فَقَالَ: إِلَّا الْإِذخِرَ. (الحديث ١١٢ ـ طرفاه في: ٢٤٣٤، ٦٨٨٠) [٨٠]

**دیسان ئەبوهورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: ساڵی گرتنی مەککە هۆزی خوزاعە پیاوێکیان کوشت لەهۆزی بەنی لەیث، لەجیاتی کوژراوێکی خۆیان کەبەنی لەیث لەوەو پێش کوشتبوویان، جا کەئەمە عەرزی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کرا، سواری وڵاخەکەی بوو، وەوتارێکی دا، فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر مەککەی پاراست لەدەستدرێژی لەخاوەن فیلەکان کەئەبرەهەو لەشکرەکەی بوون، کەهاتبوون بۆ رووخاندنی کەعبە، وەك لەسوورەتی فیل دا باس کراوە، یا فەرمووی: خودای گەورە کوشتو کوشتاری لەناو مەککەدا قەدەغە کردووە، بەڵام بەپشتیوانی خودا پێغەمبەری خواو موسوڵمانەکان لەرۆژی ئازاد کردنی مەککەدا زاڵبوون بەسەر گرتنی ئەم شارەدا، بەڵام باش باش بزانن کەئەم شارە نەلەپێش مندا وەنەلەپاش من بۆ کەسی تر رەوا نەبینراوەو رەوا نابینرێ کەشەڕو شۆڕی تیابکا، ئاگاداربن هەتا بۆ منیش بۆ ماوەیەکی زۆر کەم لەو رۆژەدا کوشتاری تیادا حەڵاڵ بوو، باش ئاگادار بن تائێستا لەم دەمەدا شارێکی بەڕێزو قەدەغەیە، کەوا بوونە دڕکی پاکۆ دەدرێو، نەدارو درەختی دادەپاچرێو ، نەکوشتارو شەڕو شۆڕی تیادا دەکرێ لەم حەلەوە هەتا رۆژی قیامەت ئەم شتانەیتیا قەدەغەیە. وەنە نەچێری دەرەوێنرێتەوە، وەنەشتی داکەوتووی هەڵ دەگێرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کەناوو نیشانی هەڵبدا بۆئەوەی کەخاوەنەکەی پەیدا ببێو بیباتەوە.**

---

**(٨٠) اخرجه مسلم في الحج (عينى ـ ـ ١٨٣، رقم: ٥٣) ـ المترجم = ٣٣٩٢ شيحا.**

وەهەرکەسێ کەسێکی کوژرا ئەوا خۆی لەیەکێ لەم دوو بڕیارە سەر پشکە: یا خوێن وەردەگرێ یاخود تۆڵەی بۆ دەسەندرێو لەجیاتی ی کوژراوەکەی بکوژەکە دەکوژێتەوە. جا پیاوێکی یەمەنی کەپێیان دەگوت: ئەبوشاە هەڵسا گوتی: ئەم ووتارەی خۆتم بۆ بنووسەرەوە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بینووسنەوە بۆ ئەبوشاە. پیاوێکی قوڕەیشیش (کەعەبباسی مامەی پێغەمبەر بوو) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (إذخر) ی لێ دەرچێ، چوونکە ئەم گیایە بۆ سووتەمەنی ناوماڵو بۆ پەردووی سەردارەڕاو بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەکاری دێنن، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: باشە تەنیا گیای سوڕناتکی لێ دەرچێ): (تاج-٢ ل-٢٨٠ ز-١٣٠ ژ-١٧٠٣ ج-٤).

٩٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ(رضي الله عنهما) قَالَ: (لَمَّا اشْتَدَّ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعُهُ قَالَ ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَا تَضِلُّوا بَعْدَهُ قَالَ عُمَرُ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَلَبَهُ الْوَجَعُ وَعِنْدَنَا كِتَابُ اللَّهِ حَسْبُنَا فَاخْتَلَفُوا وَكَثُرَ اللَّغَطُ قَالَ قُومُوا عَنِّي وَلَا يَنْبَغِي عِنْدِي التَّنَازُعُ). (الحديث ١١٤ ـ أطرافه في: ٣٠٥٣، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٣٢٤٤، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦)[٨١]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنەخۆشی سەرەمەرگا، کاتێ نەخۆشیەکەی کەشەنگ بوو فەرمووی: (قەڵەمو کاغەزم بۆ بێنن بانامەیەکتان بۆ بنووسم، پێداویسی ئەم قۆناغە ناسکەی پاش خۆمتان بۆ ڕون بکەمەوە، ئیتر لەپاش نووسینی ئەو نامەیە لەم لایەنەوە سەرتان لێ ناشێوێ!)

عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئازارەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆری بۆی هێناوەو تەواو کەشەنگی کردووە، وەکی تریش نامەی خودای گەورە

---

(٨١) أخرجه مسلم في الوصايا (عينى ـ٢ ـ ١٧٠، رقم: ٥٥) — المترجم = رقم٤٢٠٨، ٤٢٠٩، ٤٢١٠ شيحا.

کەقورئانی پیرۆزە، کەچرای ڕۆشنی دەستمانە واین لە خزمەتیدا، خوا یاربێ بۆ چارەسەرکردنی هەرکێشەیێ کەلەمەولا ڕووبدا قورئانمان بەسە، ئیتر بۆچی لەم کاتی ئێش‌و ئازارەدا بەنووسینی نامەو شتی وا زیاتر ئێش‌و ئازاری حەزرەت بدەین!.

ئیتر یاران بوون بەدوو بەرەو، دەستەیەکیان دەیانگوت: بانامەکەمان بۆ بنووسێ، دەستەیەکیشیان دەیانگوت: پێویست ناکا، لەهەمان کاتا بوو بەدەنگە دەنگ‌و هەراوزەنا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەورم چۆڵ کەن لای من شوێنی ئەم کێشمە کێشمەیە نییە!).

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) کاتێ ئەم فەرموودەیەی بۆ عوبەیدوڵلا گێڕایەوە، تەشریفی هەڵسا لەشوێنەکەی خۆی‌و ڕۆیشتە دەرەوەو فەرمووی: (سەرچاوەی کۆسپ‌و کۆست‌و کارەساتەکانی گەلی ئیسلام گشتی دەگەڕێتەوە بۆئەوە کەئەو نامەیەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نەنووسرا).

٩٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: (اسْتَيْقَظ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذاتَ لَيْلَةٍ فَقَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ مَاذا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنْ الْفِتَنِ وَمَاذا فُتِحَ مِنْ الْخَزَائِنِ أَيْقِظوا صَوَاحِبَاتِ الْحُجَرِ فَرُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الْآخِرَةِ). (الحديث ١١٥ - اطرافه في: ١١٢٦، ٣٥٩٩، ٥٨٤٤، ٦٢١٨، ٧٠٦٩).[٨٢]

ئومموسەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو هەستا، فەرمووی: پەنا بەخوا لەکاری خوا! ئەم شەو چی تازەوەو ئاشووب داباری؟ وەچی گەنج‌و خەزنە داباری؟ چەندین دەرگای ڕەحمەتی خودا کرایەوە، خۆزگە کەسێ دایکانی موسوڵمانان (أمهات المؤمنون) ی لەخەو هەڵدەستان بۆ شەونوێژو خواپەرستی، ئای کەچەندەها کەس هەن لەم جیهانەدا پۆشتەو پەرداخن کەچی لەو جیهاندا ڕووت‌و قووتن!).

(٨٢) من أفراد البخاري عن المسلم (عيني ـ ٢ ت ١٧٣، رقم: ٥٦)- المترجم.

## شیکردنەوە:

ئوموسەلەمە هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ)، وادیارە ئەو شەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای ئەو بووە، (٣٧٨) فەرموودەی هەیە، سیازدەیان پەسەندی هەردوو پیرە، دوو کۆچو ڕەوی لەپێناوی ئیسلاما کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشە، کۆچێ بۆ مەدینە، لەمانگی شەشەڵانی ساڵی چواری کۆچی دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێناویەتی، لەتەمەنی هەشتاو چوار ساڵی دا لەبەهاری ساڵی شەستو چواری کۆچی دا لەمەدینە کۆچی دوایی کردووە، ئەبوهورەیرە نوێژی مردووی لەسەر کرد، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاک سپێردرا: (تاج-١ ل-٤٩٤ ز-١٨١ ژ-٩٧٢ چ-٤ + تاج-٥ ل-١٥٨ تاج-٣ ز-٣٩ ژ-٣٤٤٢).

٩٥- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: (صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ). (الحديث ١١٦ ـ طرفاه في: ٥٦٤، ٦٠١).[٨٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکۆتایی تەمەنی دا بەمانگێ لەپێش مەرگیدا، شەوێ نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، کەسڵاوی دایەوە هەڵساو فەرمووی: (ئەرێ دەنگو باسی ئەم شەو چییە؟ دەسا ئەوەی کەمن لەم بارەیەوە دەیزانم ئەم هەواڵەیە: هەتا سەری سەد ساڵ لەم شەوەوە کەس نامێنێ لەوانەی کەئێستا وان لەسەر زەوی).

٩٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتَ الحارث زَوجْ النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَها في لَيْلَتِها فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ ثُمَّ جَاءَ إِلَى مَنْزِلِهِ

---

(٨٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: قوله (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) لا تأتي مائة سنة وعلى الارض ... رقم: ٢٥٧٣ = ٦٤٢٦ شيحا. بڕوانە فەرموودەی ژمارە (١٣٨) ـ وەرگێڕ.

فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ ثُمَّ نَامَ ثُمَّ قَامَ ثم قالَ: نَامَ الغُلَيْمُ أَو كَلِمَةً تشبهها ثم قَامَ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ فَصَلَّى خَمْسَ رَكَعَاتٍ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثم نَامَ حَتَّى سَمِعْتُ غَطِيطَهُ أَوْ قَالَ خَطِيطَهُ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ). (الحديث ١١٧ ـ أطرافه في: ١٣٨، ١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٩٢، ١١٩٨، ٤٥٦٩، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٤٥٧٢، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٦٣١٦، ٧٤٥٢).

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەماڵی مەیموونەی پوورم بووم، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، لەوێ نووستم، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی کردو ئەوجا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئەو شەوە سەرەی مەیموونەی پوورم بوو لەوێ مایەوە، چوار رکات نوێژی کردو ئنجا خەوت، لەپاشا هەڵسا بۆ شەونوێژ، وەفەرمووی: (ئەوە کوڕەکە خەوت) یاوشەیەکی ئاوای فەرموو.

ئنجا هەڵساو دەستی کرد بەشەونوێژ، منیش چووم لەلای چەپیەوە نوێژم لەپشتیەوە دابەست، بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بردمی بۆلای راستی خۆی، وەپێنج رکات شەونوێژی کرد، وەدوو رکاتی تریشی کردو دیسان خەوتەوە، هەتا گوێم لەپرخەی بوو، لەپاشا چوو بۆ نوێژی بەیانی) : (ت ـ ٦ ل ـ ٩٧ ف ـ ٣٩ تاج-٤ ز-١ ژ-٣٧٩٢).

٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (إِنَّ النَّاسَ يَقُولُونَ أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَلَوْلَا آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا حَدَّثْتُ حَدِيثًا ثم يَتْلُو إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى إِلَى قَوْلِهِ الرَّحِيمُ إِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمْ الصَّفْقُ بِالْأَسْوَاقِ وَإِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ الْأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ الْعَمَلُ فِي أَمْوَالِهِمْ وَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِبَعِ بَطْنِهِ وَيَحْضُرُ مَا لَا يَحْضُرُونَ وَيَحْفَظ مَا لَا يَحْفَظُونَ). (الحديث ١١٨ ـ أطرافه في: ١١٩، ٢٠٤٧، ٢٣٥٠، ٣٦٤٨، ٧٣٥٤).[٨٤]

---

(٨٤) أخرجه مسلم في الفضائل (عينى ـ ٢ ـ ١٨١ رقم: ٥٩ = ٦٣٤٧ شيحا) ـ المترجم.

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو خەڵكە پێم دەڵێن: ئەبوهورەیرە فەرموودەی حەزرەت زۆر دەگێڕێتەوە، بۆ هاوڕێیانی تر وانین، وادەی من‌و ئەوان دیوانی خودابێ!.

لەترسی ئەوە نەبێ کەبەر ئەو هەڕەشەیە بکەوم کەخودای گەورە لەم دوو ئایەتەدا لەو کەسانەی دەکا، کەزانست حەشار دەدەن، قەت فەرموودەم نەدەگێڕایەوە، ئەمەیش ئەو دوو ئایەتانەیە: (إن الذين يكتمون ما أنزلنا من البينات والهدى من بعد مابيناه للناس في الكتاب أولئك يلعنهم الله ويلعنهم اللاعنون الا الذين تابوا وأصلحوا وبينوا فألئك أتوب عليهم وأنا التواب الرحيم) - بەقەرە - ٢/ ١٥٩ - ١٦٠ - واتە: بەڕاستی ئەو زانایانەی کەئەو ئایات‌و بەڵگە ڕۆشنانە دەشارنەوە، کەخودای گەورە نازڵی کردوون بۆ شارەزا کردنی بەرەی ئادەم بۆ ڕێگەی ڕاست، پاش ئەوەی کەزۆر بەجوانی بەپێی پێداویست‌و شوێن لەتەورات دا ڕۆشنی کردوونەتەوە، کەتەوراتیش وەکوو ئینجیل‌و قورئان نامەی خودایە، هەتا مەردوم بەباشی لێ ی حاڵی ببن، بەڕاستی ئەم جۆرە مالووم‌و قەشە هەق حەشاردرانەو وێنەی ئەوان، خودای گەورە خۆی نەفرین‌و لەعنەتیان لێ دەکا، هەروەها نەفرەتکەرانی تریش لەعنەت‌و نەفرەتیان لێ دەکەن، مەگەر ئەوانەیان کەلەو تاوانە پەشیمان ببنەوەو ڕێگە ڕاستەکە پیشانی مەردوم بدەن‌و ڕەفتاری خۆیان چاك بکەن، چونکە خودا هەمیشە تەوبەو پەشیمانی بەندەی تەوبەکاری پەشیمانی خۆی گیرا دەکا، بەڕاستی خودا لەهەموو کەس بەڕەحمترە).

دەڵێن: ئەی بۆچی کۆچکاران‌و یاریدەدەران وەك ئەو ئاوا بەزۆری فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناگێڕنەوە؟ دەی باخۆم پێتان بڵێم کەهۆی ئەمە چییە؟ چونکە برا یاریدەدەرەکانمان خەریکی خۆش کردنی زەوی‌و زار بوون‌و خاوەنی مەزراو باخ‌و کشتوکاڵ بوون، برا کۆچکارەکانیشمان خەریکی سەوداو ئاڵ‌و وێڵی ناوبازاڕ بوون، بەڵام من بابایەکی بێ ژن‌و ماڵ

بووم، یەکێ بووم لەهەژارانی کۆمەڵەی سوففە، خۆم تەرخان کردبوو بۆ فێربوونی شەریعەت، لەبەرئەوە خزمەتی پێغەمبەرم چۆڵ نەدەکرد، بە نانەسکی دەلکام بە پێغەمبەرەوەو هەتا بۆم بکرایە بۆ ئەم مەبەستە خزمەتی ئەوم بەرنەدەدا، ئەوانیش لەوێ نەبوونایە من هەر لەخزمەتیدا دەبووم، گەلێ شت هەبوو ئەوان دەستیان نەدەپەرژا لەبەری بکەن، لەبەرئەوە لەبیریان دەچۆوە، بەلام من مەودام هەبوو لەبەرم دەکردو بەباشی رەوانم دەکرد: (ت-٥ ل-٢١٧ تاج-٣ ل-٧٣٤ ز-٦٢ ژ-٣٥٢١ هەتا ٣٥٢٦) مەناقیبی ئەبو هورەیرە.

## راڤەو شیکردنەوە:

هەتا ئەم سەردەمەی ئێمەیش لەولاتی ئێمەو دەوروبەریدا ئەم سوننەتە دێرینەی ئیمامی ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەناو دەستەی زانست پەروەراندا باوە، زاناو فێرخواز، یابڵێین: مەلاو فەقێ، لەبەر خزمەتی شەریعەت فریای ماڵداری ناکەون، هەروا ماڵپەروەرانیش لەبەر پەیدا کردنی ماڵو سامان نایانپەرژێتە سەر زانستەکانی شەریعەت، بەلام ئێستا لەگەڵ کۆندا یەك فەرقی جەوهەری هەیە: لەکۆندا کۆکردنەوەی ماڵ رێك وەك فێربوونی زانست ساخ بۆ رەزامەندیی خودای گەورە بوو، بەراستی ماڵ خزمەتکاری زانست بوو، زانستیش چاوساغی دینو دنیای ماڵو خاوەن ماڵ بوو، بەلام ئێستا نەدەوڵەمەند نەمەلا بەو شێوەیە نەماون، هەردوولا بەشوێن هەڵپەی دونیاییدا وێڵن. خودا پەنامان بدا.

٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي أَسْمَعُ مِنْكَ حَدِيثا كَثِيرًا أَنْسَاهُ قَالَ ابْسُط رِدَاءَكَ فَبَسَطْتُهُ قَالَ فَغَرَفَ بِيَدَيْهِ ثمَّ قَالَ ضمَّهُ فَضمَمْتُهُ فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا بَعْدَهُ). (الحديث ١١٩ طرفه في ١١٨).

دیسان فەرمووی: ڕۆژێ عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! من فەرموودەیەکی زۆر لەتۆ دەبیستم دوایی لەبیرم دەچن؟ فەرمووی: (ئادەی پۆشاکەکەت ڕاخە) منیش ڕایم خست، ئەویش بەهەدوو دەستی بەئاماژە مستی گرت لەلافاوی بەهرەی خوداو هەر بەئاماژە کردیە ناو پۆشاکەکەمەوە، وەك شتێ بەمشت هەڵبگرێو بیکاتە ناوی ئاوا. ئنجا فەرمووی: (ئادەی کۆی کەرەوە) منیش کۆیم کردەوە ئیتر لەوەدوا هیچ فەرموودەیەکی ئەوم لەبیر نەچۆتەوە: (تـ٥ ل-٢١٧ تاج-٣ ز-٦٢ ژ-٣٥٢١).

٩٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: (حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وِعَاءَيْنِ فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَبَثَثْتُهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَلَوْ بَثَثْتُهُ قُطِعَ هَذا الْبُلْعُومُ). (الحديث ١٢٠).

دیسان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پڕدوو دەفر زانستی جیاجیام لە پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، هەر دەفرەی لەجۆرە زانستێ، وایەکێکیانم بەخش کردەوە، کەبرێتی یە لەم فەرموودەو سوننەتە پەخشکراوانە، وەڵێ ئەو جۆرەکەی تریان ئەگەر پەخشی بکەمەوە دەدەن لەگەردنم، کەبرێتی یە لەزانینی ئاژاوەکانو لەنیشانەکانی هاتنی قیامەتو گەلێ لەنیشانەو دەنگوباسی ئاژاوە گێڕەکانی ناو گەلی ئیسلام.

**شیکردنەوە:**

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو (اعوذ بالله من رأس الستين وإمارة الصبيان) مەبەستی خەلافەتی یەزید بوو، کەلەسەری ساڵی شەستی کۆچی دا بوو، وەخودا نزاکەی گیرا کرد بەساڵێ لەپێش ئەوەدا گیانی سپارد، ئەم جۆرە زانستە هەروا بەئاسانی دەست ناکەوێ، هەموو کەسیش لێ ی تێ ناگا، کەواتە واباشە بڕوای پێ بکەینو زۆر لێ ی نەکۆڵینەوە، نزا بەکوڵی دڵ بەبڕوای

تەواوەوە یەکێکە لەهۆکانی هاتنەدی ئاوات، بۆیە پڕ بەدڵ دەڵێم: خودایە! بەشی باشمان تێ بخەی، منیش دەڵێم: (أعوذ بالله من الشرك ومشتقاته).

١٠٠- عَنْ جَرِيرِ بنَ عَبْدَالله (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ اسْتَنْصِتْ النَّاسَ فَقَالَ لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ). (الحديث ١٢١ ـ أطرافه في: ٤٤٠٥، ٦٨٦٩، ٧٠٨٠).[٨٥]

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجیماڵئاوایی دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئادەی مەردومەکەم بۆ بێدەنگ بکە تاقسەیان بۆ بکەم) منیش فەرمانەکەیم بەجێ هێنا، ئەویش وتارێکی بۆ دان و تیا فەرمووی: (نەکەن لەپاش خۆم پاشگەز ببنەوەو وەکی کۆمەڵی کافران و میللەتی خۆخۆر بەرببنە سەرو گوێلاکی یەکتری و لەسەر پڕوپاتاڵی جیهان لەگەردنی یەکتری بدەن).

١٠١- عَنْ ابن عباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قالَ: حدَّثنا أُبَيّ بْن كَعْبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (قَامَ مُوسَى النَّبِيُّ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَسُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ: يَا رَبِّ وَكَيْفَ بِهِ؟ فَقِيلَ لَهُ احْمِلْ حُوتًا فِي مِكْتَلٍ فَإِذا فَقَدْتَهُ فَهُوَ ثَمَّ فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقَ بِفَتَاهُ يُوشَعَ بْنِ نُونٍ وَحَمَلَا حُوتًا فِي مِكْتَلٍ حَتَّى كَانَا عِنْدَ الصَّخْرَةِ وَضَعَا رُءُوسَهُمَا وَنَامَا فَانْسَلَّ الْحُوتُ مِنْ الْمِكْتَلِ فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا وَكَانَ لِمُوسَى وَفَتَاهُ عَجَبًا فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِهِمَا وَيَوْمَهُمَا فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا وَلَمْ يَجِدْ مُوسَى مَسًّا مِنْ النَّصَبِ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِي أُمِرَ بِهِ

---

(٨٥) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان معنى قول النبيُ (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) لاترجعوا بعدى كفاراً، رقم: ٦٥ = ٢٢٠ شيحا.

فَقَالَ لَهُ فَتَاهُ أَرَأَيْتَ إِذ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهِ إِلَّا الشَّيْطَانُ قَالَ مُوسَى ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا فَلَمَّا انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ إِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى بِثَوْبٍ أَوْ قَالَ تَسَجَّى بِثَوْبِهِ فَسَلَّمَ مُوسَى فَقَالَ الْخَضِرُ وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ فَقَالَ أَنَا مُوسَى فَقَالَ مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ قَالَ نَعَمْ قَالَ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رَشَدًا قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا يَا مُوسَى إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَنِيهِ لَا تَعْلَمُهُ أَنْتَ وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ عَلَّمَكَهُ الله لَا أَعْلَمُهُ قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ لَيْسَ لَهُمَا سَفِينَةٌ فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ فَكَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمَا فَعُرِفَ الْخَضِرُ فَحَمَلُوهُمَا بِغَيْرِ نَوْلٍ فَجَاءَ عُصْفُورٌ فَوَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ فَنَقَرَ نَقْرَةً أَوْ نَقْرَتَيْنِ فِي الْبَحْرِ فَقَالَ الْخَضِرُ يَا مُوسَى مَا نَقَصَ عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ إِلَّا كَنَقْرَةِ هَذَا الْعُصْفُورِ فِي الْبَحْرِ فَعَمَدَ الْخَضِرُ إِلَى لَوْحٍ مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ فَنَزَعَهُ فَقَالَ مُوسَى قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا فَكَانَتْ الْأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا فَانْطَلَقَا فَإِذَا غُلَامٌ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فَأَخَذَ الْخَضِرُ بِرَأْسِهِ مِنْ أَعْلَاهُ فَاقْتَلَعَ رَأْسَهُ بِيَدِهِ فَقَالَ مُوسَى أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا؟ فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ الْخَضِرُ بِيَدِهِ فَأَقَامَهُ فَقَالَ لَهُ مُوسَى لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى لَوَدِدْنَا لَوْ صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَمْرِهِمَا).

(الحديث ١٢٢ ـ أطرافه في: ٧٨، ٢٢٦٧، ٢٧٢٨، ٣٢٧٨، ٣٤٠٠، ٣٤٠١، ٤٧٢٥، ٤٧٢٦، ٤٧٢٧، ٦٦٧٢، ٧٤٧٨).[٨٦]

---

(٨٦) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: من فضائل الخضر عليه السلام، رقم: ٢٣٨٠=٦١١٣.

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەئیبنوعەباسم گوت: بەقسەی نەوف بەکالی بێ ئەو موسایە کەهاوڕێ ی خدری زیندە بووەو داستانەکەیان لەقورئان دا باس کراوە ئەو مووسا مەشهورە نییە کە پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل بووە!

ئیبنوعەباس (ڕەزای خودیان لێ بێ) فەرمووی: ئەو دوشمنی خودایە درۆ دەکا (ئەو لای خۆی پیاوی باشەو زانایەکی پایەبەرزە چۆن هەڵەی گەورەی وادەکا؟) چونکە من ئوبەیی کوڕی کەعب خۆی قسەی بۆ کردم، فەرمووی: بەگوێ ی خۆم ژنەوتم لەدەمی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: مووسا پێغەمبەر (دروودی لەسەربێ)، هەڵسایەوە لەناو نەوەی ئیسرائیل دا وتارێکی دا، لێیان پرسی: کێ لەهەموو کەسێ زاناترە؟ فەرمووی: من! خودای گەورەیش - لەبەرئەوەی کەزانینی ئەم باسەی هەواڵە نەکرد بەعیلمی خودا - گلەیی لەموسا کردو سرووش‌و نیگای نارد بۆی: ئەی موسا! بەندەیەکی من هەیە ئەو لەتۆ زاناترە، ئێستا والەمەجمەعولبەحرەین (واتە: لە دواوانی دوو دەریای فارس‌و ڕۆم، کەئێستا پێیان دەگوترێ دەریای سوورو دەریای سپی، کەئێستە ئەو پارچە زەوییە بووە بەجەمسەر لە نێوانی ئاسیاو ئەفریقادا هەڵکەنراوەو کراوە بەڕاڕەوی پاپۆڕی گەورە، پێ ی دەڵێن: قەناتی سوێس). مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! جا ئەوە چۆن خۆم بگەیەنمەلای؟ فەرمووی: ماسییەك ببرژێنەو لەگەڵ خۆت دا لەزەمیلەیەکا ببیە، جا لەکوێدا ئەو ماسییەت وون کرد ئەو بەندەیەم والەوێدا، جا لەزەمیلەیەکا ماسییەکی هەلگرت‌و خۆی‌و یۆشەعی کوڕی نوون کەهەم سوختەی بوو، هەم خوشکەزای بوو کەوتنەڕێ‌و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای تاوێرەکەی قەراخ دەریاکە، کەخدری زیندە لەوێ بوو، ئیتر لەوێ سەریان نایەوەو خەوتن، ماسییەکەش لەزەمیلەکەدا ڕاپەڕی‌و هاتە دەرەوەو کەوتە ناو دەریاکەوە، وەبەناو نێرینەی ناوی دەریاکەدا خەندەکێکی بۆ خۆی دروست کردو ڕێگەی خۆی گرتەبەرو کەوتەڕێ، خودای

گەورەیش شڵپاوی ئاوەکەی کەبەڕۆیشتنی ماسییەکە شەق دەبوو وەك تاقی سەر دەرگاو پەنجەرە کرد بە توونێل لەژێر ئاوەکەدا!

لەگێڕانەوەیەکدا: لەبن ئەو گابەردەدا کانیاوێ هەیە ناوی ژیانە، مەشهوورە بەئاوی حەیات، هەرچی شتێ لەو ئاوەی لێ بکەوێ زیندوو دەبێتەوە، جا ماسییەکە لەئاوی ئەو کانیەی لێ دەکەوێو دەجوڵێتەوەو رادەچەنێو لەزەمیلکە دەردەپەڕێو دەچێتە ناو دەریاکەوە، کەمووسا (سەلامی خوای لێ بێ) خەبەری دەبێتەوە یووشەعی هاوڕێ ی لەبیری نابێ باسی ئەم حاڵەی ماسییەکەی بۆ بکا، جاماوەی ئەو رۆژەو شەوێکی تەواو هەتا بەیانی دەڕۆن، تابۆ سبەینێ موسا بەیووشەع دەفەرموێ: نانی بەیانیمان بۆبێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەمانا تووشی ماندوویی بووین! فەرمووی: هەتا لەو شوێنە ڕەت نەبوون کەخودا کردبووی بە نیشانە بۆی هەستی بەماندوویی‌و کفتی‌و شەکەتی نەکرد، خزمەتکارەکەی عەرزی کرد: (أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت وما أنسانيه إلا الشيطان أن أذكره واتخذ سبيله في البحر عجباً) کەهف ـ ١٨/ ٦٣ ـ قوربان! پێم نالێ ی بۆچی وام بەسەرهات؟ دەزانی کاتێ گەیشتینەلای بەردەکەو تۆ نووستیت، من شتێکی سەیرم دی، تەماشام کرد وا ماسییە برژاوەکەمان لەناو زەمیلەکە دەرپەڕی‌و خۆی فڕێ دایە ناو دەریاکەوەو لەسەر شێوەیەکی زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەر بەناوی ئاوەکەدا دەستی کرد بەڕۆیشتن، من لەبیرم چوو ئەم رووداوەت بۆ بگێڕمەوە، دیارە کەشەیتان ئەوەی لەبیر بردمەوە بەهۆی خەیاڵی دڵەوە. فەرمووی: ئەو تونێلەی کەبۆ مووساو شاگردەکەی سەرسوڕهێنەر بوو.موسا بە یوشەعی فەرموو: (ذلك ماكنا نبغ فارتداً على آثار هما قصصاً) ١٨/٦٤ ـ دەی ئێمە بۆ ئەمە دەگەڕێین کەتۆ دیوتە، ئیتر ڕێك بەشوێنی خۆیان دا گەڕانەوە. فەرمووی: واتە: بەشوێنی خۆیاندا ڕێك گەڕانەوەو شوێنەواری خۆیانیان دەقاو دەق هەڵگرتەوەتا گەیشتنەوە لای تاوێرەکە، تەماشایان کرد واپیاوێ

بەنوێنێ خۆی داپۆشیوە، جا مووسا سڵاوی لێکرد، خضریش فەرمووی: لەکوێ لەم وڵاتی تۆیە ئەم جۆرە سڵاوو ڕۆ ژباشییە هەیە. فەرمووی: من مووسام، خدری زیندە فەرمووی: موسای پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوم، هاتووم بۆلای تۆ کەلەم عیلمو زانستە نایابەی کەلەلای خوداوە فێرکراوی هەندێکم فێربکەی کەببێ بەهۆی گەییشتنم بەڕەزای خودا، خدر فەرمووی: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت بگریو صەبر بکەی، ئەی موسا! من خودا لەعیلمو زانستی خۆی بازە عیلمو زانستێکی وای فێر کردووم تۆ بەتەواوی نایزانیتو وەك من شارەزایی یەکی تەواوت نییە لەو بابەتەدا، کەپێی دەگوترێ: عیلمی حەقیقەت یا عیلمی لەدوننی، یا زانستی بەهرەیی - علمی لدنی - وە هەروەها تۆیش خوای مەزن لەعیلمو زانستی خۆی بازە عیلمو زانیارییەکی فێرکردووی کەبرێتی یە لەشەریعەتو عیلمی ظاهیر من وەك تۆ نایزانم، کەوابوو واز بێنە تۆ بەرێگەی خۆتو من بەرێگەی خۆم، مووسا فەرمووی: {قَالَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أمْرًا} ٦٩/١٨ـ خودا یاربێ ئەگەر ڕێگەم بدەی لەخزمەتتا بم، دەبینی بەباشی ئارام دەگرمو سەرپێچی لەفەرمانت ناکەم، خدریش فەرمووی: {قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا} ٧٠/١٨ - باشە، بەڵام بەمەرجێ لەشت زۆر مەکۆڵەرەوە هەرچیم کرد قسە مەکەو هەقت بەسەرمەوە نەبێ هەتا خۆم تێیت دەگەیەنم.

فەرمووی: پاش ئەوە کەلەسەر ئەم مەرجە ڕێکەوتن هەردوکیان لەقەراخی دەریاکەوە کەوتنەڕێ، تاپاپۆڕێ هات قسەیان لەگەڵیان دا کردن کەهەڵیان بگرن، خدریان ناسی بەبێ کرێ بەخۆڕایی هەڵیان گرتن، کەسواری پاپۆڕەکە بوون لەپڕ مووسا چاوی لێ بوو کەوا خدر بەتەشوێ تەختەیەکی لەتەختەکانی پاپۆڕەکە هەڵکەند، مووسا پێ ی فەرموو: ئەوە چیت کرد! لای خۆی ئەم پیاوانە پیاوەتی یان لەگەڵمان کردو بەبەلاش ئێمەیان هەڵگرتووە

کەچی تۆ دەچیت پاپۆڕەکەیان کون دەکەی، تاکوو سەرنشینەکانی نوقم بکەی‌و لەئاودا بخنکێن، بەڕاستی تاوانی گەورەو ناهەموارت کرد، خدر فەرمووی: ها! ئەدی من پێم نەگووتی کەتۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت‌و ناتوانی ئۆقرەبگری؟ مووسا فەرمووی: لەبیرم نەبوو، لێم مەگرەو هاوڕێیەکی باش بەو چاوپۆشیم لێ بکە، بانەبی بەمایەی باری زەحمەت بۆم. فەرمووی: ئەم جاری یەکەمەیان مووسا لەیادی نەبوو، فەرمووی: لەوکاتەدا چۆلەکەیێ هات لەسەر لێواری پاپۆڕەکە نیشتەوەو دەندووکێکی ژەند بەئاوی دەریاکەدا، خدر پێ ی فەرموو: زانیاری من و زانیاری تۆ لەچاو زانیاری خودادا وەك دەنووك ژەندنی ئەم چۆلەکەیە وایە بەم دەریایەدا. ئەوجا لەپاپۆڕەکە هاتنە دەرێ‌و هەردووکیان بەکەناری دەریاکەدا دەستیان کرد بەڕۆیشتن، لەناکاو خدر چاوی کەوت بەکوڕێکی منالکار لەناو منالدایاری دەکرد، یەکسەڕ پڕی کرد بەسەریاو بەدەست وەك بەچکە چۆلەکە سەری هەلکەندو ملی هەلکێشاو بەبێ قسەو پرسیارو چەندو چوون کوشتی! موسا پێ ی فەرموو: {أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا} ئەو مندالە بێ تاوان‌و گیانە پاکەت بەناهەق چۆن کوشت، بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ لەخۆتەوە کوشتت؟ بەڕاستی کارێکی زۆر ناڕەوات کردو کاری واناشیرین کەس پەسەندی ناکا.

لەغایەتولەئموولی شەرحی تاجول ئوصولدا دەفەرموێ: دەگێڕنەوە: خدر لەم ڕەددەی موسایە زۆر تووڕە دەبێ، دەچی دەفەی شانی چەپی منالەکە دەردەهێنێ‌و گۆشتەکەی لێ دادەماڵێ، سەیر دەکەن لێی نووسراوە: ئەم کوڕە کافرە قەت ئیمان‌و باوەڕ ناهێنێ! ئیتر موسا هێواش دەبێتەوە. خدر دەفەرموێ: {قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا} ١٨/٧٥ - کوڕە! من پێم نەگوتی کەتۆ لەگەڵ مندا هەڵناکەی‌و ناتوانی سەر لەکاری من دەربکەی‌و لەبەرئەوە خۆت پێ ناگیرێ‌و هەڵ دەدەیتێ؟! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕەددی ئەم جارەی خدر توندو تیژتر بوو لەڕەددی جاری یەکەم.

مووسا فەرمووی: {قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا} ٧٦/١٨ - ئەگەر جارێکی تر پاش ئەمجارە هەڵەی وام کردولەمەرجی خۆم دەرچووم ئیتر هاورێتیم مەکە، ئیتر بیانوو بەهانەت بڕیوم. فەرمووی: پاش ئەوە کەوتنەوە ڕێگەو ڕۆیشتن هەتا چوونە ناو ئاوەدانییەك (شاری ئەنطاکییە) لەوێ داوای نان و ئاویان لەهەموو خەڵکی ئەو دێ یە کرد کەبیخۆن، بەڵام کەسیان قایل نەبوون کە میوانداری یان پێ بکەن و بەنائومێدی ڕۆیشتن، دیوارێکیان بینی خەریك بوو هەرەس بهێنێ و بکەوێ، خدر دەستێکی پیادا هێناو راستی کردەوە، مووسا پێی فەرموو: خەڵکی ئەم شارە بێ ویژدان و چرووکن، ئەم هۆزە لای خۆی ئێمە بووین بەمیوانیان، کەچی نەنان و ئاوێکیان پێمان داو نەمیوانداری یان پێ کردین، ئەگەر هەوەستت ببوایە کرێت لێ وەردەگرتن و بەکرێ دیوارەکەت راست دەکردەوە، خدر فەرمووی: {هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا} ٧٨/١٨ - ئەمە کاتی لەیەك جیابوونەوەی من و تۆیە، بەزوویی ئەو شتانەت بۆ روون دەکەمەوەو نهێنی یەکانت پێ دەڵێم کەخۆت بۆ نەگیرا بەرابەریان. پێغەمبەری خۆمان (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی خۆزگا مووسا پتر ددانی بەخۆیدا بگرتبایە هەتا خودا زیاتر داشتانی ئەم دوو زاتەی باس بکردایە بۆمان!

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەم ئایەتەی بەم قیرائەتە دەخوێند: {وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا} وەئەم ئایەتەی تریشی بەم قیرائەتە دەخوێند: {وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ}. (تاج/٧ ل-٤ ز-١ ف-٢ تاج-٤ ز-١ ژ-٣٩٧٤).

١٠٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْقِتَالُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَإِنَّ أَحَدَنَا يُقَاتِلُ غَضَبًا

وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً فَقَالَ مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ). (الحديث ١٢٣ ـ أطرافه في: ٢٨١، ٣١٢٦، ٧٤٥٨)[٨٧]

ئەبومووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! غەزاو شەڕکردن لەبەر ڕەزای خودا کامەیە پێمان بفەرموو؟ چونکە ئێمە هەمانە لەڕقان دەجەنگێ و دەیەوێ تۆڵە بستێنێ، هەیشمانە تەنگە دەیگرێ و لەسەر هۆزی خۆی دەکاتەوە، پیاوی وا هەیە بۆتاڵان شەڕدەکا، هەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕدەکا، هەیە تاشوێنی دیاربێ و بڵێن ئازایە لەبەرئەوە شەڕ دەکا، جائایا ئەمانە کامەیان لەبەر ڕەزای خودایە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەرکەسێ لەپێناوی شەریعەتی خودادا شەڕبکاو جەنگ سازبدا ئەوە لەبەر ڕەزای خودایە). (ت-٨ ل-٧١ ف-١= تاج-٤ ز-١٧ ژ-٤٣٥ ج-٤ = نية الجهاد وحكمه). (ش/ د/ ت/ ن).

١٠٣ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَيْنَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَرِبِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنْ الْيَهُودِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْض سَلُوهُ عَنْ الرُّوحِ وَقَالَ بَعْضهُمْ لَا تَسْأَلُوهُ لَا يَجِيءُ فِيهِ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ فَقَالَ بَعْضهُمْ لَنَسْأَلَنَّهُ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ مَا الرُّوحُ فَسَكَتَ فَقُلْتُ إِنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ فَقُمْتُ فَلَمَّا انْجَلَى عَنْهُ قَالَ وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الرُّوحِ قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتُوا مِنْ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا) (الحديث ١٢٥ـ أطرافه في: ٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦، ٧٤٦٢).[٨٨]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەدینە لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، لەناو باخە خورمایەکا دەڕۆیشتین، پێغەمبەر

---

(٨٧) أخرجه مسلم في الامانة، باب: من قاتل لتكون كلمة الله هى العليا، رقم: ١٩٠٤=٤٨٩٧، ٤٨٩٩.

(٨٨) أخرجه مسلم في صفات المنافقين، باب: سؤال اليهود النبيَّ (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) عن الروح، رقم: ٢٧٩٤=٦٩٩٠ شيحا.

(درودی خودای لەسەر بێ) پەلکە دارخورمایەکی پێ بوو، لەکاتی رۆیشتن خۆی دەدا بەسەریدا، لەلای دەستەیێ جولەکەوە رابورد، بازێکیان گوتیان: بۆ پرسیارێ لەبارەی گیانەوە لەموحەممەد نەکەین، بازێکی تریان گوتیان: پرسیاری لێ مەکەن، نەبادا وەلامەکەیتان بەدڵ نەبێ، لەپاش دا گوتیان: ئەی باوکی قاسم! رۆح چییە؟ گیانی گیانلەبەر چییە؟ جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تاوێ راوەستاو راما، ئەوجا سەری بەرز کردەوە، زانیم کە ئەوە سرووشی بۆ هات، ئەوجا فەرمووی: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً} ٨٥/١٧ - واتە: پرسیارت لێ دەکەن لەحەقیقەتی رۆح، لەکونەو ماهییەتو چییەتی ئەو شتەی کەپێی دەگوترێ گیان کەگیاندار بەبوونی ئەو گیاندارەو زیندووەو بەنەبووونی ئەو بێ گیانەو مردووە، لەوەلامیان بفەرموو: رۆح لەوشتانەیە کەبەهۆی فەرمانی خوداوە پەیدا دەبێ، ئێوە نایزانن‌و تێی ناگەن‌و پەی پێ نابەن، لەسنووری هۆش‌و فامی ئێوە بەدەرە، لەمەیش سەرتان سوڕنەمێنێ، چونکی ئەوەی ئێوە دەیزانن لەچاو ئەوەی کەخودا دەیزانێ زۆر کەمە (ت-٦ ل-٢٧٦ ف-١٩ = تاج-٤ ز-١٨ ل-٣٢٥ ژ-٣٩٦٩ ج-٤ = ش/ ت).

**شیکردنەوە**: لەگێڕانەی ئێرەدا: لەناو کاولەکانی شاری مەدینەدا).

١٠٤-عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمُعاذ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ قَالَ يَا مُعَاذ بْنَ جَبَلٍ قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ قَالَ يَا مُعَاذ قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ ثَلَاثًا قَالَ مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُون قَالَ إِذا يَتَّكِلُوا وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا). (الحديث ١٢٨ - طرفه في: ١٢٩).[٨٩]

---

(٨٩) أخرجه مسلم في الايمان، باب: الدليل على ان من مات على التوحيد دخل الجنة قطعاً، رقم: ٣٢ = ١٤٢.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ موعاذ (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار دەبێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەی موعاذ! موعاذ دەفەرموێ: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! وام لەخزمەتتا سەرم لەڕێتایە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سێ جار وابانگی دەکا، موعاذیش هەرسێ جارەکە واوەڵامی دەداتەوە. جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ شایەتی بدا کەهەر خودا خودایەو بەس وەموحەممەد پێغەمبەری خودایە، بەزمان ئەم گەواهی یە بداو بەدڵ باوەڕێ پێی هەبێ، ئیتر خودا لەئاگری دۆزەخ رزگاری دەکا). موعاذ عەرزی دەکا: قوربان! بائەم مژدە خۆشە بەموسوڵمانان ڕابگەیەنم باخۆشییان تێ بکەوێ، فەرمووی: ئاخر پشت بەم مژدەیە دەبەستن‌و لەکردەوەی باش سارد دەبنەوەو پشتی لێ دەکەنەوە). بەڵام موعاذ لەکاتی سەرەمەرگیدا ئەم فەرموودەیەی ڕاگەیاندو گێڕایەوە بۆ موسوڵمانان، نەبادا بەشاردنەوەی‌و بەڕانەگەیاندنی گوناهبار ببێ) : (تاج-١ ل-٢٤ ز-٤ ف-٣+٤ = ژ-٢٥، ٢٦ چ-٤).

١٠٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهـا) قَالَـتْ: (جَـاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهَا) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنْ الْحَقِّ فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذا احْتَلَمَتْ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِذا رَأَتْ الْمَاءَ. فَغَطتْ أُمُّ سَلَمَةَ تَعْنِي وَجْهَهَا وَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَتَحْـتَلِمُ الْمَـرْأَةُ قَالَ نَعَمْ تَرِبَتْ يَمِينُكِ فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَـدُهَا). (الحـديث ١٣٠ ـ أطرافـه في: ٢٨٢، ٣٣٢٨، ٦٠٩١، ٦١٢١).[٩٠]

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بێ) فەرمووی: ئوم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك هات بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا

(٩٠) أخرجه مسلم في الحيض، باب: وجوب الغسل على المراة بخروج المنى منها رقم: ٣١٣ = ٧٠٨، ٧١٠.

لەگوتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکا، کەوابوو ئایا ئەگەر ئافرەت شەیتانی بوو خۆشتنی لەسەرە یانا؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بێتەوەو هەستی پێ بکا. ئوم سەلەمەش ڕووی خۆی داپۆشیو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئافرەتیش شەیتانی دەبێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): هەژارۆکە! ئەی چۆن؟ ئەی ئەگەر شەیتانی نابێتو ئاوی نایەتەوە ئەی بەچی شێوەیَ منالەکەی لیَ ی دەچیَ؟). (تاج-١ ف-٥ ز-٣٠ = ژ-٢٦٢ ج-٤ ـ د/ش)

١٠٦- عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ رَجُلًا مَذَاءً فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الْأَسْوَدِ أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ فَقَالَ فِيهِ الْوُضُوءُ). (الحديث ١٣٢ ـ طرفاه في: ١٧٨، ٢٦٩) [91]

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەزیم زۆر بوو، شەرمیشم دەکرد بۆ خۆم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بپرسم، چونکە کچەکەی خێزانم بوو، جابەمیقدادی کوڕی ئەسوەدم گوت بۆ ئەمە لێی بپرسێ، چونکە خۆم شەرمم کرد، کەلیَ ی پرسی بوو فەرموو بووی: (چووکی بشۆرێو دەسنوێژ بگرێ، شتی وا خۆشۆردن پێویست ناکا) (تاج ـ ١ ل ـ ١١٣ ف ـ ٩ ز ـ ٢٣ـ ش / د/ ت/ ن)

١٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) (أَنَّ رَجُلًا قَامَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ أَيْنَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُهِلَّ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ وَيُهِلُّ أَهْلُ الشَّأْمِ مِنْ الْجُحْفَةِ وَيُهِلُّ أَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ وَيَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ لَمْ أَفْقَهْ هَذِهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ١٣٣ ـ أطرافه في: ١٥٢٢، ١٥٢٥، ١٥٢٧، ١٥٢٨، ٧٣٣٤). [92]

---

(٩١) أخرجه مسلم في الطهارة باب: المذى، رقم: ٣٠٣ = ٦٩٤.

(٩٢) واخرجه البخارى ومسلم وابوداود والنسائى من رواية ابن عباس، ومن جابر أيضاً أخرجه مسلم (عينى ـ ٢ ـ ٢١٧، رقم: ٧٢) المترجم = مسلم-حج-٢٧٩٥، ٢٧٩٦.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەناو مزگەوتا هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکوێوە فەرمانمان پێ دەکەی کەئیحرام دابەستین‌و دەست بکەین بەلەبەیکەکردن؟ فەرمووی: خەڵکی مەدینە لەذولحەلیفەوە ئیحرام دادەبەستن، کەئێستا ناوداره بەبیری عەلی، خەڵکی شامیش لەجوحفەوە، خەڵکی نەجدیش لەقەرنولمەنازیلەوە). ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: بەقسەی هەندێ زانا، کەیەکێ لەوانە ئیبنوعەباسە گوایە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشیەتی: خەڵکی یەمەنیش لەچیای یەلەملەمەوە ئیحرام دادەبەستن، کەیەکێکە لەکێوەکانی تیهامە، وەدوو قۆناغ دووره لەمەککەوە). ئیبنوعومەر دەیفەرموو: بەلاَم من خۆم شتی وا لەپێغەمبەرەوە حاڵی نەبووم. (تاج ـ ٢ ل ـ ١٦٠ ز ـ ٨٢ ف ـ ٢ ژ-١٤٩٦ ج-٤).

١٠٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَنَّ رَجُلًا سَأَلَهُ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ فَقَالَ لَا يَلْبَسُ الْقَمِيصَ وَلَا الْعِمَامَةَ وَلَا السَّرَاوِيلَ وَلَا الْبُرْنُسَ وَلَا ثوْبًا مَسَّهُ الْوَرْسُ أَوْ الزَّعْفَرَانُ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ الْخُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا تَحْتَ الْكَعْبَيْنِ). (الحديث ١٣٤- أطرافه في: ٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٤٢، ٥٧٩٤، ٥٨٠٣، ٥٨٠٥، ٥٨٠٦، ٥٨٤٧، ٥٨٥٢).[٩٣]

دیسان فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆکەسێ لەئیحراما بێ بەرگی ئیحرام چی یە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): مێزەرو کراس‌و دەرپێ‌و کلاَوو هەرجلێ وەرس‌و زەعفەرانی پێوەبێ لەبەری ناکا، هەروا خوف لەپێ ناکا، مەگەر بۆکەسێ کەجووتێ سۆڵی دەست نەکەوێ، ئەوا باجووتێ خوف لەخوار قاپەڕەقەڵەوە ببڕێتەوە ـ ئەوجا لەپێیان بکا). (تاج ـ ٢ ز ـ ٨٣ ل ـ ١٦١ ف ـ ١ ژ-١٥٠٠). (ش/ د/ ت/ ن).

---

(٩٣) اخرجه مسلم (عینی ـ ٢ ـ ٢٢١، رقم: ٧٣) ـ المترجم = ٢٧٨٣ شیحا + تاج-٢ ز-٨٣ ژ-١٥٠٠.

**راڤەو شیکردنەوە:**

زۆر لـەم فەرمودانـە کـەوان لەنامـەی زانـین دا بەدیمـەن پەیوەنـدی یـان بەباسـێکی تـرەوە پـترە هـەتا بەنامـەی زانـین (کتـاب العلـم)ەوە، بـەلاّم ئەگـەر بـچینەوە سـەر ئەصـڵەکە کەصـەحیحی بوخـاری یـە دەبیـنین لـەوێ ئیمـامی بوخـاری ئـەم فەرمووداـنەی لـەناو چـەند سەرباسـێکی جیاجیـادا گێڕاوەتـەوە، کەدوور یانزیـك پەیوەنـدی یـەکی بـاش لـەنێوان فـەرموودەکانو سەرباسـەکانا هەیــە، هــەروەك جــۆرە پەیوەندیــەکیش لــەنێوانی نامــەی زانــستو ئەوسەرباسانەدا هەیە. بۆ نموونە ئەم نامەی زانینەی دابـەش کـردووە بەسـەر پەنجاو چەند سـەرباس دا، وەك: (بـاب فـضل العلـم: باسـی گـەورەیی زانـین) و (باب من سئل علماً وهو مشتغل في حديثه فأتم الحديث ثم أجاب السائل)..تاد.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٤) نامەی دەستنوێژ

١٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضأَ قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضرَمَوْتَ مَـا الْحَـدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ فُسَاءٌ أَوْ ضرَاط). (الحديث ١٣٥ ـ طرفه في: ٦٩٥٤) [٩٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسێ دەسـتنوێژی شـکا تادەستنوێژ نەگرێتـەوە نوێـژی دروسـت نییـە) پیاوێکی حەضرەمەوتیش گوتی: ئەی ئەبوهورەیرە! دەسنوێژ بەچـی دەشکێ؟ فەرمووی: بەباڵێبوونەوەو تڕو تسو شتی وا).

---

(٩٤) اخرجه مسلم في الطهارة باب: وجوب الطهارة للصلاة، رقم: ٢٢٥=٥٣٦ شيحا.

١١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضوءِ فَمَنْ اسْتَطاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ). (الحديث ١٣٦).(٩٥)

دیسان فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەت دا ئوممەتم پێیان دەگوترێ: مارۆی چوارپەل سپی، چونکە ئەو شوێنانەی ئەندامیان کەئاوی دەستنێژ دەیانگرێتەوە سپیو گەشو جوانن، بەهۆی ئەسەرو شوێنەواری دەستنوێژەوە، دەی بۆ بەدەستهێنانی ئەم بەهرە گەورەیە لەکاتی دەستنوێژ گرتن دا چەندەی دەتوانن قەشیو گەشی ی خۆتان زۆرتر بکەن). (ریاض ـ ٨٢٤/٣+ تاج ـ ١/ ٥٦ ژ-٦٩ ز-٩).

١١١- عَنْ عَبْدِاللهِ بنْ زَيدِ الأَنْصارِي (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ فَقَالَ لَا يَنْفَتِلْ أَوْ لَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا). (الحديث ١٣٧ - طرفاه في: ١٧٧، ٢٠٥٦).(٩٦)

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) سکاڵای ئەو حاڵم کرد کە جاری واهەیە مرۆڤ لەناو دەست نوێژدا واهەست دەکا، کەتەڕای یەك، یا بایەك، یاشتێ، لەپێشیەوە یالەپاشیەوە دەردەچێ، ئایا حوکمو بڕیاری ئەم حاڵە چی یە؟ دەستنوێژ بەشتی وا دەشکێ یانا؟ فەرمووی: (بالەکاتی وادا وادانێ کەدەستنوێژەکەی نەشکاوەو ماوە، لەبەرئەوە پێویست ناکا کەخۆی لەنوێژەکەی بدزێتەوەو نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام هەرکاتێ دەنگی بایەکی بیست، یابۆنی دەرچوویەکی کرد، یاهەستی بەدەرچوونی تەڕایی یەك کرد ئەوە دەستنوێژەکەی دەشکێ). (ت ـ ١/ ١٢٦ ف ـ ١ ز-٢٦ ژ-٢٠٧، ٢٠٨).

---

(٩٥) اخرجه مسلم في الطهارة باب: استحباب اطالة الغرة والتحجيل، رقم: ٢٤٦ = ٥٧٨ شيحا.

(٩٦) أخرجه مسلم في الحيض باب: الدليل على من تيقن الطهرة ثم شك، رقم: ٣٦١=٨٠٢ شيحا.

## راڤەو شیکردنەوە:

دەرچوونی تۆماو (مەنی) راجیایی تیادایە کەلەدەستنوێژ شکێنەکانە یانا، ئەم فەرموودەیە یاسایەکە لەیاسا سەرەکییەکانی فیقە، کەهەموو شتێ لەسەر ئەصلی خۆی دەمێنێ، تا بەبەلگە بارێ تری بۆ دەچەسپێ گومان لەکاتی وادا زیانی نییە.

پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە شەش کەسن، ڕشتەکە خۆی ئاوایە: (حدثنا علي قال حدثنا سفيان قال حدثنا الزهري عن سعيد بن المسيب عن عباد ابن تميم عن عمه).

چەند خاڵێکی گرنگ هەیە لەبابەتی زانستی فەرمووده شوناسی یەوە، لەم بۆنەیەدا ئاماژەی بۆ دەکەین:

١. ئەم ڕشتەیە تەحدیثو عەنعەنەی تیادایە.

٢. پیاوانی ئەم ڕشتەیە شەش کەسن پێنجیان لەپیاوانی (الكتب الستة) ن، کوتوبی سیتە ئەم شەش پەڕاوەن: بوخاری، موسلیم، ئەبوداود، تیرمیذی، نەسائی، ئیبنوماجە، بەلاّم لەم شەش کەسە (عەلی) یان لەپیاوانی بوخاریو ئەبوداوودو تیرمیذیو نەسائی یەو بەس، چواریشیان مەدینەیین، عەلی بەسرەیی یە، سوفیان مەککەیی یە، لەم ڕشتەیەدا صەحابی لەصەحابییەوە ڕیوایەت دەکا، لەسەر فەرمایشتی کەسانێ کەدەفەرموون عەببادیش صەحابییە، عەبدوڵلای کوڕی زەید ئوحودی یە واتە: ئامادەی غەزای ئوحود بووە، هاوبەشی تیادا کردووە خۆیو باوکیو دایکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، چلو هەشت فەرموودەی هەیە هەشتیان پەسندی هەردوو پیرن، لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمانگی قوربان دا لەشەڕەکەی ڕۆژی حەررەدا، کەلە (٦٣) کۆچیدا بوو شەهید کرا.

١١٢- عَنْ إبنْ عباسْ (رضي الله عنهما) ( أنَ النبيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نامَ حتى نَفَخ، ثمَ صلّى ولم يتوضأْ). (الحديث ١٣٨-أطرافه سبقت في رقم-٩٦/١١٧)[٩٧].

(٩٧)اخرجه مسلم في الصلاة (عينى/ ٢ ص ٢٥٤، رقم: ٤) المترجم.

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەماڵی مەیموونەی پوورم بووم، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوت، پاش ماوەیێ هەڵسا بۆ شەونوێژ، دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرتو دەستی کرد بەشەونوێژ، منیش دەستنوێژێکی سووکەڵەم گرتو پەیڕەوی (اقتدا) م پێ کرد ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەر بوو حەزرەت شەونوێژی کرد، ئەوجا خەوتەوەو لەناو خەوەکەیدا دەستی کرد بەپرخە پرخ، ئەوجا بانگدەر هات بەشوێنی داو عەرزی کرد کەبچێ نوێژی بەیانیان بۆبکا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوەکەی هەڵساو لەگەڵیدا تەشریفی برد بۆ مزگەوت، بەدەستنوێژەکەی پێشووەوە نوێژی کردو بەهۆی خەوتنی پاش شەونوێژەکەوە دەستنوێژی نەگرتەوە، دیارە پێغەمبەران بەخەوتن دەستنوێژیان ناشکێ، گەلێ جار عەلی مامۆستای شێخی بوخاری: دەیفەرموو: سوفیان فەرمووی: ئیبنوعەبباس دەیفەرموو: ئەوجا خەوتەوەو لەناو خەوەکەیدا دەستی کرد بەپرخە پرخ، گەلێ جاریش لەباتی ئەوە دەیفەرموو: ئەو جا راکشا هەتا دەستی کرد بەپرخە پرخ ئەوجا بانگدەر .. تاد).

١١٣- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (دَفَعَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى إِذا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ ثُمَّ تَوَضأَ وَلَمْ يُسْبِغْ الْوُضوءَ فَقُلْتُ الصَّلَاةَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَقالَ الصَّلَاةُ أَمَامَكَ فَرَكِبَ فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضأَ فَأَسْبَغَ الْوُضوءَ ثُمَّ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَصلَّى الْمَغْرِبَ ثُمَّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ ثُمَّ أُقِيمَتْ الْعِشَاءُ فَصَلَّى وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا). (الحديث ١٣٩ ـ أطرافه في: ١٨١، ١٦٦٧، ١٦٦٩، ١٦٧٢).[٩٨]

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجیماڵئاواییدا لەڕۆژی عەرەفەدا لەعەرەفاتەوە گەڕایەوەو کەوتەڕێو

(٩٨) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب ادامة الحاج التلبية، رقم: ١٢٨٠ = ٣٠٨٧.

رۆیــشت بۆموزدەلیفــە، تاگەیــشتە ڕێــچکەکانی حاجیــان، کــەپێیان دەگــوترێ: (شـیعبی حاجیـان) شـیعب واتـە: ڕێـچکەی قەدشـاخ، جالـەوێ تەشـریفی دابـەزیو گمێزی کردو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت منـیش عـەرزیم کـرد: قوربـان! لێـرە نوێژ دەکەی؟ فـەرمووی: نەخـەیر، نوێـژ هالەپێـشمانەوە لـەولاترە، ئینجا سـواری وڵاخەکەی بووەوەو ڕۆیـشت تاگەیـشتە موزدەلیفـە، لـەوێ دابـەزیو دەسـتنوێژێکی تێروپڕی گرت. ئەوجا قامـەتی نوێـژ کـراو نوێـژی شـێوانی کـرد، ئنجا هەرکەسـە لەجێگەی خۆی وشتری خۆی لـێ یـیخ دا، نـەبادا تەشـویش‌و سەرلێـشێوان دروسـت بکەن، لەپاشا قامەتی جەماعەتی نوێـژی خـەوتنانیش کـراو نوێـژی خەوتنانیـشی بەجەماعەت بۆ کردین‌و، هیچ نوێژی تری لەنێوانیاندا نەکرد).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئوسامەی کوڕی زەید خۆی‌و باوکی خۆشەویستی پێغەمبەر بوون، نازنـاوی (الحب بن الحب) ی بووە، نەخشی نقێمی ئەنگوستیلەکەی (حـب رسـول الله) ی بــوو، کــوڕی ئوممونەیمەنــە، کەدایــەو لەلــەی پێغەمبــەر بــووەو بــەمناڵی پەروەردەی کردووە، ئەوەندە هۆشیارو لێهاتوو بـوو لەتەمـەنی هـەژدە ساڵیدا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەسەرکردە، کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـرد تەمـەنی بیـست سـاڵ بـوو، سەدوبیـست‌و هەشـت فـەرموودەی هەیـە، یازدەیـان پەسەندی هـەردوو پـیرن، دوو فەرمودەیشی لەبوخاریـدا هەیـەو لەموسـلیم دا نیە، دوو فەرموودەیشی لەموسـلیم دا هەیـە، لەبوخاریـدا نییـە، کەواتـە: کۆی فــەرموودەکانی لەصــەحیحەین دا دەکاتــە: ١٥+ ٢+٢=١٩، لــەوادیلقورا، لەســاڵی پەنجاو چواری کۆچیدا، لەتەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا گیانی پـاکی سپاردووە. (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم فەرموودەیە پەسەندی هەردوولایە، موسـلیمیش لەحەجدا گێڕاویەتەوە.

١١٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) (أَنَّهُ تَوَضأَ فَغسَلَ وَجْهَهُ ثم أَخَذ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَمَضمَض بِهَا وَاستَنْشَقَ ثمَّ أَخَذ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَجعَلَ بِهَا هَكَذا أَضافَهَا إِلَى يَدِهِ الْأُخْرَى فَغسَلَ بِهِمَا وَجْهَهُ ثمَّ أَخَذ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَغسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُمْنَى ثمَّ أَخَذ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَغسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُسْرَى ثمَّ مَسَحَ بِرأْسِهِ ثمَّ أَخَذ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَرَشَّ عَلَى رِجْلِهِ الْيُمْنَى حَتَّى غسَلَهَا ثمَّ أَخَذ غَرْفَةً أُخْرَى فَغسَلَ بِهَا رِجْلَهُ يَعْنِي الْيُسْرَى ثمَّ قَالَ هَكَذا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضأُ). (الحديث ١٤٠)[٩٩]

عەطای کوڕی یەسار فەرمووی: ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەستنوێژی لەسەر ئەم شێوەیە گرت: دەموچاوی ئاوا شۆرد، لۆچێ ئاوی هەلگرتو لەدەمیو لەلووتی خۆی راداو هنگی کرد، ئنجا لەوێچێ ئاوی تری هەلگرتو کردیە هەردوو دەستیەوەو دەموچاوی شۆرد، ئینجا لالوێچێ تری هەلگرتو دەستی ڕاستی شۆرد، ئینجا لالوێچێ ئاوی تری هەلگرتو دەستی چەپی شۆرد، ئینجا دەستی تەڕ کردو دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، ئەوجا لەوێچێ تری هەلگرتو کەمە کەمە پرژاندی لەقاچی راستیو پێ ی شۆرد، ئەوجا لۆچێ تری هەلگرتو قاچی چەپی پێ شۆرد، ئەوجا فەرمووی: (بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا وەك ئەم دەستنوێژەی من لەبەرچاوی ئێوە گرتم ئەویش ئاوا دەستنوێژی گرت). (ت ـ ١/ ١٣٥ = ز-٢٨ ژ-٢٣٣ ل-١٣٦ چ-٤).

**شیکردنەوە:**

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی بوخاریدا ئاوایە: (حدثنا محمد بن عبد الرحمن قال أخبرنا أبو سلمة الخزاعى منصور بن سلمة قال أخبرنا ابن بلال (يعنى سليمان) عن زيد بن اسلم عن عطاء بن يسار عن ابن عباس) ئەم

---

(٩٩) هذا الحديث من أفراد البخارى عن المسلم، ولم يخرج مسلم عن ابن عباس في صفة الوضوء شيئا (عينى/ ٢/ ٢٦٣، رقم: ٦) المترجم.

ناسك كاری یانه لەم ڕشتەیەدا هەیە: تەحدیثو ئیخبارو عەنعەنەی تیادایە، تابیعی لەتابیعی یەوە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە، واتە: زەید لەعەطاوە، چونکه هەر دوکیان تابیعین، راوییەکان یابەغدادین یامەدینەیین، هەندێ لەڕاوییەکان راڤەو تەفسیری هەندێ لەوشەکانیان کردووەو بۆ دوا خۆیان ڕونیان کردۆتەوە کەمەبەست لە(ئیبنو بیلال) لەڕشتەکەدا سولەیمانی کوڕی بیلالە، زەیدیش یاڕاوییەکی تر ڕوونی کردۆتەوە: کەمەبەست لەوە کەلەپاش شۆردنی قاچی راستی دەفەرموێ: ئینجا لوێچێ ئاوی تری هەلگرتو قاچی پێی شۆرد، مەبەست شۆردنی قاچی چەپیەتی بەدواترین لوێچ! ئەم جۆرە تێچەنە لەزانستی فەرموودە شوناسیدا پێی دەگوترێ: راڤەو روونکردنەوەو تەفسیر، چونکه ئامرازی راڤەکردن بەکارهێنراوە کە (یعنی) یە، کەبەمانای (واتە) ی کوردی یە، بەلاّم بەمە ناگوترێ تێچەنێ بەواتای ئیداج کەیەکێکە لەنەنگەکانی فەرموودەو فەرموودەکەی پێ دەبێ بەمودرەج.

هەندێ دەفەرمون: حەدیثەکانی ئیبنوعەبباس، جگە لەدەدوازدەیەکیان، ئیتر ئەوانی تری لەسەحابەکانی پێغەمبەر بیستووە، زۆرجاران خۆی ڕونی کردۆتەوە کەحەدیثەکەی لەکێ بیستووە، وەك فەرموودەی ژمارە (٧) ی ئەم تەجریدە، کەخۆی دەفەرموێ: ئەبوسوفیان بۆی گێڕامەوە، یادەفەرموێ: فلاّنە فەرموودەم لەئوسامەی کوڕی زەید بیستووە، یالەفەضلی برامم زنەوت، چونکه خۆی لەسەردەمی پێغەمبەردا مێردمنالّ بووە، دە پازدەسالاّن بووە، لەم فەرموودەیەدا وەرگرتنی ئاوی تازە بۆتەڕکردنی سەرلەگێڕانەوەی تری ئەم فەرموودەیە وەرگیراوە، کەئەبوداود گێڕاویەتەوە بەپێ ی یاسای: (فەرموودە هەندێکی دەبێ بەڕاڤەو رونکردنەوە بۆ هەندێکی تری). ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو چەند فەرموودە کەمانەی کەئیبنوعەبباس بۆخۆی لە پێغەمبەری وەرگرتووە.

١١٥- عَنْ أَنَس (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِكَ مِنَ الْخُبُث وَالْخَبَائِث). (الحديث ١٤٢ - طرفه في: ٦٣٢٢) (١٠٠)

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەیویست بچێتەناو ئاودەستەوە دەیفەرموو: (اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث): ئەی خودایە! پەنا دەگرم بەپەنای تۆ لەشەڕی گوڵو دێڵی شەیتانی چەپەڵ) (ش/ د/ ت/ ن - تاج/ ١/ ١١٨ ف - ٥ ز-٢٤ ژ-١٨٦).

**شیکردنەوە:**

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لەڕشتەی چوار کەسیەکانی بوخاری یە.

١١٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ: فَوَضَعْتُ لَهُ وَضوءًا، قَالَ: (مَنْ وَضعَ هَذا) فَأُخْبِرَ، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ). (الحديث ١٤٣).

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ ڕۆیشتە ناو ئاودەست، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ دانا، جاکەهاتە دەرەوە ئاوەکەی دی بۆی دانرابوو، فەرمووی: (کێ ئەم ئاوەی داناوە؟ عەرزی کرا: کەمن دامناوە بۆی، فەرمووی: خودایە! شارەزای شەریعەتی بکەو بیکە بەزانایەکی گەورەی ئیسلام). (ت/ ٥/ ١٢١ ف - ٣ رقم-٣٣٨١ ز-٢١ تاج-٣).

١١٧- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِذا أَتَى أَحَدُكُمْ الْغَائِط فَلَا يَسْتَقْبِل الْقِبْلَةَ وَلَا يُوَلِّهَا ظَهْرَهُ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا). (الحديث ١٤٤ - طرفه في: ٣٩٤)(١٠١)

---

(١٠٠) اخرجه ملسم في الحيض، باب: مايقول اراد دخول الخلاء، رقم: ٣٧٥ = ٨٢٩.

(١٠١) اخرجه مسلم في الطهارة باب: الاستطابة، رقم: ٢٦٤ = ٦٠٨ شيحا.

**ئەبوئەیوبی ئەنصاری** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی پێغەمبەری خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (کەدەچنە سەر پێشاو نەڕووبکەنە ڕووگە (قیبلە)و نەپشتی تێ بکەن، بەڵام ڕووبکەنە ئەملاو ئەولا). (ش/ د/ ت/ ن ١/ تاج/ ١/ ١١٨، ژمارە: ١٠ ز-٤ ژ-١٩١ ل-١١٠ ج-٤ = چاپی چوارەم).**

ئەبو ئەیوب ئەنصاری یە، نەجاری یە، لەهۆزی نەجاری خاڵوانی پێغەمبەرە، بەدری یە، ئامادەی پەیمانی بەیعەتولعەقەبەی دوەم بووە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە دەوری مانگێ میوانی ئەو بوو، یەکێکە لەنوجەبای صەحابەکان (ڕەزای خودایان لێ بێ)، سەدو پەنجا فەرموودەی لەکتێبە ناودارەکانی حەدیثدا هەیە، حەوت لەو سەدو پەنجایە پەسەندی هەردوو پیرن، کەیەکێ لەو حەوت فەرموودەیە ئەم فەرموودەی ئێرەیە کەواین لەخزمەتی دا، چونکە پێشەوا موسلیمیش (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، لەصەحیحی خۆیدا، لەباسی (الطهارة) دا، لە (باب: الاستطابة) دا، ژمارە: ٢٦٤ = ٦٠٨ شیحا. یەك فەرموودەیشی لەبوخاریدا بەتەنها هەیە، کەواتە کۆی فەرموودەکانی لەصەحیحەین دا دەکاتە: ٧+١= ٨. ئەبوئەیوب لایەنگیری ئیمامی عەلی بوو، لەگشت جەنگەکانیدا لەگەڵیدا بوو. لەگەڵ سوپاکەی یەزیدی کوڕی مەعاوییەدا، دەچێ بۆ فەتحی قوسطە نطەنییە، جاکاتێ نزیك دەبنەوە نەخۆش دەکەوێ، بەهاوڕێکانی خۆی دەفەرموێ: (کاتێ کەمردم لەگەڵ خۆتان تەرمەکەم هەڵگرنو بەرەو شارەکە بمبەن، لەکوێدا بەرابەری دوژمن ریزتان بەست، لەبەردەم پێی خۆتاندا بمنێژن، ئەوانیش وایان کرد). گۆڕەکەی لەنزیك شوورا کۆنەکەی قەسطە نطە نییە بوو، کەئێستا ناونراوە: ئەستەنبووڵ، مزگەوتێکی مەزن لەسەر گۆڕەکەی دروست کراوە، موسوڵمانان ڕێزێکی زۆر لەگۆڕەکەی دەگرن، ئێستا بووە بەزیارەتگایەکی گەورە، لەخزمەتیدا لەکاتی بێ بارانیدا داوای بارینی باران لەخودای گەورە دەکرێ، وەنزاکەیان گیرادەبێو باران دەبارێ. لەساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە، ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ.(بڕوانە: عەینی/٢/٢٧٦).

١١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: (إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ إِذَا قَعَدْتَ عَلَى حَاجَتِكَ فَلَا تَسْتَقْبِلْ الْقِبْلَةَ وَلَا بَيْتَ الْمَقْدِسِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لَقَدْ ارْتَقَيْتُ يَوْمًا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَنَا فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلًا بَيْتَ الْمَقْدِسِ لِحَاجَتِهِ). (الحديث ١٤٥ ـ أطرافه في: ١٤٨، ١٤٩، ٤١٠٢).[١٠٢]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: کەسانێ هەن دەڵێن: کاتێ لەسەر پێشاو دانیشتن بۆ سەراوکردن ڕووبەڕووی قیبلە، یاروووبەڕوی بەیتولەقدیس دامەنیشە. بەڵام من جارێ ئیشم هەبوو چوومە سەر سەربانەکەی حەفصەی خوشکم کەژنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو: پێغەمبەرم دی خەریك بوو دەستی بەئاو دەگەیاند، لەسەر دووخشتی کاڵ ڕوو بەڕووی شام دانیشتبوو، پشتی لەڕووگە بوو، سەراوی دەکرد.(ش/د/ ١ ن / ن ـ تاج/ ١/ ١٢٠/ ١١ ز-٢٤ ژ-١٩٢).

١١٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) (أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْجُبْ نِسَاءَكَ فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُ فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً مِنْ اللَّيَالِي عِشَاءً وَكَانَتْ امْرَأَةً طَوِيلَةً فَنَادَاهَا عُمَرُ أَلَا قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ حِرْصًا عَلَى أَنْ يَنْزِلَ الْحِجَابُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ الْحِجَابِ). (الحديث ١٤٦ ـ أطرافه في: ١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧، ٦٢٤٠).

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: دەستووری هاوسەرەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کەدەچوون بۆسەراو بەشەو دەردەچوون، دەچوون بۆ سەراوخانەکانی مەدینە کەچۆڵێکی پان و پۆڕبوو لەلامالان بوو، پێیان دەگوت: مەناصیع. عومەریش هەمیشە پێشنیاری دەکردو عەرزی حەزرەتی دەکرد:

---

(١٠٢) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: الاستطابة، رقم: ٢٦٦.

قوربان! ژنەکانت قەدەغە بکەو مەهێڵە لەماڵ دەربچن، پێغەمبەریش نەیدەکرد، تاشەوێ لەشەوان وارێ دەکەوێ سەودەی کچی زەمعە، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، دەمی خەوتنان لەماڵ دەردەچێو دەچێ بۆ سەراو، لەبەرئەوەی سەودە ئافرەتێکی کەلەگەڵت بوو، عومەر دەیناسێتەوەو بانگی دەکا: ئەی سەودە! بزانە دەتناسین، عومەر لەپەرۆشی ئەوەی ئایەتی حیجاب بێتەخوارەوە، بەهیوای ئەم مەبەستە بەرزە ئەم قسەیەی کرد. جاخودای گەورەو سەروەر ئایەتەکانی حیجابی نارد، کەباسی حوکمی خۆداپۆشینی ژنانیان تیادا ڕوون کراوەتەوە).

### ڕوونکردنەوە:

مەبەست لەحیجاب لەشەرعدا ئەوەیە پیاو تەماشای ناڕەوای لەشی ئافرەتی بێگانە نەکا، ئەویش بەم چەند شێوەیە جی بەجێ دەکرێ: لەماڵەوە بەهۆی پەردەو هۆدەو جێگەی جیاوە، لەدەریشەوە بەهۆی سەرپۆشو پەچەو بالاپۆشو بەرگی ئاودامانەوە، جلی کوردی بەرگێکی شەرعی زۆر جوانە، لەڕاستی دا جوانترین نموونەیە بۆ حیجابی ئیسلامی، گرنگ ئەوەیە ژن شەرمگای بەجلێکی ژنانە بپۆشێ، هەتا ئەگەر بلووزو پانتۆڵی ژنانەی ئاسایی بەحورمەت لەبەربکا دەبێ، چونکە جلو بەرگ لەبەشی عاداتە، لەبەشی عیبادات نییە، لەبەرئەوە دروستە کەبەپێی عورفو باوی سەردەم بگۆڕی.

لەڕاستی دا خۆبەستنەوە بەهەموو عادەتێکی سەردەمی حەزرەتەوە لەم سەدەیەدا زەحمەتە، شتی وا بۆ کەسی خۆی دەست دەدا، وەشتی چاکیشە، بەڵام بۆئەوخەڵکە بەگشتی زەحمەتە، بناغەی ئایینیش لەسەر ئاسانکاری یە.

بڕوانە: تاج-٩ ل-٣٢٩ ئاخری باسی زوهد=تاج-٥ل-٣١٧کۆتایی زنجیرە-٩٩ ژ-٥٢٢٥م.

١٢٠ - عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ أَجِيءُ أَنَا وَغُلَامٌ مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ يَعْنِي يَسْتَنْجِي بِالماء).

وفي ريواية: من ماء وعنزة، يستنجي بالماء. (الحديث ١٥٠ ـ أطرافه في: ١٥١، ١٥٢، ٢١٧، ٥٠٠) [١٠٣]

ئەنەس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەچوو بۆسەراو، من‌و کوڕێکی تر، جەوەندەییٚ ئاومان هەڵدەگرت‌و شوێنی دەکەوتین، واتە: بەوئاوە تاراتی دەگرت، لەگێڕانەوەیەکدا: من‌و کوڕێکی تر لەسێرەی مندا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ سەراو جەوەندەییٚ ئاومان بۆ دەبرد، بەو ئاوە تاراتی دەگرت، وەنەقیزەکەیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایدەچەقاندو دەیکرد بەبەربەست (سوترە) لەکاتی نوێژدا). (ش/ د/ ت ـ تاج/ ١/ ١٢٢/ ١ ز ـ ٢٥ ژ-٢٠١).

١٢١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إذا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ وَإِذا أَتَى الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ). (الحديث ١٥٣ ـ طرفاه في: ١٥٤، ٥٦٣٠) [١٠٤]

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمویٚ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (کاتیٚ شت دەخۆنەوە لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن، کەسەراویش دەکەن بەدەستی راستتان چووکتان مەگرن، هەروا تاراتیش بەدەستی راستتان مەگرن). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ١٢٠/ ١٣= ز-٢٤ ژ-١٩٤).

## ڕوونکردنەوە:

ئەبوقەتادە ناوی حاریث، یا نوعمان، یاعەمری کوڕی ڕەبیعی یە، نازناوی (فارس رسول الله) یە. واتە: شاسوارەکەی پێغەمبەری خودا، لەخزمەت حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق‌و غەزاکانی

---

(١٠٣) اخرجه مسلم في الطهرة، باب: الاستنجاء بالماء من التبرز، رقم: ٢٧١=٦١٩.

(١٠٤)أخرجه مسلم في الطهارة، باب: النهى عن الاستنجاء باليمين، وفى الاشربةرقم: ٢٦٧=٦١٢.

تری پاش خەندەق بووە، بەڵام واناودارەکە ئامادەی بەدر نەبووە، سەدوحەفتا فەرموودەی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، دوو فەرموودەی تری لەبوخاریدا هەیە جگەلەو یازدەیەی کەپەسەندی هەردوو پیرن هەشت فەرموودەی تری لەصەحیحی موسلیم دا هەیە، واتە: کۆی فەرموودەکانی لەبوخاریدا دەکاتە: ١١+٢= ١٣ فەرموودە، وەکۆی فەرموودەکانی لەموسلیم دا دەکاتە یازدە لەگەڵ هەشت دا یەکسانە بەنۆزدە، سەرجەمی فەرموودەکانی لەبوخاریو موسلیم دا دەکاتە: ١١+٢+٨= ٢١ فەرموودە. راجیایی هەیە لەشوێنی مردنیدا هەندێ دەفەرموون: لەمەدینە مردووە، هەندێ دەڵێن: لەکووفە مردووە، لەساڵی پەنجاو چواری کۆچی دا لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا فەرمانی هەقی یەزدانی بەجێ هێناوە رەزای خودای لێ بێ. لەزانستی فەرموودەدا زانینی زێدو شوێنی مەرگو چەندێتی تەمەنو ساڵی مەرگی فەرموودەزان (راوی)و جێگەی دانیشتنیو ناوی ناسیاوی، بایەخێکی چاکی هەیە، زۆرجار دەبێ بەسەرچاوە بۆ روون کردنەوەی فەرموودەکە، یابۆ لەباریو نالەباریی ڕشتەکەی. بۆ نموونە: بەپێ ی مەرجی بوخاری بەیەك گەیشتنی فەقێو مامۆستا، بۆگێڕانەوەی فەرموودە لەلایەنی ئەو فەقێ یەوە لەو مامۆستایەوە پێویستە، دەبێ هەردوولا هاوچەرخ بن، وەکی تریش ئیمامی حەمزە لەغەزای ئوحوددا شەهید بووە، کەواتە کەسێ لەوەوە داستانی غەزای خەندەق بگێڕێتەوە راست ناکا، بەڵام داستانی غەزای بەدر بگێڕێتەوە دەبێو قسەکەی ڕێ ی تێدەچێ، چونکە ئیمامی حەمزە یەکێك بووە لەپاڵەوانەکانی غەزای بەدر، کەلەساڵی دووەمی کۆچی دا ڕووی داوە، لەغەزای ئوحوددا شەهید بووە کەلەساڵی دوەمی کۆچی دا روی داوە، دەی چۆن ئەقڵ دەیگرێ کەئیمامی حەمزە داستانی غەزای خەندەق بگێڕێتەوە کەلەساڵی چوارەمی کۆچیدا رووی داوە.

بێجگە لەم ئەبوقەتادەیە لەناو یارانی پێغەمبەردا کەسێکی ترنییە کەسناوی ئەبوقەتادە بێ، کەواتە: ئەگەر یەکێ فەرموودەیێ بداتەپاڵ

ئەبوقەتادەیەكی تر لەهاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەكەی جێگەی گومانێكی گەورەیە، بگرە درووییەكی ڕووتە، چوونكە بەپێچەوانەی فەرمایشتو رای پسپۆڕانی ئەم زانستەوەیە.

١٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَخَرَجَ لِحَاجَتِهِ فَكَانَ لَا يَلْتَفِتُ فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَقَالَ ابْغِنِي أَحْجَارًا أَسْتَنْفِض بِهَا أَوْ نَحْوَهُ وَلَا تَأْتِنِي بِعَظْمٍ وَلَا رَوْث فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطرَفِ ثِيَابِي فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ وَأَعْرَضتُ عَنْهُ فَلَمَّا قَضى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ). (الحديث ١٥٥ ـ طرفه في: ٣٨٦٠) [(١٠٥)]

ئەبوهوڕەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆسەراو، منیش دوای كەوتم، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو ئاوڕی نەدەدایەوە، جاكە لێی نزیك بوومەوە فەرمووی: (چەند بەردێكم بۆ پەیداكە، خۆمیان پێ پاك دەكەمەوە) یاقسەیەكی ئاوای فەرموو، فەرمووشی: (بەڵام ئێسقانو تەپاڵەم بۆ مەهێنە). منیش لەداوێنی جلەكانما چەند بەردێكم بۆ بردو لەتەنیشتیەوە دامنانو پشتم تێ كرد، كاتێ سەرواوەكەی تەواو كرد خۆی بەبەردەكان سڕی). (تاج/ ١/ ١٢٣/ ٢ ز-٢٥ ژ-٢٠٢).

## ڕوونكردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە كەڕیوایەتی حەدیث بەمەعنا دروستە، واتە: گێڕانەوەی مەبەستی فەرموودەكە بەقسەیێ ئەنجام بدا، كەخۆی بەشداری بكا لەداڕشتنەكەیدا، وەك لێرەدا ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: (یا قسەیەكی ئاوای فەرموو).

١٢٣- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (أَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْغَائِط فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثةِ أَحْجَارٍ فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ وَالْتَمَسْتُ الثالِث فَلَمْ

---

(١٠٥) لم يخرجه مسلم ولا الأربعة، يعنى أباداو والترمذى وانسائي وابن ماجه (عينى/ ٢/ ٢٩٨/ ٢١) المترجم.

أَجِدْهُ فَأَخَذتُ رَوْثَةً فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَأَخَذ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ وَقَالَ هَذا رِكْسٌ). (الحديث ١٥٦) (١٠٦)

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ سەراو، فەرمانی پێ کردم کەسێ بەردی بۆ بەرم، هەتا لەپاش سەراوەکە خۆیان پێ پاك بکاتەوە، گەڕام دوو بەردم دۆزی یەوە، گەڕام بۆ بەردی سێیەم چنگم نەکەوت، لەباتی ئەوە تەرسەقولێکم هەڵگرتو دوو بەردەکەو تەرسەقوولەکەم بۆیبرد، جاهەر دووبەردەکەی وەرگرتو تەرسە قوولەکەی تووڕداو فەرمووی: (ئەمەیان نابێ چونکە چەپەڵە).

## ڕوونکردنەوە:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەد یەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە، تابیعی یە، فەرموودەی لەباوکیو لە حەزرەتی عائیشە وەرگرتووە، ئەعمەشو کەسانی تریش فەرموودەیان لەو وەرگرتووە، زانایەکی کارابوو، هەموو ڕۆژێ حەوت سەد ڕکات نوێژی دەکرد، نوێژی شێوانو بەیانی بەیەك دەستنوێژ دەکرد، واتە: بەشەو نەدەخەوت، هەربێدار بووە، شەوی زیندوو دەکردەوە، هەتا شەبەق هەر خەریکی خواپەرستی بوو، ئەم فەرموودەیە لەئەفرادی بووخارییە.

١٢٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: (تَوَضَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّةً مَرَّةً). (الحديث ١٥٧) (١٠٧)

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جارە جارە کەدەسنوێژی دەشۆرد، هەموو ئەندامێکی دەستنوێژی یەك جار دەشۆرد). (ب/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ١٣٦/ ٣ = ز-٢٨ ژ-٣٥).

---

(١٠٦) هو من أفراد البخاري (عينى/ ٢/ ٣٠٣/ ٢٢) المترجم.

(١٠٧) هذا مما تفرد به البخاري عن مسلم وأخرجه الأربعة (عينى/ ٣/ ٢/ ٢٣) المترجم.

١٢٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ). (الحديث ١٥٨) [١٠٨]

عەبدوڵلای کوڕی یەزیدی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەرم دی (درودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی دەگرت، هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژی دووجار دووجار شۆرد). (ب/ د/ ت/ تاج/ ١/ ١٣٦/ ٢ = ز-٢٨ ژ-٢٣٤ چ-٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە لەئەفرادی پیری بوخاری یە، موسلیم نەیگێڕاوەتەوە، هەروا کەسی تریش لەکۆمەڵەکە (الجماعە: بوخاری، موسلیم، ئەبوداوود، تیرمیزی، نەسائی، ئیبنوماجە) نەیگێڕاوەتەوە، بەڵام لەئەبوهورەیرەوە ئەبوداوودو تیرمیزی گێڕاویانەتەوە (عەینی/ ٣/ ٤/ ٢٤)

١٢٦- عنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أنهُ: (دَعَا بِإِنَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاث مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْإِنَاءِ فَمَضمَض وَاسْتَنْشَقَ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلَاث مِرَارٍ ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاث مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثُمَّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ تَوَضأَ نَحْوَ وُضوئِي هَذا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّث فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ. وفِي رواية: أَنَّ عُثْمَان (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَلَا أُحَدِّثكُمْ حَدِيثا لَوْلَا آيَةٌ مَا حَدَّثْتُكُمُوهُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَا يَتَوَضأُ رَجُلٌ يُحْسِنُ وُضوءَهُ وَيُصَلِّي الصَّلَاةَ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلَاةِ حَتَّى يُصَلِّيَهَا قَالَ عُرْوَةُ الْآيَةَ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ). (الحديث ١٥٩ ـ أطرافه في: ١٦٠، ١٦٤، ١٩٣٤، ٦٤٣٣) [١٠٩]

---

(١٠٨) هذا من افراد البخارى ولم يخرجه غيره من الجماعة (عينى/٣/ ٤/ ٢٤) المترجم.

(١٠٩) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: صفة الوضوء وكماله، رقم: ٢٢٦=٥٣٧ شيحا.

حومرانی نۆکەری عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) داوای ئاوی دەسنوێژی کردو ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: لەپێشا ئاوی کرد بەهەردوو دەستی خۆیدا، هەردوو دەستی تاهەردوو مووچەکانی سێ جار شۆرد، ئنجا دەستی راستی کرد بەناو دەفرەکەداو سێ جار ئاوی لەدەمی‌و لەلووتی راداو هنگی کرد، ئنجا سێ جار دەم‌و چاوی شۆرد، ئەنجا سێ جار دەستی راستی هەتا ئانیشکی شۆرد، ئینجا سێ جار بەوچەشنە دەستی چەپیشی شۆرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریداو، سەری خۆی مەسح کرد، ئینجا قاچی راستی هەتا هەردوو قاپە رەقەڵەی سێ جار شۆرد، ئینجا سێ جار بەوچەشنە قاچی چەپیشی شۆرد، لەپاشا عوپمان فەرمووی بەچاوی خۆم پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) دی وەك ئەم دەستنوێژەی من گرتم لەبەرچاوی ئێوە، ئاوا دەستنوێژی گرت‌وئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرکەسێ دەستنوێژێ بگرێ لەچەشنی ئەم دەسنوێژەی کەئێستا من گرتم، ئنجا هەلسێ دوو رکات نوێژی پوختی دوور لەخەیاڵی کاروباری دنیایی بکا، یاپتر لەدوو ڕکات بکا بەهەمان شێوە، ئیتر خودای گەورە لەگوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێ) لەگێڕانەوەیەکا: عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئاگادار بن بائەم فەرموودەیەتان پێ بڵێم، بەخودا لەبەر ئەو ئایەتە نەبێ کەهەڕەشە لەشاردنەوەی زانستی ئایینی دەکا، بەپێویستم نەدەزانی کەبۆتانی بگێڕمەوە، بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەرکەسێ دەستنوێژێ بەجوانی بگرێ، ئەوجا نوێژێ لەپێنج فەرزەکان بکا، مسۆگەر کەخودا لەگوناهی ئەو ماوەیەی هەتا نوێژە فەرزەکەی تری دوا ئەو نوێژە، خۆش دەبێ). (ت/ ١/ ١/١٣٥ ز-٢٨ ژ-٢٣٣). عوروەی کوڕی زوبەیر دەفەرموێ: (مەبەست لەم ئایەتەی کەعوپمان لەم شوێنەدا ئاماژەی بۆ دەکا ئایەتی سەدو پەنجاو نۆی سورەتی بەقەرەیە کەدەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ

وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ } واتە: (ئەو كەسانەی كەئەو بەلگەو نیشانە رۆشنانە حەشار دەدەن، كەخوادی گەورەو سەروەر ناردوونی‌و لەنامە ئاسمانی یەكانـدا روونی كردوونەتەوە بۆ مەردووم، ئەم جۆرە كەسانە لەسەر ئەم جۆرە تاوانـە گەورانـە، كـەبریتی یـە لەشاردنەوەی زانـستی ئـایینی، هـەموو نەفرەتكـەری نەفرەت‌و لەعنەتیان لێ دەكەن!).

## روونكردنەوە:

گەرچی ئـەم ئایەتـە پیرۆزە دەرهـەق بـەخاوەن نامـەكان هاتۆتـە خـوارەوە بەتایبـەتی، بـەلاّم بایـەخ‌و عیـبرەت بەگـشتیایەتی ی بێژەیـە، عیـبرەت بـە عمومی لەفظە، نەك بەهۆیە تایبەتەكە، كەواتـە: هەركەسێ زانـستی ئـایینی حەشـاربدا، سـەر بەهـەر ئـایینێ بێ، بـەر هەڕەشـەی ئـەم ئایەتـە دەكـەوێ، فـەرمانڕەوای سێیەمی موسـوڵمانان ئیمـامی عوثمـانی كـوڕی عـەففان، دایكـی نـاوی (أروى) یـە كـچی پـووری بـاوكی پێغەمبـەرە لـە پێغەمبـەر منـاڵترە، نـاودەبرێ بـە: ذو نـورەین، واتـە: دوو نـوور، چوونكە دوو كـچی پێغەمبـەری هێنـاوە لەپێـشا روقیـەی هێنـاوە، كەڕوقیـە دەمـرێ ئوممكـەلثووم دەهێنـێ، روقیـەو ئوممكـەلثووم كـچی پێغەمبـەر بـوون، دروودی خـوا لـە پێغەمبـەرو رەزای خودا لـەوان بێ، سـەدو چل‌و شـەش فـەرموودەی لەكتێبـە ناودارەكـانی سوونەتدا هەیە، پێشەوا بوخاری یازدەیانی گێڕاوەتەوە.

لـەپاش شـەهید بـوونی ئیمـامی عومـەر، لەیەكـەم رۆژی موحـەڕەمی سـاڵی بیست‌و چواری كۆچی دا كـرا بـەجێ نـشینی سێیەم، دەوڵـەتی ئیـسلام لەسـەر دەسـتی ئـەودا تـەواو دامـەزراو رووبـەری فـراوان بـوو، سـامان ئـەوقی دایــەوە، مــاڵ زۆر زۆر بــوو، وای لێ هــاتبوو خــەڵك كــەنیزەكیان دەكـڕی سەربەسـەر بـەپارە، گـرنگترین‌و نـاودارترین كـاری ئیمـامی عوثمـان جـەمعی قورئـان بـوو، لەتەمـەنی هەشـتاو دوو سـاڵیدا، لەفەرتەنەیـەكی كوێرانـەدا،

لەڕۆژی هەینی دا، ڕێکەوتی هەژدەی مانگی قوربانی ساڵی (٣٥) کۆچی، لەکاتی دەورکردنـەوەی قورئانـدا، ئەسـوەدی تـەجیبی شـەهیدی کـرد، قورئانەکـە لەباوەشی دا بوو خوێنەکەی پژا بەسەر ئەم ئایەتەدا: (فسيكفيكهم الله) هـەزار ڕەحمەت لەئیمامی جەزەری کەلە (ذات الشفا) دا دەفەرموێ:

فـــذبحوه تـــالی القـــرآن
بـــین یدیـــه المـــصحف العثمـــانی!

(بڕوانە: تـاج/٥ /٣٣١/ ١ = تـاج-٤ ز-٩٤ ژ-٣٦٨٤ هـەروا تـاج/ ٥/ ٤٥ ز ـ ٨ هـەتا ف ـ ١٦ تاج-٣ ز-٨ ژ-٣٢٧٢ هەتا ٣٢٨٧).

بەکوردی واتە:

وەک بـەرخ سـەربڕی، سـەربڕا عوثمـان
کاتی شەهید بوون، قورئان لەسەر ڕان

١٢٧–عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّـهُ قَـالَ: (مَنْ تَوَضأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ). (الحديث ١٦١ ـ طرفه في: ١٦٢ طرفه في: ١٦١)[١١٠]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (هەرکەسـێ دەسـتنوێژ دەگـرێ بـاهنگ بکـاو ئـاو لـەلوولتی رابـدا، وەهەرکەسـێ بەبـەردو شـتی وا تـارات دەگـرێ، بابەچـەند بـەردێکی تـاك خـۆی پـاك بکاتـەوە، وەك سێ یاپێنج یاحەوت.وە هەروەها). (ش/ ت/ ن- تاج/ ١/ ١٣٤/ ١ ز-٢٨ ژ-٢٣٣).

١٢٧– (مكرر) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا تَوَضأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ ثمَّ لِيَنْثرْ وَمَنْ اسْـتَجْمَرَ فَلْيُـوتِرْ وَإِذا

(١١٠) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: الإيتار في الاستنثار والاستجمار، رقم: ٢٣٧=٥٦١.

اسْتَيْقَظ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهَا فِي وَضُوئِهِ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ). (مكرر) (الحديث ١٦٢).(١١١)

**دیسان ئەو** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی پێغەمبەری خوا** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کاتێ یەکێ لەئێوە دەستنوێژ دەگرێ بائاو بکاتە لووتی یەوەو ناو لووتی پاك بکاتەوەو ئەوجا هنگ بکا، وەهەرکەسێ بەبەردو شتی وا تارات دەگرێ بابەچەن بەردێکی تاك تارات بگرێ، کاتێکیش لەخەو هەڵدەستن دەست مەکەن بەناو حاجەتەکەدا، کەئاوی دەستنوێژەکەی تیادایە، لەپێشا سێ جار لەدەرەوەی حاجەتەکە دەستتان پاك بشۆرن، ئەوجا بۆتان هەیە دەست بکەن بەناویدا، بەمشت یابەلۆیچ ئاوی لێ هەلگۆزن، چونکە ئێوە نازانن دەستتان بەشەو لەکاتی خەوتن دا چی بەسەر هاتووەو بەرکوێ ی تری جەستە کەوتووە، دوور نیە کەبەرشتێکی پیس کەوتبێ!). (ش/ د/ ت/ ن - تاج/ ١/ ١/١٣٠ ز-٢٧ ژ-٢٢١).**

١٢٨- عنْ إبنْ عمر (رَضي اللهُ عَنْهُما) وقد قيل له: (رَأَيْتُكَ لَا تَمَسُّ مِنْ الْأَرْكَانِ إِلَّا الْيَمَانِيَّيْنِ وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ وَرَأَيْتُكَ إذا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إذا رَأَوْا الْهِلَالَ وَلَمْ تُهِلَّ أَنْتَ حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ أَمَّا الْأَرْكَانُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمَسُّ إِلَّا الْيَمَانِيَّيْنِ وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَلْبَسُ النَّعْلَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ وَيَتَوَضَأُ فِيهَا فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْبُغُ بِهَا فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا وَأَمَّا الْإِهْلَالُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِث بِهِ رَاحِلَتُهُ). (الحديث ١٦٦- ١٥١٤، ١٥٥٢، ١٦٠٩، ٢٨٦٥، ٥٨٥١)(١١٢)

---

(١١١) (مكرر) رواه الخمسة، أخرجه مسلم، باب: كراهة غمس المتوضيء يده المشكوك في نجاستها في الاناء (شرح النووى على صحيح مسلم ج/٣ ص ١٧٨، تاج الاصول ج/١ ص ٩٩ طبعة/٤) المترجم=٥٥٩ شيحا تـاج-١ ز-٢٨ ژ-٢٣٣).

(١١٢) اخرجه مسلم في الحج باب: الإهلال من حيث ينبعث الراحلة رقم: ١١٨٧.

عوبەیدی کوڕی جورەیج فەرمووی: عەرزی ئیبنوعومەرم کرد: قوربان! بۆ تۆ چوار شت هەیە دەیانکەی، کەچی برادەرەکانی ترت نایکەن؟ فەرمووی: ئەوانە کامانەن ئەی کوڕی جورەیج! گوتم: دەتبینم لەکاتی تەوافی کابەدا لەچوار گۆشەکەی کابە، بەس ئەو دوو گۆشەیە دەست پیادەهێنیو ماچیان دەکەی، کەناودارن بەدوو گۆشە یەمەنییەکان، دەیشت بینم سۆلی سەبتیش لەپێ دەکەی، کەبەسۆلی چەرمی خۆشەکراوی بێ کوڵكو مووەگوترێ، دەیشت بینم مووی خۆتو هەروا پۆشاکت بەڕەنگی زەرد ڕەنگ دەکەی، مەردومیش لەمەککە کەمانگی نوێ ی قوربانیان دێ، ئیتر ئیحرامی حەج یاعەمرە دادەبەستن، کەچی تۆ لەمەککە دەبی هەتا ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربان، کەناوداره بەڕۆژی تەرویە، ئیحرام دانابەستی؟ ئیبنوعومەر فەرمووی: دەبا بۆت روون بکەمەوە کەبۆ وادەکەم: من بۆیە دەست دەهێنم بەدوو گۆشە یەمانی یەکانی کابەداو ماچیان دەکەم، چوونکە نەمدیوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جگە لەم دوو گۆشەیە گۆشەکانی تری کابە ماچ بکا، یادەستیان پێدا بهێنێ، وە پێغەمبەریشم بەچاوی خۆم دیوە سۆلی سەبتی لەپێ دەکرد، وەدەسنوێژی پێوەدەگرت، بۆیە منیش حەز دەکەم کەئەو جۆرە سۆلە لەپێ بکەم، چونکە بتپەرستەکان زۆرتر سۆلی چەرمی خاویان لەپێ دەکرد، بەکارهێنانی ڕەنگی زەردیش لەبەرئەوەیە، کەمن خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگی زەردی بەکار دەهێنا، لەبەرئەوە منیش حەزدەکەم ئەو ڕەنگە بەکار بهێنمو لەوەدا پێغەمبەر بکەم بەسەرمەشق بۆخۆم، مەسەلەی ئیحرام دابەستنیش ئەوەی من دیومە ئەمەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ئیحرامی دادەبەست کەوڵاخەکەی لەژێری دا هەڵدەستایە سەرپێو بەرەو مینا دەکەوتەڕێ). (بڕوانە زنجیرە/٩٥ تاج/ ٢/ ١٨٥ = ژ-١٥٤٣ هەتا ١٥٥١).

١٢٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْجِبُهُ ألتيمنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطهورِهِ وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ) (الحديث ١٦٨ ـ أطرافه في: ٤٢٦، ٥٣٨٠، ٥٨٥٤، ٥٩٢٦) (١١٣)

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) (تابۆی بکرایە لەگشت کاروبارێکی خۆی دا حەزی لەوەبوو کەلای ڕاست پێش بخات، وەك پێلاو لەپێ کردنو سەرداهێنانو مووشانەکردنو دەستنوێژ گرتنو گشت کاروبارێکی بایەخداری تر). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ٤/١٥٤ تاج-١ ز-٣٢ ژ-٢٨٠ + تاج/ ٤/ ١٤٠/ ٤).

١٣٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهما) أَنَّهُ قَالَ: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَانَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ فَالْتَمَسَ النَّاسُ الْوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ الْإِنَاءِ يَدَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ قَالَ فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ) (الحديث ١٦٩ـ أطرافه في: ١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٢، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥). (١١٤)

ئەنەس (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نزیکی نوێژی عەصر بوو، روانیم یاران دەگەڕان بۆ ئاو بۆ دەستنوێژ، ئاو نەبوو، تالەجامێکا هەنێ ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ دەسنوێژ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی خستەناو دەفرەکەوەو دەستووری دا بەخەڵکەکە دەستنوێژی لێ بگرن، بەچاوی خۆم دەمدی کەئاوەکە لەنێوانی پەنجەکانی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) وەك کانی هەڵدەقوڵایە ناو جامەکەوە، ئیتر عەشامەتەکە هەتا دوا کەسیان لەو ئاوە دەستنوێژیان گرت!). (ش/ ت ـ تاج/ ٤/ ٣٣٤/ ٢+ ١+ ٣+ ٤ تاج-٣ ز-١٠٤ ژ-٣١٧١، ٣١٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٤).

---

(١١٣) أخرجه مسلم في الطهارة باب: التيمن في الطهور وغيره، رقم: ٢٨٦ = ٦١٦.

(١١٤) أخرجه مسلم في الفضائل باب: في معجزات النبيُ (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) رقم: ٢٢٧٩=٥٩٠١.

١٣١- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ لَمَّا حَلَقَ رَأْسَهُ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَوَّلَ مَنْ أَخَذ مِنْ شَعَرِهِ). (الحديث ١٧١- طرفه في: ١٧٠)[(١١٥)]

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەحەجی ماڵئاوایی دا سەری خۆی تاشی، یەکەم کەس لەو قژە پیرۆزەی بەرکەوت ئەبو طەلحە بوو). (تاج/٢/ ٢١٦ زنجیرە/ ١١١از- ١٠٨ ژ-١٥٩٦).**

## ڕاڤەو ڕونکردنەوە:

**ئەم فەرموودەیە دەبێ بەبەڵگە لەسەر چەند بڕیار (حوکم)ێ، وەك پاکیی موو، پاکیی ئەو ئاوەی مووی پێ دەشۆرێ، سەرتاشین سوننەتی پێغەمبەرە، خۆ موفەڕك کردن بە مووی پیرۆزی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سوننەتە لەحودەیبییە خێراشی کوڕی ئومەییە سەری پێغەمبەری تاشی لەحەجی ماڵئاوایی دا.**

## باسی: بەرماوەی سەگ‌و شوێن پای لەناو مزگەوتا

١٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ: (إِذا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا). (الحديث ١٧٢).[(١١٦)]

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کەسەگ یان بەراز دەمی نایە ناو حاجەت‌و قاپتانەوە هەرچی تێدایە**

---

(١١٥) أخرجه مسلم في الحج، باب: بيان ان السنة يوم لنحر أن يرص ثم ينحر، رقم: ١٣٠٥=٣١٣٩-٣١٤٢، ١٥٩٦.

(١١٦) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: حكم ولوغ الكلب، رقم: ٢٧٩=٦٤٦.

بیرێژن، ئینجا حەوت جار بەئاو بیشۆرن). لەگێڕانەوەیەکی تردا: (جاری حەوتەمیان بەخۆڵاو). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ١٠٩/ ٤ = ز-٢٤ ژ-١٦٢).

١٣٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضي اللهُ عَنْهما) قَالَ: (كَانَتْ الْكِلَابُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِك).

**ئیبنوعومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سەگ دەهاتو دەچوو بەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، تەنانەت جاری وادەبوو میزیشی تێ دەکرد، چونکە مزگەوت دەرگای نەبوو، لەگەڵ ئەوەیشا ئاویشیان لەشوێن میزەکەی نەدەپرژان چ جای شۆردنەوەی).**

١٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا يَزَالُ الْعَبْدُ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ مَا يُحْدِث). (الحديث ١٧٦ ـ أطرافه في: ٤٤٥، ٤٧٧، ٦٤٧، ٦٤٨، ٦٥٩، ٢١١٩، ٣٢٢٩,٤٧١٧).

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (بەندەی خوا هەتا لەناو مزگەوتدا چاوەنواڕی نوێژ بکا بەئیعتیبار والەناو نوێژداو خێرو پاداشی ئەو نوێژەی بۆهەیە کەچاوەنواڕی دەکا، بەمەرجێ دەسنوێژەکەی نەشکێ).**

١٣٥-عنْ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ: سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ قَالَ قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِذا جَامَعَ فَلَمْ يُمْنِ قَالَ عُثْمَانُ يَتَوَضأُ كَمَا يَتَوَضأُ لِلصَّلَاةِ، وَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ. قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عليًا وطلحةَ وأُبَيَّ بنَ كَعْبٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمْ) فأمروا بذلك)(الحديث١٧٩طرفه في:٢٩٢).[117]

---

(١١٧) اخرجه مسلم في الحيض، باب: إنما الماء من الماء، رقم: ٣٤٥=٧٧٩.

زەیدی کوڕی خالید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە عوثمانی کوڕی عەففان ، گوتم: پێم بفەرموو: ئەگەر پیاو جووت بوو لەگەڵ کەسێ، بەڵام ئاوی نەهاتەوە، بڕیارەکەی چییە، لەشی پیس دەبێ یانا؟ عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (چووکی بشۆرێو دەستنوێژێ وەك دەستنوێژێ نوێژ بگرێو تەواو). عوثمان فەرمووی: (ئەمەم لە پێغەمبەر خۆی بیستووە) زەید فەرمووی: هەمان پرسیارم لەعەلیو زوبەیرو طەلحەو ئوبەیی کوڕی کەعب کرد، ئەوانیش فەرموویان: چووکی بشواو دەسنوێژێ بەو شیوەیە بگرێ).

١٣٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْسَلَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ الْأَنْصَارِ فَجَاءَ وَرَأْسُهُ يَقْطرُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّنَا أَعْجَلْنَاكَ فَقَالَ نَعَمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أُعْجِلْتَ أَوْ قُحِطتَ فَعَلَيْكَ الْوُضوءُ).(١١٨)

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن پیاوێکی ئەنصاریدا، کەهات بۆ خزمەتی تازە خۆی شۆردبوو، هێشتا سەری ئاوی لێ دەتکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ڕەنگ بێ فریا نەکەوتبێ لەبەر پەلە پەل ئیشەکەت تەواو بکەی؟) گوتی: بەڵێ جووتبوونەکەم بۆ تەواو نەکرا کەتۆ ناردت بەشوێنما یەکسەر خۆم شۆردو هاتم بۆ خزمەتت. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ جووتبوونت بۆ تەواو نەکراو ئاوت نەهاتەوە، بەس دەستنوێژت لەسەرە، خۆشۆردنت لەسەر نییە).

### ڕوونکردنەوە:

ئەم بڕیارە لەپێشەوە وابووە، لەکاتی وادا خۆشۆردن پێویست نەبووە، بەڵام کاتێ ئیسلامەتی بەتەواوی دامەزرا ئەم بڕیارە هەڵوەشایەوە، ئەوەوی (ڕەزای خوای

(١١٨) أخرجه مسلم في الحيض، باب: إنما الماء من الماء، رقم: ٣٤٥=٧٧٧،٧٧٩.

لێ بێ) دەفەرموێ: یەك گرتن (ئیجماع) هەیە لەسەر ئەوە کەخۆشۆردن پێویستە لەسەر مرۆڤ هەرکاتێ سەری چووك چووبەناو پیش یابەناو پاش دا، هەرچەند هیچ لایەکیشیان ئاویان نەیەتەوە: (تاج/١/ ١٤٥/ ٤ ز-٣٠ ژ-٢٦١).

١٣٧-عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ وَأَنَّهُ ذهَبَ لِحَاجَةٍ لَهُ وَأَنَّ مُغِيرَةَ جَعَلَ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَتَوَضأُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ). (الحديث ١٨٢ - أطرافه في: ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩).[119]

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە دەرەوە ڕۆیشت بۆسەراو، منیش بەجەوەندەیێ ئاوەوە شوێنی کەوتم، جالەسەراوەکەی لێ بۆوە ئاوەکەم کرد بەدەستیاو دەسنوێژی گرت، وەلەجیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆڵەکانیدا، سۆڵ: واتە: خوفف). (ش/ د/ ت/ ن - تاج/ ١/ ١٤٠/ ١ =ز-٢٩ ژ-٢٤٧).

١٣٨- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) (أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ خَالَتُهُ فَاضطجَعْتُ فِي عَرْض الْوِسَادَةِ وَاضطجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ فِي طولِهَا فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ اسْتَيْقَظ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ ثمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ ثمَّ قَامَ إِلَى شَنّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضوءَهُ ثمَّ قَامَ يُصَلِّي قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثلَ مَا صَنَعَ ثمَّ ذهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذ بِأُذنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ

---

(١١٩) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين، باب: الدعاء في الصلاة الليل وقيامه، رقم: ٧٦٣=مسلم. وضوء: ٦٢٥، ١٧٨٦.

ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ أَوْتَرَ ثمَّ اضطجَعَ حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ). (الحديث-١٨٣ طرفه في: ١١٧).[١٢٠]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەلای مەیموونەی پوورم، هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مامەوە، کەخوشکی دایکم بوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای بوو، چوونکە شەوی سەرەی خۆی بوو، کەنوێژی خەوتنانی کرد هات بۆماڵەوە، جا کەخەوتین من لەسەر باری پانی ی سەرینەکە سەرم کردە سەری‌و ڕاکشام، پێغەمبەرو هاوسەرەکەیشی سەریان کردە سەرباری درێژی ی سەرینەکەو ڕاکشان، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوت، هەتا نیوە شەو، یاهەتا بەر لەنیوەشەو بەکەمێ، یاهەتا پاش نیوەشەو بەکەمێ، ئەوجا حەزرەت خەبەری بۆوەو دانیشت‌و بەدەستەکانی چاوەکانی وولی‌و خەوەکەی بەدەستی لەڕوخساری دەسڕی تاخەوی بزڕێ، ئەوجا دە ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێند، ئینجا تەشریفی هەڵساو چوو لەکوندەیەکی هەڵواسراو دەسنوێژێکی بەجوانی گرت، ئەمجا هەڵسا بۆشەونوێژ کردن. ئیبنووعەباس فەرمووی: جامنیش هەڵسام‌و چاوم لەو کرد، ئەو چی کرد منیش هەمان شتم کرد، لەگەڵ ئەودا خەوتم‌و لەگەڵ ئەودا لەخەو هەڵسام‌و چاوی خۆم وولی‌و، دە ئایەتەکەم خوێندو لەکوندەکە دەسنوێژم گرت‌و ئەوجا چووم لەلای چەپیەوە ڕاوەستام‌و نوێژم بەجەماعەت لەپشتیەوە دابەست، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم‌و گوێ ی ڕاستی گرتم‌و کەمێ وولی‌و بردمی بۆلای ڕاستی‌و دوو ڕکات شەونوێژی کرد، ئنجا دوو ڕکاتی تریشی کرد، ئینجا دووڕکاتی تریشی کرد، هەروا، هەتا (سەرجەمیان کردییە دوازدەڕکات) ئینجا بەیەك ڕکات وەتریشی

---

(١٢٠) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين، باب: الدعاء في صلاة الليل وقيامه، رقم: ٧٦٣=١٧٨٦.

کرد، کەسەرجەمیان دەکاتە سیازدە رکات، ئەوجا حەزرەت راکشایەوە هەتا بانگدەر هاتو بانگی کرد کەکاتی نوێژی بەیانی یە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو دوو رکات نوێژی سووکەڵەی کرد، ئەوجا دەرچوو، رۆیشت بۆ مزگەوت لەوێ نوێژی بەیانی بۆ مەردومەکە کرد). (بڕ= بڕوانە: فەرموودەی نەوەدوشەش کەلەنامەی زانست دا رابوارد. تاج/ ٦/ ٩٧/ ٣٩ = تاج-٤ ز-٤ ژ-٣٧٩٢).

## راڤەو شیکردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە کەڕیوایاتو طوروقو ووجووهی زۆرە بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم، ج/٦ ص ٤٤ هەتا ص ٥٥ لەم فەرموودەدا ئەمانەی تیادایە: دروستە خوێندنی قورئان بەبێ دەستنوێژ، هەرکاتێ مرۆڤ بەشەو لەخەو هەڵسا خوێندنی ئەم دە ئایەتە سوننەتە، لەنوێژی سوننەت دا جەماعەت دروستە، بەدوو کەسیش جەماعەت دەکرێ.

١٣٩- عنْ عبْدالله بنْ زيد (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا قَالَ له: أَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ نَعَمْ فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ). (الحديث ١٨٥ـ أطرافه في: ١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩)[١٢١]

پیاوێ بەعەبدوڵلای کوڕی زەیدی گوت: ئایا دەتوانی کەپیشانم بدەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەسنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵلا فەرمووی: بەڵێ

(١٢١) اخرجه مسلم في الطهارة، باب: في وضوء النبيُ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) رقم: ٢٣٥=٥٥٤.

باشه، جاداوای ئاوی کردو لێی کرد بەهەردوو دەستی داودووجار هەردوو دەستی هەتا هەر دوو مووچی خۆی شۆرد، ئینجا ئاوی لەدەمیو لەلووتی رادا، ئەوجا سێ جار روخساری خۆی شۆرد، ئینجا بەهەردوو دەستی سەری خۆی تەڕکرد، لەپێشا لەپێشەسەریەوە بردنی بۆ پشتەسەری، لەسەرەتاوە هەردوو دەستی لەپێشی سەریەوە بەتەڕی خشان بەسەر سەریدا هەتا پشتەملی، ئەوجا بەرەودوا بەسەر سەری دا بەکێشی کردن هەتا ئەو شوێنەی کەلەوێوە دەستی پێکرد، ئەنجا هەردوو پێ ی شۆرد).

١٤٠- عنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْهَاجِرَةِ فَأُتِيَ بِوَضوءٍ فَتَوَضأَ فَجَعَلَ النَّاسُ يَأْخُذونَ مِنْ فَضلِ وَضوئِهِ فَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ فَصَلّى النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظهْرَ رَكْعَتَيْنِ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ) (الحديث ١٨٧ ـ أطرافه في: ٣٧٦، ٤٩٥، ٤٩٩، ٥٠١، ٦٣٣، ٦٣٤، ٣٥٥٣، ٣٥٦٦، ٥٧٨٦، ٥٨٥٩) [(١٢٢)]

ئەبوجوحەیفە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا تەشریفی هات بۆلامان، ئاوی دەستنوێژیان بۆهێنا دەستنوێژی لێ گرت، جا خەڵکەکە لەپاشماوەی دەستنوێژەکەی تۆزە تۆزە ئاویان دەبردو بۆ مووفەڕك خۆش خۆش هەڵیان دەسووی لەدەمو چاوو دەستی خۆیان، وەنێزەیەکیش لەبەر دەمیابوو، دایچەقاندبوو هەتابێ بەبەربەست بۆ نوێژەکەی).

ئەبوجەحیفە ناوی وەهبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی سوائی یە، خەڵکی کووفەیە، لەکۆتایی تەمەنی حەزرەت دا بەخزمەتی گەیشتووە، ئەوکاتە خۆی مێردمناڵ بووە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو ئیمامی عەلیو بەرای کوڕی عازیبەوە هەیە، کوڕەکەی خۆیو عەونو شەعبیو ئەبوئیسحاقی سوبەیعیو کەسانی تریش گێڕانەوەیان لەوەوە هەیە، چلو پێنج فەرموودەی

(١٢٢) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: سترة المصلى، رقم: ٥٠٣ = ١١٢٢.

هەیە، دووانیان پەسەندی هەردوو پیرن، لەبووخاریدا دوو فەرموودەی بەجیا (واتە: بەبێ ئەوە لەموسلیما هەبێ) هەیە، لەصەحیحی موسلیما سێ ی بەجیا هەیە، پێشەوا عەلی زۆر خۆشی دەویستو زۆر ڕێزی لێ دەگرتو زۆر جێگەی متمانەو باوەڕی بوو، کردی بەلێپرسراوی سەر بەیتولمال لەکووفە، لەهەموو شەڕو شەڕگەکانی عەلی دا لەگەڵی بوو، لەکووفە نیشتەجێ بوو، کۆمەڵەکە (الجماعـة) فەرموودەیان لێ یەوە گێڕاوەتەوە، لەهاوڕێ منالکارەکانی پێغەمبەر دەژمێررێ. بێژراویشە: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مردووە ئەو هێشتا رەسیدە نەبووە، لەسەر فەرمایشتی عومدەلقاری لەحەفتاو دووی کۆچیدا مردووە، لە (الاصابة في تمييز الصحابة) دا دەفەرموێ: (واقیدی دەفەرموێ: لەو سەردەمەدا کەبیشر والی عێراق بوو مردووە.) بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٢٤٠ کە لەدواوە دێت.

ئەم جۆرە شیکردنەوەیەم زۆر مەبەستە، چونکە حەزدەکەم کەبراکوردە عەلاقەتمەندەکانی حەدیث بزانن کەسوننەتو راژەکەرانی سوننەت لەهەموو قۆناغێکا، چۆن بوونو، چی بوونو، کێ بوون. چونکە بەداخەوە زۆر لەمەلاکانیش بەباشی لەحاڵەکە حاڵی نەبوون، بگرە زۆربەیان وادەزانن کەپیاوانی فەرموودەو سووننەت وەك ئەم کۆلکە مەلاو وشکەسۆفیو دەروێشە ساویلکانە وابوون، کەهەندێ قسەی بێ سەرو بەریان لەبارەی ئایینو داستانی پیاوچاکانەوە لەبەرە، کەلەهەموو کەسێ دەکەن لەزانا نەبی

١٤١-عنْ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ ثُمَّ تَوَضأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضوئِهِ ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثلَ زرِّ الْحَجَلَةِ). (الحديث ١٩٠- أطرافه في: ٣٥٤٠، ٣٥٤١، ٥٦٧٠، ٦٣٥٢).[١٢٣]

---

(١٢٣) أخرجه مسلم في الفضائل باب: خاتم النبوة وصفته ومحله،رقم: ٢٣٤٥=٦٠٤٠.

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پوورم بردمی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هێنا بەسەر سەرمداو دوعاونزای پیتو فەڕی بۆکردم، ئەنجا دەستنوێژی گرتو لەئاوەچۆڕی دەستنوێژەکەیم بۆ موفەڕك خواردەوە، ئەوجا لەپشتیەوە راوەستامو سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد، کەبەناوشانیەوە بوو، وەك دوگمەی پەردە کوللە وابوو، یاخود وەك هێلکەی کەو وابوو. (ت/ ٤/ ٢٨٠/ ١ تاج-٣ ز-٩٢ ژ-٣١٣٧ ـ ش/ ت).

## راڤەو شیکردنەوە:

سائیب خۆیو باوکی لەهاوڕێیانن، خۆی دەفەرموێ: لەحەجی ماڵئاوایی دا لەگەڵ پێغەمبەردا باوکم حەجی پێ کردم، تەمەنم حەوتساڵ بوو، پێنج فەرموودەی هەیە، بوخاری هەر پێنجیانی گێڕاوەتەوە، ئاوەچۆڕی دەستنوێژ پاکە، بەتایبەتی هی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشەوا ئەبو حەنیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (گمیزو گشت دەردراوەکانی تری لەشی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) پاکن).

١٤٢ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: (كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمِيعًا).(١٢٤)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: (لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوانو ژنان پێکەوە دەستنوێژیان دەگرت لەیەك جێگە).

١٤٣ –عَنْ جَابِرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ (جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيض لَا أَعْقِلُ فَتَوَضأَ وَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضوئِهِ فَعَقَلْتُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ

(١٢٤) ئەم فەرموودەیە قسەی سەحابییە، ئیضافە کراوە بۆلای سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرئەوە بەمەرفوع دادنرێ، بڕوانە: شەرحی صەحیحی موسلیم/ نەوەوی/ ج/١ ص ٣٠ چاپی دار أحياء التراث العربي بيروت ـ لبنان. (وەرگێڕ).

اللَّهِ لِمَنْ الْمِيرَاث إِنَّمَا يَرِثنِي كَلَالَةٌ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِض). (الحديث ١٩٤ـ أطرافه في: ٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٦٤، ٥٦٧٦، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣، ٧٣٠٩)[١٢٥]

جابير (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نەخۆش بووم هۆشم نەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتبوو بۆ سەردانم، جا دەستنوێژ دەگرێو لەئاوی دەستنوێژەکەی لێم دەپرژێنێ، ئەوجا هۆشم دێتەوە. جا گوتم: ئەی ڕەهبەری خودا! میراتو کەلەپوورەکەم بۆ کێ یە؟ چونکە من تەنیا چەن خوشکێکم هەن کەکەلەپوورم لێ بگرنو کەسی ترم نییە نەباوكو دایكو نەمناڵ، ئیتر بەم بۆنەیەوە ئایەتی کەلەپوور دابەش کردن هاتە خوارەوە (ت/ ١/ ١٠٧/ ١٣+ ٣/ ٦/ ١- = ژ-١٥٨ ز-٢١ ش/ ن/ ت).

١٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (حَضرَتْ الصَّلَاةُ فَقَامَ مَنْ كَانَ قَرِيبَ الدَّارِ إِلَى أَهْلِهِ وَبَقِيَ قَوْمٌ فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِخْضبٍ مِنْ حِجَارَةٍ فِيهِ مَاءٌ فَصغُرَ الْمِخْضبُ أَنْ يَبْسُط فِيهِ كَفَّهُ فَتَوَضأَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ قُلْنَا كَمْ كُنْتُمْ قَالَ ثَمَانِينَ وَزِيَادَةً).[١٢٦]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتی نوێژی عەصر داهات، ئەوانەی کەماڵیان نزیك بوو هەڵسان چوونەوە بۆلای کەسو کاریان، بۆدەسنوێژ شۆردن، کۆمەڵێکیش لەخزمەتی حەزرەتدا مانەوە، لەئینجانەیەکی بەردا چۆڕێ ئاویان هێنا، بۆ دەسنوێژ، بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئینجانەکە -لەبەر بچووکی- جێ ی ئەوەی تیادا نەدەبۆوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی تیادا بڵاو بکاتەوە، جاهەموو ئەو کۆمەڵەی لەخزمەت حەزرەتدا مانەوە لەو چۆڕە ئاوە دەستنوێژیان گرت، چونکە خودا بەرەکەتێکی وای تێخست بەشی هەموویانی بەزیادەوە کرد، گوتمان: چەن کەس دەبوون؟

---

(١٢٥) أخرجه مسلم في الفرائض، (عەینی/ ٣/ ٨٧/ ٥٧) المترجم = ٤١٢١.

(١٢٦) أخرجه مسلم واخرجه الاسماعيلي وغيره (عينى/٣/ ٨٨/ ٥٨) المترجم.

فەرمووی: (لەهەشتا کەس پتر دەبووین!). (ت/ ١/ ١٠٤/ ٥ = ژ-١٥٠ ز-٢١ + ت/ ٤/ ٣٣٣/ ١+٢+٣ = ژ-٣١٧٠، ٣١٧١، ٣١٧٢ + ٤ + ت/ ٤/ ٣٣٦/ ١+٢ ـ ش/ت).

١٤٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ وَمَجَّ فِيهِ).

**ئەبوموسا** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **داوای ئاوی کرد بۆ دەستنوێژ، لەجامێکا هەنێ ئاویان بۆ هێنا، هەردوو دەستیو دەموچاوی تیادا شۆردو، ئاوەکەی ناودەمی تفانەوە ناو جامەکە).**

١٤٦-عنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: (لَمَّا ثقُلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ فِي أَنْ يُمَرَّض فِي بَيْتِي فَأَذنَّ لَهُ فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخط رِجْلَاهُ فِي الْأَرْض بَيْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٍ آخرَ قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ فَأَخْبَرْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ أَتَدْرِي مَنْ الرَّجُلُ الْآخرُ قُلْتُ لَا قَالَ هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَانَتْ عَائِشَةُ رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحدِّث أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَعْدَمَا دَخلَ بَيْتَهُ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ: هَرِيقُوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ لَعَلِّي أَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ وَأُجْلِسَ فِي مِخْضبٍ لِحَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ طفِقْنَا نَصُبُّ عَلَيْهِ تِلْكَ حَتَّى طفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ ثمَّ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ). (الحديث ١٩٨- أطرافه في: ٦٦٤، ٦٦٥، ٦٧٩، ٦٨٣، ٥٨٧، ٧١٢، ٧١٣، ٧١٦، ٢٥٨٨، ٣٠٩٩، ٣٣٨٤، ٤٤٤٢، ٤٤٤٥، ٥٧١٤، ٧٣٠٣)[١٢٧]

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ نەخۆشینەکەی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **قورس بوو، بەچەند رۆژێ لەپێش مەرگیدا، ڕوخسەتی لەهاوسەرەکانی خواست، کەلەماڵی من بمێنێتەوەو، لەوێ خزمەت بکرێ، ئەوانیش ڕێگەی ئەوەیان پێ دا، جا رۆژێ نەخۆشینەکەی کەشەنگ بوو، فەرمووی** (درودی خودای لەسەر

(١٢٧) أخرجه مسلم في الصلاة، (عينى/ ٣/ ٨٨/ ٥٨) المترجم.

بێ): (لەحەوت کوندە کەدەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە ئاو بکەن بەسەرما، سابەشکوو کەمێ باری لەشم سووك ببێ، هەتا بچم بۆ مزگەوت بۆناو موسوڵمانان، تاوەسێتتان بۆ بکەم)جا سوێنەیەکی حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەبوو، پێغەمبەریان لەناویدا دانیشاند، ئەوجا ئێمەی هاوسەرانی حەزرەت لەحەوت کوندە، دەستمان کرد بەئاو کردن بەسەریدا، هەتا خۆی ئاماژەی بۆ کردین: کەئیتربەسە، ئەوەی پێویست بوو کردتان. جاتۆزێ باری لەشی سووك بوو، جا دوو پیاو چوونە ژێربالی، عەبباس‌و پیاوێکی تر بوو، بەدارە دارە بردیان بۆ نوێژ بۆ مزگەوت، هەردوو پێی دەخشان لەزەوییەکە. عوبەیدوڵلا فەرمووی: کاتێ ئەم فەرموودەیەی عائیشەم باس کرد بۆ ئیبنوعەباس، فەرمووی: ئایا دەزانی ئەو پیاوەکەی تر کێ بوو؟ گوتم: نەو، فەرمووی: عەلی بوو. بڕوانە (ژمارە/٣٧٦).

١٤٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ فَأُتِيَ بِقَدَحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ قَالَ أَنَسٌ فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى الْمَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ قَالَ أَنَسٌ فَحَزَرْتُ مَنْ تَوَضَّأَ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ).(١٢٨)

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەفرێکا داوای ئاوی کرد، جامێکی دەم پەلیان بۆهێنا، کەمێ ئاوی تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەکانی تێ خست، ئەنەس دەیگوت: کەسەیری ئاوەکەم کرد لەنێوانی پەنجەکانی پێغەمبەرەوە وەك کانی هەڵ دەقوڵا، ئەنەس دەیگوت: ئەوانەی دەسنوێژیان لەو جامە گرت دامنان حەفتا هەشتاکەسێك دەبوون(ت-١/١٠٤/٥-ش).

(١٢٨) أخرجه مسلم في فضائل النبيُّ (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) (عينى/ ٣/ ٩٣/ ٦٣) المترجم = ٥٩٠٠ شيحا.

١٤٨- عنْ أَنَس (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْسِلُ أَوْ كَانَ يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ وَيَتَوَضأُ بِالْمُدّ).(١٢٩)

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمەن (صاع) ێك ئاو خۆی دەشۆرد، یان دەیگەیاندە پێنج مشت (مودد) جاروباریش بەیەك مشت ئاو دەستنوێژێكی دەگرت! (ت/ ١/ ١٣٢/ ٧ ز-٢٧ ژ- ٢٢٧ ـ ش/ د/ ت/ ن).

## ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:

صاع ئەیارەیەكە چوار مودد (مست: مشت) دەگرێ، موددیش ئەیارەیەكی شەش گۆشەیە، درێژیی زلعێكی نزیكەی (٩/٢) سم. مودد لەعەرەبیدا بەمشتیش دەگوترێ. جا لەحەدیثو لەشەرعا، مەگەر نیشانەیەكی لابەر (قرینه الصارفه) هەبێ، دەنا مەبەست لەموود مشتی مرۆڤ نییە، بەڵكوو مەبەست ئەو ئەیارە ناوبراوەیە، كەزوربەی وەرگێڕە كوردەكان تەرجەمەیان كردووە بەمشت، یابەمست، بەڵام تەرجەمەكە زۆر سەركەوتوو نییە، چونكە خەڵك بەمشتی دەست تێ دەگەن.

١٤٩- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَنَّهُ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ سَأَلَ عُمَرَ عَنْ ذلِكَ فَقَالَ نَعَمْ إِذا حَدَّثَكَ شَيْئًا سَعْدٌ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَا تَسْأَلْ عَنْهُ غَيْرَهُ). (الحديث ٢٠٢).(١٣٠)

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەسنوێژی گرت،

---

(١٢٩) أخرجه مسلم في الحيض باب: القدر المستحب من الماء في غسل الجنابة، رقم: ٣٢٥. = ٧٢٨، ٧٣٤، ٧٣٥.

(١٣٠) من افراد البخارى (عينى/٣/٩٦/٦٥) المترجم.

لەجیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆلەکانیدا، کەبەوجۆرە سۆلە لەزاراوی شەرعا پێی دەگوترێ (خوفف) عەبدوڵلای کوڕی عومەر بۆئەم مەسەلەیە لەباوکی پرسی، باوکی پێی دەفەرموێ: (بەڵێ وایە، وەکی تریش هەرکاتێ سەعد فەرموودەیەکی پێغەمبەری گێڕایەوە بۆت پێویست ناکا لەکەسی تر بپرسی).

١٥٠- عنْ عمرو بن أمية الضمري (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أنه رأى النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يمسح على الخفين). (الحديث ٢٠٤ - طرفه في: ٢٠٥) [(١٣١)]

عەمری کوڕی ئومەییەی کوڕی چهمری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینیوە، لەدەستنوێژدا، لەجیاتی ی شۆردنی هەدوو پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر جووتە سۆلەکەی کەلەپێ یدا بوو).

## شیکردنەوە:

عەمر پیاوێکی زۆر ڕەشیدو قسەزان بوو، گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەینارد بۆ کاری گرنگ، نامەیەکی پێغەمبەری برد بۆ نەجاشی لەحەبەشە، هەروا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ مەککە، لەوێ تەرمەکەی خوبەیبی شەهیدی لەسیدارەکەی کردەوەو هێنای. بیست فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە.

١٥٠- (مكرر) عنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: (رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ وَخُفَّيْهِ).

دیسان لەوەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی لەناو دەسنوێژا لەجیاتی سەرتەڕکردن (مسح الرأس) دەستی تەڕی هێنا بەسەر مێزەرەکەیداو، لەجیاتی قاچ شۆرینیش دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆلەکانیدا).

---

(١٣١) ١٥٠/ ١٥١-قال العيني: لم يخرج مسلم في المسح إلا لعمر بن الخطاب (٣/ ٩٧/ ٦٥) المترجم.

١٥١- عَنْ الْمُغِيرَةِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَأَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طاهِرَتَيْنِ فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا). (الحديث ٢٠٦ طرفه في:١٨٢).

**موغیرەی کوڕی شوعبە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەتدا بووم** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەسنوێژی گرت، کەگەیشتە سەرقاچی دانەویمەوە کەخوففەکانی لەپێ ی داکەنم، فەرمووی: (وازیان لێ بێنە بەدەسنوێژەوە لەپێم کردوون) ئیتر قاچی نەشۆردو لەجیاتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆلەکانیدا. (ت/ ١/ ١٤١/ ز–٢٩ فەرموودەی ژمارە: ٢٥٠).**

١٥٢– عنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ (أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَلْقَى السِّكِّينَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ). (الحديث ٢٠٨ ـ أطرافه في: ٦٧٥، ٢٩٢٣، ٥٤٠٨، ٥٤٢٢، ٥٤٦٢)[١٣٢]

**عەمری کوڕی ئومەییە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەرم دی** (دروودی خودای لەسەر بێ) **شانی مەڕێکی بەدەستەوە بوو، بەچەقۆیێ پارچە پارچەی دەکردو دەیخوارد، لەوکاتەدا بانگیان کرد بۆ نوێژ، ئیتر گۆشتو چەقۆکەی داناو هەڵساو چوو بەرنوێژی یەکەی بۆ کردن، بەڵام لەبەر خواردنی گۆشتەکە دەستنوێژی نەگرتەوە. (ت/ ٤/ ٥٣/ ١٧ تاج-٣ ز-١٦ ژ-٢٦٥٢ ـ ش/ ت) .**

١٥٣– عَنْ سُوَيْدَ بْنَ النُّعْمَانِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ خَيْبَرَ حَتَّى إِذا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ وَهِيَ أَدْنَى خَيْبَرَ فَصَلَّى الْعَصْرَ ثُمَّ دَعَا بِالْأَزْوَادِ فَلَمْ يُؤْتَ إِلَّا بِالسَّوِيقِ فَأَمَرَ بِهِ فَثرِّيَ فَأَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَكَلْنَا ثُمَّ قَامَ إِلَى الْمَغْرِبِ فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ).

---

(١٣٢) اخرجه مسلم في الحيض، باب: نسخ الوضوء مما مست النار، رقم: ٣٥٥. = ٧٨٨-٧٩١.

(الحديث ٢٠٩ أطرافه في: ٢١٥، ٢٩٨١، ٤١٧٥، ٤١٩٥، ٥٣٨٤، ٥٣٩٠، ٥٤٥٤، ٥٤٥٥).

سووەیدی کوڕی نوعمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازاد کردنی خەیبەر لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆغەزا، بەرەو خەیبەر کەوتینەڕێ، کەگەیشتینە صەهباء، کەناوی شوێنەکە وا لەخوار خەیبەرەوە، لەوێ نوێژی عەصری کرد، کەنانەکەیان بۆی هێنا، برێتی بوو لەهەندێ قاووتو بەس، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو بەئاو تەڕیان کرد، ئەوجا بە کۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا دەستمان کرد بەخواردنی ئەو پڕپۆڵەی قاوتە. لەپاشا لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئاوی لەدەمی خۆی راداو ئێمەیش ئاومان لەدەمی خۆمان راداو، دەممان شۆرد، نەبادا شتێ لەقاوتەکە لەنێوانی ددانمانا بمێنێتەوەو لەناو نوێژەکەدا پێوەی خەریك بین، بەڵام دەسنوێژمان تازە نەکردەوە بەهۆی خواردنی قاوتەکەوە. (ت/٤/٥٥/٢٣ = تاج-٣ ز-١٦ ژ-٢٦٥٨).

**روونکردنەوە:**

سووەید (ڕەزای خوای لێ بێ) لەدەستەی پەیمانی خۆشنوودی یە (واتە: لەکۆمەڵەی بەیعەتوریضوانە) حەوت فەرموودەی هەیە، یەك فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە ئەویش ئەمەیە.

١٥٤ – عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفًا ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ).[١٣٣]

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای من شانێ گۆشتی خوارد، ئەوجا هەڵسا نوێژی کرد، لەپاش خواردنی گۆشتەکە دەستنوێژی نوێ نەکردەوە.

---

(١٣٣) أخرجه مسلم في الحيض باب: نسخ الوضوء مما مست النار، رقم: ٣٥٦=٧٩٤.

مەیموونەی کچی حاریث، دایکی موسوڵمانان، لەساڵی شەش یاحەوتی کۆچی، لەسەریف پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێنای، لەهەمان شوێن لەساڵی (٥١) ی ك، بێژراویشە لە (٦٦) ی ك مردووە، ئیبنووعەبباسی خوشکەزای نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

١٥٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَرِبَ لَبَنًا فَمَضْمَضَ وَقَالَ إِنَّ لَهُ دَسَمًا. (الحديث ٢١١ طرفه في: ٥٦٠٩).(١٣٤)

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شیری خواردەوە، لەپاشا ئاوی لەدەمی رادا، فەرمووی: شیر چەوریو بەڵخی هەیە). (ت/ ٤/ ٦٠/١١ تاج-٣ ز-١٧ ژ-٢٦٧٤).

١٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ). (الحديث ٢١٢).(١٣٥)

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ یەکێ لەئێوە لەناو نوێژدا وەنەوزی دەداو خەوەنووچکەی بوو ئیتر بابچێ بخەوێ هەتا خەوەکەی دەڕوا، چونکە کاتێ بەدەم وەنەوزەکوتێو خەوبردنەوەوە، نوێژ بکەن ڕەنگە بتانەوێ بپاڕێنەوە بۆخۆتان بەلام لەجیاتی ئەوە جنێو بەخۆتان بدەن (ت/ ١/ ٢٩٨ = ز-٩٦ ژ-٥٧٨ ـ ش/د/ت/ن).

١٥٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَنَمْ حَتَّى يَعْلَمَ مَا يَقْرَأُ). (الحديث ٢١٣).

لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێکتان لەناو نوێژدا خەوی دەهاتو وەنەوزی دەدا، بائیتر بخەوێ، هەتا بزانێ چی دەخوێنێ، بەلام ئەو نوێژەی کەتیادایەتی دەبێ ئەوە تەواو بکا).

---

(١٣٤) أخرجه مسلم في الحيض، باب: نسخ الوضوء مما مست النار، رقم: ٣٥٨.=٧٩٦شيحا.

(١٣٥) أخرجه مسلم في صلاة المسافر وقصرها، باب: أمر من نعس في صلاته، رقم: ٧٨٦. = ١٨٢٢ شيحا.

١٥٨– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضأُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ قَالَ وَكَانَ يُجْزِئُ أَحَدَنَا الْوُضوءُ مَا لَمْ يُحْدِث). (الحديث ٢١٤).

عەمری كوڕی عامیر فەرمووی: ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەموو نوێژێ لەكاتی داهاتنی دا دەستنوێژێكی تازەی دەگرت (هەتا ڕۆژی ئازاد كردنی شاری مەككە، لەو ڕۆژەدا بۆ دەربڕینی دروست بوون - واتە: بۆبەیانی جەواز - بەیەك دەستنوێژ هەر پێنج فەرزە نوێژەكانی كرد). عەمر فەرمووی: گوتم: ئەی ئێوەی یارانی پێغەمبەر چۆن دەستنوێژتان دەگرت؟ فەرمووی: یەك دەستنوێژمان بەس بوو، تاكاتێ دەستنوێژەكەمان دەشكا، ئەوسا لەكاتی پێویست دا دەستنوێژێكی ترمان هەڵدەگرتەوە. (ت/ ١/ ١٣٩/ ١٣ = ژ-٢٤٥ ز-٢٨ - ب/ د/ ت/ ن)

١٥٩– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: (مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحَائِط مِنْ حِيطان الْمَدِينَةِ أَوْ مَكَّةَ فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذبَانِ فِي قُبُورِهِمَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَذبَانِ وَمَا يُعَذبَانِ فِي كَبِيرٍ ثمَّ قَالَ بَلَى كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ ثمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ فَوَضعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسْرَةً فَقِيلَ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ فَعَلْتَ هَذا؟ قَالَ لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ تَيْبَسَا). (الحديث ٢١٦- أطرافه في: ٢١٨، ١٣٦١، ١٣٧٨، ٦٠٥٢، ٦٠٥٥).[١٣٦]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، یالەمەككە، بەلای باخە خورمایەكا رابورد، گوێ ی لەدەنگی دوو مرۆڤ بوو، لەناو گۆڕەكانیان دا سزا دەدران، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

(١٣٦) أخرجه مسلم في الطهارة باب: الدليل على نجاسة البول ووجوب الاستبراء منه، رقم: ٢٩٢. = ٦٧٥ شيحا.

(خـاوەنی ئـەم دوو گـۆڕە سـزا دەدرێـن، لەسـەر شـتێ سـزا دەدرێـن کـەخۆیان لـەژیانیانا بەگـەورەو گرانیـان دانـەناوە، بـەبێ نرخیـان زانیـوە، بـەڵام ئـەو شـتە لەلای خودا، گوناهو تـاوانێکی گـەڵێ گەورەیـە، یـەکێکیان لەسـەرئەوە ئازار دەدرێ چونکە لـەحاڵی ژیـانی دا خـۆی لـەگمیزی خـۆی نەدەپاراسـتو، لـەکاتی میزکـردن دا خـۆی لـەپاڵ شتێك دا حەشار نـەدەدا، ئەویتریـشیان قـسەچێن بـوو، دووزمـانی دەکرد، قسەی دەهێناو دەبرد بۆ تێکبەردانی خەڵك لەیەکتری!).

ئـەنجا حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پەلکـە دارخوارمایـەکی سـەوزی هـەڵگرتو کردی بەدوو لەتەوەو، هەرکەرتەی لەسەر گۆڕێکیـان داچـەقاند. گوتیـان: ئـەی پێغەمبەری خودا! ئەمەت بۆچی کرد؟ فـەرمووی: (چـونکە گیـاو داری سـەوزو درەختـی تـەڕی سـەرگۆڕ، تاوشـك دەبـێو تـەرایی تێـدا نـامێنێ دەپاڕێتـەوە بـۆ مردووەکـە، جاکـەوابوو بەشـکوو ئـەم دوولەتـە پەلکـە خورمـا سـەوزەیە لـەم روانگەیـەوە، بـاری ئازاریـان سـووك بکـەن، هـەتا ئەوکاتـەی کەوشـك دەبـنو لەتەسبیحات کردن دەکەون!) (تاج/ ١/ ١١٠/ ٣ = ز-٢٣ ژ-١٦٥ ش/ د/ ت/ ن).

## روونکردنەوەیێ:

بڕیـار (حـوکم)ە کـانی شـەریعەت لەسەرچـاوە گـەورەکانی شـەریعەت وەردەگیرێن، پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، لـەکاروباری ئـایینی دا، وەك پێشینانە باشەکان، چاویان لـەدەمی زانـا گـەورەکان بێ، وەك شـێخی ئەزهـەر، وەك جـەنابی مامۆسـتا مەلاعەبدولکـەریمی مـودەڕیس، وەك هـەموو مـەلا گـەورەکانی تـری جیهـانی ئیـسلام. وەلـەکاتی پێویـست دا موراجەعـەی کتێبـە گەورەکانی شەرع بکرێ.

بەڵام بەداخەوە، لەوڵاتی ئێمەدا، بەتایبەتی لەکوردستانی ئازیزدا، شیرازەی کاروبار تێکچووە، کەسانی وا خۆیان بەمەلا ناگۆڕنەوە فەقێ ی تەواویش نین، خۆزگـا بـەخۆزگایی خـودا، لایەنـە ئیـسلامییەکان هـەقیان بەسـەر بابەتـە

فیقهیەکانـەوە نەبوایـە، دەوری قـازی‌و مـەلاو موفتیـان نەبینیبایـە، چـونکە ئـەرکی پـیرۆزی سەرشـانی ئـەوان پـشتگیریی شـەریعەتە، نەشـری دەعوەتـە، بەرگری یە لەئیسلام، هەوڵدان‌و تێکۆشانە بۆ پیادەکردنی دەوڵەتی قورئان!

ئـەوەی مـن بەچـاوی خـۆم دەیبیـنم کارەسـاتێکی زۆر دڵتەزێنـە، کەئـەویش ئەمەیـە: رەشـەخەڵکێکی جـەهێڵی وا دروسـت بـوون باوەڕیـان بەلایەنەکـەی خۆیـان زیـاتر هەیـە تابەفەرمایـشتی توحفـەو ئـوممی شـافیعی‌و صـەحیحی بوخـاری، هـەتا ئێـوارێ تـۆ بڵـێ ی لـەمینهاجی نـەوەوی دا وادەفـەرموێ، ئـەو خەڵکـە سەرلێـشێواوە شـتی وابەبیدعــەت دادەنــێ، تەنانــەت دووبـەرەکی‌و راجیـایی یـەکی گـەورەی وا دروسـت بـووە، لـەناو ڕیـزی نوێـژی جەماعەتـدا، دەزانــرێ نوێژکەرەکــە لــەچ لایەنێکــەو ســەربەکێ یــە! زوربــەی ئەمانــە غەربزەدەو کۆنە پیری عیلمانین!

بەداخەوە لایەنە نەیارەکانی ئیسلام ئەم هەڵە گەورەیان قۆستۆتەوە، یـەك بەهەزار لەگیرفانی خۆیانەوە لێ ی زیاد دەکەن‌و، ئەوەنـدەی تـر ئـاگری ئـاژاوە لەنێوان لایەن‌و گوروپ‌و گورۆهە ئیسلامییەکان دا خۆش دەکەن!

من لەم کتێبە پیرۆزەدا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: نابێ لایەنگیرانی ئـەو لایەنانــە خۆیــان لــەتێکڕای موســوڵمانان جیــا بکەنــەوە، وەدەبــێ پــەیڕەوی مەذهەبی خۆیان بکەن، نابێ هەندێ بابەت‌و مەسائیلی خیلاف بکەن بەمارکـە موسەجەلە بۆخۆیان، منیش لەگەڵ ئەوەدام کەپەیڕەوی سوننەت لەپێـشترو باشترە لەپەیڕەوی کردنی کوێرانەی مەژهەب!

بـەڵام شـتی وا بەرنامەیـەکی هێـدی‌و دورودرێـژی دەوێ، کەلـەخودا بـەزیاد بــێ ئێـستا ئــەو بەرنامەیــە لەگەشــەکردن دایــە، وەبــەهیچ جــۆرێ پێویــستی بەپشگوێ خـستنی ئـەم مەژهەبـە گەورانـە نییـە، بـەڵکوو خوایـاربێ هەمیشە کۆششی باشی پاشینانی نەتەوەی ئیسلام دەبێ بەتەواوکـەری کۆششی پیرۆزی

پێشینانی ئەم نەتەوەیە، ڕەحمەت لەوکەسە، لەولایەنە، لەومەلایە، لەو موسوڵمانە کەقسەی خێر بۆ موسوڵمانان دەکا، ریزەکانی موسوڵمانان یەك دەخا، گوێ بۆ قسەی هەق دەگرێ.

جا وامن لێرەدا لەبابەت ئەم فەرموودەیەوە، بۆ کەسی خۆی ئەم چەند خاڵە روون دەکەمەوە:

١- دێنیێو سەردانی گۆڕو گۆڕستان سوننەتێکی گەورەیە، بۆ پیاوو ژن سوننەتە، ڕەحمەت لەوکەسەی بەپێی شەریعەت سەردانەکەی ئەنجام دەدا.

٢- پێشەوا نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبەرگی سێیەمی شەرحی صەحیحی موسلیما، لەلاپەڕە (٢٠٢ ژ-٦٧٥ شیحا) دا، لەباسی (الدليل على نجاسة البول ووجوب الاستبراء منه) دا، بەدەق دەفەرموێ: (واستحب العلماء قراءة القرآن عند القبر لهذا الحدبث، لأنه إذا كان يرجى التخفيف بتسبيح الجريد فتلاوة القرآن أولى والله أعلم) واتە: زاناکان دەفەرموون: خوێندنی قورئان لەسەر گۆڕ بەپێی ئەم فەرموودەیە سوننەتە،چوونکە لەشوێنێ بەهۆی پیتو فەڕی تەسبیحات کردنی پەلکە خورمای سەوزەوە، سزای مردوو سووك ببێ، دیارە کەبەهۆی قورئانخوێندنی موسوڵمانەوە باشتر سزای سووك دەبێ).

٣- عەللامەی عەینیش (ڕەزای خوای لێ بێ) هەمان را لەخەططابییەوە راگوێز دەکاو دەفەرموێ: (ئەم مەسەلەیە راجیایی تیادایە، ئەبوحەنیفەو ئەحمەد (ڕەزای خوایان لێ بێ) رایان وایە کەپاداشی خوێندنی قورئان دەگا بەمردوو، بەپێ ی ئەو فەرموودەیەی کەوا ئەبوبەکری نەجار لەکتێبی (السنن) دا، لەعەلی کوڕی ئەبوطالیبەوە دەیگێڕێتەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەگۆڕستانەوە رەت بێو یازدەجار (سورەتی قل هو الله أحد) بخوێنێ، ئەوجا پاداشەکەی ببەخشێ بەمردووەکان، بەقەد ژمارەی مردوەکان پاداشی پێ دەدرێ).

٤- لەکاتی خوێندنی قورئانا سەکینەو مایەی ئارامیو فریشتەی ڕەحمەت دادەبارن، بوخاریو موسلیمو تیرمیذی (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕنەوە: بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ ئوسەیدی کوڕی حوزەیر سوورەتی کەهف دەخوێنێ، لەوکاتەدا ماینەکەی لەلایەوە بەدوو گوریس بەسرابۆوە، پەڵە هەورێ دەدا بەسەریاو دەیگرێتە ناوو، دەست دەکا بەگڕخواردن بەدەوریداو لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەکەشی کەئەمە دەبینێ سڵی لێ دەکاو، هەڵ دەسەڵەمێتەوە، جا بۆبەیانی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە فریشتەی ئارامیو مایەی ڕەحمەتو ئاسایش بوون لەبەرخاتری قورئانەکە داباریون!)

٥- مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (یاسین دڵی قورئانە، هەرکەسێ ئەم سورەتە ساخ بۆ ڕەزای خودا بخوێنێ، بەنیازی پاداشی باشی ئەوجیهان، مسۆگەر خودا لێی خۆش دەبێ، سوورەتی یاسین لەسەر مردووی خۆتان بخوێنن!) (نەسائیو ئەحمەدو ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە ئیبنوحیببان بەفەرموودەیەکی دروستی داناوە). واتە: بەحەدیپێکی صەحیحی داناوە.

٦- دەقی ئایەتو فەرموودەی زۆر هەیە لەسەرئەوە کەمردوو سوودو بەهرە لەکردەوەی کەسێکی تر وەردەگرێ. وەك:

أ- قورئان دەفەرموێ: (وكان أبوهما صالحاً) وە دەفەرموێ: (ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان) وە دەفەرموێ: (من يشفع شفاعة حسنة يكن له نصيب منها) وە دەفەرموێ: (والذين آمنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان ألحقنا بهم ذريتهم).

ب- نزاو پاڕانەوەی زیندوو بۆ مردوو سوودی هەیە بۆی، نوێژ لەسەر مردوو سوودی هەیە بۆی، بەپێی فەرموودەی ساخ، کەشەیخەین گێڕاویانەتەوە

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ بمرێو ڕۆژووی لەسەربێ، کەسوکاری دەتوانن لەباتی ئەو بەرۆژوو بن) وەك دروشمێکی گشتی، بۆ قەزاگێڕانەوە بۆ مردوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فدين الله أحق أن يقضى). حەجیش بۆ مردوو قەزا دەکرێتەوە، فەرمووده لەسەر ئەمە لەبوخاریو موسلیمو تیرمیزیدا هەیە، خێری وەقف دەگا بەمردوو، لەفەرموودەی ساخ دا دەڵێ: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە، ئایا سوودی هەیە بۆی ئەگەر من ئێستا خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەڵێ). قەرزدانەوەیش بۆ مردوو سوودی هەیە.

٧- نوێژی مردوو لەسەر گۆڕ دروستە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لەپاش هەشت ساڵ نوێژی مردووی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد، ئەوەیش مەعنای وایە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی لەسەر مردوو خوێندووە،چونکە فاتیحەی لەو نوێژەدا خوێندووە (بڕوانە: ٤٦١).

٨- ئیمامی تیرمیذی بەڕشتەیەکی جوان دەیگێڕێتەوە: ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازانێ چاتۆڵەکەی لەسەر گۆڕێ هەڵدەدات، کەگوێ دەگرێ والەناو گۆڕەکەدا یەکێ سوورەتی (تبارك الذي بيده الملك) دەخوێنێ تاتەواوی دەکا، جادەچێتە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزی دەکا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! نەمزانی چاتۆڵەکەمم لەسەر گۆڕێ هەڵ دابوو، کەچی مرۆڤێکی تیا بوو، کەلەو گۆڕەدا نێژرابوو، سوورەتی تەبارەکی خوێند هەتا تەواوی کرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو سوورەتە شوورەو پەرژینەو کەسێ بیخوێنێ دەبێ بەفریارەسیو رزگاری دەکا لە سزاو ئێشو ئازاری گۆڕ).

٩- زۆر لەو عیبادەتانەی کە پێغەمبەرانو بەندە باشەکانی خودا لەپاش مردنیان کردوویانە یادەیکەنو بەندە لەصەحیحی سونەتدا بەرچاوم

کەوتوون لەئورجوزەی (بین یدي کتاب الله) دا تۆمارم کردوون وەك ئەم چەن بابەتانەی وان لەم چەن هەڵبەستەدا دەی ئەم جۆرە شتانە ئەوە دەگەیەنن، کەلەپاش مردنیش خێری کردەوەی باش دەگا بەخاوەنی، وەعەلاقەو پەیوەندی لەنێوان مردوان و زیندواندا بەتەواوی نەپچڕاوە. ئەمە چەند نموونەیەکە.

لحافظ (الملك) الذي يتلوها
في كل يوم نال ما يرجوها
تنجيه من عقوبة القبور
وتشفع وله لدى الغفور
وجاء في الخبر أن الميتا
قرأها في قبره، قيس يا فتى!
لو لم يفد هذا، فهذا الرجل
ما كان في دار الثواب يعمل
وبعض الانبياء بعد الموت
تعبداً طاف حول البيت
وبعضهم بالحج قد أهلا
وبعضهم في قبره قد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)
أمهم الرسول بالمصلى
لما سرى في قدسنا المعلا!
قد اقتدى الأموات بالأحياء
إذ أمهم أحمد في الإسراء
هذا من التكريم للخيار
فلا مجال فيه للشرار!
أن نلهم التسبيح حين نخلد

يثبت أن الله دوما نعبد
والحمد والتسبيح والسجود

١٠- لەچوارچێوەی ئەم روونکردنەوەیەدا بەندە لەکتێبی (بين يديه كتاب الله) دا گوتوومە:

ياسين تقرأ على الأموات
وجارة لسورة الصافات
قرآن ربي قلبه ياسين
فقلب تاليها بها يلين
وقبر من تتلى عليه يؤهل
إذ السكينة عليه تنزيل
وسن ختمها على المحتضر
وذكرُ مايدعواه للتذكّر!
يازائر القبور كن مسلماً
وداعياً لهم بخير واعلما:
خير هدية من الزوار قراءة القرآن والأذكار
(قراءة القرأن والأذكار)
إن الجريت الأخضر إذ يذكر
على القبور ذنبها قد يغفر
بختم ياسين القبور عطروا
أفرض بأنك الجريد الأخضر!
ليس لتفريج الكروب مثلها
وكل ليل قبل نوم فاتلها
إن المدار لعلى الإخلاص
وقوة اليقين في الخلاص

ئەمەش چەن شیعرێکە لەو پێڕستە کەبەحیسابی ئەبجەد ژمارەی سورەتەکان لەناو شیعرەکاندا، لەسەر ئەم شێوەیە تۆمارکراوە: (لو- زل) لو= ٣٦ کە دەکاتە ژمارەی سوورەتی یاسین. زل= ٣٧ کەدەکاتە ژمارەی سوورەتی‌صافات، کەیەکسەر والەدوا یاسینەوە، ئیتر هەروا، لەهەمان کاتدا خودی شیعرەکەیش مەعنا یەکی جوانی ئاسایی تری هەیە:

هـــود ويوســـف ورعـــد ســـور
الرمزهـــا (يـــا بيجـــي) نعـــم الـــصور!
بـــالفكر ســـبر غـــورة تمـــيطَ
بكهـــف مـــريم العـــلا (يحـــيط)
(كطـــل) غيـــث في حقـــول الفـــوم
العنكبـــوت في جـــوار الـــروم
(لا . لب) لي إن لم اقل ياهاني + (لقمان قبل سجدة القرآن)
ياسين والصافات قد تقاسموا + (لو . زل) علم لزل عالم
عـــينى لقلـــبى فى فـــداه (مـــزحم!)
محمـــد في فتحـــه (ص) مكـــرم
لـــولا هـــدى الـــرحمن يـــاحنون
في الواقعـــة بـــشدة (نهـــون)
بـــسورة الحديـــد نـــصف الـــسور
قـــد إنتهـــى عـــددها في نظـــري
عـــدد نـــصف ســـور القـــرآن
جمـــع (الحديـــد:زن) بـــلا نقـــصان!
وعـــددي (وز) بـــسين ادرجـــوا
رقـــم تحـــريم وملـــك يخـــرج
إلى المعـــارج بعينهـــا اشـــر

في (جدّ نـوح) رقـم نـوح قـد سـطر!
والنازاعـات جـارة لعـبس
(عطـف) الجـوار منهمـا تأسـس!
(لان) لتكـوير ولانفطـار
(نُمـلٌ) رزقـتم منـه ياصـفاري!
(فـج) هـوى المطففـين مـن سـلك
بالانـشقاق (دف) يمـن مامـلك
(فـه) بـالبروج (وف) هـا تبجـيلا
ورتلـن طارقـاً تـرتيلاً [137]

---

(١٣٧) بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج/٣ ص ٢٠٢، ج/ ١٨ ص ١٤٤، ج/ ٦ ص ٨١، ص ١٠١، ص ٢١٩، عمدة القاری ج/٢٠ ص ٣١، ص ٣٥ ج/٣ ص ١١٨ ج/٦ ص ١١٨، ج/ ١٦ ص ١٣٥، ج/ ٨ ص ١٥٢، ص ١٥٦، ج/١٧ ص ١٤١، ص ٦٤، ص ١٦٥، تاج الاصول ج/١ ص ٨٦، ص ٣٧٧، ص ٣٧٩، ص ٣٨١، ص ٣٨٣، ج/٣ ص٢٨٠، ج/ ٤ ص ١٤، ص ٢١، ص ٢٣، مغني المحتاج/١/ ٣٦٤/ ٣٦٨ ج/٣/ ٦٨-٧٠. الفقه الميسر/١/٢٩٥ ج/٢/٣٠١- ٣١٠. فيقهی ئاسان/١/ ٣٨٩، ٤٠٠- ٤١٢. (نامەی زانین لەم کتێبە پیرۆزە، فەرموودەی ژمارە: (٢٧٥) + تاج/١ ص٢٩٢ حەلکردنی چەن شیعرێ لەم شیعرانەی سەرەوە: قورئان (١١٤) سوورەتە، نیوەی دەکاتە: (٥٧) کەڕێك دەکاتە کۆی پیتەکانی (الحدید) کەسورەتی ژمارە (٥٧) ی قورئانە: أ= ١ ل= ٣٠ح= ٨ د= ٤ ی= ١٠ د= ٤ هەموو دەکاتە: ١+٣٠+ ٨+ ٤+ ١٠+ ٤= ٥٧. سوورەتی مەعاریج ژمارەکەی (٧٠) یە، عەینیش کەیەکێکە لەپیتەکانی (المعارج) بەحیسابی جومەل دەکاتە (٧٠) (فج) هوی الخ، أی قسماً بسورة الانشقاق من سلك طريق أهواء المطففين الجائرة في المعاملات دَفَ ـ أی استأصل ونسف ـ بركة ماله. أو المعنى هكذا: من سلك طريق أهواء المكتالين المحتالين محق الله بركة ماله، بسبب الشقاق والمنازعة مع الذين غشهم بالتطفيف ونحوه، وضمن هذا المعنى يشير (فج=٨٣) إلى رقم السورة المطففين و (دف=٨٤) إلى رقم سورة الانشقاق، واتە: ناوکەوانەکان، لەسەر ئەو ڕیزەی کەوان لەشیعرەکەدا وەك (فە=٨٥) ژمارەی برووجە (وف=٨٦) ژمارەی سوورەتی طاریقە وە هەروەها ـ وەرگێڕ.

١٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا تَبرَّزَ لِحَاجَتِهِ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فَيَغْسِلُ بِهِ). (١٣٨)

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرمویٚ: (حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ دەچوو بۆسەراو، ئاوم بۆی دەبرد، خۆی پێ دەشۆرد).

١٦١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ فَقَالَ لَهُمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلًا مِنْ مَاءٍ أَوْ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ وَلَمْ تُبْعَثوا مُعَسِّرِينَ). (الحديث ٢٢٠- طرفه في: ٦١٢٨) (١٣٩)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرەبێکی دەشتەکی هەڵسا، لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) گمیزی کرد، چەن کەسێ تێیان خوڕی: ئەها کوڕە! شتی وانەکەی. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی تازە وازی لێ بهێنن، بەڵام سەتڵێ ئاو، یادۆڵچەیێ ئاو بکەن بەشوێنی میزەکەی دا، خودای گەورە بۆیە منی کردووە بە پێغەمبەری ئێوە، کەوەك خۆم کاری ئاسان بکەن، نەوەك کارگران بکەن (جاکەوابوو دەبێ چاو لەنەزان بپۆشن و بەناسکی فێری وێڵ و یاساکانی ئیسلامی بکەن).(ت/ ١/ ١١٠ = ز-٢٣ ژ-١٦٤ - ش/د/ت/ن).

١٦٢- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ (رَضيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلْ الطَّعَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجْرِهِ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ). (الحديث ٢٢٣- طرفه في: ٥٦٩٣) (١٤٠)

---

(١٣٨) أخرجه مسلم في الطهارة (عينى/٣/١٢٢/٨٠) المترجم.

(١٣٩) أخرجه مسلم في الطهارة (عينى/٣/١٢٤/٨٢) المترجم.

(١٤٠) أخرجه مسلم في الطهارة باب: حكم بول الطفل الرضيع، وفي السلام، باب التداوى بالعود الهندى رقم: ٢٨٧.=٦٦٠.

ئوم قەیسی کچی میحصەن (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی کۆرپەم هەبوو، نانەخۆرە نەبوو بوو، بۆ موبارەکی بردم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکۆشی خۆی دا داینا، منالەکە میزی کرد بەجلەکانیدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو ئاوەکەی لەجلەکەی پرژاند، ئیتر نەیشۆرد (ت/ ١/ ١١١/ ٤ = ز-٢٣ ژ-١٦٦ ـ ش/ د/ ت/ ن).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئوم قەیس خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەنە، لەدێرینا لەمەککە ئیسلام بووە، وە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، بیستو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەصەحیحەیندا دوو فەرموودەی هەیە، زۆر تەمەندرێژ بووە. بەپێی ئەم فەرموودەیە سوننەتە ساوا بەنیازی پیرۆز بوونو نزای باش بۆکردن ببرێ بۆ خزمەتی پیاوچاکان.

١٦٣ –عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أَتى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قائماً ثم دَعَا بماءٍ فَجِئْتُهُ بَمَاءٍ فتوضأ وفي رواية عنه: فانتبذت منه، فأشار إلي فجئته، فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ). (الحديث ٢٢٤– أطرافه في: ٢٢٥، ٢٢٦، ٢٤٧١)[(١٤١)]

حوذەیفە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چووە سەر سەرانگوێلکی هۆزێ، لەوێ بەپێوە گمیزی کرد، ئەوجا داوای ئاوی کرد، منیش ئاوم بۆیبرد، دەسنوێژی پێگرت. لەگێڕانەوەیەکی تری حوژەیفەدا فەرمووی: منیش ویستم لەکاتی گمیز کردنەکەدا لێی دوور بکەومەوە بەلام ئاماژەی بۆکردم کەبچم بۆ خزمەتی، هەتا ببم بەحەشارگە بۆیو خەلکەکە لەسەر ئەو شێوەیە نەیبینن، منیش چووم لەلای قنگەپاژنەی دا راوەستام خۆم کرد بەپەردە هەتا گمیزەکەی تەواو کرد.(ت/ ١/١٢٠/ ١٢ = ز-٢٤ ژ-١٩٣ =ش/د/ت/ن).

---

(١٤١) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: المسح على الخفين، رقم: ٢٧٣=٦٢٣.

**شیکردنەوە:**

وادەردەکەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم سەراو کردنەدا مەهانەیەکی رەوای بووبێ وەك نەپەرژان و خۆپاراستن لەبۆن و پیسی زبڵدانەکە، لەهەمان کاتدا بەڵگەی ئەوەیشە بەپێوە گمیز کردن، لەبەر هەندێ هۆ دروستەو ناڕەوانییە.

حوذەیفەی کوڕی یەمانی عەبەسی خۆی و باوکی ئوحودین، واتە: لەغەزای ئوحوددا بەشداریان کردووە - باوکی لەغەزای ئوحوددا بەهەڵە بەدەستی هەندێ موسوڵمان شەهید کرا، حوذەیفە یەکێکە لەهاوڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەغەزای خەندەقا، رۆڵێکی جوانی هەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی سووسەی هەواڵی سوپای دوژمنی بۆ بکا.

فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بیست فەرموودەی لەبوخاری شەریفا هەیە، بیست و نۆی لەموسلیم دا هەیە، دوازدەیان پەسەندی هەردوولایانن، کۆی فەرموودەکانی لەصەحیحەینا: ١٢+٨+١٧= ٣٧ ناوداره بەرازگری پێغەمبەر (صاحب سِرِّ النبـي). کاتێ یەکێ دەمرد ئیمامی عومەر سەرنجی دەدا ئەگەر حوذەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبوایە ئەویش ئامادەی نەدەبوو، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی گشت ناپاکە (موونافیق)ەکانی پێ گووتبوو، یەك بەیەکیانی دەناسی، لەغەزای نەهاوەندا ئامادە بوو، کەسوپا سالاری موسوڵمانان، نوعمانی کوڕی موقرین شەهید بوو، حوذەیفە ئاڵای هەڵگرت و هەمەدان و رەی ی و دینەوەر لەسەردەستی ئەودا ئازاد کران، لەبیست و دووی کۆچیدا عومەر کردی بەسەرکاری سەر مەدائین، لە (٣٦) ی کۆچیدا لەپاش چل رۆژ لەجێنشینی عەلی لەمەدائین مرد، صەفوان و سەعیدی کوڕی لەیارانی عەلی بوون، لەصەفین شەهید بوون. لەحوذەیفە پرسیار کرا: چی ئاژاوەیە زۆر کوشندەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی

کەببی بەسەرپشك لەنێوانی خێرو شەڕدا، واسەرت لێ شێوابێ نەزانی کامەیان هەڵبژێری!) دەیشی فەرموو: (قیامەت هەڵناسێ هەتا گشت هۆزێ، ناپاکەکانیان دەبن بەئاغاو سەرۆکیان!) وەدەیفەرموو: (ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێ، هەتا قیامەت هەڵدەستێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمووی پێ گووتووم). (ت/ ٥/ ١٨٨/ ١+٢ تاج-٣ ز-٥٥ ژ-٣٤٩٢، ٣٤٩٣).

١٦٤- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (جَاءَتْ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا تَحِيض فِي الثوْبِ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ تَحُتُّهُ ثمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ وَتَنْضحُهُ وَتُصَلِّي فِيهِ). (الحديث ٢٢٧- طرفه في: ٣٠٧) [١٤٢]

ئەسماء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ هاتە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزی کرد: ئەگەر خوێنی بێنوێژی بەر جلەکانمان کەوت چی لێ بکەین؟ فەرمووی: بی ووڵنو بی کرێننو ئەوجا بەئاو هەڵی گولۆفنو دەستی تێ خەن، لەپاشا پاك بی شۆرن، ئیتر نوێژی پێوە بکەن). (ت/١/ ١/١١٠ = ژ-١٦٣ ز-٢٣ = ش/ د/ ت/ ن).

١٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (جَاءَتْ فَاطمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاض فَلَا أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا إِنَّمَا ذلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِحَيْض فَإِذا أَقْبَلَتْ حَيْضتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ؟ وَإِذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثمَّ صَلِّي). وقال (ثم توضأي لكل صلاة، حتى يجئ ذلك الوقت) (الحديث ٢٢٨- أطرافه في: ٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٣١) [١٤٣]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: فاطیمەی کچی ئەبوحوبەیش هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئافرەتێکم

---

(١٤٢) من افراد البخاری عن مسلم (عینی/٣/ ٩٨/١٦١) المترجم.

(١٤٣) أخرجه مسلم في الحيض، باب: المستحاضة وغسلها وصلاتها، رقم: ٣٣٣=٧٥١.

حاڵم وایه هەمیشه بێنوێژم‌و کەتێکەوتم پاك نابمەوە، جا ئایا هەتا حاڵم ئاوەهابێ واز لەنوێژ بهێنم یانا؟ فەرمووی: نەء، چوونکه ئەوە دەمارەو خوێنی بەربووە، وەئەوە خوێنی بێ نوێژیی نییە، بەلام لەوەپێش چەن رۆژ دەکەوتیتە بێ نوێژییەوە، ئێستاش لەم حاڵەدا بەقەد ئەو رۆژانەی بێنوێژیی جارانت نوێژ مەکە، ئنجا خۆت بشۆرەو نوێژی خۆت بەئاسایی بکە.لەگێڕانەوەیەکا: (کاتێ سەرەتای بێ نوێژی یەکەی جارانت دەستی پێ کردەوە، ئیتر وادابنێ کە لەوێوە دەکەویتە بێ نوێژیەوە، کەواتە: ئیتر نوێژ مەکە هەتا بەقەد ئەو رۆژانە دەڕوا، ئنجا باخوێنەکەش نەوەستێ بەلام تۆ وادابنێ کەپاك بوویتەتەوە، جابەنیازی خۆشۆردنی بێنوێژیی خۆت بشۆرەو ئەوجا بەئاسایی نوێژی خۆتی لێ بکە) وەفەرمووی: (وە بۆ هەموو نوێژێکیش دەسنوێژێکی تازە بگرەوەوە، هەتا دیسانەوە دەچێتەوە کاتی ناوبراوی خۆت ئیتر دووبارە وادابنێ کەوا تازە تێ دەکەویت‌و واز لە نوێژ بهێنە وەبەقەد رۆژانی بێنوێژی جارانت، ئیتر ئەمە پیشەی هەمیشەت بێ!) (ت/ ١/ ١٦٥/١+٣ هەتا لاپەڕە١٧٠ = ز-٣٦ ژ-٣٠٤).

بەهرەکانی ئەم فەرموودەیە: ١- گوفتوگۆی ڕووبەڕوی ژن‌و پیاوی بیانی لەبارەی کارو باری ئایینی یەوە دروستە. ٢- بیستنی دەنگی ژن بۆ پێویستی ی رەوا دروستە. ٣- بەلگەیە لەسەر پیسی ی خوێن. ٤- بەلگەیە لەسەر ئەوە ژنی هەمیشە بێنوێژ بۆ هەموو فەرزێ دەسنوێژی سەربەخۆ دەگرێ. ٥- لەکاتی بێنوێژیدا نوێژ نادروستە.

١٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنْتُ أَغْسِلُ الْجَنَابَةَ مِنْ ثوْبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلَاةِ وَإِنَّ بُقَعَ الْمَاءِ فِي ثوْبِهِ). (الحديث ٢٢٩- أطرافه في: ٢٣٠، ٢٣١، ٢٣٢) [١٤٤]

---

(١٤٤) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: حكم المنى، رقم: ٢٨٩.=٦٦٧.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو ئەسەری لەشپیسیم بەجلەکانی پێغەمبەرەوە دەشۆرد، کەدەچوو بۆ نوێژ بۆ مزگەوت هێشتا جێگە شۆراوەکە تەڕ بوو، وەك پەڵەیێ لەڕەنگێکی تر بەجلەکەیەوە دیار بوو (ب/ ١١٤/ ١٢= تاج١ ز-٢٣ ژ-١٧٤ = ش/ د/ ت/ ن).

١٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَدِمَ أُنَاسٌ مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ فَأَمَرَهُمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلِقَاحٍ وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا فَانْطَلَقُوا فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ فَجَاءَ الْخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ فَلَمَّا ارْتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ فَأَمَرَ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلَا يُسْقَوْنَ). (الحديث ٢٣٣- أطرافه في: ١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٩٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠، ٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩)[١٤٥]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: تاقمێ لەهۆزی عوکل، یالەهۆزی عورەینە، هاتنە خزمەتی حەزرەتو موسوڵمان بوونو، پاش ماوەیێ هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ فەرموون کەبچن بۆ دەرەوەی مەدینە بۆ ناو ڕانە وشترە زەکاتەکانو، لەوێ لەگمێزو شیری وشترەکان بخۆن، هەتا سکیان دەکەوێتەرێو، لەو نەخۆشینەیە ڕزگار دەبن، ئەوانیش ئاوایان کردو چاك بوونەوە، کەچی ڕۆژێ، لەئیسلام وەردەگەڕێنو، سەرای ئەوەش شوانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر بەبێ نەزاکەت دەکوژن، دەستو پێی دەبڕنو دڕك دەکەن بەچاوی دا تادەمرێ، ئنجا وشترەکانیش دەدەنە بەرو، دەیان فڕێنن بۆ وڵاتی خۆیان، ئەم دەنگوباسە سەرلەبەیانی گەیشت، کاتێ حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەم کارەساتەی زانی کۆمەڵێ جەنگاوەری نارد بەشوێنیاناو، لەڕێ دەیانگرنەوەو، دیلیان دەکەنو،

(١٤٥) أخرجه مسلم في القسامة، باب: حكم المحاربين والمرتدين، رقم: ١٦٧١=٤٣٣٠.

سەرلەئێوارێ دەیانهێننەوە بۆ مەدینە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوەڕێی فەرمانی خودای کرد، تائایاتی سیی‌و سێ لەسورەتی مائیدە هاتە خوارەوە، ئەوجا بە پێی ئەو ئایەتە حەزرەت فەرمانی کرد، دەست‌و پایان بڕین‌و، بەبسماری سوورەوەکراو چاویان ڕشتن، ئەوسا توورپیان دانە ناو خڕە بەرداوییەکەوە لەدەرەوەی شار، کەپێی دەگوترا ئەلحەرە، داوای ئاویان دەکرد، کەس ئاوی نەدەدانێ، هەتا گیانیان دەرچوو (ت/٣/٢٣٠/٣= ز-٨٨ ژ-٢٣٣٧ = ش/د/ن) = تاج ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە لەبەرگی/ ٣ لاپەڕە/ ٢٣٠ فەرموودەی/ ٣ لەوباسەدا وەدەشفەرموێ (بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبوداوودو نەسائی) ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە.

١٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي قَبْلَ أَنْ يُبْنَى الْمَسْجِدُ فِي مَرَابِض الْغَنَمِ). (الحديث ٢٣٤- أطرافه في: ٤٢٨، ٤٢٩، ١٨٦٨، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩، ٣٩٣٢)[(١٤٦)]

دیسان ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش ئەوەدا مزگەوتەکەی خۆی لەمەدینە دروست بکرێ لەناو پەچەرانا نوێژی دەکرد).

١٦٩- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطتْ فِي سَمْنٍ فَقَالَ أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا فَاطرَحُوهُ وَكُلُوا سَمْنَكُمْ). (الحديث ٢٣٥- أطرافه في: ٢٣٦، ٥٥٣٨، ٥٥٣٩، ٥٥٤٠)[(١٤٧)]

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: مشکێ دەکەوێتە ناو ڕۆنی مەییوەوە، بۆ ئەوە لەپێغەمبەر پرسیاریان کرد فەرمووی: مشکە تۆپیوەکەو دەوروبەرەکەی فڕێ دەن‌و، ڕۆنی خۆتان بخۆن). (ت/١/١١٥/١٤)

(١٤٦) اخرجه مسلم في المساجد ومواضيع الصلاة، باب: ابتناء مسجد النبيُ (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ) رقم: ٥٢٤.=١١٧٣.

(١٤٧) من أفراد البخارى عن المسلم (عينى/٣/١٦١/٩٨) المترجم.

١٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كُلُّ كَلْمٍ يُكْلَمُهُ الْمُسْلِمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَكُونُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهَا إِذ طعِنَتْ تَفجَّرُ دَمًا اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَالْعَرْفُ عَرْفُ الْمِسْكِ). (الحديث ٢٣٧- طرفاه في: ٢٨٠٣، ٥٥٣٣)[148]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەڕێ ی خودادا زامار بکرێ، لەڕۆژی قیامەتا کەدێ بۆ دیوانی خودا، زامەکەی تازەو نوێ یە، وەکوو کاتی زامارکردنەکەی، ڕێك لەسەر هەمان شێوەیشە، ڕەنگەکەی سووری تلیقی یە، وەك خوێنی ئاسایی، بەڵام بۆنو بەرامە خۆشەکەی لەبۆنی میسك دەکا، لەناو خەڵکی مەحشەردا دەبێ بەمایەی شانازیو سەربەرزی بۆی). (ت/٨/ ٢/٤٦ =ز-١١ ژ-٤٢٩٨ تاج-٤ ش)

١٧١- عَنْ أبي هريرة (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَه قَالَ: (لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الذِي لايَجْرِي ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ). (الحديث ٢٣٩)[149].

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (کەستان گمیز مەکەنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە کەلەبەری نەڕوا لەپاشیشا بچێ خۆی تیا بشوات). (ت/١/١٠٥/٦ = ز-٢١ ژ-١٥١).

١٧٢- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ إِذ قَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْض أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلَانٍ فَيَضعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَجَاءَ بِهِ فَنَظَرَ حَتَّى سَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَضعَهُ عَلَى ظَهْرِهِ بَيْنَ

---

(١٤٨) أخرجه مسلم في الامارة، باب: فضل الجهاد والخروج في سبيل الله،رقم: ١٨٧٦.=٤٨٣٦ — ٤٨٣٨.

(١٤٩) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: النهى عن البول في الماء الدائم، رقم: ٢٨٢.=٦٥٣، ٦٥٥.

كَتِفَيْهِ وَأَنَا أَنْظُرُ لَا أُغْنِي شَيْئًا لَوْ كَانَ لِي مَنَعَةٌ قَالَ فَجَعَلُوا يَضحَكُونَ وَيُحِيلُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْض وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاجِدٌ لَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطمَةُ فَطرَحَتْ عَنْ ظهْرِهِ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ ثلَاث مَرَّاتٍ فَشَقَّ عَلَيْهِمْ إِذ دَعَا عَلَيْهِمْ قَالَ وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذلِكَ الْبَلَدِ مُسْتَجَابَةٌ ثُمَّ سَمَّى اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَشَيبَةَ بنْ رَبيعة وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْط وَعَدَّ السَّابِعَ فَلَمْ يَحفِظْهُ الراوي قَالَ فَوَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذينَ عَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَرْعَى فِي الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ). (الحديث ٢٤٠– أطرافه في: ٥٢٠، ٢٩٣٤، ٣١٨٥، ٣٨٥٤، ٣٦٦٠) [١٥٠]

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەلای کەعبەدا نوێژی دەکرد، ئەبوجەهلو چەند هاوڕێ یەکی لەوێ دانیشتبوون، ڕۆژی پێشووتریش وشترێ سەربڕابوو، ئەبوجەهل گوتی: ئادەی یەکێکتان بچن پرزانگی ئەو وشترە سەربڕاوە بێنن، کەدوێنێ ئەو ماڵە سەریان بڕیوە پرزانگەکەیان لەلامالان فڕێ داوە، جاکاتێ هێنای کەموحەممەد سەری دانا لەناو کوڕنوش دا، ئەو پرزانگە پیسو پۆخڵە لەگەڵ خوێنو خوڕو سیخوڕەکەیدا، لەسەر بۆتەقەی ملی دابنێ، بەدترین کەسی کۆمەڵەکە دەرپەڕیو، چوو پرزانگو خوڕو خوێنەکەی هێناو، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کڕنووشی برد، لەناو شانیدا داینا، فەرمووی: ئیتر کردیان بەفشەو پێکەنینو، لەبەر لاقرتیو پێکەنین لاڵو پاڵ کەوتن بەسەر یەکتردا! بەیەکتریان دەگوت: ئەمە کەتنی تۆ بوو کردت بەموحەممەد!

منیش هەر سەیرم دەکردو دەسەڵاتی هیچیشم نەبوو، ئەگینا پرزانگەکەم لەسەر پشتی فڕەدەدا، حەزرەت لەسەر ئەوحاڵە لەناو سەجدەدا مایەوەو

(١٥٠) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: مالقى النبيُّ (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) من اذى المشركين، رقم: ١٧٩٤.=٤٦٢٥.

سەری هەڵنەبڕی، تامرۆڤێ چوو بەفاطیمەی کچی گوت حاڵەکە وایە، ئەوکاتە فاطیمە منالکار بوو. کەهات فڕێ ی داو، دەستی کرد بەجنێودان پێیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، دەنگی هەڵبڕیو نزای شەڕی لێ کردن، دەستووری حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وابوو کەنزای دەکرد سێ جار نزاکەی دووبارە دەکردەوە، کەشتێکیشی لەخودا داوا دەکرد سێ جار داواکردنەکەی دووبارە دەکردەوە.

جا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ جار لەسەریەك بەدەنگی بەرز فەرمووی: (خودایە قوڕەیشم هەواڵەی قینو قاری تۆ کرد!) ئەوانیش کەگوێیان لەمە بوو لەپێکەنین کەوتنو، زۆر لەنزاو سکاڵاکەی ترسان. دوا ئەوە فەرمووی: (خودایە! ئەم زەلامانەم هەواڵە بەخەشمو قاری تۆ کرد: ئەبوجەهلی کوڕی هیشامو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی عوقبەو ئومەییەی کوڕی خەڵەفو عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیطو....) فەرمووی: (ئەو حەوتەمیشی ژمارد بەڵام من ناوی حەوتەمم لەبەر نەماوە) (حەوتەم عەمارەی کوڕی وەلید بوو. عەینی). ئیبنومەسعود فەرمووی: (دەی بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو بەدبەختانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەیەکە ناوی هێنانو نزای شەڕی لێ کردن بەچاوی خۆم چاوم پێیان کەوت لەڕۆژی بەدردا کوژرابوون، لەدوایی دا کەلاکەکانیان بەکێش کردنو تووڕیان دانە ناو کۆنە بیرەکەی بەدرەوە!) (ت/ ٨/١٩٠/ ١ تاج-٤ ز-٨٢ ژ-٤٥٦٨).

١٧٣-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَزَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَوْبِهِ). (الحديث ٢٤١- أطرافه في: ٤٠٥، ٤١٢، ٤١٣، ٤١٧، ٥٣١، ٨٢٢، ١٢١٤).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاروبار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو نوێژدا کەناچار دەبوو تفی دەکردە ناو دوتوێ ی جلەکانیەوە).

١٧٤- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أنه سَأَلَهُ النَّاسُ: بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جُرْحُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي كَانَ عَلِيٌّ يَجِيءُ بِتُرْسِهِ فِيهِ مَاءٌ وَفَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْ وَجْهِهِ الدَّمَ فَأُخِذ حَصِيرٌ فَأُحْرِقَ فَحُشِيَ بِهِ جُرْحُهُ). (الحديث ٢٤٣- أطرافه في: ٢٩٠٣، ٢٩١١، ٣٠٣٧، ٤٠٧٥، ٥٢٤٨، ٥٧٢٢).[151]

لەسەهلی کوڕی ئەل -ساعیدی- (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیارکرا: ئەرێ لەڕۆژی هەراکەی ئوحوددا زامەکەی پێغەمبەریان بەچی دەرمان کرد؟ فەرمووی: (بەڕاستی لەکەسێ باشتان پرسی، چونکە کەسی تر نەماوە کەلەمنی باشتر لێ بزانێ، لەڕۆژی هەراکەی ئوحوددا کەخوودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەریدا شکاو، خوێن بەدەمو چاویدا هاتەخوارەوەو، ددانە چوارینە (رەباعییە) کەی لەڕیزی لای راستی، لەڕیزی خوارەوە شکا، عەلی لەقەڵغانەکەیدا ئاوی دەهێناو، فاطیمەیش خوێنەکەی لەڕوخساری باوکی دەشۆری، فاطیمە سەرنجی دا خوێنەکە بەئاوەکە زۆرتر دەبێ، چوو پرزۆڵێ حەسیری هێناو سووتاندنیو کردی بەسووتوو، وە نای لەسەر زامەکە، ئیتر خوێنەکەی وەستایەوە). (ت/٤/ ١/٢١١ تاج-٣ ز-٧٠ ژ-٣٠٣١).

## راڤەو شیکردنەوە:

پێشەوا نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (بەڵگەیە لەسەرئەوە کەخودای گەورە پێغەمبەرانو خۆشەویستانو چاکانی خۆی، بەدەردو وەیو ئێشو ئازارو خەمو خەفەتو زیانی سامانی تاقی دەکاتەوە، یاگیرۆدەیان دەکا، هەتا پاداشی باشی گەورە وەربگرن، هەتا بیشبن بەسەرمەشقو پێشەوا بۆ نەتەوەکانیان، هەتا لەکاتی لێقەومانو دووچاریدا دڵنەوایی خۆیان بەحاڵی

(١٥١) اخرجه مسلم في المغازى (ج/٣/١٨٣/١٠٥) - المترجم.

ئەوان بدەنەوە، هەتا بشزانن کەئەوانیش هەر ئادەمیزادنو بەندەی خودانو، حاڵیان حاڵی ئەوانە لەبارەی دەردو بەڵاو بەسەرهاتی جیهانەوە).

سەهل لەگەورە پیاوانی هاوڕێ یانە، ناوی حەزن بووە، (حەزن) واتە: سەختو نارەحەت، (سەهل) واتە: خۆشو ئاسان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی نا سەهل، ئەنصاری یە، سەدو سیوهەشت فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، سیو نۆ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، یان: چلو یەك فەرموودە، پتر لەسەد ساڵ ژیاوە، لەنەوەدو یەکی کۆچیدا لەمەدینە مردووە، کە پێغەمبەر مردووە پازدەساڵ بووە، ئیمامی زوهری فەقێ ی بووە. یەکێ بووە لەو هاوڕێ نازدارانەی پێغەمبەر کەحەجاج گەڕی پێکردوونو ئازاری داون.

١٧٥- عَنْ أبي موسى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَال: (أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ يَقُولُ أُعْ أُعْ وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ كَأَنَّه يَتَهَوَّعُ). (الحديث ٢٤٤)[١٥٢]

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) سیواکێکی لەدەستا بوو، سیواکی پێ دەکرد، دەیفەرموو: (ئوع، ئوع) وەك بڕشێتەوە ئاوا (ت/١/٢٣٤/٢/١/٣/٤ = ز-٦٥ ژ-٤٣٨ + ل/ ١٢١/٣/٥/٦، ریاض الصالحين بەرگی/٣ ل/٨٩٣ ز- ٢١٥، فیقهی ئاسان/١ ل- ٢٣ ز- ٧)[١٥٣]

١٧٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ). (الحديث ٢٤٥- طرفاه في: ٨٨٩، ١١٣٦)

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەشەو لەخەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ، یا بۆهەر شتێ تر، سیواکی لەدەمی رادەدا).

---

(١٥٢) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: السواك، رقم: ٢٥٤.=٥٩١.

(١٥٣) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: السواك، رقم: ٢٥٥.=٥٩٢.

١٧٧-عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ فَجَاءَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ الْآخَرِ فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي كَبِّرْ فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ مِنْهُمَا. (الحديث ٢٤٦).[١٥٤]

**ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخەوما دیتم کەوا بەدارسیواکێ سیواك دەکەم، دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەویتریان گەورەتر بوو، منیش ویستم دارسیواکەکە بدەم بەبچکۆلەکەیان کەچی پێم گوترا: گەورەکەیان وەپێشخە، منیش دام بەگەورەکەیان). (ت/٨/١٨/٦ تاج-٤ ز-٥ ژ-٤٢٥٩).**

**شیکردنەوە:**

**یەکێ لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە عەفانی کوڕی موسلیمە، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، کەبەفیتی موعتەزیلەکان گەڕیان دەکرد بەزانا گەورەکان، لەبارەی قوئانەوە کەدروست کراوە یا دێرینو قەدیمە لەویش پرسیارکرا، رازی نەبوو کەبڵێ: (قورئان مەخلووقەو دروستکراوی خودایە). یەکێ بوو لەحوککامی جەرحو تەعدیل، دەهەزار لیرەی زێڕیان پێ دا، لەباتی ئەوەکە لەبارەی پیاوێکەوە راماویو بێ ئاگایی لەحاڵی دەربڕی، واتە: نەبڵێ عادڵە، نەبڵێ ناعادڵە، بەڵام قاییل نەبوو، فەرمووی: (قەت حەق ناکەم بەناحەق)، یەکێ تر لەپیاوانی ئەم رشتەیە نوعەیمی کوڕی حمادە، پیاوێکی فەرائیز زان بوو، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، لەبارەی خەلقی قورئانەوە، ئەویشیان پێچا، لەسەرئەوە لەسامەڕا بەند کرا هەتا لەساڵی (٢٢٠) ی کۆچیدا لەزیندانا مرد! رەزای خودای لێ بێ.**

---

(١٥٤) أخرجه مسلم في الرؤيا، باب: رؤيا النبيُّ (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) رقم: ٢٢٧١. = ٥٨٩٢ وفي الزهد واالرقائق، باب: مناولة الأكبر، رقم: ٣٠٠٣.

لەفیقهی ئاسانا (٢٤/١) دەفەرموێ: (سیواك سوودی زۆرە: پووك توند دەکاتەوەو، ددان ساخڵەم دەکاو، دەسگای هەرسو هەزم بەهێزدەکاو،گمیزکردن خێرا دەکاو، دەمو ددان پاكو خاوێن دەکاتەوەو، دەبێ بەمایەی رەزای خوداو، پیریی دوا دەخاو، چارەی مرۆڤ گەشو نوورانی دەکاو، گەشەو پەرە بەهۆشیاری دەداو، پاداشی باش دووچەندان دەکاو، لەکاتی گیانەڵادا گیانکێشان ئاسان دەکاو، لەکاتی سەرەمەرگا شایەتمان یادی موسوڵمان دەخاتەوە!).

١٧٨- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قالَ : قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إذا أَتَيْتَ مَضجَعَكَ فَتَوَضأْ وُضوءَكَ لِلصَّلَاةِ ثمَّ اضطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ ثمَّ قُلْ اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ وَفَوَّضتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذي أَرْسَلْتَ فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطرَةِ وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ قَالَ فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا بَلَغْتُ اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أَنْزَلْتَ قُلْتُ وَرَسُولِكَ قَالَ لَا وَنَبِيِّكَ الَّذي أَرْسَلْتَ). (الحديث ٢٤٧- اطرافه في: ٦٣١١، ٦٣١٣، ٦٣١٥، ٧٤٨٨) [(١٥٥)]

خودایە خۆم دایە دەستی تۆو کاری خۆم سپارد بەتۆو، پەنام هێناوە بۆ پەنای تۆو، پشتم بەستووە بەتۆ، هەروەك مەترسیم هەیە لەقارو سزای تۆ، ئومێدیشم قەوی یە بەمیهرەبانیو رەحمەتی تۆ، هیچ پەناو پاسارێ نییە لەقارو قینو خوشمی تۆ، مەگەر هەر لەلای خۆت، پەنا هەر پەنای تۆیەو بەس، باوەڕم هەیە بەو نامە پیرۆزەی تۆ، کەخۆت ناردووتەتە خوارەوە، کەقورئانی گەورەیە، وەباوەڕیشم هەیە بەو پێغەمبەرەیشت کەخۆت رەوانەت کردووە بۆ سەر بەرەی ئادەمیزادو بەرەی پەری، کە حەزرەتی موحەممەدە).

---

(١٥٥) اخرجه مسلم في الذكر والدعاء والتوبة، باب: مايقول عند النوم وأخذ المضجع، رقم: ٢٧١٠=٦٨٢٠.

ئەوجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (جائەگەر لەپاش خوێندنی ئەم نزایە، دنیا بوو وا ڕێکەوت لەو شەوەتدا بمریت، ئەوا ئیمان دەرەبەریتو، لەسەر ئایینی پاکی ئیسلام دەمریت. وەئەم نزایە بکە بەکۆتایی قسەی ئەو شەوەتو، کەدووعاکەت خوێند ئیتر قسەی تر مەکە، هەتا خەوت لێ دەکەوێ). بەراو فەرمووی: خەریکبووم لەبەری بکەم، کەبۆیم گوتەوە لەجیاتی ڕستەی (ونبيك الڈی أرسلت) گوتم: (ورولك الڈی أرسلت) کەچی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆی ڕاست کردمەوەو فەرمووی: نەو، وامەڵێو وشەکانی نزاکە لەخۆتەوە مەگۆڕەو ڕێك وەك خۆم پێتم گوت وابڵێ (ونبيك الڈی ارسلت). (ت/٨/٢٤ /١ـ تاج-٤ ز-٨ ژ-٤٢٧٠ = ش/د/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی هاوڕێ ی پێغەمبەر بوون، سێ سەدوپێنج فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بیستو دوویان پەسەندی هەردوو پیرن، بوخاری بەجیا پازدەی هەیە، موسلیمیش شەش.

بەراء دەیفەرموو: (مەرج نییە ئەو فەرموودانەی کەئێمە ئەیان گێڕینەوە بۆئێوە بەگوێ ی خۆمان لەخودی پێغەمبەرمان بیستبن، هەیانە لەهاوڕێیانی خۆمانمان بیستووە کەئەوان لە پێغەمبەریان بیستووەو بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوە).

هەندێ دەفەرموون: وڵاتی ڕەیی لەسەردەستی ئەودا ئازاد کراوە، یەکەم غەزا کەبەراء هاوبەشی تیادا کردووە خەندەقە، خۆی دەفەرموێ: هەژدە سەفەرم لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە. لەناو هاوڕێ یاندا کەسی تر نییە جگە لەخۆی کەناوی بەرای کوڕی عاذیب بێ. لەلایەنگرانی ئیمامی عەلی بوو، ڕەزای خودای گەورە لەخۆیو لەباوکیو لەئیمامی عەلی بێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٥) نامەی خۆشۆردن (غوسل)

١٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ ثمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاث غُرَفٍ بِيَدَيْهِ ثمَّ يُفِيض الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ). (الحديث ٢٤٨- طرفاه في: ٢٦٢، ٢٧٢).[١٥٦]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەسەر هاوسەرەکانی) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر وابوو کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، لەپێشا هەردوو دەستی خۆی دەشۆرد، تامووچەکانی، ئینجا بەدەستی ڕاست ئاوی دەکرد بەدەستی چەپیداو، ناوگەڵی دەشۆرد، ئەوجا دەق وەك دەسنوێژی نوێژ دەستنوێژێکی دەگرت! ئنجا ئاوی هەڵدەگرتو پەنجەی دەخستە بن مووەکانی سەری، تادەیزانی کەوا تەواو تەڕبوون، ئەوجا سێ مشت ئاوی دەکرد بەسەر بەسەریدا، لەپاشا سەراپا باقی مەندەی لەشی خۆی دەشۆرد، لەپاشان هەردوو قاچیشی دەشۆرد. (ت/١/١٥٣/٢ ز-٣٢ ژ-١٧٩ ـ ش/ د/ت/ ن)

١٨٠- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: (تَوَضَّأَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وُضوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ وَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ مِنْ الْأَذى ثمَّ أَفَاض عَلَيْهِ الْمَاءَ ثمَّ نَحَّى رِجْلَيْهِ فَغَسَلَهُمَا هَذهِ غُسْلُهُ مِنْ الْجَنَابَةِ). (الحديث ٢٤٩- أطرافه في: ٢٥٧، ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٧٤، ٢٧٦، ٢٨١)[١٥٧]

---

(١٥٦) أخرجه مسلم في الحيض، باب: صفة غسل الجنابة، رقم: ٣١٦.=٧١٦.

(١٥٧) أخرجه مسلم في الحيض، باب: صفة الغسل الجنابة، رقم: ٣١٧.=٧٢٠، ٧٦٥.

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێشا دووجار یاسێ جار هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئینجا ئاوی کرد بەدەستی چەپیداو، ناوگەڵی خۆی شۆرد، لەپاشا بەزەوییەکە دەستی خۆی سڕی، هەتا بەتەواوی شوێنەواری تارات گرتنەکە بەدەستیەوە نەما، ئنجا سەرتاپا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئنجا لەشوێنەکەی خۆی گواستیەوە، ئنجا هەردوو قاچی خۆی شۆرد، لەگێڕانەوەیەکا: ئنجا سێ جار سەری خۆی شۆرد. واتە: لەپێش شۆردنی لەشیدا. لەگێڕانەوەیەکی تردا: جامنیش پەڕۆیەکم بۆهێنا کەخۆی پێ وشك بکاتەوە بەڵام پەڕۆکەی نەویستو، ئاوەکەی بەدەستی لەلەشی تەکاند. (ت/١/١٥٢/١- ز-٣٢ ژ-٢٧٧ = ش/د/ت/ ن).

١٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ قَدَحٍ يُقَالُ لَهُ الْفَرَقُ). (الحديث ٢٥٠- أطرافه في: ٢٦١، ٢٦٣، ٢٧٣، ٢٩٩، ٥٩٥٦، ٧٣٣٩)[١٥٨]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیەکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، پێیان دەگوت: (فەرەق) شازدە (ڕەگل) ئاوی دەگرت. لەگێڕانەوەیەکا: هەردوو لایشمان لەشمان پیس بوو. (ت/١/١٠٥/٧، ل ـ ١٤٩/٣ =ز-٢١ ژ-١٥٢٠ ـ ش/د/ت/ ن).

## ڕوونکردنەوە:

قەتبیو کەسانی تر دەفەرموون: (فرق) ئاوا دەخوێنرێتەوە (فەرەق) نەوەوی دەفەرموێ: بەم شێوەیە ڕەوانبێژ ترە. ئیبنوتین دەفەرموێ: (فەرق)

(١٥٨) أخرجه مسلم في الحيض، باب: القدر المستحب من الماء في غسل الجنابة رقم: ٣٢٠. = ٧٢٠، ٢٧٢٥، ٧٢٦.

دەخوێنرێتەوە. ئیبنوئەثیر دەفەرموێ: فەرەق شازدە رەتڵە، بەڵام فەرق، بەزەنەی رێ، سەدو بیست رەتڵە. ئیبنوعویەینە دەفەرموێ: فەرەق سێ صاعە، نەوەوی دەفەرموێ: ئەمە قسەی جەماوەرەکانە، بێژراویشە: دووصاعە، جەوهەری دەفەرموێ: فەرەق ئەیارەیەکی ناسراوە لەمەدینە هەیە، شازدە رِەتڵە، ئەبوزەید دەفەرموێ: (فەرق)و (فەرەق) یەك شتن، ئەیارەیەکە سێ مەن دەگرێ، کەدەکاتە شازدە رِەتڵ.

ئەمە نموونەیەکە لەجۆری شیکردنەوە، کەنیشانەی ئەوەیە راڤەکردنی فەرمووده زۆر گرانە، پێویستی بەزانستی زۆر هەیە. جا ئەگەر لەشوێنێ بینیمان کە فەرموودەیێ بەدوو جۆر، یابەچەند جۆرێکی جیاجیا، راڤە کراوە، یاوەرگێڕاوە، ئەوە کێشە نیە.

١٨٢–عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رحمه الله تعلى) قالَ: (دَخَلْتُ أَنَا وَأَخُو عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَلَى عَائِشَةَ فَسَأَلَهَا أَخُوهَا عَنْ غُسْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ نَحْوًا مِنْ صَاعٍ فَاغْتَسَلَتْ وَأَفَاضَتْ عَلَى رَأْسِهَا وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا حِجَابٌ). (الحديث ٢٥١).[159]

ئەبو سەلەمە - رەحمەتی خودای لێ بێ - فەرمووی: ( منو برایەکی شیریی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) رۆیشتین بۆ خزمەتی، براشیری یەکەی لەبارەی چۆنێتی ی خۆشۆردنی پێغەمبەرەوە پرسیاری لێکرد، ئەویش داوای دەوری صاعێ ئاوی کردو، خۆی شۆرد، لەتەوقە سەریەوە ئاوی کرد بەسەر خۆیدا. لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی عائیشەدا پەردەیێ هەبوو، ئەو شوێنانەی شاردبۆوە کەلە لەشی ئافرەتی خۆیی، تەماشاکردنی نادروستە.

١٨٣– عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ (رَحِمَهُ الله) قَالَ: (حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ هُوَ وَأَبُوهُ وَعِنْدَهُ قَوْمٌ فَسَأَلُوهُ عَنْ الْغُسْلِ فَقَالَ يَكْفِيكَ صَاعٌ فَقَالَ رَجُلٌ

(١٥٩) أخرجه مسلم في الحيض، باب: القدر المستحب من الماء في غسل الجنابة، رقم/ ٣٢٠.

مَا يَكْفِينِي فَقَالَ جَابِرٌ كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعَرًا وَخَيْرٌ مِنْكَ ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ). (الحديث ٢٥٢ ـ طرفاه في: ٢٥٥، ٢٥٦)*

ئەبوئیسحاق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالیب، کەناسراوە بە (ئەلباقیر) گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: من و باوکم لەخزمەت جابیری کوڕی عەبدوللادا بووین، کۆمەڵێ تری لەخزمەتدا بوو، لەبارەی خۆشۆردنەوە کەچەندێ ئاو بەشی دەکا لێیان پرسی، فەرمووی: (مەنێکت بەسە!) (مەن = صاع).

پیاوێ گوتی: مەنێ ئاو بەشم ناکا کەخۆمی پێ بشۆرم. جابیر فەرمووی: مەنێ ئاو بۆ خۆشۆردن و غوسڵ دەرکردن بەشی پێغەمبەری دەکرد، کەلەتۆمووی زۆرتر بوو، وەلەتۆیش چاکتر بوو، کەواتە: قسەی وامەکە، لەپاشا کەنوێژ بوو، پێشەوا جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەیەك لۆجل دا بەرنوێژی بۆکردین.

١٨٤- عَنْ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَمَّا أَنَا فَأُفِيض عَلَى رَأْسِي ثلَاثا). وَأَشَارَ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا. (الحديث ٢٥٤)[١٦٠]

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەراستیدا من بەش بەحاڵی خۆم، سێ مشت ئاو دەکەم بەسەرما) جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهەردوو دەستی نیشانی دا کەمەبەست لەمشت پڕ هەردوو دەستە.

---

* أخرجه مسلم. طهارة. استحباب استفاضة الماء رقم٧٤١.

(١٦٠) أخرجه مسلم في الحيض، باب: استحباب إفاضة الماء على الرأس وغيره، رقم: ٣٢٧=٧٣٨.

**راڤەو شیکردنەوە:**

جوبەیر لەپیاوماقوڵانی قورەیش بوو، نوێنەری قورەیش بوو کەهاتە خزمەت حەزرەت بۆ بەردانی دیلەکانی غەزای بەدر، لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بوو، زانایەکی بنەچەناسو رەگەز ناسێکی گەورە بوو، لەئەبوبەکری صەدیقەوە ئەو زانستە فێر بوو بوو، شەست فەرموودەی هەیە، نۆیان لەبوخاریدا هەن، لەمەدینە لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا مردووە).

١٨٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوَ الْحِلَابِ فَأَخَذ بِكَفِّهِ فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الْأَيْمَنِ ثمَّ الْأَيْسَرِ فَقَالَ بِهِمَا عَلَى وَسَط رَأْسِهِ). (الحديث ٢٥٨).[١٦١]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، پڕ دەوری گۆزەیێ ئاوی داوا دەکرد، ئەوجا پڕ مشتێ ئاوی هەڵدەگرتو لەپێشا دەیکرد بەلای راستی سەریدا، ئەمجا دەیکرد بەلای چەپی سەریدا، ئەنجا بەمست بەهەردوو دەستی ئاوی دەکرد بەسەر تەوقە سەریدا.

١٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا فِيهِ).[١٦٢]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران منو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەیەکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، رێ دەکەوت لەناو دەفرەکەدا دەستمان بەرەنگاری دەستی یەکتری دەبوو. (ت/١/١٤٩/٣ = ز-٣١ ژ-٢٦٩).

١٨٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَطوفُ عَلَى نِسَائِهِ ثمَّ يُصْبِحُ مُحْرِمًا يَنْضَخُ طِيباً). (الحديث ٢٦٧- طرفه في: ٢٧٠).[١٦٣]

---

(١٦١) أخرجه مسلم في الحيض، باب: صفة غسل الجنابة، رقم: ٣١٨.=٧٢٣.

(١٦٢) اخرجه مسلم في الحيض، باب: القدر المستحب من الماء في الغسل الجنابة رقم: ٣١٩، ٣٢١.=٧٢٩.

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆخۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام بەستن دا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کەئیحرام ببەستێ، جا هەر لەوشەوەدا دەچوووە لای ژنەکانیو، بۆ بەیانیش هێشتا بۆنی گوڵاوەکە دەمار دەمار دەڕۆیی کەئیحرامی دادەبەست (ت/٢/١٦٧/٢ ز-٨٧ ژ-١٥١٥).

١٨٨-عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنْ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُنَّ إِحْدَى عَشْرَةَ وَفِي ريواية: تِسْعُ نِسْوَةٍ. قِيلَ: لِأَنَسٍ أَوَكَانَ يُطِيقُهُ قَالَ كُنَّا نَتَحَدَّث أَنَّهُ أُعْطِيَ قُوَّةَ ثَلَاثِينَ). (الحديث ٢٦٨ أطرافه في: ٢٨٤، ٥٠٦٨، ٥٢١٥)*.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەردەمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یازدە ژنی هەبوو، جاری وادەبوو لەیەك تاودا، بەشەو یابەڕۆژ، دەڕۆیشتەلای هەر یازدەیانو یەکە یەکە لەو ماوەیەدا دروست دەبوو لەگەڵیان. لەگێڕانەوەیەکا: نۆژنی هەبوو. گوترا: جا ئایا توانای ئەوەی هەبوو لەکاتێکی وا کەما لەگەڵ ئەوەندە هاوسەردا دروست ببێ؟ ئەنەس فەرمووی: بەڵێ، ئێمە قسەی ئەوەمان لێ دەکرد: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم لایەنەوە توانای سیی پیاوی پێ دراوە. (ت/١/١٥٦/١٠ ز-٣٢ ژ-٢٨٦ ـ ش/د/ت/ ن)

١٨٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كَأَنِّي أَنْظرُ إِلَى وَبِيصِ الطيبِ فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ). (الحديث ٢٧١- أطرافه في: ١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣)[١٦٤]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئێستاش هەر لەبەرچاومە کە چۆن شوێنی جیاکردنەوەی مووی سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەلەناوەڕاستا دەیکرد

---

(١٦٣) أخرجه مسلم في الحج، باب: الطيب للمحرم عند الإحرام، رقم: ١١٩٢=٧٢٥، ٧٢٦.

* أخرجه مسلم في الطهارة رقم-٧٠٦ شيحا.

(١٦٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: الطيب للمحرم عند الإحرام، رقم: ١١٩٠=٢٨٢٦، ٢٨٢٤.

بەدوو بەشەوە، بریسکەی میسکەکەی پێوە بوو دەبریسکایەوە، کەلەپێش ئیحرام بەستن دا لێی دابوو. (تاج-٢/١٨١ ز-٨٧ ژ-١٥١٥ چ-٤).

١٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ وَتَوَضأَ وُضوءَهُ لِلصَّلَاةِ ثمَّ اغْتَسَلَ ثمَّ يُخَلِّلُ بِيَدِهِ شَعَرَهُ حَتَّى إِذا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشرَتَهُ أَفَاض عَلَيْهِ الْمَاءَ ثلَاث مَرَّاتٍ ثم غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد هەردوو دەستی خۆی تاممووچەکانی دەشۆرد، ئەوجا ڕێك وەك دەسنوێژی نوێژ دەسنوێژی دەگرت، ئەوجا دەستی دەکرد بەخۆشۆردن، دەستی دەخستە بن مووەکانی سەری، تابەزەینی وایدەزانی کەپێستی بن قژەکەی بەباشی تەڕبووە، ئەوجا سێ مست ئاوی دەکرد بەسەر سەریدا، لەپاشا باقی مەندەی جەستەی خۆی پاك دەشۆرد. (ت/١/١٥٣/ ٢ ز-٣٢ ژ-٢٧٨ ـ ش/د/ ت/ ن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابورد (ب/١ ف ـ ١٧٩= بڕوانە بەرگی یەکەم، فەرموودەی ژمارە/ ١٧٩).

١٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ وَعُدِّلَتْ الصُّفُوفُ قِيَامًا فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلَّاهُ ذكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ فَقَالَ لَنَا مَكَانَكُمْ ثم رَجَعَ فَاغْتَسَلَ ثمَّ خَرَجَ إِلَيْنَا وَرَأْسُهُ يَقْطرُ فَكَبَّرَ فَصَلَّيْنَا مَعَهُ). (الحديث ٢٧٥- طرفاه في: ٦٣٩، ٦٤٠).[165]

---

(١٦٥) أخرجه مسلم المساجد ومواضع الصلاة، باب: متى يقوم الناس للصلاة، رقم: ٦٠٥.=١٣٦٦ شيحا.

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەتی نوێژ کراو، ڕیزەکانی ڕێك خران‌و، هەرکەسەی بەپێوە لەڕیزی خۆیدا ڕێك راوەستا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهۆدەکەی خۆیەوە تەشریفی هاتەدەرەوەو لەنوێژگاکەی خۆیدا لەپێشمانەوە راوەستا، لەوکاتەدا یادی کەوتەوە کەلەشپیسە، جا فەرمووی پێمان: (لەجێگەی خۆتان بن تادێمەوە) ئەوجا رۆیشتەوە بۆ ماڵەوەو گورج خۆی شۆرد، کەهاتەوە بۆلامان سەری ئاوی لێ دەتکا، هی خۆشۆردنەکەی، ئینجا ئەڵلاهوئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو ئێمەیش لەگەڵیدا نوێژمان دابەست

١٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْض وَكَانَ مُوسَى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ فَقَالُوا وَاللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلَّا أَنَّهُ آدَرُ فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ يَقُولُ ثَوْبِي يَا حَجَرُ حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى فَقَالُوا وَاللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ وَأَخَذَ ثَوْبَهُ فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالْحَجَرِ سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ ضَرْبًا بِالْحَجَرِ). (الحديث ٢٧٨- طرفاه في: ٣٤٠٤، ٤٧٩٩) [١٦٦]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەوەی ئیسرائیل - کەناودارن بەبەنی ئیسرائیل - بەرووت‌و قووتی لەبەرچاوی یەکتری خۆیان دەشۆرد، بەڵام موسا (سەلامی خوای لێ بێ) پیاوێکی زۆر بەشەرم‌و شکۆ بوو هەمیشەخۆی باش دادەپۆشی، بەرەنگێکی وا پێستی لەشی هیچ نەدەبینرا، وەهەر بەتەنهایش خۆی دەشۆرد، جاهەندێ کەسیان بەم جۆرە قسە ناشرینانە ئازاری دڵی موسایان دەداو، دەیانگوت: ببێ‌و نەبێ بۆیە

---

(١٦٦) أخرجه مسلم في الحيض، باب: جواز الاغتسال عريانا في الخلوة، وفى الفضائل، باب: من فضائل موسى، رقم: ٣٣٩. = ٧٦٨.

مووسا بەم شێوەیە خۆی دادەپۆشیو بەجیا خۆی دەشواو لەگەڵ ئێمەدا خۆی ناشۆری، دیارە نەنگیێ بەلەشیەوە هەیە، سایابەڵەکە، یادەبەو قۆڕە، یادەردێکی تری هەر هەیە.

جا خودای گەورەو سەروەر ویستی ئەم قسەو باسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوە، پاکیو بێ نەنگی موسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەربخا، جابۆیە رۆژێ موسا (سەلامی خوای لێ بێ) بەتەنیا خۆی لەوان کلا کردو رۆیشت بۆ چۆڵێ لەوێ خۆی بشۆرێ، جا جلەکانی لەبەرخۆی داکەندو، لەسەر بەردێ دانیان، کاتێ کەخۆی تەواو شۆرد، چوو بۆلای جلەکانی تالەبەریان بکاتەوە، بەڵام بەفەرمانی خودای گەورە بەردەکە جلەکەی موسای فڕاند! مووسایش داردەستەکەی خۆی هەڵگرتو نیشتە سەر بەردەکەو ڕایکرد بەشوێنی داو بانگی کرد: بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکەیش رۆیشت، مووسایش شوێنی کەوت، هەتا گەیشت بەکۆمەڵێ لەنەوەی ئیسرائیلو، گشتیان تەماشای لەشی مووسایان کرد، بەڕووتو قووتیو بەچاوی خۆیان بینیان کەلەشو لاری لەوە جوانترو پاکتر نابیو زۆر دوورە لەو درۆیانەی کەئەوان دەیانلێن، جا ئەوجا بەردەکە رەق راوەستاو مووسایش جلەکەی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بەلێدانی بەردەکەو، بەگۆچانەکەی چەند کوتەکێکی باشی لێ دا!

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: سوێندم بەخودای گەورە مووسا وابەتوندی بەردەکەی داپلۆسی بوو، سێ یاچوار، یاپێنج، یا شەش، یاحەوت خاڵی لێ کردبوو، ئاوا قرنجاندبووی وەك جێگەبرین. ئەمە ئەو داستانەیە کەخودای گەورە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: (یا أیها الذین آمنوا لاتکونوا کالذین آذوا موسی فبرأه الله مما قالوا وکان عندالله وجیهاً) ٦٩/٣٣ ـ واتە: ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هەیە بەخوداو بە پێغەمبەری خودا! وەك ئەوانە مەبن کەئازاری دڵی موسایان دەدا، تاخودای گەورە پاکیو بێ نەنگی موسای

دەرخستو قسە ناهەقەکانی ئەوانی بەدرۆ خستەوە، لەڕاستی دا موسا لەلای خودای گەورە گەلێ خاوەن خاترو زۆر پایەبەرزو ڕێزدار بوو). (ت/٧/ ١٠١/ ١٩ = تاج-٤ ز-١٦ ژ-٤٠٥٤ - ش/ت).

## ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە دەست دەدا بۆ بەلگە، لەکاتی پێویستیو ناچاریدا ڕووت کردنی شەرمگای مرۆڤ دروستە، وەك شایەتیو مەبەستی پزیشکیو شتی تری وا وە هەروەها بەلگەیە لەسەر ئەوە دارو بەردیش هەستو پیتو فەڕو هۆشیان هەیە، وەشیاوی تەمێو ئامۆژگارین.

١٩٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (بَيْنَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا فَخَرَّ عَلَيْهِ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ فَجَعَلَ أَيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِهِ فَنَادَاهُ رَبُّهُ يَا أَيُّوبُ أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ بَلَى وَعِزَّتِكَ وَلَكِنْ لَا غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ). (الحديث ٢٧٩- طرفاه في: ٣٣٩١، ٧٤٩٣).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ ئەیووب بەڕووتی: (واتە: بەبێ پەشتەماڵ گرتنەوە بەبەرکۆشیا، بەلام بەتەنیا لەجێگەیەکی چۆلا) خۆی دەشۆرد، لەوکاتەدا کوللەی زێڕینی بەسەردا دباری، جا ئەییوب بەمشت زێڕەکەی دەکردە ناو جلەکانیەوە. خوداوەند گازی کرد: ئەی ئەییوب! ئەدی من بێ نیازم نەکردبووی لەشتی وا، ئیتر ئەم هەڵپەیەی بۆچی یە؟ فەرمووی: با، بەگەورەیی تۆ چۆن دەفەرمووی وایە، ئەوەندەت خێرو بێر پێ بەخشیوم کارم نییە بەم زێڕە بەلام لەگەڵ ئەوەشا هەرگیزاو هەرگیز لەپیتو فەڕی تۆ بێ نیاز نابمو ئەو زێڕەیش بەشێکە لەپیتو فەڕی تۆ، بۆیە کۆی دەکەمەوە!) (ت/ ٤/ ١/٣٨٩ تاج-٣ چ-٤ ز-١١٩ ژ-٣٢١٧).

١٩٤–عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهـا) قالـت: (ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ وَفَاطِمَةُ تَسْتُرُهُ فَقَالَ مَنْ هَذِهِ فَقُلْتُ أَنَا أُمُّ هَانِئٍ). (الحديث ٢٨٠– أطرافه في: ٣٥٧، ٣١١٧، ٦١٥٨)[١٦٧]

ئوموهانئ كچى ئەبوطاليب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازاد كردنی شاری مەككە، ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەچووم خۆی دەشۆرد فاطیمە پەردەی بۆ كردبوو، كەهەستی بەمن كرد فەرمووە (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو ژنە كێ یە؟) گوتم: منم ئوموهانیئم (ت/١/ ١/١٤٨ = ز-٣١ ژ-٢٦٧).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

ئوموهانی خوشكی ئیمامی عەلی یە (ڕەزای خوای لێ بێ) چڵو شەش فەرموودەی هەیە، دەڵێن: ئەم لەدوا ئیمامی عەلی مردووە، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ (ت/١/٤٨٥/٤ = ز-١٧٩ ژ-٩٥٦).

١٩٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَهُ فِي بَعْضِ طَرِيقِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ جُنُبٌ فَانْخَنَسْتُ مِنْهُ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ كُنْتُ جُنُبًا فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ وَأَنَا عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ فَقَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّ الْمُسْلِمَ لَا يَنْجُسُ). (الحديث ٢٨٣– طرفه في: ٢٨٥)[١٦٨]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشم پیس بوو، لەیەكێ لەڕێگەكانی مەدینە تووشی پێغەمبەر بووم (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرئەوە كەلەشم گران بوو خۆم لێ شاردەوەو، چووم خۆم شۆردو ئەوسا هاتمەوە بۆ خزمەتی،

---

(١٦٧) أخرجه مسلم في الحيض، باب: تستر المغتسل بثوب ونحوه، رقم: ٣٣٦.= ٧٦٢، ٧٦٣، ١٦٦٦.

(١٦٨) أخرجه مسلم في الحيض باب: الدليل على ان المسلم لاينجس، رقم: ٣٧١. = ٨٢٢.

فەرمووی: (ئەی ئەبوهورەیرە! ئەوە لەکوێ بووی؟ گوتم: راستیەکەی لەشم پیس بوو، لەبەرئەوە حەزم نەکرد بەلەشی ناپاکەوە لەخزمەتتا دابنیشم). فەرمووی: (سوبحانەڵلا! چەند سەیریت! موسوڵمان چۆن پیس دەبێت!) (ت/١/١٥٥/٧ = ز-٣٢ ژ-٢٨٣).

١٩٦-عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُما) (سَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ نَعَمْ إِذا تَوَضأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ وَهُوَ جُنُبٌ). (الحديث ٢٨٧- طرفاه في: ٢٨٩، ٢٩٠).[169]

ئیبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەططاب (رەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەری پرسی: کەسێ لەئێمە ئەگەر لەشی پیس بوو، پێش ئەوەی خۆی بشۆرێ، بۆی هەیە کەبخەوێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەڵێ، هەرکاتێ لەشتان پیس بوو بۆتان هەیە کەبەلەشی پیسەوە بخەون، بەڵام واباشە لەکاتی وادا دەسنوێژێ بگرن ئەوسا بخەون).

١٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ: (إِذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الْغَسْلُ). (الحديث ٢٩١).[170]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پیاو لەناو چوارپەلی ئافرەتا دانیشتو لەگەڵیا دروست بوو، بائاویشی نەیەتەوە، ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوولا پێویست دەبێ) (ت/١/ ١٤٤/ ١ - ز-٣٠ ژ-٢٥٨ = ش/د/ ن).

---

(١٦٩) اخرجه مسلم في الحيض، باب: جواز نوم الجنب واستحباب الوضوء له، رقم: ٣٠٦=٧٠٢.

(١٧٠) اخرجه مسلم في الحيض، باب: نسخ الماء من الماء، رقم: ٣٤٣=٧٨١.

بسم الله الرحمن الرحيم

## (٦) نامەی بێنوێژی (كتاب الحيض)

١٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) تَقُولُ: (خَرَجْنَا لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ حِضتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي قَالَ مَا لَكِ أَنُفِسْتِ؟ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ إِنَّ هَذا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطوفِي بِالْبَيْتِ قَالَتْ وَضحَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ). (الحديث ٢٩٤- أطرافه في: ٣٠٥، ٣١٦، ٣١٧، ٣١٩، ٣٢٨)[١٧١]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ حەج، وەبەتەمای عەمرە نەبووین، چوونكە گومانمان وابوو كەلەمانگەكانی حەجدا عەمرە ناكرێ، كەگەیشتینە سەریف لەوێ من بێ نوێژ كەوتمو دەستم كرد بەگریان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بەسەرما دەگریام، فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆچی دەگری؟) گوتم: بەخوا حەزم دەكرد كەئەمسالْ نەهاتمایە بۆ حەج، فەرمووی: (ڕەنگبێ بێنوێژ بیت؟) گوتم: بەڵێ. فەرمووی: (ئەمە شتێكە خودا نووسیوویەتی لەسەر كچانی ئادەمو سووچی تۆی تێدا نییە، جاهەرچی حاجی دەیكا تۆیش بیكە، بەلاّم تەواف بەیت مەكە، هەتا پاك دەبیتەوە).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاكەگەیشتینە مەككە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەهاوڕێیانی خۆی فەرموو: بیكەن بەعەمرە، ئیتر خەڵكەكە ئیحرامیان شكان، مەگەر ئەو كەسانە نەبێ كەئاژەڵی دیاریی بەیتیان پێ بوو. فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆی دیاری پێ بوو، وەئەبوبەكرو عومەریش دیارییان پێ بوو، هەروەها دەوڵەمەندەكانیش دیارییان پێ بوو، جا كەتاقی

(١٧١) أخرجه مسلم في الحج، باب: وجوه الاحرام، رقم: ١٢١١=٢٩٢٨.

ئێوارەی ڕۆژی تەروییە کەوتنەوە ڕێ، دیسانەوە ئیحرامی حەجیان دابەستەوە فەرمووی: ڕۆژی جەژن لەبێنوێژیی پاك بوومەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم تەوافی ئیفازەم کرد، فەرمووی: جاگۆشتی گایان بۆهێناین، گوتم: ئەم گۆشتە هی چی یە؟ گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گای کردووە بەقوربانی بۆ هاوسەرەکانی. (ت/١/١٩٨/٢ = ز-١٠٠ ژ-١٥٦٧ = ش/د/ ت/ ن).

١٩٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالت: (كُنْتُ أُرَجِّلُ تَعْنِي رَأْسَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ حَائِض وَرَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَئِذ مُجَاوِرٌ فِي الْمَسْجِدِ يُدْنِي لَهَا رَأْسَهُ وَهِيَ فِي حُجْرَتِهَا فَتُرَجِّلُهُ وَهِيَ حَائِض). (الحديث ٢٩٦ طرفه في ٢٩٥).[١٧٢]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاری وادەبوو بێنوێژ بووم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری خۆی دەنایە بەردەستم قژەکەیم شانە دەکرد. لەگێڕانەوەیەکدا: جاری وادەبوو من لەناو هۆدەکەی خۆما دەبووم، کەوا لەتەنیشت مزگەوتەکەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا لەدەرگای هۆدەکەی خۆمەوە، کەلەسەر ماڵی مزگەوت بوو سەری دەردەهێناو سەری لەمنەوە نزیك دەکردەوە، منیش بۆیم شانە دەکرد، لەوکاتەدا بێنوێژیش بووم) (ت/١/١٤٦/٢ = ز-٧٥ ژ-١٤٦٣).

٢٠٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالتْ: (كَانَ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِض ثُمَّ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ).[١٧٣]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری لەسەر کۆشم دادەنا، لەوکاتەدا من بێنوێژ بووم، وەلەسەر ئەو حاڵە قورئانی دەخوێند.

---

(١٧٢) أخرجه مسلم في (الباب: غسل الحائض رأس زوجها وترجله. الخ) المترجم.=٦٨٢-٦٨٦.

(١٧٣) أخرجه مسلم في الحيض، باب: الاضطجاع مع الحائض في لحاف واحد، رقم: ٣٠١.=٦٨٠، ٦٩١.

**ڕوونکردنەوە:**

ژنی بێنوێژ پاکە، ئاوو نانی دەستی حەڵاڵە، لێکەوتنی دروستە چونکە پاکە، نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کەخوێندنی قورئان لەکاتی ڕاکشان‌و پاڵکەوتنا دروستە، هەروا لەنزیکی جێگەی پیسایشەوە. شێخی عەینی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەمەی نەوەوی دەفەرموێ: کەلەنزیکی جێگەی پیساییەوە خوێندنی قورئان دروستە جێگەی سرنجە، چونکە بەم قسەیەبێ نابێ خوێندنی قورئان بەرابەر بەئاودەست ناباشی (کەراهەتی) ی هەبێ، بەڵام پێویستە کەکاری واناباش بێ، لەبەرخاتری ڕێزگرتنی قورئان، چونکە دەوروبەری شت حوکم‌و بڕیاری ئەو شتەی هەیە).

٢٠١–عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ المؤمِنِينْ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالتْ: (بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضطَجِعَةٌ فِي خَمِيصَةٍ إِذ حِضتُ فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذتُ ثِيَابَ حِيضَتِي قَالَ أَنُفِسْتِ؟ قُلْتُ نَعَمْ فَدَعَانِي فَاضطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ). [١٧٤]

ئوممومسەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەیەکێکە لەدایکانی موسوڵمانان، فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا لەژێر جاجمێکی بازوودا پاڵکەوتبووم، لەناکاو لەو دەمەدا کەوتمە بێ نوێژی یەوە، ئیتر خۆم لەژێر جاجمەکە دزی یەوەو، چووم خۆم گۆڕی‌و جلی بێنوێژییەکەمم لەبەرکرد. فەرمووی: (ئەوە تێکەوتیت؟) گوتم: بەڵێ. ئەوجا بانگی کردمەوە، چوومەوە لەگەڵیا لەژێر مەوجەکەدا ڕاکشامەوە.

٢٠٢– عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كنت أغتسل أنا ورسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من اناء واحد كلانا جنب، وكان يأمرني فأتزر، فيباشرني وأنا حائض وكان يخرج رأسه إلي وهو معتكف فأغسله وأنا حائض) وفي رواية عنها

(١٧٤)أخرجه مسلم في الحيض، باب: الاضطجاع مع الحائض في لحاف واحد، رقم: ٢٩٦.=٦٨١.

(رَضيَ اللهُ عَنْها) قالت:(كَانَتْ إِحْدَانَا إِذا كَانَتْ حَائِضا فَأَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُبَاشِرَهَا أَمَرَهَا أَنْ تَتَّزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا ثُمَّ يُبَاشِرُهَا قَالَتْ وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْلِكُ إِرْبَهُ). (الحديث ٣٠٢ طرفه في: ٣٠٢، ٢٠٣٠).[١٧٥]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو خۆم و پێغەمبەر پێکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، هەردووکمانیش لەشمان پیس بوو. هەندێ جاریش بێ نوێژ دەبووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردم، بەرکۆشم دەپۆشی، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی لەگەڵما تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرتم، زۆرجاریش لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، لەناو مزگەوتەکەوە سەری خۆی دەهێنایە ناو هۆدەکەی منەوە، کەبەتەنیشتی ماڵی مزگەوتەوە بوو، منیش سەریم دەشۆرد لەوکاتەیشدا بێنوێژ بووم.

لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە دەفەرموێ: ئەگەر یەکێ لەئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەرمەی بێنوێژیدا بوایە، ئەگەر پێغەمبەر بیویستایە لەوکاتەدا دەستی لەگەڵ دا تێکەڵ بکا، فەرمانی دەدا بەرکۆشێکی دەدا بەنێوانی ناوکیو ئەژنۆی دا، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی بۆ دەبردو لەگەڵێدا خۆی تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرت بەڵام بەبێ دروست بوون. عائیشە فەرمووی: بەڵام کێ لەئێوە دەتوانێ کە وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئارەزووی خۆی بۆ زەوت بکرێو سنوور نەبەزێنێ.

٢٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَضحَى أَوْ فِطرٍ إِلَى الْمُصَلَّى فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ فَقُلْنَ وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ قُلْنَ وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ

(١٧٥) اخرجه مسلم في الحيض، باب: مباشرة الحائض فوق الإزار، رقم: ٢٩٣.=٦٧٨.

نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ قُلْنَ بَلَى قَالَ فَذلِكِ مِنْ نُقصَانِ عَقْلِهَا أَلَيْسَ إِذا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ قُلْنَ بَلَى قَالَ فَذلِكِ مِنْ نُقصَانِ دِينِهَا). (الحديث ٢٠٤ أطرافه في: ٩٥٦، ١٤٦٢، ١٩٥١، ٢٦٥٨).[١٧٦]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جەژنی قوربان بوو، یارۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەرچووە دەرەوە ڕۆیشت بۆ نوێژگاکە بۆئەودەشتە لەدەرەوەی شار، سەری لەژنان داو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ژنان! خێرو خێرات زۆر بکەن‌و، زۆریش بپاڕێنەوەو داوای لێبووردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا خودا نیشانی دام کەئێوە زوربەی خەڵکی دۆزەخ بوون) ژنەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی ئێمە زۆربەی خەڵکی ناو دۆزەخین؟ فەرمووی: (چوونکە زۆر نەفرەت لەخەڵك دەکەن‌و، سپڵەیی لەگەڵ مێر دەکەن‌و چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کەوەك ئێوە ئاوا کەم هۆش‌و کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا ئاوا زاڵ بێ‌و، پیاو بەو هەموو زیرەکی‌و زرنگی یەیەوە تەفرەی دەداو هۆشی لەکەللەدا ناهێڵێ!) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کەم ئایینی‌و کەم هۆشییەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: (کەم هۆشی یەکەتان بریێتی یە لەوە کەشایەتی دووژن بەشایەتی تاقە پیاوێ حلێبە، ئەمە کەم هۆشییەکەتان، ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژیدا چەن شەوێ دەمێنێتەوە نەنوێژ دەکاو، نەرۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، ئەمەیش کەم ئایینی یەکەتان). (ت/ ١/٣٦/ ١+ل - ٤٥١ هەتا ٤٦٠ = ز-٣ ژ-١٨ + ز-١٥٨ هەتا ز-١٦٣).

٢٠٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْتَكَفَ مَعَهُ بَعْض نِسَائِهِ وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ تَرَى الدَّمَ فَرُبَّمَا وَضعَتْ الطسْتَ تَحْتَهَا مِنْ الدَّمِ). (الحديث ٣٠٩ أطرافه في: ٣١٠، ٣١١، ٢٠٣٧).

---

(١٧٦) أخرجه مسلم في الايمان، باب:بيان نقصان الإيمان بنقص الطاعات رقم: ٧٩، ٨٠=٢٣٨.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ژنێ لەژنەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ پێغەمبەردا، لەناو مزگەوت دا خەڵوەی دەکێشا، واتە: ئیعتیکافی دەکرد، بەڵام ئەو ژنە هەمیشە بێنوێژ (موستەحاضە) بوو، گەڵێ جار لەکاتی نوێژ کردندا تەشتێکی لەژێر خۆیدا دادەنا، نەبادا خوێنەکە مزگەوتەکە پیس بکا، (ت/١/١٧٠/١ = ز-٣٨ ژ-٣٠٨).

٢٠٥- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاث إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا وَلَا نَكْتَحِلَ وَلَا نَتَطَيَّبَ وَلَا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطهْرِ إِذا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظفَارٍ وَكُنَّا نُنْهَى عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ). (١٧٧)

ئوموعەطییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نەی ی کراوە لەئێمە کەدەستەی ژنانین کەلەسێ ڕۆژ پتر تازێ بۆ مردوو بگرین، مەگەر بۆ مێرد، کەدەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دە ڕۆژ تازێ بگرین، وەلەو ماوەیەدا نابێ چاو بڕێژین، یاخۆمان بۆن خۆش بکەین، یاجلو بەرگی ڕەنگین لەبەربکەین، مەگەر بەرگێ کەلەپێش دا هەوداکەی ڕەنگ کرابێو لەپاشا چنرابێ، یاتەنرابێ، کاتێکیش پاك بووینەوە لەبێنوێژیی کەویستمان خۆمان بشۆرین، ڕێگەی ئەوەمان دراوە کەبەقەد پێویست عوودو گوڵاوو بۆنی خۆش نەختێ بۆ وانێك، بۆ جێگە خوێنەکە بەکاربهێنین! (ت/٣/١٨٩/٥ = تاج-٢ ز-٧٩ ژ-٢٢٧٨ = ش/د/ن).

## ڕاڤەو ڕوون کردنەوە:

کوست، یاقوسط، جۆرە بوخورو بۆنێکی خۆشە، پارچە پارچەیە، هەندێ دەڵێن: ڕەنگی ڕەشباوە، لەچەشنی نینۆکی مرۆڤ وایە، هەندێ دەفەرموون: ظیفاری، یا ئەظفار کەنارێکە لەکەنارەکانی عەدەن، لەهیندەوە بۆنی خۆش

---

(١٧٧) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: نهى النساء عن اتباع الجنائز، رقم: ٩٣٨.=٣٧٢٠، ٣٧٢٢.

دەهێنن لەوێ ساخی دەکەنەوە، هەندێ تر دەفەرموون: شارێکە لەیەمەن. هەرچۆن بێ مەبەست لەفەرموودەکە دووشتە: سوننەتە بۆ ئافرەت بەبۆنی خۆش بێنی ناخۆشی بێنوێژیو زەیستانی لابەرێ، هەتا ئەگەر تازێباریش بێ لەکاتی خۆشۆردنا ئەو مافەی بۆهەیە.

ئوموعەطییە (رەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەژنانی هاوڕێیانی پێغەمبەر، هاوڕێیەکی ناوداری پێغەمبەر بووە، زۆر ئازاو دلێر بووە، ئەنصاری یە بووە، لەزۆر غەزادا لەگەڵ پێغەمبەردا بووە، دەستی پزیشکی هەبوو، نەخۆشیانی تیمار دەکرد، فەرموودەیەکی هەیە لەبابەت شۆردنی مردووەوە دادەنرێ بەبنەمای شۆردنی مردوو، نۆ فەرموودەی لەبەخاریدا هەیە رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ.

٢٠٦ – عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) (أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ غُسْلِهَا مِنْ الْمَحِيض فَأَمَرَهَا كَيْفَ تَغْتَسِلُ قَالَ خُذِي فِرْصَةً مِنْ مَسْكٍ فَتطَهَّرِي بِهَا قَالَتْ كَيْفَ أَتطهَّرُ؟ قَالَ تَطهَّرِي بِهَا قَالَتْ كَيْفَ؟ قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ تَطهَّرِي فَاجْتَبَذتُهَا إِلَيَّ فَقُلْتُ تَتَبَّعِي بِهَا أَثرَ الدَّمِ). (الحديث ٣١٤ طرفه في: ٣١٥، ٧٣٥٧).[١٧٨]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەسماء (رەزای خوای لێ بێ) بۆچۆنێتی خۆشۆردنی بێنوێژی لە پێغەمبەری پرسی، فەرمووی: (هەرکامێکتان کەویستی خۆی بشۆرێ، بالەپێشا ئاوو مۆردەکەی ئامادە بکاو خۆی پاك بکاتەوەو، تاراتێکی جوان بگرێ، ئنجا دەستنوێژێکی جوان بگرێ، ئنجا ئاوبکا بەسەر سەریاو دەستی تێ بخاو، زۆر باش هەڵیبگلۆڤێ تائاو دەگاتە بن مووەکانی سەری، ئەوجەلە ئاو بکا بەسەر سەر خۆیا سەراپا، ئنجا گوڵە لۆکەیەکی میسکاوی،

---

(١٧٨) أخرجه مسلم في الحيض، باب: استحبتب استعمال المغتسلة من الحيض فرصة رقم: ٣٣٢=٧٤٨، ٧٤٦.

یاگوڵێ خوری میسکاوی، یاپەڕۆیەکی بۆنخۆش بهێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ!).

ئەسمائیش باش تێ نەگەیشت گوتی: چۆن چۆن خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ؟ فەرمووی: (سوبحانەڵلا سەیرە بۆ تێ ناگەی؟!) خۆتی پێ پاك بکەرەوەو تاراتی پێ بگرەو تەواو. عائیشەیش ـ رەزای خوای لێ بێ ـ فەرمووی: منیش ئەسمام راکێشا بەلای خۆمەوە، کەکچی شەکەل بوو، وەپێم گوت: وەرە من تێت بگەیەنم: بیهێنە بەشوێنی خوێنەکەداو، داینێ لەناو شەرمتا، تاناو گیانت بۆساردی لێ نەییێو بۆنی خۆش بێ. لەگێڕانەوەیەکا: حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) سێ جار فەرمووی: پارچەیەکی میسکاوی بێنەو تاراتی پێ بگرە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەرم گرتیو رووی کرد بەولاوە، عائیشە دەیگوت: ژنگەلی یاریدەدەران (أنصار) ژنگەلی چاکن ئافەرین بۆخۆیان! شەرمو شکۆ رێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کەبۆخۆیان شارەزای ئایین ببن! (ت/١٦١/١/ ١ = ز-٣٥ ژ-٢٩٧ چ-٤ = ش/د/ ن)

٢٠٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (أَهْلَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَكُنْتُ مِمَّنْ تَمَتَّعَ وَلَمْ يَسُقْ الْهَدْيَ فَزَعَمَتْ أَنَّهَا حَاضتْ وَلَمْ تَطهُرْ حَتَّى دَخَلَتْ لَيْلَةُ عَرَفَةَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذِهِ لَيْلَةُ عَرَفَةَ وَإِنَّمَا كُنْتُ تَمَتَّعْتُ بِعُمْرَةٍ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي وَأَمْسِكِي عَنْ عُمْرَتِكِ فَفعَلْتُ فَلَمَّا قَضيْتُ الْحَجَّ أَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ فَأَعْمَرَنِي مِنْ التَّنْعِيمِ مَكَانَ عُمْرَتِي الَّتِي نَسَكْتُ). (الحديث ٣١٦ طرفه في: ٢٩٤)[١٧٩].

---

(١٧٩) أخرجه مسلم في الحج (صحيح مسلم بشرح النووى ج/٨ ص ١٣٤، ص ١٤١، باب: بيان وجوه الإحرام الخ) انظر عمدة القارى ج/٣ ص ٢١/٢٨٧- المترجم.=٢٩٢٨، ٢٩١٠، ٢٩١١، ٢٩٢٥، ٢٩٢٧، ٢٩٢٩.

عوروه فەرمووی: عائیشەی پوورم فەرمووی: لەحەجی مالاواییدا لەگەڵ پێغەمبەرا ئیحرامم دابەست، یەکێ بووم لەوانە کەلەسەر شێوەی تەمەتتوع حەجیان کرد، چونکە دیاری (هەدی) ی بەیتیان پێ نەبوو، جا لەسەریف بێنوێژ کەوتم، هەتا شەوی عەرەفە هات، هەرپاك نەبوومەوە، جاگوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شەو عەرەفەیە، منیش ئیحرامی عەمرەم دابەستووەو بێنوێژیشم، چار چییە؟ فەرمووی: (قژە سەرەکەت هەڵوەشێنەو شانەی بکەو، جارێ واز لەتەواو کردنی عەمرەکەت بهێنە!) منیش چۆنی فەرموو وام کرد، ئەوجا ئیحرامی حەجم دابەست، جاکەحەجم تەواو کرد، جا شەوی حەصبە (ناوی شوێنێکە لەنێوانی مەککەو مەدینەدا)، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خەڵکە هەموو حەج و عەمرەشیان کردووە، تەنیا من نەبێ، کەهەر حەجەم کردووە؟! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەئەورەحمانی برام، لەپاشکۆی وشترەکەی خۆیدا بردمی، تاچووینە تەنعیم، جالەوێ ئیحرامی عەمرەم بەست، لەجیاتی ئەو عەمرەیەی کەنێتم لێ هێناو هەڵم وەشانەوەو تەواوم نەکرد. (ت/٢/ ١/١٩٨ = ز-١٠٠ ژ-١٥٦٧ = ش/د/ ت/ ن).

٢٠٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (خَرَجْنَا مُوَافِينَ لِهِلَالِ ذي الْحِجَّةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهْلِلْ فَإِنِّي لَوْلَا أَنِّي أَهْدَيْتُ لَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ فَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِعُمْرَةٍ وَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِحَجٍّ وَكُنْتُ أَنَا مِمَّنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَأَدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ وَأَنَا حَائِض فَشَكَوْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ دَعِي عُمْرَتَكِ وَانْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي وَأَهِلِّي بِحَجٍّ فَفَعَلْتُ حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةُ الْحَصْبَةِ أَرْسَلَ مَعِي أَخِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ فَخَرَجْتُ إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ مَكَانَ عُمْرَتِي وَلَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ هَدْيٌ وَلَا صَوْمٌ وَلَا صَدَقَةٌ). (الحديث ٣١٧).

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چوار پێنج رۆژی مابوو بۆ مانگی نوێ ی قوربان، لەمەدینە بەرەو مەککە دەرچووین. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

فەرمووی: (هەرکەسێ حەزدەکا عەمرە دابەستێ باعەمرە دابەستێ، مـن خـۆم بۆیە عەمرە دانابەستم چونکە ئاژەڵی دیاری ی بەیتم هێناوە لەگەڵ خۆم) جاهەندێ کەس عەمرەیان دابەست، جاکاتێ ڕۆژی عەرەفە هات مـن بێنوێـژ بووم، لەخزمەت حەزرەتـدا (دروودی خودای لەسەر بێ) سکاڵای حاڵم کـرد، عـەرزیم کـرد: من لەسەر شێوەی تەمەتتوع (پشوو وەرگـرتن) ئیحرامم دابەستووە. بەڵام وا ڕۆژی عەرەفـە هات، مـن لەبەرئـەوەی کەبێنوێـژم هێـشتا عەمرەکـەمم تـەواو نەکردووە، چونکە تەواڤ بەیتم نـەکردووە، کەیەکێکە لەبنیاتـەکانی عـەمرە، کەمەرجە لەسەر پاکی بکرێ، دەی ئەگـەر چاوەڕێ ی پاك بوونـەوە بکـەم بـۆ تەواو کردنی عەمرەکەم، حەجی ئەمـساڵم دەفـەوتێ، چـونکە فریـای وەسـتانی کێوی عەرەفە ناکەوم، کەواتە چار چییە؟

حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: (واز لەتـەواو کردنـی عەمرەکـەت بهێنـەو، قژە سەرەکەت هەڵوەشێنەو شانەی بکەو، ئیحرامـی حـەج دابەستە باحـەجی ئەمـساڵت لـەکیس نەچـێ). جـا منـیش چـۆنی فـەرموو وام کـرد، تاشـەوی حەصـبە، گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خـۆمن عـەمرەم نـەکردووە؟ جـا عەبـدوڕەحمانی برامـی لەگـەڵ دا نـاردم، دەرچـووم بـۆ تـەنعیم، کـەنزیکترین هەرێمی خاکی حیللە لەخاکی حەرەمەوە، لەوێوە ئیحرامـی عـەمرەم دابەسـت لەجیاتی عەمرەکەی پێشووم.

هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبـەیری کـوڕی عـەوام فـەرمووی: لەهـەموو ئـەم گۆڕانکاریانـەدا عائیـشە نـەدیاری ی بەسـتی سـەربڕیوە، نـەڕۆژووی گـرت، نــەنانی هــەژاری دا (بڕوانــە فــەرموودەی ژمــارە (١٩٨) و (٢٠٧) بڕوانــە: (ت/١/١٧٤/٢ = ز-٩٠ ژ-١٥٢٧ + ز-٩٢ ژ-١٥٣٨ + ز-٩٦ ژ-١٥٥٠ + ل/١/١٧٧ + ل/١/١٧٩ + ل/١/١٨٧ + ل/٢/١/٢٠٣ + ل/١/٢٢٥). بۆئـەوەی بەباشی بزانـی ئیحـرام دابەسـتن بەچـەند جـۆر دەکـرێ، وە (تمتـع= پـشوو وەرگـرتن) چییەوچۆنە، وەعـەمرە

چۆن دەکرێ بفەرموو تەماشای فیقهی ئاسان بەرگی یەکەم لاپەڕە (٣٥٨، ٣٧٩، ٣٨٠، ٣٨٢، ٣٩٢ = ز-١٦٣ هەتا ز-١٦٧ بکە).

٢٠٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) (أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ أَتَجْزِي إِحْدَانَا صَلَاتَهَا إِذا طَهُرَتْ فَقَالَتْ أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ كُنَّا نَحِيض مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَا يَأْمُرُنَا بِهِ أَوْ قَالَتْ فَلَا نَفْعَلُهُ).[١٨٠]

موعاذە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەعائیشەم پرسی گوتم: بۆچی ژنی بێنوێژ ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێتەوە، کەچی نوێژە فەرزەکان ناگێڕێتەوە؟! فەرمووی: بۆتۆیش حەرووری یەیتو لەو خەواریجانەی کەدەڵێن: دەبێ ژن نوێژی کاتێ بێنوێژیش وەك ڕۆژوو بگێڕێتەوە؟ گوتم: خەیر، من لەوان نیم، بەڵام پرسیارەو دەیکەم، گوتی: جاران بەسەرینی ی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ)، کەدەکەوتینە بێنوێژییەوە، لەپاش پاکبوونەوەو خۆشۆردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان دەکرد کەڕۆژوو بگرینەوەو نوێژ نەگێڕینەوە (ت/١/١/١٦٣/٣ = ز-٣٥ ژ-٢٩٩ ش/د/ ت/ ن)

٢١٠-عنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: حِضتُ وَأَنا مَعَ النيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في الخميلة فَانْسَلَلْتُ فخرجت منها فَأَخَذتُ ثِيَابَ حِيضتِي فلبستها فقَالَ لي رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنُفِسْتِ؟ قُلْتُ نَعَمْ فَدَعَانِي فأدخلي مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ. (الحديث ٣٢٣ طرفه في ٢٩٨). وَعَنْهَا (رَضِي اللهُ عَنْها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ. (ز-٢٠١).

(بڕوانە فەرموودەی ژمارە - ٢٠١- لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئوممومسەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: جاری وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژوو بوو، لەهەمان کاتا منی ماچ دەکرد).

---

(١٨٠) أخرجه مسلم في الحيض، باب: وجوب قضاء الصوم على الحائض رقم: ٣٣٥.=٧٥٩، ٧٦١.

٢١١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالت: سمعت النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: (يَخْرُجْ الْعَوَاتِقُ وَذوَاتُ الْخُدُورِ أَوْ قَالَ الْعَوَاتِقُ وَذوَاتُ الْخُدُورِ وَالْحُيَّض وَلْيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّض الْمُصَلَّى قيلَ لَهَا: الْحُيَّض؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ أَلَيْسَ تَشْهَدُ عَرَفَة وَكَذا وَكَذا). (١٨١)

ئوموعەطییە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردین: کەگەورە کچو ئافرەتی بێنوێژو کەیبانۆی ناوماڵ لەگەڵ خۆمان ببەین بۆئەو دەشتە، بۆ نوێژی جەژن، بەڵام ئافرەتە بێنوێژەکان نوێژەکە ناکەن، تەنیا حازری کۆڕی پڕ فەڕو نزای کۆمەڵی موسوڵمانان دەبن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر واڕێکەوت یەکێکمان چار شێوی نەبوو ئایا بەبێ چارشێویش هەربێ بۆ نوێژگاکە بۆ دەرەوەی شار؟ فەرمووی: (بالەخوشکێکی موسوڵمانی چارشێوێ بخوازێ).

حەفصە دەفەرموێ: گوتم: چۆن؟ ژنی بێنوێژیش ئامادەی ئەو کۆڕە پیرۆزە ببێ؟ فەرمووی: بەڵێ، هەروەك چۆن لەکاتی حەج کردنا ئامادەی ڕاوەستانی کێوی عەرەفە دەبێ هەروا لەموزدەلیفە، هەروا حازری نزا کردنی نوێژە بارانەیش دەبێ. (ب/ ١/ ٤٥٣/ ٦ ز-١٥٩ ژ-٩٠٣ ج-٤ = ش/ت/ ن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

(ژنی بێنوێژ دروستە یادی خودا بکا، لەسەر ذیکری خودا پاداش وەردەگرێ، مافی هەیە ئامادەی کۆڕی دەورو دەرسو زانستو هەموو جۆرە

---

(١٨١) أخرجه مسلم في العيدين، باب: ذكر إباحة خروج النساء في العيدين، رقم: ٨٩٠. = ٢٠٥١ – ٢٠٥٣.

خێرێکی تر ببێ، بەمەرجێ کۆڕەکە لەناو مزگەوتا نەبێ. هەروا بۆی هەیە گوێ لە خوێندنی قورئانو گوتنو دەور کردنەوەی حەدیث بگرێ).

٢١٢- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنَّا لَا نَعُدُّ الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ شَيْئًا). (الحديث ٣٢٦).

دیسان ئومموعەطییە (ڕەزای خوای لێ بێ): دەستوورمان وابوو لەپاش پاکەوە بوون لەبێنوێژی، ئیتر لێلاوو زەرداومان بەهیچ دانەدەنا. (ب/١/١٦٠/ ٣ = ز-٣٣ ژ-٢٩٢ = د/ ب/ ن).

٢١٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ قَدْ حَاضَتْ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا أَلَمْ تَكُنْ طافَتْ مَعَكُنَّ؟ فَقَالُوا بَلَى قَالَ فَاخْرُجِي). (الحديث ٣٢٨).(١٨٢)

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەسەر هاوسەرەکانی بێ) دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حوییەی کەوتۆتە بێنوێژییەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گلمان نەداتەوە باشە، پەکی گەڕانەوەمان نەخا باشە، خۆئەو ڕۆژی جەژن لەگەڵ ئێوەدا تەوافی کرد؟) گوتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: (کەواتە: دەرچۆ ئەی صەفییە!) (ت/ ٢/ ٢٢٧/ ٦ = ز-١١٥ ژ-١٦٢٤ = ش/ د/ ت/ ن).

لەتاجا ئەم فەرموودەیە ئاوایە: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوی نەفر - واتە: شەوی گەڕانەوەی حاجی بۆ وڵاتی خۆی - صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وادەزانم گلتان دەدەمەوە، چونکە کەوتوومەتە بێنوێژییەوە، هێشتا تەوافی ماڵئاوایی (تەوافی ویداع) یشم

(١٨٢) أخرجه مسلم في الحج، باب: بيان وجوه الإحرام، رقم: ١٢١١.=٣٢١٥.

نەکردووە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەش بەبارو دەم بەئازار بێ، بۆخێر بەدەمیا نایێ! ئەی رۆژی جەژن تەوافی نەکردووە؟ گوترا: با، کردوویەتی. فەرمووی: (دەبا بکەوێتە رێو لەگەڵمان بگەرێتەوە بۆ مەدینە، مادام تەوافی فەرزی بەجێ هێناوە، کەناودارە بە (طواف الإفاضة) یابە (طواف الزيارة) کەبنیات (روکن) ی حەجە، تەوافی ماڵئاوایی بۆ ئەو و بۆ وێنەی ئەو مەرج نییە، نەشی کەن قەیناکات)

٢١٤- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ امْرَأَةً مَاتَتْ فِي بَطْنٍ فَصَلَّى عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ وَسَطَهَا). (الحديث ٣٣٢ طرفاه في: ١٣٣١، ١٣٣٢).[١٨٣]

سەموورەی کوری جەندووب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنێ بەسەر منالەوە مرد، واتە: بەهۆی زەیستانییەوە مرد، لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی مردووم لەسەر تەرمەکەی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو نوێژەکەدا لەناوەراستی تەرمەکەدا وەستابوو. (ت/ ١/ ٥٥٨/ ٣/٢ = ز-٢١٠ ژ-١٠٩٧، ١٠٩٩/-ت/د/ ئەحمەد).

## راڤەو شیکردنەوە:

سەموورەی کوری جەندوب سەدو بیستو سێ فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، لەپەنجاو نۆی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

٢١٥- عنْ مَيْمُونَةَ (رَضي اللهُ عَنْهَا) زَوْجَة النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّهَا كَانَتْ تَكُونُ حَائِضا لَا تُصَلِّي وَهِيَ مُفْتَرِشَةٌ بِحِذَاءِ مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى خُمْرَتِهِ إِذا سَجَدَ أَصَابَنِي بَعْض ثوْبِهِ).[١٨٤]

---

(١٨٣) أخرجه مسلم في الجنائز (عينى/٣/ ٣١٥/ ٣٦) المترجم.=٢٢٣٢، ٢٢٣٣.

مەیموونـەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـوا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرەکانی) فەرمووی: گەلێ جار ڕێ دەکـەوت مـن بێنوێـژ دەبـووم، لـەماوەی بێنوێژییەکـەما نوێـژم نـەدەکرد، وادەبـوو پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەر بەرماڵۆچـکەکەی کەلەپووشـی خورمـا دروسـت کرابـوو نوێـژی دەکـرد، منیش لەسەر ئەوحاڵە لەئاستی کوڕنووشگاکەی رادەکشام، کە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کڕنووشی دەبرد جلەکانی بـەر مـن دەکـەوت، کەواتـە: زاتـی بێنوێـژ پاکـە، لێکەوتنی زیانی نییەو نوێژ بەشتی وا پووچ نابێتەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٧) نامەی تەیەمموم (كتاب التيمم)

٢١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَـتْ: (خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي فَأَقَـامَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ عَلَـى الْتِمَاسِهِ وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَقَالُوا أَلَا تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَالنَّـاسِ وَلَيْـسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَاضِـعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ فَقَالَ حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَالنَّـاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ مَـا شَـاءَ اللَّـهُ أَنْ يَقُولَ وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي فَلَا يَمْنَعُنِي مِنْ التَّحَرُّكِ إِلَّـا مَكَـانُ رَسُـولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَخِذِي فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ حِـينَ أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَتَيَمَّمُوا فَقَالَ أُسَيْدُ بْـنُ الْحُـضَيْرِ مَـا هِـيَ

---

(١٨٤) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الاعتراض بين يدى المصلي وفى المساجد ومواضع الصلاة، باب: جواز الجماعة في النافلة والصلاة على حصير وخمرة رقم: ٥١٣=١١٤٦.

بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذي كُنْتُ عَلَيْهِ فَأَصَبْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ). (الحديث ٣٣٤ أطرافه في: ٣٣٦، ٣٦٧٢، ٣٧٧٣، ٤٥٨٣، ٤٦٠٧، ٤٦٠٨، ٥١٦٤، ٥٢٥٠، ٥٨٨٢، ٦٨٤٤، ٦٨٤٥).[185]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوڕێو هاوسەرانی بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەرێکا کەوتینەڕێ، ڕۆیشتین تاگەیشتینە بەیداو، یاگەیشتینە (ذات الجیش) لەوێ گەردانەیەکی من پچڕایەوەو گوم بوو، ئیتر پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ مایەوە بەهیوای دۆزینەوەی ئەو گەردانەیە، خەڵکەکەیش لەخزمەتیدا مانەوە، ئەمە لەکاتێکا بوو کەنە شوێنەکە ئاوی لێ بوو وەنەخەڵکەکە ئاویان پێ بوو، جاخەڵکەکە چوون بۆلای ئەبوبەکری باوکمو گلەیی دەکەنو دەڵێن: نابینی عائیشەی کچت چی کرد؟ پێغەمبەرو ئەم عەشاماتەی لەم بیابانە چۆڵو بێ ئاوەدا بۆ گەردانەیێ گل داوەتەوەو، ئاویشمان پێ نیە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوتبوو سەری لەسەر ڕانم دانابوو، لەوکاتەدا ئەبوبەکر بەتوڕەیی هات، فەرمووی: پێغەمبەرو ئەم عەشاماتەت لەم شوێنە چۆڵو بێ ئاوەدا، بەبێ ئاو، گل داوەتەوە، ماتڵت کردوون بە خوتو خۆڕایی، ئەمە ئیش بوو تۆ کردت؟ ئیتر چەندە خودا حەزکا ئەبوبەکر گلەیی لێ کردمو بۆ تەمێ کردن قسەی پێ گوتم، خۆش خۆشیش بەسەرە سیخورمە دەیکوتایە کەلەکەم، منیش (هەرچەند ئێشم پێ گەیشتبوو، بەڵام لەبەرئەوەی کەسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ڕانم بوو) جووڵەم پێ نەدەکرا! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو شەوە خەوت تابەیانی، کاتێ کەبەیانی کەهەستا ئاونەبوو بۆ دەسنوێژ، جا خودا ئایەتی تەیەممومی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: (... فلم تجدوا ماءً فتيمموا صعيداً

---

(١٨٥) أخرجه مسلم في الحيض، باب: التيمم، رقم: ٣٦٧=٨١٤.

طيباً فامسحوا بوجوهكم وأيديكم منه) واته: ئەگەر لەهەموو ئەم شێوەکارانەدا ئاو نەبوو، ئەوا قەستی هەڵگرتنی گڵێکی پاك بکەن‌و لەتۆزی ئەو گڵەپاکە دەست بهێنن بەڕوخسارو بەهەردوو دەستاندا، لەجیاتی دەسنوێژ، یالەجیاتی خۆشۆردنی لەشپیسی).

ئیتر تەیەممومیان کرد. جا بەم بۆنەیەوە ئوسەیدی کوڕی حوضەیر فەرمووی: ئەی خانەوادەی ئەبوبەکر! بەڕاستی ئێوە بۆئەم نەتەوەی ئیسلامە بوون بەپیت‌و فەڕو خێرو بەرەکەت، ئەم داهاتنی تەیەمومە بەهۆی ئێوەوە بوو، چونکە گوومبوونی گەردانەکەی عائیشە بوو بەهۆی، ئەمەیش یەکەم پیت‌و بەرەکەتی ئێوە نییە، پیت‌و فەڕی ئێوە لەم بابەتەوە زۆرە، ئوسەید (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێك بوو لەدەمڕاست (نەقیب)ەکانی شەوی پەیمانی عەقەبە، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەو شەوەدا کردبوونی بەدەمڕاست‌و سەرگەورەی هۆزەکانی خۆیان. عائیشە فەرمووی: سەیر لەوەدا بوو ئەو وشترەی کەمن لەو سەفەرەدا سواری دەبووم، پاڵکەوتبوو، کاتێ هەڵمان ساند گەردانەکە لەژێریدا بوو، ئیتر دۆزیمانەوە. (ت/ ١/ ١٧١/ ١ = ز-٣٩ ژ-٣١١).

٢١٧-عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْض مَسْجِدًا وَطهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَث إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً). (الحديث ٣٣٥ طرفاه في: ٤٣٨، ٣١٢٢).[١٨٦]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێنج بەهرەی گەورەم لەلایەنی پەروەردگارەوە پێ خەڵات کراوە،

(١٨٦) أخرجه مسلم في اول كتاب المساجد ومواضع الصلاة، رقم: ٥٢١=١١٦٣، ١١٦٤.

ئەم پێنج بەهرەیە بەسەر یەکەوە بەهیچ پێغەمبەرێکی تر لەپێش منەوە بەکەس نەدراوە:

یەکەم: تاماوەی مانگەڕێ یەك، دوژمن لەسامو شکۆی خۆمو لەشکرم زەندەقیان دەچێو، هەر بەبیستنی ناوو شۆرەتی ئازایی سوپای ئیسلام لەسایەی خوداوە، ورە بەردەدەنو خۆگرییان دەڕوخێ، ئەمەیش بووە بەهۆی سەرکەوتن بۆ ئێمە،

دووەم: رووی زەویش هەمووی بۆ خۆمو نەتەوەی ئیسلام کراوە بەمزگەوتو، لەهەرشوێنێ مزگەوتی لێ نەبوو، لەسەر رووی زەوی نوێژی خۆمانی لێ دەکەینو، مەرج نییە کەئێمە وەك نەتەوەکانی تر هەر لەناو کلێسەو پەرستگاکاندا نوێژ بکەینو بەس! لەهەمان کاتدا خۆڵەکەشی پاكو پاکەوەکەرە، لەکاتی پێویستدا خۆمانی پێ پاك دەکەینەوەوتەیەمومی پێ دەکەین، کەواتە: هەر موسوڵمانێ، لەهەرکوێ یەك بوو، خوای مزگەوتی لێ بوو یانا، وەخوای ئاو هەبوو بۆ دەستنوێژو شتی وا یانا، بابەکەماڵی حەواوەیی نوێژی خۆی لێ بکا.

سێیەم: ماڵی تالانی بێبڕواکانیش حەلاڵ کراوە بۆ منو بۆ نەتەوەی ئیسلامم، لەپێش مندا بۆ کەسی تر خواردنی ماڵی تالانی کافران حەلاڵ نەبووە،

چوارەم: لەرۆژی قیامەتدا لەخزمەت خودای پەروەردگاردا تکاو شەفاعەت بۆ هەرکەسێ بکەم خودا تکاکەم قەبووڵ دەکا،

پێنجەم: جاران لەپێش مندا زوربەی پێغەمبەرەکان کەدەکران بە پێغەمبەر، بەتایبەتی رەوانە دەکران بۆسەر هۆزەکەی خۆیانو بەس، بەلام من لەسایەی خوداوە، خودا کردوومی بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووم بۆسەر هەمووکەسێ بەگشتی واتە: بۆ سەر بەرەی مرۆڤ). (ت/ ٤/٣٤٣/١ = ز-٥ ژ-٣٦ + ز-١١٤ ژ-٦٧٨).

٢١٨- عَنْ أَبِي جُهَيْمِ بْنِ الْحَارِث بْنِ الصِّمَّةِ الْأَنْصَارِيِّ (رَضي اللهُ عَنْـهُ) فَقَـالَ: (أَقْبَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَـرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثـمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَام). (الحديث ٣٣٧).[١٨٧]

ئەبو جوهەیمی کوڕی صیممەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەلای بیری جەمەلەوە دەهات، پیاوێ پێی گەیشتو سلاوی لێ کرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوەکەی نەسەندەوە، هەتا رووی کردە دیوارەکەو رووی خۆیو هەردوو دەستی مەسح کرد، لەگەردی سەربەردی دیوارەکە، ئەوجا کەتەیەموومەکەی تەواو کرد وەلامی پیاوەکەی دایەوە (ت/١/ ١٧٧/ ٢/٣ = ز-٤١ ژ-٣١٨).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەبوجوهەیم خۆیو باوکی لەهاوڕێ یانی پێغەمبەر بوون، باوکی یەکێ بووە لەهاوڕێ مەزنەکانی پێغەمبەر، لەغەزای ئوحوددا پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەکرد، پەیمانی پێ ی دا لەسەر مردن، لەڕووداوەکەی بیری مەعوونەدا، لەگەڵ حەفتا قورئان خوێنەکاندا شەهید کرا، ئەبوجوهەیم دوو فەرموودەی لەبوخاری شەریف دا هەیە، ناوی عەبدوڵڵایە، خزرەجی یە، ئەنصاری یە.

٢١٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أُصِبْ الْمَـاءَ فَقَـالَ عَمَّـارُ بْـنُ يَاسِـرٍ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطابِ أَمَا تَذكُرُ أَنَّا كُنَّا فِي سَفَرٍ أَنَا وَأَنْتَ فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُـصَلِّ وَأَمَّـا أَنَـا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ فَذكَرْتُ ذلك لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذا فَـضَرَبَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بِكَفَّيْـهِ

---

(١٨٧) أخرجه مسلم في الحيض، باب: التيمم، رقم: ٣٦٩.=٨٢٠.

الْأَرْض وَنَفَخَ فِيهِمَا ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ). (الحديث ٣٣٨ أطرافه في: ٣٣٩، ٣٤٠، ٣٤١، ٣٤٦، ٣٤٣، ٣٤٥، ٣٤٦، ٣٤٧)[188]

ئەوڕەحمانی كوڕی ئەبزا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەت عومەری كوڕی خەططاب (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزی كرد: لەشم پیسەو ئاوم دەست ناكەوێ چارم چییە؟ عەمماری كوڕی یاسریش لەوێ بوو، بەعومەری كوڕی خەطابی فەرموو: ئایا لەبیرتە كەجارەكە منو تۆ ڕەوتەنی بووین، لەو سەفەرەدا لەشمان پیس بوو، كاتێ نوێژمان لێ بوو تۆ نوێژت نەكرد، بەڵام من خۆم لەخۆڵا گەوزانو ئەوجا نوێژم كرد، ئەوەبوو كەئەمەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس كرد فەرمووی: (تەنها ئاوەهات بەس بوو) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو لەپی خۆی ماڵی بەسەر رووی زەوییەكەداو، فووی لێ كردن تاتۆزەكەیان تۆزێ سووك بێ، ئەوسا بەهەردوو ناولەپی مەسحی دەموچاوی‌و هەردوو دەستی خۆی ی كردا . (ت/ ١/ ١٧٧/ ١= ز-٤١ ژ-٣١٧ = تاجول ئوصول بەرگی یەكەم، لاپەڕە (١٧٧) فەرموودەی ژمارەیەكی ئەولاپەڕەیە لەوەرگەڕاوە كوردی یەكەی لەچاپی یەكەم = ز-٤١ ژ-٣١٧ چاپی چوارەم).

عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبزای خوزاعی خۆی‌و باوكی صەحابی بوون (ڕەزای خوایان لێ بێ). ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپەسنی جوانی عەبدوڕەحمانا دەیفەرموو: (عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبزا یەكێكە لەو بەهرەوەرانە كەخودا بەهۆی زانینی قورئانەوە پایەبەرزی كردوون) خۆی زۆرتر فەرموودەی لەئیمامی عومەرو ئوبەییەی كوڕی كەعبەوە دەگێڕایەوە، سەعیدو عەبدوڵلا، كەكوڕی خۆی بوون لەگەڵ موحەممەدی كوڕی ئەبولەجالیدا، فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، عەبدوڕەحمان دەیفەرموو: (نوێژم بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەرەوە كردووە).

---

(١٨٨) اخرجه مسلم في الحيض، باب: التيمم، رقم: ٣٦٨=٨١٨.

٢٢٠- عَنْ عِمْرَانَ بْن حصين الخزاعي (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِنَّا أَسْرَيْنَا حَتَّى كُنَّا فِي آخِرِ اللَّيْلِ وَقَعْنَا وَقْعَةً وَلَا وَقْعَةَ أَحْلَى عِنْدَ الْمُسَافِرِ مِنْهَا فَمَا أَيْقَظَنَا إِلَّا حَرُّ الشَّمْسِ وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ اسْتَيْقَظ فُلَانٌ ثُمَّ فُلَانٌ ثمَّ فُلَانٌ ثمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ الرَّابِعُ وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا نَامَ لَمْ يُوقَظ حَتَّى يَكُونَ هُوَ يَسْتَيْقِظ لِأَنَّا لَا نَدْرِي مَا يَحْدُث لَهُ فِي نَوْمِهِ فَلَمَّا اسْتَيْقَظ عُمَرُ وَرَأَى مَا أَصَابَ النَّاسَ وَكَانَ رَجُلًا جَلِيدًا فَكَبَّرَ وَرَفَعَ صَوْتَهُ بِالتَّكْبِيرِ فَمَا زَالَ يُكَبِّرُ وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالتَّكْبِيرِ حَتَّى اسْتَيْقَظ بِصَوْتِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا اسْتَيْقَظ شَكَوْا إِلَيْهِ الَّذي أَصَابَهُمْ قَالَ لَا ضَيْرَ أَوْ لَا يَضِيرُ ارْتَحِلُوا فَارْتَحَلَ فَسَارَ غَيْرَ بَعِيدٍ ثمَّ نَزَلَ فَدَعَا بِالْوَضوءِ فَتَوَضأَ وَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى بِالنَّاس فَلَمَّا انْفَتَلَ مِنْ صَلَاتِهِ إِذا هُوَ بِرَجُلٍ مُعْتَزِلٍ لَمْ يُصَلِّ مَعَ الْقَوْمِ؟ قَالَ مَا مَنَعَكَ يَا فُلَانُ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ الْقَوْمِ قَالَ أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلَا مَاءَ قَالَ عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ ثمَّ سَارَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاشْتَكَى إِلَيْهِ النَّاسُ مِنْ الْعَطشِ فَنَزَلَ فَدَعَا وَدَعَا عَلِيًّا (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: اذهَبَا فَابْتَغِيَا الْمَاءَ فَانْطَلَقَا فَتَلَقَّيَا امْرَأَةً بَيْنَ مَزَادَتَيْنِ أَوْ سَطِيحَتَيْنِ مِنْ مَاءٍ عَلَى بَعِيرٍ لَهَا فَقَالَا لَهَا أَيْنَ الْمَاءُ قَالَتْ عَهْدِي بِالْمَاءِ أَمْسِ هَذِهِ السَّاعَةَ وَنَفَرُنَا خُلُوفًا قَالَا لَهَا انْطَلِقِي إِذا قَالَتْ إِلَى أَيْنَ قَالَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ الَّذي يُقَالُ لَهُ الصَّابِئُ قَالَا هُوَ الَّذي تَعْنِينَ فَانْطَلِقِي فَجَاءَا بِهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَدَّثَاهُ الْحَدِيث قَالَ فَاسْتَنْزَلُوهَا عَنْ بَعِيرِهَا وَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِنَاءٍ فَفَرَّغَ فِيهِ مِنْ أَفْوَاهِ الْمَزَادَتَيْنِ أَوْ سَطِيحَتَيْنِ وَأَوْكَأَ أَفْوَاهَهُمَا وَأَطْلَقَ الْعَزَالِيَ وَنُودِيَ فِي النَّاسِ اسْقُوا وَاسْتَقُوا فَسَقَى مَنْ شَاءَ وَاسْتَقَى مَنْ شَاءَ وَكَانَ آخِرُ ذاكَ أَنْ أَعْطى الَّذي أَصَابَتْهُ الْجَنَابَةُ إِنَاءً مِنْ مَاءٍ قَالَ اذهَبْ فَأَفْرِغْهُ عَلَيْكَ وَهِيَ قَائِمَةٌ تَنْظرُ إِلَى مَا يُفْعَلُ بِمَائِهَا وَايْمُ اللَّهِ لَقَدْ أُقْلِعَ عَنْهَا وَإِنَّهُ لَيُخَيَّلُ إِلَيْنَا أَنَّهَا أَشَدُّ مِلْأَةً مِنْهَا حِينَ ابْتَدَأَ فِيهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اجْمَعُوا لَهَا فَجَمَعُوا لَهَا مِنْ بَيْنِ عَجْوَةٍ وَدَقِيقَةٍ وَسَوِيقَةٍ حَتَّى جَمَعُوا لَهَا طعَامًا فَجَعَلُوهَا فِي ثَوْبٍ وَحَمَلُوهَا عَلَى بَعِيرِهَا وَوَضعُوا الثوْبَ بَيْنَ يَدَيْهَا قَالَ لَهَا تَعْلَمِينَ مَا رَزِئْنَا مِنْ مَائِكِ شَيْئًا وَلَكِنَّ

اللَّهَ هُوَ الَّذي أَسْقَانَا فَأَتَتْ أَهْلَهَا وَقَدْ احْتَبَسَتْ عَنْهُمْ قَالُوا مَا حَبَسَكِ يَا فُلَانَةُ قَالَتْ الْعَجَبُ لَقِيَنِي رَجُلَانِ فَذهَبَا بِي إِلَى هَذَا الَّذي يُقَالُ لَهُ الصَّابِئُ فَفَعَلَ كَذا وَكَذا فَوَاللَّهِ إِنَّهُ لَأَسْحَرُ النَّاسِ مِنْ بَيْنِ هَذِهِ وَهَذِهِ وَقَالَتْ بِإِصْبَعَيْهَا الْوُسْطى وَالسَّبَّابَةِ فَرَفَعَتْهُمَا إِلَى السَّمَاءِ تَعْنِي السَّمَاءَ وَالْأَرْض أَوْ إِنَّهُ لَرَسُولُ اللَّهِ حَقًّا فَكَانَ الْمُسْلِمُونَ بَعْدَ ذلِكَ يُغِيرُونَ عَلَى مَنْ حَوْلَهَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ وَلَا يُصِيبُونَ الصِّرْمَ الَّذي هِيَ مِنْهُ فَقَالَتْ يَوْمًا لِقَوْمِهَا مَا أُرَى أَنَّ هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ يَدْعُونَكُمْ عَمْدًا فَهَلْ لَكُمْ فِي الْإِسْلَامِ فَأَطَاعُوهَا فَدَخَلُوا فِي الْإِسْلَامِ). (الحديث ٣٤٤ طرفه في ٣٤٨، ٣٥٧١).(١٨٩)

**عیمرانی کوڕی حوصینی ئەل —خوزاعی- (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، شەوێ تادەمەوبەیان هەر بەڕێوە بووین، لەدەمەوبەیانا کەلەخەو خۆشتر نیە بۆ کاروانی شەونخوونی کەر، ویستمان سەرخەوێ بشکێنین، بەڵام کەخەومان لێ کەوت خەبەرمان نەبۆوە تاتینی خۆرەکە خەبەری کردینەوە، یەکەم کەس خەبەری بۆوە ئەبوبەکری صەدیق بوو، دوەم فیسار بوو، سێیەم ئەو فیسار بوو، چوارەم کەس عومەری کوڕی خەطاب بوو. پێغەمبەریش (درووی خودای لەسەر بێ) کەتەشریفی دەخەوت خەبەرمان نەدەکردەوە، تاخۆی خەبەری دەبۆوە، چونکە مەترسی ئەوەمان هەبوو کەلەو دەمەدا سرووشی بۆبێ، جائەگەر خەبەری بکەینەوە سرووشەکە بڕێ.**

**کاتێ عومەر خەبەری بۆوەو حاڵەکەی بینی لەبەجەرگی خۆی بەدەنگی بەرز دەستی کرد بەئەڵلاهو ئەکبەر کردن، ئیتر لەسەر ئەڵلاهوئەکبەر کردنو دەنگ بەرزەوە کردن بەردەوام بوو، هەتا بەدەنگی ئەو پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) خەبەری بۆوە، ئەوجا خەڵکەکە حاڵەکەیان عەرز کردو سکاڵای ئەوەیان لەخزمەتیدا کرد کە نوێژی بەیانییان چووەو ئاویش نییەو، بەم بۆنەیەوە**

---

(١٨٩) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: قضاء الصلاة ، باب: قضاء الصلاة الفائتة، رقم: ٦٨٢.=١٥٦١ تخريج شيحا.

زۆر پەرۆشن، حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) بۆدڵدانەوەیان فەرمووی: (قەیدی نییە) یا فەرمووی: (قەیناکا، ئادەی زووکەن بارکەن) ئیتر باریان کردو کەمێ دوور کەوتنەوە لەو شوێنە خراپە، ئەوجا حەزرەت دابەزیو داوای ئاوی دەسنوێژی کردو، دەسنوێژی گرتو، فەرمانی فەرموو بانگ دراو، دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش بەیانی کردو، ئنجا فەرمانی فەرموو قامەت کراو، بەرنوێژی ی نوێژی بەیانی بۆ هاورێیانی کرد، کە حەزرەت نوێژەکەی تەواو کرد روانی واپیاوێ لەکۆمەڵ کلابووەو نوێژ ناکا لەگەڵ ئەوان، فەرمووی: (ئەی فیسارەکەس! ئەوە بۆ لەگەڵ گەل نوێژەکەت نەکرد؟) گوتی: قوربان! لەشپیسیم تووش بووەو خۆ شۆردنم لەسەرەو ئاویش نییە.

حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (بەگڵ تەیەمموم بکە، لەکاتی وادا تەیەمومت بەسە) ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوتەڕێو مەردومەکەش لەتاو توونێتی سکالایان بردەبەر، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دابەزی عەلیو منی بانگ کردو، فەرمووی: (بڕۆن بۆ ئاو بگەڕێن). جا هەردوکمان رۆیشتین، تاگەیشتین بەژنێ، بەسواری وشترێ بوو، لەناو کۆڵی دوو کوندەی گاوەسا سوار بوو بوو، هەردوو قاچەکانی شۆڕ کردبۆوە، پێمان گوت: لەکوێ ئاو هەیە، ئەم ئاومت لەکوێ هێناوە؟ گوتی: ئاو لەم نزیکە نییە، رۆژە رێیەك دوورە، دوێنێ ئەم کاتە لەلای ئاوەکەوە هاتووم! پیاوەکانی ئێمەیش بۆئاو دەگەڕێنو بەشوێن ئاودا وێڵن. پێمان گوت: دەوەرە لەگەڵمان، گوتی: بۆ کوێ؟ گوتمان: بۆلای پێغەمبەری خودا، گوتی: ئەو کابرایەی کەپێی دەڵێن: وەرگەڕاو؟ گوتمان: بەڵێ ئەوەیە کەتۆ وای پێ دەڵێ ی، دەی وەرە بابڕۆین بۆلای، ئەوجا بردمان بۆلای پێغەمبەر، وەچی قسەیەکی بۆئێمە کرد هەمان قسەی کردەوە بۆ ئەویش، بەلام عەرزی پێغەمبەری کرد کەهەتیوبارە.

حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دەستووری دا هەردوو گاوەسەکانیان لەوشترەکە داگرتو ژنەکە دابەزی، ئەوجا حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) داوای جامێکی کردو

هەردوو دەمی هەردوو گاوەسەکەی کردەوەو ئاوی لێ داکردنە ناو جامەکەوەو، دەمیانی بەدەمبێنەکانیان بەستەوە، وەنزای بەسەریان دا خوێندو دەستی پیرۆزی هێنا بەهەردوو هنگڵەکانیاندا، فەرمانی فەرموو بەناو عەشاماتەکەدا جاڕدرا: بفەرموون هەم ئاو بدەن بەوڵاخەکانتان، هەم بۆ خۆتان ئاو بخۆنەوە، جا هەرکەس بەئارەزووی خۆی بەشی خۆی برد، لەدوا هەموان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرێ ئاوی بەپیاوە لەش پیسەکەداو، پێی فەرموو: (بڕۆ لەشوێنێکا بیکەبەسەر خۆتا).

ژنەکەیش هەر ڕاوەستا بوو سەرنجی دەدا کەچی لەئاوەکەی دەکرێ، سوێندم بەزاتی خودا کاتێ لەشکرەکە بەتەواوی بەشی خۆیان ئاو برد لەو دووگاوەسەو وازیان لەئاوەکە هێنا، ئاوەکە یەك تنۆك کەمی نەکردبوو، بەڵکوو زیادی کردبوو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شتێکی بۆ کۆبکەنەوە) ئێمەیش هەندێ خورمای عەجوەی مەدینەو ئاردو قاوتمان بۆی کۆکردەوە، تاهەمووی بوو بەبڕێ خۆراکی باش‌و کردیانە ناو پارچەیێ جلەوە، ئەوسا ژنەکەیان سواری وشترەکەی خۆی کردەوەو، جلەکەیان بەخۆراکەکەیەوە نایەبەردەمی‌و، گاوەسەکانیان بۆ بارکردەوەو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێ ی فەرموو: (خۆت دەزانیت کەئێمە هیچمان لەئاوەکەی تۆ کەم نەکردۆتەوە، ئەوەتا بەبەرچاوتەوە ئاوەکەت وەك خۆی ماوە، زیادی نەکردبێ کەمی نەکردووە، ئەوەی کەبەکارمان هێنا، ئاوێ بوو لەخواوە بوو، خودا خۆی بۆی ڕەخساندین!).

ئەوجا ژنەکە ڕۆیشتەوە بۆ ناوکەسوکاری، تۆزێ درەنگ دەڕواتەوە، پێی دەڵێن: ئەرێ خاتوون! خێر بوو وادرەنگ هاتیتەوە،؟ دەڵێ: کارێکی عەنتیکە درەنگی بەسەر هێنام! تووشی دوو کابرا بووم بردمیان بۆلای ئەو پیاوەی کەپێ ی دەڵێن: صابیئیی، واتە: لەئایینی کۆنی خۆی وەرگەڕاو. شتی سەیر سەیری دەکرد، دەسا بەزاتی خوا ئەم پیاوە یەکێکە لەم دووکەسە:

یاجادووبازترین کەسە لەنێوانی ئەم زەمینەو ئەم ئاسمانەدا، یاخود بەڕاستی پێغەمبەری رەوانەکراوی خودایە، بەپەنجەی ناوەڕاستو بەپەنجەی شایەتمان ئاماژەی کرد بۆ ئاسمانو زەوی.

جالەوەدوا ناوبەناو لەشکری ئیسلام هەڵمەتیان دەبردە سەر ئەوخێڵەهاوبەشکەرانەی کەلەدەوروبەری هۆزی ئەو ژنە بوون، وەدەستیان لەتاقمەکەی ئەو نەدەدا، هەتا رۆژێ ژنەکە بەهۆزەکەی خۆی دەڵێ: من لەوباوەڕدام کەئەم کۆمەڵەیە بەخۆڕایی نییە کەهەقیان بەسەر ئێوەوە نییە، بەڵکوو ئەمە هۆیەکی هەیە، کەئەویش ئەوەیە ئەمانە چاکەیەکی ئێمەیان لەبەرچاوە، جامن وابەباش دەزانم تازووە قەبووڵی ئیسلام بکەین، ئێوە دەڵێن چی؟ هۆزەکەی بەیەك دەنگ بەگوێی دەکەنو هەموو ئیسلام دەبن (ت/٤/ ٣٣٧/ ٢+ ت/١/ ٢٠١/ ٣ = تاج-٣ ز-١٠٥ ژ-٣١٧٥ + تاج-١ ز-٤٩ ژ-٣٦٨).

**روونکردنەوە:**

عیمرانی کوڕی حوصەین خۆیو باوکی هاوڕێ ی پێغەمبەر بوون، عیمرانی ساڵی ئازاد کردنی خەیبەر ئیسلام بووە، لە پێغەمبەرەوە سەدوهەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەبوخاری نازداردا دوازدە فەرموودەی هەیە، عومەر ناردی بۆ بەصرە هەتا شارەزای ئایینیان بکا، بوو بەقازی بەصرە، گشت جارێ فریشتە دەهاتن بۆ دیدەنیو سلاویان لێ دەکردو بەگوێ ی خۆی سلاوەکەیانی دەبیست، لەپەنجاو هەشتی کۆچیدا، لەبەصرە مرد.

بسم الله الرحمن الرحيم

## (٨) نامەی نوێژ (كتاب الصلاة)

٢٢١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ أَبُو ذرّ (رَضـي اللهُ عَنْـهُ) يُحدِّث أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فُرِجَ عَنْ سَقْفِ بَيْتِي وَأَنَا بِمَكَّةَ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفَرَجَ صَدْرِي ثُمَّ غَسَلَهُ بِمَاءِ زَمْزَمَ ثُمَّ جَاءَ بِطسْتٍ مِنْ ذهَبٍ مُمْتَلِئٍ حِكْمَةً وَإِيمَانًا فَأَفْرَغَهُ فِي صَدْرِي ثُمَّ أَطْبَقَهُ ثُمَّ أَخَذ بِيَدِي فَعَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَلَمَّا جِئْتُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا قَالَ جِبْرِيلُ لِخَازِنِ السَّمَاءِ افْتَحْ قَالَ مَنْ هَذا قَالَ هَذا جِبْرِيلُ قَالَ هَلْ مَعَكَ أَحَدٌ قَالَ نَعَمْ مَعِي مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ فَلَمَّا فَتَحَ عَلَوْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَإِذا رَجُلٌ قَاعِدٌ عَلَى يَمِينِهِ أَسْوِدَةٌ وَعَلَى يَسَارِهِ أَسْوِدَةٌ إِذا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ وَإِذا نَظَرَ قِبَلَ يَسَارِهِ بَكَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالِابْنِ الصَّالِحِ قُلْتُ لِجِبْرِيلَ مَنْ هَذا قَالَ هَذا آدَمُ وَهَذهِ الْأَسْوِدَةُ عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ نَسَمُ بَنِيهِ فَأَهْلُ الْيَمِينِ مِنْهُمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ وَالْأَسْوِدَةُ الَّتِي عَنْ شِمَالِهِ أَهْلُ النَّارِ فَإِذا نَظَرَ عَنْ يَمِينِهِ ضَحِكَ وَإِذا نَظَرَ قِبَلَ شِمَالِهِ بَكَى حَتَّى عَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثانِيَةِ فَقَالَ لِخَازِنِهَا افْتَحْ فَقَالَ لَهُ خَازِنهَا مِثلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُ فَفَتَحَ قَالَ أَنَسٌ فَذكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ فِي السَّمَوَاتِ آدَمَ وَإِدْرِيسَ وَمُوسَى وَعِيسَى وَإِبْرَاهِيمَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ وَلَمْ يُثبِتْ كَيْفَ مَنَازِلُهُمْ غَيْرَ أَنَّهُ ذكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ آدَمَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَإِبْرَاهِيمَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ قَالَ أَنَسٌ فَلَمَّا مَرَّ جِبْرِيلُ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِدْرِيسَ قَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالْأَخِ الصَّالِحِ فَقُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا إِدْرِيسُ ثمَّ مَرَرْتُ بِمُوسَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالْأَخِ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا مُوسَى ثمَّ مَرَرْتُ بِعِيسَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا عِيسَى ثمَّ مَرَرْتُ بِإِبْرَاهِيمَ فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالِابْنِ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا إِبْرَاهِيمُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَأَخْبَرَنِي ابْنُ حَزْمٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا حَبَّةَ الْأَنْصَارِيَّ كَانَا يَقُولَانِ قَالَ النَّبِيُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوَى أَسْمَعُ فِيهِ صَرِيفَ الْأَقْلَامِ قَالَ ابْنُ حَزْمٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى أُمَّتِي خَمْسِينَ صَلَاةً فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ حَتَّى مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ مَا فَرَضَ اللَّهُ لَكَ عَلَى أُمَّتِكَ قُلْتُ فَرَضَ خَمْسِينَ صَلَاةً قَالَ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى قُلْتُ وَضَعَ شَطْرَهَا فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَاجَعْتُهُ فَقَالَ هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَقُلْتُ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى انْتَهَى بِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وَغَشِيَهَا أَلْوَانٌ لَا أَدْرِي مَا هِيَ ثُمَّ أُدْخِلْتُ الْجَنَّةَ فَإِذَا فِيهَا حَبَايِلُ اللُّؤْلُؤِ وَإِذَا تُرَابُهَا الْمِسْكُ). (الحديث ٣٤٩ طرفاه في: ١٦٣٦، ٣٣٤٢).[١٩٠]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران ئەبوذەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕایەوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هێشتا لەمەککە بووم بنمیچی ماڵەکە شەق بوو، جوبرەئیل لەشەقەکەوە دابەزی، سڵاوی خودای لێ بێ، سینگی لەت کردمو بەئاوی زەم زەم شۆردیەوە، ئەوسا تەشتێکی زێڕینی هێنا، پڕ بوو لەداناییو باوەڕ، واتە: لەحیکمەتو ئیمان، تەشتە پڕەکەی خاڵی کردە ناو سینگمەوە، ئەوجا قەپاتی کردەوە. ئنجا دەستی گرتمو سەری خستم بۆ ئاسمانی یەکەم.

کاتێ کەیشتینە ئاسمانی یەکەم، جوبرائیل بەدەرکەوانی ئاسمانی فەرموو: دەرگاکەمان بۆ بکەرەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەکێ یە؟ فەرمووی: منم جوبرائیلم، فەرمووی کەسی ترت لەگەڵە؟ فەرمووی: بەڵێ: موحەممەدم

---

(١٩٠) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الإسراء برسول الله (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) رقم: ١٦٣=٤٠٩.

لەگەڵدایـە، فـەرمووی: دیـارە نێـردراوە بەشـوێنیدا؟ فـەرمووی: بـەڵێ، جـا دەرگاکـەی بۆمـان کـردەوەو سـەرکەوتینە سـەرئاسمانی یەکـەم، سـەرنجم دا واپیـاوێ دانیـشتووە، لەڕاسـتو لەچـەپیەوە، پـۆل پـۆل تارمـایی ی عەشـامات دیـارن، پیاوەکە کەسـەیری لای ڕاستی خـۆی دەکرد، لەخۆشـیدا پـێ دەکـەنی، بـەڵام کەسـەیری لای چـەپی خـۆی دەکـرد، لەخەفـەتانا، دەگریـا، فـەرمووی مەرحەبا لە پێغەمبەری بـاشو لـەکوڕی باشـم، گـوتم: ئـەی جوبرائیـل! ئەمـە کێیـە؟ فـەرمووی: ئەمــە بــاوە ئادەمــە، ئــەوتارمایی عەشــاماتانەش کــەوان لەڕاسـتو چـەپیەوە، گیانگـەلو ڕەوانگـەل (ئـەرواح) ی وەچـەو نەوەکانیـەتی، ئەوانەیان کەوان لەلای راسـتیەوە ئەوانـە بەهەشـتین، بـەڵام ئەوانـەیان کـەوان لـەلای چـەپیەوە ئەوانـە دۆزەخـین، جابۆیـە کەتەماشـای لای ڕاسـتی دەکا پـێ دەکەنێو کەتەماشای لای چەپی دەکا دەگری.

ئـەوجا سـەری خـستم بـۆ ئاسمـانی دووەم، بەدەرکەوانەکـەی ی فـەرموو: دەرگاکە بکەرەوە، ئەو پرسـیارو وەڵامـەی کەلـەنێوانی جوبرائیـلو دەرکـەوانی یەکەم دا رووی دا، لەنێوانی جوبرائیلو دەرکەوانی ئاسمانی دوەمیش دا رووی دا، ئەوجا دەرگاکەی کردەوە).

ئەنەس فەرمووی: ئەبوزەڕ باسی ئەوەی فەرموو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئاسمانەکان ئـەم پێغەمبەرانـەی دیـوە: ئـادەمو ئیـدریسو مووسـاو عیـساو ئیبراهیم ـ دروودی خودای گەورەیان لێ بێ ـ بەڵام جێگەو شـوێنی هـەموویانی دیاری نەکرد، تەنیا باسی ئەوەندەی کرد کەلـەئاسمانی یەکـەم بـەئادەم دەگـاو، لەئاسمانی شەشەم بەئیبراهیم.

ئەنەس خۆی دەیفەرموو: کاتێ جوبرائیل پێغەمبەر دەبـا بـۆلای ئیـدریس، پێغەمبـەر ڕۆژباشـی لێ دەکـاو سـڵاوی لێ دەکـا، ئیدریـسیش پێـی دەفـەرموێ: مەرحەبا لە پێغەمبەری بـاشو لـەبرای بـاش، (جـا بـەجوبرائیلم گـوت: ئەمـە کـێ یـە؟ فـەرمووی: ئەمـە ئیـدریس پێغەمبـەرە، ئینجـا گەیـشتم بەمووسـا،

فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش‌و لەبرای باش، گوتم: ئەمەکێیە؟ فەرمووی: ئەمە مووسایە، ئەوجا گەیشتم بەعیسا، فەرمووی: خۆشهاتن پێشکەش دەکەم بە برای باش‌و بە پێغەمبەری باش، گوتم: ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە عیسایە، ئەوجا گەیشتم بەئیبراهیم، فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش‌و لەکوڕی باشم، گوتم: ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە ئیبراهیم بوو (سەلامی خوای لێ بێ).

ئیبنوشیهاب (کەناوداره بەزوهری) دەفەرموێ: ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم هەواڵی پێم دا: کەئیبنوعەباس‌و ئەبوحەببەی ئەنصاری فەرموویانە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پاشتر بەرەو ژوورتریش برام تاگەیشتمە سەرئاستێ لەوێوە گوێم لەجیرەی قەڵەمی فریشتەکان بوو). ئیبنوشیهاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبوبەکری نەوەی ئیبنوحەزم لەپیر (شێخ) ی خۆیەوەو، ئەنەسی کوڕی مالیك لەئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوجاا خودا شەوو رۆژی پەنجا نوێژی لەسەر گەلی ئیسلامم دانا، منیش بەم فەرمانەوە گەڕامەوە، هەتا چوومەوە لای مووسای کوڕی عیمران، فەرمووی: خودا چی بۆدانای لەسەر نەتەوەکەت؟ گوتم: لەهەموو شەوو رۆژێکا پەنجا نوێژی داناوە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، فەرمووی: من لەتۆ زیاتر شارەزاییم هەیە لەڕەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لەپێش تۆدا ئەرکی زۆرم لەم بارەیەوە لەگەڵ گەلی خۆم دا، کەنەوەی ئیسرائیلن، کێشاوەو، بەراووردم کردوون‌و ئەزموونی باشم هەیە لەم بوارەدا، جابۆیە دەزانم کە ئۆمەت (نەتەوە) ی تۆ تەوانای ئەوەیان نییە، کەواتە بگەڕێرەوە بۆلای خودای پەروەردگارت، داوای لێ بکە کەئەم نوێژانەلەسەر نەتەوەکەت سووك بکا، منیش گەڕامەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارم، بۆئەو شوێنەی کەیەکەمجار گوفتوگۆم لەخزمەتیدا کردو، داوای ئەوەم لێ ی کردو، ئەویش ژمارەیەکی لێ

لابردن، دیسان گەڕامەوە بۆلای مووساو، حاڵەکەم پێ گوت، ئەویش فەرمووی بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت، چونکە نەتەوەکەت توانای ئەم ژمارە داشکاوەیشیان نییە، جا چوومەوە بۆ خزمەتیو دیسان ژمارەیەکی تری لێ داشکاند، ئەویش دیسانەوە فەرموویەوە: بچۆرەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارت چونکە نەتەوەکەت توانای ئەم ژمارە تازەیشیان نییە، ئەم ژمارەیش کەماوە هێشتا هەر زۆرە، ئەمجارەیان کەچوومەوە خزمەتی فەرمووی: خۆیان بەکردن ژمارەیان پێنج نوێژە، بەڵام خێرو پاداشی پەنجا نوێژیان هەیە، ئەی موحەممەد! ئەمەدوا فەرمایشتەو گۆڕانی بۆ نییە، وەئیتر لەمەزیاتر ژمارەی نوێژەکان کەم ناکەمەوە، بەڵام بۆتۆو بۆهەموو نوێژکەرێکی ئۆمەتی تۆ هەیە لەجیاتی کردنی ئەم پێنج نوێژەیە، خێرو پاداشی پەنجا نوێژەکەی پێشوو. دیسانەوە گەڕامەوە بۆلای موسا، هەمدیسانەوە فەرموویەوە: بچۆرەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارت، بەڵام گوتم: ئەم خێرەم قەبووڵەو کاری خۆم دایە دەست خوداو، ئیتر شەرم دەکەم لە پەروەردگارم کەبڕۆمەوە بۆلایو داوای کەم کردنەوەی ژمارەی پێنج نوێژەی لێ بکەم ).

هەروا بردمیان هەتا گەیاندمیانە لای سیدرەتولمونتەها (واتە: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ، بۆیە وای پێ دەبێژرێ چونکە زانیاری فریشتەکان هەتا ئەوێ بڕ دەکا، جگە لەیەزدانی پاك کەس نازانێ لەولاتر چی هەیە) سەرنجم دا چەندەها رەنگی سەیری زۆری جۆراو جۆر دایپۆشیبوو، مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ کەچی بوونو چۆن بوونو چەند بوون!

پاشتر برامە ناو بەهەشتەوە، کەتەماشام کرد پڕە لەگومەزی مرواریو خاکەکەیشی مسکە). (ت/ ٤/ ٢٩٩/ ١، ت/ ١/ ١٨٠/ ١ = تاج-٣ ز-١٠٠ ژ-٣١٥٥ + تاج-١ ز-٤٣ ژ-٣٢٢).

روونکردنەوە: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- ئیسراو میعراج دوو رووداوی جیان.

٢- پێغەمبەر لەنەوەی حەزرەتی ئیبراهیمە (سەلامی خوای لێ بێ).

٣- بەهەشتو دۆزەخ ئێستا دروست کراونو هەن.

٤- گیانی چاکان دەبرێن بۆ ئاسمان.

٥- پێغەمبەران بەڕاستی زیندوون، بەکاری باشی نەوەو نەتەوەیان دڵخۆش دەبن، بەکاری خراپیان دلگران دەبن.

٦- مەرحەباو چاکوچۆنیو بەخێرهاتن لەکاتی بەیەك گەیشتن دا سوننەتە. (ت/ ٤/ ٢٩٩/ ١+ ت/ ١/ ١٨٠/ ١).

٢٢٢- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (فَرَض اللَّهُ الصَّلَاةَ حِينَ فَرَضهَا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْحَضرِ وَالسَّفَرِ فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَزِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضرِ). (الحديث ٣٥٠ طرفاه في: ١٠٩٠، ٣٩٣٥).

عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووی: لەسەرەتاوە یەکەمجار کەخودای گەورە نوێژی فەرزکرد، دوورکات دوورکات فەرزی کرد، ئیتر نوێژخوێن نیشتەجێ بوایە، یارێبوار بوایە، گشت نوێژێ دوورکاتی دەکرد، جانوێژی سەفەر وەك خۆی مایەوەو لەسەر شێوەی یەکەمجاری چەسپاو دامەزرا، بەلام نوێژی نیشتەجێ لێ ی زیاد کرا (ت/١/ ٤٤٦ ز- ١٥٥).

**روونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە مورسەلی صەحابییە، مورسەلی صەحابی حوججەتو بەلگەیە، بۆیە مورسەلە چونکە عائیشە خۆی فریای روودانی ئەم داستانە نەکەوتووە، سایا لە پێغەمبەری بیستووە، یالەیەکێ لەهاوڕێ یانی پێغەمبەری ژنەوتووە، هەرچۆن بێ ئەم فەرموودەیە دەبێ بەسەر بەلگە بۆ ئەم بابەتە، کەعیبادەتە، چونکە عیبادەت بەڕایی خۆیی دانامەزرێ، ساخ بوونەوەی

هـەموو پەرستنێ پێویستی بەدەقی یاسادانەر (شاریع) هەیە کەخودای گەورەیە، کەس بۆی نییە چۆنێتیو چەندێتی ی پەرستنێ بڕیار بدا، جگە لەخودا خۆی.

مورسەل (بەکوردی واتە: بێ بەند: بێ پێوەند: رەها: بەرەڵا: ئازاد: سەربەست) چونکە راوی جڵەوی ڕشتەکە بەردەداو، خۆی سەربەخۆ، راستەوخۆ فەرموودەکە دەگێڕێتەوەو، باسی ئەوە ناکا کەئەو فەرموودەیەی لەکێ وەرگرتووە. کەواتە: حەدیثی مورسەل، واتە: فەرموودەی بەرەڵا، کەسەر روشتەی روشتەکە کوێر بۆتەوەو، لەدەستا نەماوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩) چەند باسێکی نوێژ بەجل و بەرگەوە (أبواب الصلاة في الثياب)

٢٢٣-عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ قَدْ خَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ).[١٩١]

عومەری کوڕی ئەبوسەلەمە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەیەك لۆجل دا نوێژی کردو هەردوو چمکەکەی لەسەرشانی راستو چەپ کردبوو، ئالاندبووی لەخۆیەوە (ت/١/٢١٥ ز- ٥٥).

عومەری کوڕی ئەبوسەلەمە زڕکوڕی پێغەمبەر بووە، لەساڵی دووی کۆچیدا لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، چەند فەرموودەی لەصەحیحەین دا هەیە، کوڕی ئوممومسەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە (بڕوانە: ت/ ١/ ٥٢٠/ ٣/ ٤، ت/٤/ ١٨٩/ ١، ت/ ٤/٤٧/ ٢) = ز-١٩٢ ژ-١٠١٦، ١٠١٧ + تاج-٣ ز-٥٧ ژ-٢٩٦٢.

٢٢٤- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ قَالَتْ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ مَنْ هَذِهِ فَقُلْتُ أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ

---

(١٩١) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: الصلاة في ثوب واحد وصفة لبسه رقم: ٥١٧.

فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ ابْنُ أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلًا قَدْ أَجَرْتُهُ فُلَانَ ابْنَ هُبَيْرَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ وَذَاكَ ضُحًى). (الحديث ٣٥٧).[١٩٢]

ئوموهانیئی کچی ئەبوطالیب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازاد کردنی شاری مەککە، ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەچووم خەریك بوو خۆی دەشۆرد، فاطیمەی کچی بەپارچەیێ جل پەردەی بۆ کردبوو، فەرمووی: کەسلاوم لێ کرد، فەرمووی: (ئەو ژنە کێ یە؟) گوتم: منم ئوموهانیئی کچی ئەبوطالیبم. جافەرمووی: (مەرحەبا لەئوموهانیێ). جاکاتێ لەخۆشۆردنەکەی لێ بۆوە هەشت رکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد، لەدوا هەموو دوو ڕکاتێکەوە سلاوی دەدایەوە، لەکاتی نوێژەکەدا یەك پارچە جلکی ئالاندبوو بەخۆیەوە، کەسلاوی دایەوە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی برام دەیەوێ پیاوێ بکوژێ کەکوڕی هوبەیرەی مێردی منە، وەمنیش پەنایم داوەو، ئەمانم پێی داوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئوموهانیێ! وائەمانمان دا بەهەرکەسێ تۆ ئەمانی بدەیتێ!) ئوموهانیێ فەرمووی: کاتیش چێشتەنگاو بوو. (ت/١/١٤٨/١، ت/١/٤٨٥/٤ بڕوانە: زنجیرەی پێنجەم، فەرموودەی ژمارە ـ ١٩٤) = ز-٣١ ژ-٢٦٧ + ز-١٧٩ ژ-٩٥٦.

٢٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ سَائِلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الصَّلَاةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ ؟). (الحديث-٣٥٨ طرفه في ٣٦٥).[١٩٣]

---

(١٩٢) أخرجه مسلم في الحيض، باب: يستر المغتسل بثوب ونحوه، رقم: ٣٣٦.

(١٩٣) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الصلاة في ثوب واحد وصفة لبسه، رقم: ٥١٥.=٧٦٢، ٧٦٣، ١٦٦٦، ١١٤٨.

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەڵسا لە پێغەمبەری پرسی: نوێژ بەیەك لۆجلەوە دروستە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە تۆ دەڵێی چی، ئەی چۆن دروست نییە، كوا هەركەسێ بگری لەئێوە دوو پارچە جلی هەیە؟). (ت/١/٢١٥/١) = ز-٥٥ ژ-٣٩٦.

٢٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ). (الحديث ٣٥٩ طرفه في: ٣٦٠).[١٩٤]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەیەك پارچە جلی واوە نوێژ مەكەن، كەنەگاتەوە بەسەر هەردوو شانتانا). (ت/١/٢١٦/٢) = ز-٥٥ ژ-٣٩٧.

٢٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فَلْيُخَالِفْ بَيْنَ طرَفَيْهِ).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: شایەتی دەدەم كەبۆخۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (هەركەسێ لەیەك لۆجل دا نوێژ دەكا، بابیئاڵێنێ لەخۆیەوەو، هەردوو چمكەكەی لەسەرشانی راستو چەپ بكا) (بڕوانە/ ژمارە: ٢٣٣)

٢٢٨- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْض أَسْفَارِهِ فَجِئْتُ لَيْلَةً لِبَعْض أَمْرِي فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي وَعَلَيَّ ثوْبٌ وَاحِدٌ فَاشْتَمَلْتُ بِهِ وَصَلَّيْتُ إِلَى جَانِبِهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ مَا السُّرَى يَا جَابِرُ فَأَخْبَرْتُهُ بِحَاجَتِي فَلَمَّا فَرَغْتُ قَالَ مَا هَذا الِاشْتِمَالُ الَّذِي رَأَيْتُ قُلْتُ كَانَ ثوْبٌ يَعْنِي ضاقَ قَالَ فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ). (الحديث ٣٦١ طرفه في: ٣٥٢).[١٩٥]

---

(١٩٤)أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الصلاة في ثوب واحد وصفة لبسه: رقم: ٥١٦.=١١٦٤.

(١٩٥) أخرجه مسلم في الزهد والرقائق، باب: حديث جابر الطويل، رقم: ٣٠١٠.=٧٤٣٧.

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، شەوێ بۆ ئیشێكی خۆم چووم بۆ خزمەتی، كاتێ چووم خەریكبوو نوێژی دەكرد، منیش یەك پارچە جلم پێوە بوو، ڕاستو چەپ ئاڵاندبووم لەخۆمەوەو، لەتەنیشتیەوە دەستم كرد بەنوێژ كردنو پەیڕەوی (ئیقتدا)م پێی كرد، كاتێ لەنوێژەكەی بۆوەو رووی لەڕووگە نەما فەرمووی: (ئەی جابیر! بەم شەوە خێرە هاتووی؟) منیش كارەكەی خۆمم عەرزی كرد، جاكاتێ ئیشەكەمم تەواو كرد، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی جابیر! ئەگەر جلەكە فەرەح بوو دوو چمكەكەی ڕاستو چەپ بكە، بەڵام ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بەكەمەرتەوە!)

ڕوون كردنەوە: بۆ حاڵیبوونی تەواو ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصووڵ ڕاگوێز دەكەین، جابیر فەرمووی: (.. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا نوێژ بكا، منیش یەك عەبای میلدارم لەبەردا بوو، ویستم دوو چمكەكەی ڕاستو چەپ بكەم، پیاما نەگەیشتەوە، عاباكە هەنێ ڕێشوو گوێزو گوڵینكەی پێوە بوو، سەربەرەوخوارم كردەوەو ئەنجا لەژێر هەردوو باڵمەوە هەردوو چمكەكەیم ڕاستو چەپ كردو، لەسەر سێنگم گرێم دانو ملم كووڕ كردەوە بەسەریاو، بەملم گرتم تابەرنەبێتەوە، ئەنجا چووم لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتمو سووڕاندمییەوەو، بردمی لەلای ڕاستی خۆیەوە وەستاندمی، لەپاش دا جەببباری كوڕی صەخریش هاتەوەو، دەستنوێژی گرتو، هات لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستا، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستی هەردوكمانی گرتو پاڵی پێوەناین بۆ دواوە، هەتاڕێك لەپشتی خۆیەوە ڕیزی كردینو ڕایوەستانین، ئاگام لێ نەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرنجی منی دەدا، لەپاشا كەهەستم پێ ی كرد بەدەستی ئاوای كرد، واتە: ناوقەدت ببەستە، جاكاتێ لێ بۆوە، فەرمووی: (ئەی جابیر!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەگەر جلەكە فەرەح بوو دوو چمكەكەی

راستو چەپ بكە، بەڵام ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بەكەمەرتەوە...) تاكۆتایی فەرموودەكە، بڕوانە: (بەرگی چوارەمی تاجولئوصول. كوردی لاپەڕە ـ ٣١٥ ـ فەرموودەی ژمارەیەك، زنجیرەی ـ ١١٠ = تاج-٣ ز-١١٠ ژ-٣١٨٥).

٢٢٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْد (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَاقِدِي أُزْرِهِمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ وَيُقَالُ لِلنِّسَاءِ لَا تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوسًا). (الحديث ٣٦٢ طرفاه في: ٨١٤، ١٢١٥).[196]

سەهل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم دیومە كەپیاوان بەركۆش (ئیزار)ە كانیان، لەبەر تەسكو تروسكیو، نەبوونی جلو بەرگ، وەك بەروانكەی مناڵان، گرێ دەدا بەبەرۆكیانەوە، لەكاتی نوێژی جەماعەتدا، كەلەپشتی پێغەمبەرەوە دەیان كرد، پیاوێكیش بانگەوازی دەكرد: ژنان! ئێوە سەر بەرز مەكەنەوە، تاپیاوەكان هەڵدەسنەوەو، لەپاش كوورنووشەوە ڕێك دادەنیشنەوە، نەوەك لەداوێنەوە شەرمیان دەركەوێ!(ت/١/٣٩٢/٤=ز-١٣٠ژ-٧٨٠).

٢٣٠- عَنْ مُغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَقَالَ يَا مُغِيرَةُ خُذ الْإِدَاوَةَ فَأَخَذْتُهَا فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فَقَضَى حَاجَتَهُ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ شَأْمِيَّةٌ فَذَهَبَ لِيُخْرِجَ يَدَهُ مِنْ كُمِّهَا فَضَاقَتْ فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ أَسْفَلِهَا فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ فَتَوَضَأَ وُضوءَهُ لِلصَّلَاةِ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ ثمَّ صَلَّى). (الحديث ٣٦٣ طرفه في: ١٨٢).

موغیرەی كوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا لەخزمەتی حەزرەتدا بووم (درودی خودای لەسەر بێ) جارێ فەرمووی: (ئەی موغیرە! مەتارەكە هەڵگرە) منیش مەتارەیێ ئاوم هەڵگرتو شوێنی كەوتم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمن دوور كەوتەوە تاون بوو لەبەرچاومو چووە نەدیوی، لەوێ دەستی بەئاو گەیاند، جاكەلەسەراوەكەی لێ بۆوە، هاتەوە ویستی دەستنوێژ

---

(١٩٦) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: أمر النساء المصليات وراء الرجال، رقم: ٤٤١.

بگرێ، جبەیەکی شامی دەستکردی بێبڕوایانی لەبەردا بوو، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ویستی قۆڵی هەڵماڵێو لەسەر قۆڵەکەیەوە دەستی دەربهێنێ، بەڵام قۆڵی جبەکە تەسک بوو، دەستی بۆدەرنەدەهات لێ یەوە، جالەژێر جبەکەوە دەستەکانی دەرهێناو، جبەکەی دا بەسەرشانیدا، ئەوسا ئاوم کرد بەدەستیاو، دەستنێژی گرت بۆ نوێژ، لەجیاتی ی شۆردنی پێ ی دەستی تەڕێ هێنا بەسەر سۆلەکانیدا (بڕ/فەرموودەی ژمارە:١٣٧+ت/١/١٠٨/٤=تاج-٣ ز-٣٢ ژ-٢٧٨٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

جلو بەرگی دەستکردی بێبڕوایان پاکەو دروستە بەهرەو سوودی لێ وەربگیرێ، بەمەرجێ پیس نەبێ، چونکە ئەم جبە شامی یە دەستکردی بێبڕوایان بووە، چونکە ئەم ڕووداوە لەغەزای تەببوك دا بووە، ئەو سەردەمەش شام کافرستان بووە. وەکی تریش بەپێوەری (وطعام الذين أوتوا الكتاب حل لكم) بێ، دەبێ جلو بەرگو شتی تری بێبڕوایان باشتر ڕەوابێ بۆ موسوڵمانان بەمەرجێ لەزاتی خۆیا ڕەوابێ، چونکە لەسەربڕاودا نەی ی کراوە لەخواردنی گۆشتی گیانلەبەرێ کەلەکاتی سەربڕینا ناوی خودای لەسە نەبرابێ، بەڵام لەجلو بەرگو شمەك دا شتی وانییە کەبفەرموێ: (هەر دەستکردێ ناوی خودای لێ نەهێنرابێ بەکاری مەهێنن!)

٢٣١- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يُحَدِّث: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمْ الْحِجَارَةَ لِلْكَعْبَةِ وَعَلَيْهِ إِزَارُهُ فَقَالَ لَهُ الْعَبَّاسُ عَمُّهُ يَا ابْنَ أَخِي لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَ عَلَى مَنْكِبَيْكَ دُونَ الْحِجَارَةِ قَالَ فَحَلَّهُ فَجَعَلَهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ فَسَقَط مَغْشِيًّا عَلَيْهِ فَمَا رُئِيَ بَعْدَ ذلِكَ عُرْيَانًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (٣٦٤ طرفاه في: ١٥٨٢، ٣٨٢٩).[197]

---

(١٩٧) لأخرجه مسلم في الحيض، باب: الاعتناء بحفظ العورة، رقم: ٣٤٠.=٧٦٩.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کاتێ هۆزی قورەیش لەپێش ڕەوانەکردن (بیعثەت) ی پێغەمبەردا کەعبەیان دروست کردەوە، پێغەمبەرو عەبباسی مامەی بەیەکەوە لەگەڵ ئەوانا بەردیان بۆ دەهێنا، عەبباس بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەی کوڕی برام! تۆیش وەك هاوەڵەکانت، شەرواڵەکەت بکەرەوەو بیخەرە سەرشانت، بابەرد سەرشانت نەبا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوادەکا شەرمگای دەردەکەوێ، ئیتر لەشەرمانا دەبوورێتەوەو خرپ بەردەبێتەوە دەکەوێتە سەرزەوی، وەچاوی لەترسی خودا بەرەوئاسمان ئەبلەق دەبێ، وە دەفەرموێ: دەرپێکەم کوانێ، ئەوجا دەرپێکە لەبەردەکاتەوە، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە بەڕووتی نەبینراوە. (ت/٢/٢٦٩/١ = ز-١٣٤ ژ-١٧١٦).

## ڕاقەو شیکردنەوە:

مەبەست لەدەرپێ لەم شوێنەدا (ئیزار)ە، کەپشتەماڵێکی گەورەیە وەك بەرکۆش دەپێچرێ بەلای خوارووی لەشەوە، ئەم فەرموودەیەیش مورسەلی صەحابی یە، چونکە جابیر ئامادەی ئەم ڕووداوە نەبووە

٢٣٢–عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ). (الحديث ٣٦٧ أطرافه في: ١٩٩١، ٢١٤٤، ٢١٤٧، ٥٨٢٠، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤).[١٩٨]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) نەهیی کردووە لەوە کەمرۆڤ بەپارچە جلێ خۆی شەتەك بدا، بەشێوەیەکی وا کەنەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ مەگەر لەدامێنیەوە، کەبەم جۆرە خۆپێچانەوەیە لەزاراوی شەریعەت دا دەگوترێ: (اشتمال الصماء: مەلۆتکەپێچ)

(١٩٨)اخرجه مسلم في البيوع: (عينى/٤/٧٥/٣٣) المترجم. = مسلم. لباس. ٥٤٦٦.

وەنەهی کردووە لەوەیشە کەپیاو بەچیچکانەوە جلێ بئالێنێ بەخۆیەوە، بەڵام هیچ نەدا بەشەرمگای خۆی دا، کەبەم جۆرە خۆپێچانەوەیەش دەگوترێ:(ئیحتیباء:تێوەپێچان).(ت/٤/١٣٧/١=تاج-٣ز-٤١ز-٢٨٥٦).

٢٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعَتَيْنِ عَنْ اللِّمَاسِ وَالنِّبَاذ وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ).(الحديث٣٢٧ أطرافه في: ١٩٩١، ٢١٤٤، ٢١٤٧، ٥٨٢٠، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤).[١٩٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەم دوو جۆرە فرۆشتنە کردووە: لەفرۆشتن بەدەست لێدان، کەناودارە بە (مولامەسە) وە لەفرۆشتن بەهەڵدان بۆیەکتری، کەناودارە بە (مونابەذە) فرۆشتن بەدەست لێدان ئاوایە: فرۆشیار بەکڕیار دەڵێ: هەرکاتێ دەستت دا لەم جلەوە بەیعی هاتبێو، ئیتر ئەوە لەباتی تەماشا کردنیو ئەمدیوەو ئەودیو کردنی! وەئەم دەست لێدانەش خوای بەشەوی تاریك بێ، خوای بەرۆژی رووناك بێ. فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەکتریش ئاوایە: ئەم جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆئەوو ئەویش جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆئەم، وەئەمە لەجیاتی داڕێژگە (صیغە:گوتە) ی فرۆشتن، ئیتر بەبێ سەرنج دانو دلگرتن. وەهەروا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) نەهی لەخۆمەلۆتکە کردن کردووە، وەلەوەیش کەپیاو بەچیچکانەوە دابنیشێو، بەپارچەیێ جل خۆی بابۆڵەبدا (ت/٢/٣١٥/٢ = ز-١٥٢ ز-١٨٠٦، ش/د/ ن) بڕ: (فەرموودەی ژمارە ـ ٢٣٢) کەلەپێشەوە رابوورد.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم جۆرە فرۆشتنو دانیشتنو خۆپێچانە لەسەردەمی نەزانیدا باوبووە، وەلەزمانی عەرەبیدا زاراوی بۆ دانراوە، مەرج نییە ئەم جۆرە شتانە لەسەر

---

(١٩٩) أخرجه مسلم في البيوع، (عينى/ ٣٤/٧٦/٤) المترجم. = مسلم. بيوع. ٣٧٨٤.

هەمان یاساو شێوە لەناو گەلانی تردا هەبوون، چونکە زۆرشت زادەی ژینگەو کاتو جێگەو شوێنو دەوروبەرو سەرماو گەرماو هۆی تایبەتین، بۆ نموونە: لەکوێستان بەفرو کرێوەو تۆفو زریانو سەهۆڵو چلوورەو کلیلەو بەفرماڵینو رەقبوونەوەو ئاوبەستنو شەختەو زوقمو سەهۆڵبەندانو دەستو پاڕچین هەیە، لەگەرمیانیش لمو بیابانو تەپوتۆزو قرچەی گەرماو خۆربردنو شتی تری لەم بابەتانە هەیە، لەبەرئەوە گەلێ ئەستەمە کەئەم جۆرە زاراوە تایبەتانە پیتاوپیت وەربگێڕرێن بۆسەر زمانێکی تر بۆیەمن زۆرجاران هەوڵ دەدەم کەبەواتا شتەکە بکەم بەکوردی، چونکە مەبەست ئەوەیە کەخوێنەری کورد لەجەوهەری بابەتەکە حاڵی ببێ.

٢٣٤- عَنْ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رضي قَالَ: (أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِي تِلْكَ الْحَجَّةِ فِي مُؤَذِنِينَ يَوْمَ النَّحْرِ نُؤَذِنُ بِمِنًى أَنْ لَا يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ قَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيًّا فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِنَ بِبَرَاءَةٌ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَأَذنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنًى يَوْمَ النَّحْرِ لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ). (الحديث ٣٦٩ أطرافه في: ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٤٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧).[٢٠٠]

حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەوحەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کردبوو بەسەرداری حەج، کەبەر لەحەجی ماڵئاوایی بوو، لەو حەجەدا ئەبوبەکر منی لەگەڵ دەستەیێ جاڕدەری تردا نارد، رۆژی جەژن دەستمان کرد بەجاڕدان: ئیتر لەم ساڵ بەدواوە بتپەرستو هاوبەشپەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وەکەسیش نابێ بەرووتی تەواف بەیت بکا. حومەیدی کوڕی

(٢٠٠) أخرجه مسلم في الحج (عينى/٤/٧٧/٣٥) المترجم.=٣٢٥٤ شيحا.

عەبدوڕەحمان فەرمووی: پاشتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەلیش دەنێرێ، وەفەرمانی پێ دەکا کە بانگەواز هەڵ دا بەخوێندنەوەی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی بەرائەت. ئەبوهورەیرە فەرموویەتی: لەڕۆژی جەژندا عەلی لەگەڵ ئێمەدا لەناو خەڵکی مینادا ئەم بانگەوازەمان پەخشەوە کرد: لەم ساڵ بەدواوە فرەخوا (مشرك) نەیێ بۆ حەج، وەمرۆڤی رووتیش تەوافی خانەی خودا نەکا.(ب/٢/١٨٧/٢+ب/٦/١٩٩/٤/٥ = تاج-٢ ز-٩٦ ژ-١٥٥١ + تاج-٤ ز-١٠ ژ-٣٨٩٤).

لەتاجول ئوصولا، لەتەفسیری سورەتی بەرائەتدا، فەرموودەی پێنجەم دەفەرموێ: لەعەلی (رەزای خوای لێ بێ) پرسیارکرا: لەو حەجەدا کە حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) تۆی نارد تایەخە هەڵتەکاندنی خوداو پێغەمبەری خودا لەفرە خواکان جاڕ بدەی، چی فەرمانێکت پێ کرابوو، کەلەو رۆژەدا رایبگەیەنی؟ فەرمووی: بەم چوارشتە فەرمانم پێ کرابوو: یەکەم: ئادەمیزادی ڕووت تەوافی کابە نەکا، دوەم: ئەوانەی پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەتا ماوەی ئەو پەیمانە تەواو دەبێ مۆڵەت دەدرێن، وە ئەوەی پەیمانی نییە تاچوار مانگ مۆڵەت دەدرێ، سێیەم: ناچێتە بەهەشت مەگەر کەسێ کەئیمان‌و باوەڕی هەبێ. چوارەم: لەم ساڵ بترازێ ئیتر نابێ هاوبەشپەیدا کەران‌و موسوڵمانان پێکەوە حەج بکەن، واتە: ئیتر لەمرۆ بەدواوە فرەخوانەیەن بۆ حەج (تیرمیزی بەڕشتەیەکی جوان گێڕاویەتیەوە. ت/٢٠١/٥ = تاج-٤ ز-١٠ ژ-٣٨٩٥ چ-٤).

٢٣٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْـهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ غَزَا خَيْبَرَ فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلَاةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ حَسَرَ الْإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاض فَخِذ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ

الْمُنْذرِينَ قَالَهَا ثلَاثا قَالَ وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ يَعْنِي الْجَيْشَ قَالَ فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً فَجُمِعَ السَّبْيُ فَجَاءَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ قَالَ اذهَبْ فَخُذ جَارِيَةً فَأَخَذ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيّ فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيّ سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ لَا تَصْلُحُ إِلَّا لَكَ قَالَ ادْعُوهُ بِهَا فَجَاءَ بِهَا فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ خُذ جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ غَيْرَهَا قَالَ فَأَعْتَقَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَزَوَّجَهَا فَقَالَ لَهُ ثابِتٌ يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا قَالَ نَفْسَهَا أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا حَتَّى إِذا كَانَ بِالطرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنْ اللَّيْلِ فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرُوسًا فَقَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ وَبَسَط نِطعًا فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ قَالَ وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذكَرَ السَّوِيقَ قَالَ فَحَاسُوا حَيْسًا فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ٣٧١ أطرافه في: ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٥٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣).[٢٠١]

**ئیمامی ئەنەس** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **سوپای ئامادە کردو بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ، تاریکولێڵەکە لەپاڵ قەڵای خەیبەردا نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **سواری وڵاخەکەی بوو، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **وڵاخەکەی خۆی بەناو کووچەو کۆڵانەکانی خەیبەردا غار دەدا، منو ئەبوطەلحە لەنزیکی پێغەمبەرەوە بووین، تەنانەت**

---

(٢٠١) أخرجه مسلم في الحج، باب: فضل المدينة وفى الجهاد والسير، باب: غزوة خيبر، رقم: ١٣٦٥.=٣٤٨٢ شيحا.

کەشکەژنۆم لەپاشکۆی ئەبوطەلحەوە دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ): جالەئەنجامی ولاخ تاو دانو جەنجاڵیو پاڵەپەستۆدا رانی پێغەمبەر رووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپێدەی رانی پێغەمبەرم بینی.

کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی هەڵ رژانە ناو گوندەکەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ): ئەڵلاهوئەکبەر، وێران بوو خەیبەر، لەڕاستی دا ئێمە هەرکاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەوتۆقیوانە بەیانی رۆژی ڕەشیانە) وەئەم فەرمایشتەی سێ جار دووبارە کردەوە، کەئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ} ١٧٧/٣٧ - واتە: کاتێ تۆڵەی سەختی خودا بەردەرگا بەهۆزی بێبڕوا دەگریو، لەهەموولاوە گەمارۆیان دەدا، ئیتر ئەو گەلە تۆقیوانە سەرلەبەیانی رۆژی رەشیانە). فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان ئاگایان لەم هەڵمەتە نەبوو، سەرلەبەیانی وەك رۆژانی تر وەدەرکەوتن بۆسەر مەزراو ئیشو کاری رۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی سوپای ئیسلاما، جاهاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! ئەمە موحەممەدو سوپاکەیەتی، هاتوون بۆسەرمان.

ئەنەس فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بەزەبری بازوو لەچنگی دوژمن رزگار کرد. کاتێ ژنە دیلەکان کۆ کرانەوە، دەحیەی کەلبی هاتە خزمەتی حەزرەت عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ژنە تالانییانە کەنیزەکێکم پێ بدە، فەرمووی: (برۆ کەنیزەکێ ببە). دەحیە پیاوێکی قۆزی شۆخ بوو، زۆر جاران جوبرائیل لەشێوەی ئەودا دەهات بۆخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و سرووشی بۆ دەهێنا، دەحیە چوو، صەفییەی کچی حویەی برد بۆ خۆی بەڵام پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حویەی، کەخانمی ژنانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەظیرە، داوتە بەدەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەوخانمە خانەدانە بۆکەسی تر دەست نادا مەگەر بۆ تۆئەی

پێغەمبەری خودا!) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی دەحیە بانگ کەن ئەو ژنە بهێنێ) دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بەدەحییەی فەرموو: (بڕۆ لەو ژنگەلە بەتاڵانی گیراوانە کەنیزەکێکی تر بەرە بۆخۆت).

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازاد کردو مارەی کرد بۆخۆی، ثابیتی بەنانی بەئیمامی ئەنەسی فەرموو: ئەی باوکی حەمزە! چی کرد بەمارەیی بۆی؟ فەرمووی: خودی خۆی کرد بەمارەیی بۆی، لەپێشا لەباتی مارەیی ئازادی کردو ئەوسا مارەی کرد لەخۆی، جاکاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەڕێگە شەوێ ئومموسولەیمی دایکم تەدارەکی بووکی بۆ صەفییە خستو جیازی ی بووکی بۆ کردو کردی بەبووك و پێشکەشی کرد بە پێغەمبەر، بۆبەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوا بوو. ئەوسا فەرمووی: (هەرکەسێ خۆراکی هەیە بابچێ بیهێنێ)، نانی شایی یەکەی برێتی بوو لەوە، کە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمانی کرد، سفرەیەکیان ڕاخست، ئیتر هەرکەس لەلای خۆیەوە هەنێ خورما، یاڕۆن، یاقاوت، یاکەشکی هێناو هەڵیان ڕشتە سەری و کردیان بەخورماوڕۆن و، دەستیان کرد بەنۆش کردنی، ئیتر هەرئەوە نانی شایی یەکەی بوو. (ت/٣/٩٣/٣ = تاج-٢ ز-٤٠ ژ-٢١٢٤ چ-٤ + تاج/٤ ص-٣٦٨، ص-٤٢٢).

**ڕوونکردنەوە:**

خەیبەر قەڵایەکی قایم بوو، بەدەستی هۆزی جوولەکەوە بوو، جێگەی هۆزی بەنوقورەیظەو بەنی نەظیر بوو، لەخۆرهەڵاتی باکووری مەدینەوەیە، شەش قۆناغ لەمەدینەوە دوورە، باخەخورمای زۆر بوو، ساڵی حەوتی کۆچی ئازادکرا، ئەبوطەلحە مێردی ئومموسولەیمی دایکی ئەنەسی نۆکەری پێغەمبەرە، ناوی زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری یە، ئامادەی شەوی پەیمانی عەقەبە بووە، یەکێکە لە(نوقەبەکان) ی ئەو پەیمانە، ئەوەدو دوو

فـەرموودەی هەیـە، بوخـاری سیانیانی گێڕاوەتـەوە، ئەنـەس زڕکوڕی بـوو. لەپاش مەرگی پێغەمبەر ئەبوطەلحە چل ساڵ لەسەریەك بەڕۆژوو بوو، بـەس لەدوو جەژنەکانا ڕۆژووی دەشکان.

٢٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنها) قَالَتْ: (لَقَدْ كَـانَ رَسُـولُ اللّـهِ صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الْفَجْرَ فَيَشْهَدُ مَعَهُ نِسَاءٌ مِنْ الْمُؤْمِنَاتِ مُتَلَفِّعَاتٍ فِي مُـرُوطِهِنَّ ثـمَّ يَرْجِعْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ مَا يَعْـرِفُهُنَّ أَحَـدٌ). (الحـديث ٣٧٢ أطرافـه في: ٥٧٨، ٨٦٧، ٨٧٢)*.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفـەرموێ: بـەخودا گـەلێ جار وادەبـوو کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتی نوێژی بـەیانی بـۆ دەکـردین، هەنـدێ ژنـی بـڕوادار، چارۆکەیێ، یاشاڵینەیێ، یابالاپێچێکی دەپێچا لەخۆیـەوەو ئامادەی ئـەو نوێـژە دەبـوو لەپـشت پێغەمبـەرەوە، کـاتێ لـەپاش کردنـی جەماعـەت ژنـەکان بـەو شـێوەیە دەگەڕانـەوە بـۆ مـاڵی خۆیـان، کەچـی هێـشتا لەڕێگـە لەبـەر تاریکولێڵەکە، کەس نەیدەناسینەوە. (ت/١/١٩٦/٥ = ز-٤٧ ژ-٣٥٢).

٢٣٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قالَتْ: (أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ فَنَظَـرَ إِلَـى أَعْلَامِهَـا نَظـرَةً فَلَمَّـا انْـصَرَفَ قَـالَ اذهَبُـوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّـةِ أَبِـي جَهْـمٍ فَإِنَّهَـا أَلْهَتْنِـي آنِفًـا عَـنْ صَلَاتِي). (الحديث-٣٧٣ طرفاه في: ٧٥٢، ٥٨١٧).[٢٠٢]

عائیشه (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی دەکـرد، کراسێکی خوری گوڵ گوڵی لەبـەردا بـوو، لـەناو نوێژەکـەدا سـەرەنجێکی گوڵو نـەخشەکانی دا، کاتێ لەنوێژەکە بۆوە فـەرمووی: (گـوڵو نـەخشی ئـەم کراسـە

* مسلم. صلاة. ١٤٥٥-١٤٥٧.

(٢٠٢) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: كراهة الصلاة في ثوب له اعلام، رقم: ٥٥٦=.١٢٣٨.

خەریکیان کردمو نەیانهێشت لەناو نوێژەکەدا باش دڵ بدەمە نوێژەکەم، کەوابوو ئەمە ببەنەوە بۆئەبوجەهم خۆیو کراسە ئەنبیجانی یە سادەکەی ئەو بێنن بۆمن). (ت/١/٢٩٨/ ٦ ز-٩٦ ژ-٥٧٧ = ش/د).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەبوجەهم هاوڕێیەکی ناوداری پێغەمبەرە، کراسێکی گوڵ گوڵی خوری بەدیاری دەدا بە پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەو هۆیەی کەباس کرا، کراسەکە دەنێرێتەوە بۆئەبوجەهم. بەڵام لەبەرئەوەی بەهۆی گەڕانەوەی دیاریەکەیەوە بۆی دلگیر نەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای لێ دەکا کەبیگۆڕێتەوە بەکراسێکی سادەی بێ نەخش بۆی.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کەئەو نەخشو نیگارو نووسینو وێنانەی کەوان بەمیحرابو دیواری رووی قیبلەی مزگەووتەوە هەمووی کارێکی ناباشن، نەبوونیان گەلێ چاکترە، بگرە ئەگەر بکرێ فەرشو رایەخی ناو مزگەوتیش هەتا سادەو بێ نەخشو نیگاربێ باشترە. بەڵام هەرچۆن بێ بەم جۆرەشتانە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە.

٢٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمِيطِي عَنَّا قِرَامَكِ هَذا فَإِنَّهُ لَا تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِض فِي صَلَاتِي). (الحديث-٣٧٤ طرفه في: ٥٩٥٩)*.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عائیشە پۆپەشمینێکی هەبوو، وێنەی لێ نەخشا بوو، کردبووی بەپەردە بۆ کولێنی ناوماڵەکەی خۆی، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی دی پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! ئەم پۆپەشمینەی

---

* مسلم. لباس. ٥٤٩٤.

خۆتمـــان لـــێ دووربخـــەرەوە، چـــونکە لـــەناو نوێژەکـــەم دا وێنـــەکانی دێنەبەرچاوم!). (ت/١٦٠/٤/٣ = تاج-٣ ز-٥٠ ژ-٢٩١٥).

٢٣٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُّوجُ حَرِيرٍ فَلَبِسَهُ فَصَلَّى فِيهِ ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ وَقَالَ لَا يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ). (الحديث-٣٧٥ طرفه في: ٥٨٠).[٢٠٣]

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کەوایەکی چاکداری ئاوریشمیان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودی لەسەر بێ) لەبەری کردو نوێژی پێوەکردو لەپاشا کەسڵاوی دایەوەو ڕووی لەڕوگە نەما، بەتوندی کەواکەی لەبەر خۆی داکەندو فڕەی دا، وەك یەکێ حەزی لێ ی نەبێ، ئەوجا فەرمووی: (ئەمە بۆپیاوی لەخواترس دەست نادات!). (ت/١/٢١٦/٤ = ز-٥٥ ژ-٣٩٩).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

وشەی (انصرف) لەم شوێنانەدا مەعنای وایە: نوێژکەر نوێژەکە تەواو دەکاو سڵاو دەداتەوەو ڕووی لەڕووگە نامێنێ.

چەمكو مەفهوومی ڕستەی (ئەمە بۆ پیاوی لەخواترس دەست نادا) مەعنای وانییە کەبۆ موسوڵمانی ئاسایی گوناهباری لەخوانەترس دەست دەدا، چونکە ئەم جۆرە دەربڕینو تەعبیرانە بۆتەئکیدی مەنطووقە، نەك بۆبەیانی دەلالەتی مەفهووم.

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی پەنجاوپێنج فەرموودەی هەیە، لەصەحیحی بەخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، والی موعاویە بوو لەسەر وڵاتی میصر، ساڵی پەنجاوهەشتی کۆچی لەمیسر مردووە.

(٢٠٣) أخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: تحريم استعمال إناء الذهب والفضة، رقم: ٢٠٧٥.

٢٤٠- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ وَرَأَيْتُ بِلَالًا أَخَذ وَضوءَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذاكَ الْوَضوءَ فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيْئًا أَخَذ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ ثمَّ رَأَيْتُ بِلَالًا أَخَذ عَنَزَةً فَرَكَزَهَا وَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مُشَمِّرًا صَلّٰى إِلَى الْعَنَزَةِ بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ وَرَأَيْتُ النَّاسَ وَالدَّوَابَّ يَمُرُّونَ مِنْ بَيْنِ يَدَيْ الْعَنَزَةِ). (الحديث-٣٧٦ طرفه في: ١٨٧).[٢٠٤]

ئەبوجوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بیلالم بینی بانگی دەدا، بەدەم بانگدانەکەوە دەخولایەوەو، ئەملاولای دەکردو، دەمی خۆیی بەڕاستو بەچەپا دەسووڕاند، وەدوو پەنجەی خۆشی نابوونە ناو دوو کونەگوێ ی خۆی، تادەنگی تەواو بەهێزبێو بەهەرچوارلادا بگا، لەوکاتەدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو چادرێکی سووری چەرمینا بوو کەهی خۆی بوو، هەروا بیلالم دی ئاوی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری پێ بوو، چاوم لێ بوو خەلکەکە پاشماوەی ئەو ئاوەیان دەقۆستەوە، جائەوانەی کەلەو ئاوەیان دەست دەکەوت، یەکسەر بۆ مووفەڕکی دەیانسوی لەخۆیانو لەسەروچاویانو خۆیان پێ موبارەك دەکرد، بەڵام ئەوانەی کەلەوئاوەیان دەست نەدەکەوت، لەتەڕی ی دەستی هاوڕێ یەکی خۆی دەستی خۆی ی تەڕ دەکردو، بۆ مووفەڕك دەیانسووی لەخۆیانو خۆیان پێ پیرۆز دەکرد، ئەنجا بیلالم بینی نێزەیەکی هێنا، لەزیخەڵانەکەی بەطحادا دایچەقاند، کردی بەبەربەست (سوترە) بۆ نوێژەکە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەلەچادرەکە هاتە دەرەوە بۆ نوێژگاکە، دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، هەردوولاقی تانیوەی هەلکردبوو، بەرەو نێزەکە نوێژی دابەست، نوێژی نیوەڕۆی بەدوو رکات بەقەصرو جەمعە تەقدیم بۆ کردین،

---

(٢٠٤) أخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٤/٩٩/٤٢) المترجم. = ١١٢٠ شيحا.

ئەوجا نوێژی عەصریشی بەدوو ركات، بەكۆكردنەوەی كورتەوە كراو، بۆ كردین.

ئیتر لەودیو نێزەكەوە سەگو كەرو ئاژەڵو ماڵاتو خەڵك بەبەرنوێژی جەماعەتەكەدا ئاموشۆیان دەكردو قەدەغەنەدەكران. (ت/١/ ٢٢٨/ ٤+ل /٢٤١/ ٢+ز- ٧١ ز-٦١ ژ-٤٢٥ + ژ-٤٦٣، ٤٦٤، ٤٦٥، ٤٦٦).

## راڤەو شیكردنەوە:

ئەبوجوحەیفە (رەزای خوای لێ بێ) چلو پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، دوانیان پەسەندی هەردووپیرن، بوخاری دوانیانی بەجیا گێڕاوەتەوە، موسلیمیش سیانیان، كۆی فەرموودەكانی لەصەحیحەین دا دەكاتە: ٢+٢+٣= ٧ فەرموودە. ئیمامی عەلی زۆری خۆش دەویست، جێگەی متمانەی بوو، كردی بەبەرپرسی بەیتولمال لەكووفە، لەهەموو شەڕگەكانیدا لەگەڵیدا بوو.

عەونی كوڕی ئەبوجوحەیفە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: جارێ تریتی گەنمو گۆشتم خواردبووو چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەوێ قرقێنەم دەهات، فەرمووی: (ئەبوجوحەیفە! ئەم قرقێنەیە هەڵبگرەبۆكاتێكی تر، چونكە ئەوانەی كەلەم جیهانەدا زیاتر تێرن، لەرۆژی قیامەتا لەهەموو كەسێ پتر برسێتییان درێژە دەكێشێ. عەون فەرمووی: ئیتر لەوەدوا باوكم هەتا مرد تێرسكی خۆی نەخوارد، ئەگەر نانی ناشتای بخواردایا نانی شێوانی نەدەخوارد، ئەگەر نانی شێوانی بخواردایە نانی بەیانی نەدەخوارد. بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: ١٤٠)

٢٤١–عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) وقَدْ سُئِلَ: (مِنْ أَيِّ شَيْءٍ الْمِنْبَرُ؟ فَقَالَ مَا بَقِيَ بِالنَّاسِ أَعْلَمُ مِنِّي هُوَ مِنْ أَثْلِ الْغَابَةِ عَمِلَهُ فُلَانٌ مَوْلَى فُلَانَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ عُمِلَ وَوُضِعَ

فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ كَبَّرَ وَقَامَ النَّاسُ خَلْفَهُ فَقَرَأَ وَرَكَعَ وَرَكَعَ النَّاسُ خَلْفَهُ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ ثُمَّ رَجَعَ الْقَهْقَرَى فَسَجَدَ عَلَى الْأَرْضِ ثُمَّ عَادَ إِلَى الْمِنْبَرِ ثُمَّ رَكَعَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ ثُمَّ رَجَعَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ بِالْأَرْضِ فَهَذَا شَأْنُهُ). (الحديث: ٣٧٧ أطرافه في: ٤٤٨، ٩١٧، ٢٠٩٤، ٢٥٦٩).[٢٠٥]

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خوای لێ بێ) پرسیاری لێ کرا: ئایا دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەچی دروست کرابوو، فەرمووی: کەسێ نەماوە کەلەمن لەم باسەیە باشتر بزانێ، دارەکەی لەتەرگەز (ئەثل) ی جەنگەڵەکەی نزیکی مەدینە بوو، کەناوی ئەلغابەیە، دارتاشێ دروستی کرد، رەنجبەری ژنێ بوو، کاتێ تەواو بوو، وەلەجێگەی خۆی دانرا، پێغەمبەر چووە سەری‌و لەسەری راوەستاو، وتاری هەینی خوێندەوە، ئەوجا لەسەر مینبەرەکە نوێژی دابەست، لەپێشا رووی کردە رووگەو، ئەڵلاهوئەکبەری نوێژدابەستنی کرد، نوێژ خوێنەکانیش لەپشتیەوە ریزراوەستان‌و نوێژیان بەجەماعەت دابەست، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە قورئانخوێندنی رکاتی یەکەم، کەتەواوی کرد روکوعی برد، خەڵکەکەیش لەخوارەوە کەلەپشت ئەوەوە ریزبوو بوون لەگەڵ ئەودا روکوعیان برد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری لەچەمینەوە بەرز کردەوە، نوێژخوێنەکانیش سەریان لەچەمینەوە بەرزکردەوە، ئینجا پێغەمبەر پشتاوپشت لەدوانگەکە دابەزی، رووی لەرووگە وەرنەچەرخان، هەتا گەیشتە خوارەوەو، لەسەر زەوییەکە دوو کوڕنووشی برد، دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆسەر مینبەرەکەو، دەستی کرد بەقورئانخوێندنی رکاتی دووەم، دیسان کەتەواوی کرد لەسەر مینبەرەکە روکوعی برد، خەڵکەکەیش لەگەڵیدا روکوعیان برد، ئەوجا پێغەمبەر سەری لەچەمینەوەی رکاتی دووەم

---

(٢٠٥) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: جواز الخطوة والخطوتين في الصلاة، رقم: ٥٤٤=١٢١٧.

بـەرزکردەوە، نوێژخوێنـەکانیش هـەروا، دیـسانەوە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) پشتاوپـشت لەدوانگەکـە دابـەزی یـەوە، لەسـەر زەوییەکـە دوو کڕنووشی تـری بردەوە، خەڵکەکـەیش هـەروا، هـەتا لەسـەر ئـەم شێوەیە نوێژەکەی بۆیـان تـەواو کـرد، ئـەوجا رووی کـردە خەڵکەکـەو فـەرمووی: (ئـەی موسـوڵمانەکان! ئەمـەم لەبەرچـاوی ئێـوە لەسـەر ئـەم شێوەیە کـرد هـەتا لەنوێـژکردن دا خـۆم بکـەن بەسـەر مەشقو چـاو لـەمن بکـەنو، چۆنێتی نوێـژ لـەخۆم فێـرببن!) ئەمـەبوو داسـتانی دوانگەکـە. (ت/١/٣٦٤/٣/٢/٣+ت/٤/٣٤٧/١/٢+ صـەحیحی موسـلیم، شـەرحی نەوەوی/٥/٣٣ = ز-١١٩ ژ-٧٣٠ + تاج-٣ ز-١٠٩ ژ-٣١٨٣، ٣١٨٤ ج-٤).

٢٤٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِطعَامٍ صَنَعَتْهُ لَهُ فَأَكَلَ مِنْهُ ثمَّ قَالَ قُومُوا فَلِأُصَلِّ لَكُمْ قَالَ أَنَسٌ فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدْ اسْوَدَّ مِنْ طولِ مَا لُبِسَ فَنَضحْتُهُ بِمَاءٍ فَقَامَ رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَفَفْتُ انا وَالْيَتِيمَ وَرَاءَهُ وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ انْصَرَفَ). (الحديث- ٣٨٠ أطرافه في: ٧٢٧، ٨٦٠، ٨٧١، ٨٧٤، ١١٦٤).[٢٠٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مولەیکەی نەنکم نانی دروست کـرد بـۆ پێغەمبـەرو بـانگی کـرد، کەتەشـریفی هـاتو نـانی خـوارد، ئـەوجا فـەرمووی: (ئـادەی هەسـتن بـادوو رکـات نوێـژی سـوننەتتان لەماڵەکـەتانا بـۆ پیرۆزی بەجەماعەت بۆ بکەم). ئەنەس فەرمووی: حەسیرێکمان هـەبوو لەبـەر راخستنی زۆر کۆن بوو بوو، رەنگی رەش بـوو بـوو، منـیش چـووم ئـەو پارچـە حەسـیرەم مـاڵیو ئـاوم لێ پرژانـد، ئـەوجا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەبەردەممانەوە لەسەر حەسیرەکە راوەستاو، نوێژی دابەست، منو ضەمیرەی

---

(٢٠٦) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: جواز الجماعة في النافلة رقم: ٦٥٨.=١٥٠٠ شيحا.

کوڕی ئەبوضەمیرەیش کەئەو وەختە هەتیو بوو، لەپشتیەوە بووین بەڕیزێ، پیرێژنەکەی ئەنکیشم لەپشت ئێمەوە بەتەنیا نوێژی بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە دابەست، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەرخاتری ئێمە دوورکات نوێژی بەجەماعەت کرد، ئەوجا لەپاش تەواوکردنی نوێژەکە تەشریفی گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی. (ت/١/٣٨٩/٣ ز-١٢٩ ژ-٧٧٥).

## راڤەو شیکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا ئەم بەهرانەی تیادایە: جەماعەت لەنوێژی سوننەتا دروستە، لەماڵیشا جەماعەت دروستە، سوننەتە جێگە نوێژ بماڵرێو پاك رابگیرێ، دروستە منداڵ لەریزی پیاوانا راوەستێ، بەپیاوێكو منداڵێ ڕیز دروست دەبێ، کەسێ بەتەنیا خۆی راوەستێ، لەناو ڕیزدا نەبێ، نوێژەکەی دروستە، نوێژی منداڵی فامیدە دادەمەزرێ، هەروا دەسنوێژی، نوێژ لەسەر حەسیر دروستە، لەماڵی خاوەن دەعوەتا نوێژ بکرێ بۆ مووفەڕكو پیرۆزی.

٢٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا قَالَتْ: (كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ فَإِذا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضتُ رِجْلَيَّ فَإِذا قَامَ بَسَطْتُهُمَا قَالَتْ وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ). (الحديث: ٣٨٢ أطرافه في: ٣٨٣، ٣٨٤، ٥٠٨، ٥١١، ٥١٢، ٥١٣، ٥١٤، ٥١٥، ٥١٩، ٩٩٧، ١٢٠٩، ٦٢٧٦).[٢٠٧]

عائیشەی هاوسەری حەزرەت (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر عائیشە بێ) دەفەرموێ: جاری وادەبوو لەبەردەمی پێغەمبەردا لەسەر نوێنەکەم دەخەوتم، پێغەمبەریش لەهەمان نوێن نوێژی دەکرد، هەردوو قاچیشم لەوکاتەدا لەرووی رووگەوە لەجێ سووژدەکەیدا دەبوو،

(٢٠٧) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: الاعتراض بين يدى المصلى، رقم: ٥١٢=١١٤٥.

جاكەدەيويست با بەدەست تێوەی دەژەندم، منيش قاچم هەڵدەكێشا تاسوژدەكەی تەواو دەكرد جائەو هەڵ دەسايەوە منيش ديسانەوە قاچم رادەكێشايەوە، ئەوسەردەمە هێشتا ماڵەكانمان چرای تيانەبوو، لەبەرئەوە نەم دەزانی كەكەی كوڕنووش دەبا، دەنا پێش ئەوەی تێوەم بژنێ جێ كوڕنووشەكەم بۆی چۆڵ دەكرد. (ت/١/٢٤٤/٥ = ز-٧١ ژ-٤٦٧).

٢٤٤- وعَنها (رَضي اللهُ عَنْها) ( أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي وَهِيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ اعْتِرَاض الْجَنَازَةِ). (الحديث: ٣٨٥ طرفاه في: ٥٤٢، ١٢٠٨).[٢٠٨]

ديسان فەرمووی: جاری وا دەبوو پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنی نووستنەكەی خۆی‌و خێزانەكەی نوێژی شەونوێژی دەكرد، لەوكاتەدا من لەبەردەميدا، لەنێوانی پێغەمبەرو رووگەكەيدا رادەكشام، رێك وەك شێوەی دانانی تەرم لەبەردەمی كەسێكا نوێژی مردووی لەسەربكا ئاوا (ت/١/٢٤٤/٤ = ز-٧١ ژ-٤٦٦).

٢٤٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضعُ أَحَدُنَا طَرَفَ الثوْبِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ فِي مَكَانِ السُّجُودِ). (الحديث-٣٨٦ طرفه في: ٥٨٥).[٢٠٩]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران كاتێ نوێژی نيوەڕۆمان بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا دەكرد، رێ دەكەوت قرچەی نيوەڕۆ بوو، لەبەرگەرمی ی شوێن كوڕنووشەكە، لەسەر چمكی جلی خۆمان كوڕنووشمان دەبرد

---

(٢٠٨) اخرجه مسلم (عينى/٤/١١٥/٤٩) المترجم.=١١٤٢.

(٢٠٩) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب تقديم الظهر، رقم: ٦٢٠. = ١٤٠٦ شيحا.

٢٤٦- وعنه أنهُ سئلَ: (أَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ قَالَ نَعَمْ). (الحديث-٣٨٧).[٢١٠]

لەئیمامی ئەنەس پرسیارکرا: ئایا پێغەمبەر بەپێڵاوەوە نوێژی دەکرد یانا؟ فەرمووی: بەڵێ بەپێڵاوەوە جارجارە نوێژی دەکرد.

٢٤٧-عَنْ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنهُ بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ ثمَّ قَامَ فَصَلَّى فَسُئِلَ فَقَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَنَعَ مِثلَ هَذا قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَكَانَ يُعْجِبُهُمْ لِأَنَّ جَرِيرًا كَانَ مِنْ آخِرِ مَنْ أَسْلَمَ).[٢١١]

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) جارێ گمیزی کردو خۆی پاك کردەوەو ئەوجا دەستنوێژی گرتو، لەباتی شۆردنی قاچەکانی دەستی تەڕی بەسۆلەکانیدا هێناو، ئەوسا هەڵسا بەسۆلەکانیەوە نوێژی کرد، جاپیاوێ رەخنەی لێ گرتو لێ ی پرسی: چۆن شتی وادەکەی؟ پێت ناشۆرێو، بەپێڵاوەوە نوێژ دەکەی؟ فەرمووی: بۆنایکەم، من بەچاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان شتی کردووە موسوڵمانان ئەم فەرموودەی جەریریان زۆر بەدڵ بووو چونکە بەڵگەی بڕیارەکەی هەڵنەوەشاوەتەوە، چونکە جەریر لەدوا هاتنی ئایەتی دەسنوێژ کەوا لەسوورەتی مائیدەدا ئیسلام بووە، ئەمەیش واتای وایە دەسهێنان بەسۆلدا کەلەپێش هاتنی ئەم ئایەتەدا هەبوە نەسخ نەبۆتەوە بەهاتنی ئەم ئایەتە

٢٤٨-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكِ بن بُجيْنَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاض إِبْطَيْهِ). (الحديث-٣٩٠ طرفاه في: ٨٠٧، ٣٥٦٤).[٢١٢]

---

(٢١٠)أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: جواز الصلاة في نعلين، رقم: ٥٥٥=١٢٣٦.

(٢١١) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: المسح على الخفين، رقم: ٢٧٢=٦٢١.

عەبدوڵلای کوڕی مالیك، کەبەناوی دایکیشیەوە ناودەبرێو پێی دەگوترێ: ئیبنو بوحەینە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنوێژی دەکرد، لەناو کوڕنووشدا، هەردوو باڵی خۆی بڵاو دەکردەوە، تەنانەت جاروبار سپیدەی بنباخەڵی دەردەکەوت.

## ڕوونکردنەوە:

بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ـ١٨٢ ـ باسی ژمارە ـ ٦٦. عەبدوڵلای کوڕی مالیك یەکێکە لەهاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوحەینەی دایکیشی صەحابییە بووە، دەڵێن: باوکیشی لەهاوڕێ یانی پێغەمبەر بووە، لەهۆزی ئەزدە، لەمێژەوە موسوڵمان بوو بوو، پیاوێکی سۆفیلکەی خواپەرست بوو، ئەم زاتانە فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە: ئەعرەجو حەفصی کوڕی عاصمو عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی بوحەینە، لەئاخرو ئۆخری جێنشینی ی موعاوییەدا، لەکاتی فەرمانڕەوایی مەڕوان لەسەر مەدینە، لەپەنجاو شەشی کۆچیدا مردووە، بڕوانە: (ف ـ ٤٤٥).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ١٠) باسەکانی ڕووگە (أبواب القبلة)

٢٤٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ صَلّٰى صَلَاتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا وَأَكَلَ ذبِيحَتَنَا فَذلِكَ الْمُسْلِمُ الّٰذي لَهُ ذمَّةُ اللّٰهِ وَذمَّةُ رَسُولِهِ فَلَا تُخْفِرُوا اللّٰهَ فِي ذمَّتِهِ).

---

(٢١٢) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: مايجمع صفة الصلاة، رقم: ٤٩٥. = ١١٠٥.

ئەنــەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفــەرموێ: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفــەرموێ: (هەرکەسێ وەك خۆمان ئەم نوێژەی ئێمەیە بکاو وەك خۆمـان ڕووبکاتـە ئـەم قیبلەیـەی ئێمەیـەو، وەك خۆمـان لەگۆشـتی گیانلەبەرێ بخوا کەئێمـە سـەری بـبڕین، ئـیتر ئـەو کەسـە موسـوڵمانی تـەواوەو، لـەئامانی خـوداو، لـەئامانی پێغەمبەری خودادایە، کەوابوو ئیتر ئێوەیش ئامان‌و پەیمانی خودا ببەنەسەر، وەناپاکی لەو موسوڵمانە مەکەن) (ت/١/٢١٠/١ ز-٥٣ ژ-٣٨٦).

٢٥٠- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) (أَنهُ سُئل رَجُلٍ طـافَ بِالْبَيْـتِ الْعُمْـرَةَ وَلَمْ يَطفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَيَأْتِي امْرَأَتَهُ فَقَالَ قَدِمَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَطافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ وَطافَ بَـيْنَ الـصَّفَا وَالْمَـرْوَةِ وَقَـدْ كَانَ لَكُمْ فِـي رَسُـولِ اللّٰهِ أُسْـوَةٌ حَـسَنَةٌ). (الحـديث ٣٩٥ أطرافـه في: ١٦٢٣، ١٦٢٧، ١٦٤٥، ١٦٤٧، ١٧٩٣).[٢١٣]

لەئیبنوعومــەر (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسـیارکرا: پیـاوێ لـەکاتی کردنـی عـەمرەدا تەواف بەیت بکا، بەڵام هاموشۆی نێوانی سەفاو مـەڕوا نـەکا، ئایا بـۆی هەیـە لەگــەڵ ژنەکــەی دا دروســت بــبێ؟ فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەتەشریفی بـرد بـۆ مەککە حـەوتجار بـەدەوری بەیـتدا هەڵسوڕا، وەلەپـشتی مــەقامی ئیبراهیمــەوە دوو ڕکـات نوێــژی تــەواف کــرد، وەحــەوت جـاریش لەناوەنـدی سـەفاومەڕوەدا هاتوچۆی کـرد. ئنجـا بۆئـەوەی کەبەباشـی بـزانین کەئەمـە یاسـای ڕەسـای ئایینـەو پـەیڕەوی کردنـی مەبەسـتە، ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (لقـد کـان لکـم في رسـول الله أسـوة حـسنة) واتـە: لەڕاسـتی دا پێغەمبـەری خـودا ڕەهبـەرو سەرمەشـقێکی هـەرە جوانـە بۆئێـوە، وەشـایانی ئەوەیـە کـەئێوە چـاوی لێ بکـەن‌و، هـەنگاو بەهـەنگاو بـست بەبـست شـوێنی بکەون). (ت/٢/١٩١/ ٣ ز-٩٧ ژ-١٥٥٥ چ-٤).

---

(٢١٣) أخرجه ومسلم في الحج، باب: مايلزم من احرم بالحج، رقم: ١٢٣٤.=٢٩٨٩.

٢٥١- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (لَمَّا دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا وَلَمْ يُصَلِّ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ وَقَالَ هَذِهِ الْقِبْلَةُ). (الحديث: ٣٩٨ أطرافه في: ١٦٠١، ٣٣٥١، ٣٣٥٢، ٤٢٨٨).[٢١٤]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە، کەناودارە بەفەتحی مەککە، کەپێغەمبەرو کۆمەڵێ لەیارانی چوونە ناومالّی کابەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو هەموو لایەکی ناو کابەدا نزای کردو لەخودا پاڕایەوە، بەڵام بەپێی ئاگاداری من کەلەئوسامەی کوڕی زەیدم وەرگرتووە، نوێژی لەناویدا نەرکردووە، هەتا دێتەدەرەوە، کەدێتە دەرەوە بەرەوڕووی ڕووگە (موقابیلی قیبلە) دوورکات نوێژی سوننەت دەکا، وە دەفەرموێ: (ئەمە رووگەی موسوڵمانانە، ئەو قیبلە یەیە کە لەنوێژدا رووی تێ دەکەن). (ت/٢/٢٧٢/٢ ژ-١٧٢٠ ز-١٣٥).

## روونکردنەوە:

ئیمامی بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ) گەلێ جار بەگێڕانەوەی فەرموودەیێ، ئامازەی بۆ مەبەستێکی تریش کردووە، کەلەڕۆژگاری ئەودا قسەی لێ کراوەو، لەناو کۆڕی زاناکاندا قسەی جیاجیای لێ کراوەو، جاروباریش ڕاجیایی لەومەسەلەیەدا بەهۆی جیاوازیی شێوازی چەند فەرموودەیەکەوە پەیدا بووە. جاپێشەوا بوخاری بۆبەرپەرچدانەوە، یاوەڵامی ئەوجۆرە پرسیارو ڕاجیاجیانە، بەگێڕانەوەی فەرموودەیێ لەبارەیەوە ئامازەی کردووە، گەلێ جاریش بڕیارە شەرعیەکانی لەئامازەی فەرموودەکان وەرگرتووەو، فەرموودەکەی کردووە بەبەڵگە لەسەری، هەتا ئەوجۆرە ئامازەو وردەکارییەی بوخاری بووە بەسەرچاوە بۆ زۆر لەبڕیارە شەرعی یەکان و

(٢١٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب دخول الكعبة للحاج وغيره والصلاة فيها رقم: ١٣٣٠=٣٢٢٤.

گوتراوه (فقه البخاري في تراجمه). جالەسەر ئەم بنیاتە دەبێ فەرموودەكانی بوخاری رەچاو بكرێن

٢٥٢– عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَتَوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ وَقَالَ السُّفَهَاءُ مِنْ النَّاسِ وَهُمْ الْيَهُودُ مَا وَلَّاهُمْ عَنْ قِبْلَتِهِمْ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا قُلْ لِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاط مُسْتَقِيمٍ فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ مَا صَلَّى فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنْ الْأَنْصَارِ فِي صَلَاةِ الْعَصْرِ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَقَالَ هُوَ يَشْهَدُ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَّهُ تَوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ فَتَحَرَّفَ الْقَوْمُ حَتَّى تَوَجَّهُوا نَحْوَ الْكَعْبَةِ). (الحديث ٣٩٩ طرفه في: ٤٠).[٢١٥]

تەرجەمەكەی لەپێشەوە رابورد، بڕوانە فەرموودەی ژمارە : (٣٨)

٢٥٣–عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ فَإِذا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ). (الحديث ٤٠ أطرافه في: ١٠٩٤، ١٠٩٩، ٤١٤٠).

جابیر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری ولاخ، نوێژی سوننەتی دەكرد، بەمەرجێ ولاخەكە لەژێریا رووی لەشوێنی مەبەست بوایە، بەلام كەدەیویست نوێژی فەرزبكا، لەولاخەكە دادەبەزیو رووی دەكردە رووگەو نوێژی دادەبەستو نوێژەكەی بەتەواوی بەرەو رووگە تەواو دەكرد. (تیٚ/١/٢١٤/١/٢ ز-٥٤ ژ-٣٩٣، ٣٩٤).

(٢١٥) اخرجه مسلم في الصلاة، بڕوانه هامیشی ژماره: (٣٨).

٢٥٤-عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِبْرَاهِيمُ الراوي عن علقمة الراوي عن ابن مسعود: لَا أَدْرِي زَادَ أَوْ نَقَصَ فَلَمَّا سَلَّمَ قِيلَ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدَث فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ وَمَا ذاكَ؟ قَالُوا صَلَّيْتَ كَذا وَكَذا فَثَنى رِجْلَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثمَّ سَلَّمَ فَلَمَّا أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ قَالَ إِنَّهُ لَوْ حَدَث فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ لَنَبَّأْتُكُمْ بِهِ وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ فَإِذا نَسِيتُ فَذكِّرُونِي وَإِذا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتحَرَّ الصَّوَابَ فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ ثمَّ لِيُسَلِّمْ ثمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ). (الحديث: ٤٠١ أطرافه في: ٤٠٤، ١٢٢٦، ٦٦٧١، ٧٢٤٩).[٢١٦]

عەبدوڵلای کوری مەسعوود (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆ بۆ یارانی دەکا، ئیبراهیم کەئەم فەرموودەیە لەعەلقەمەوە، لەئیبنومەسعوودەوە دەگێڕێتەوە، لێ ی تێك چوو بوو، دەیفەرموو: نازانم: پێغەمبەر لەنوێژەکە زیاد دەکا، یالێ ی کەم دەکاتەوە. جاکاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سلاو دەداتەوە عەرزی دەکەن: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هیچ گۆڕانێ لەنوێژدا رووی داوە؟ فەرمووی: (بۆچی چی بووە؟) گوتیان: وا وانوێژت کرد، وەك رۆژان بەئاسایی نوێژت نەکرد. جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چۆك بەرەورووگە دانیشت، وەك بۆ تەحیات دابنیشێ ئاوا، وەدوو کڕنووشی هەڵەی برد، ئەوجا سلاوی دایەوە، پاشتر کاتێ رووی تێ کردین فەرمووی: (ئەگەر گۆڕانێ لەنوێژدا رووی بدایە پێم دەگوتن، منیش ئادەمیزادم وەکوو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیردەچێ منیش ئاوەها جاروبار شتم لەبیردەچێ، جائەگەر رێکەوت جارێ شتێکم لەیاد نەمابوو، ئێوە بیخەنەوە یادم، ئەگەر لەنوێژەکەتاندا گومانتان بۆ پەیدا بوو، وەك ئەوە کەنەتاندەزانی کەسێ رکاتتان کردووە یادووڕکات، ئەوە لەبارودۆخی وادا،

---

(٢١٦) أخرجه مسلم في المساجد وامواضع الصلاةى، باب: السهو في الصلاة والسجود له، رقم: ٥٧٢. = ١٢٨١.

بانوێژخوێن بەووردی بیربکاتەوەو، مشووری رووی بە راستی بخوات‌و جاچی بەڕاست دەزانێ لەسەرئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکات، ئەمجار سلاّو بداتەوە، ئەوجا دوو کڕنووشی هەڵە ببات) (ب/١/٣٢٧/٩ ز-١٠٩ ژ-٦٤٢ چ-٤).

٢٥٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاث فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّهِ لَوْ اتَّخَذنَا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلّى فَنَزَلَتْ وَاتَّخِذوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلّى وَآيَةُ الْحِجَابِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّهِ لَوْ أَمَرْتَ نِسَاءَكَ أَنْ يَحْتَجِبْنَ فَإِنَّهُ يُكَلِّمُهُنَّ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ وَاجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فِي الْغَيْرَةِ عَلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُنَّ عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ). (الحديث: ٤٠٢ أطرافه في: ٤٤٨٣، ٤٧٩٠، ٤٩١٦).

پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسایەی خوداوە لەم سێ مەسەلەیەدا رای من لەگەڵ فەرمانی پەروەردگاری گەورەما یەکی گرت، یەکەم: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە مەقامی ئیبراهیممان دەکرد بەنوێژگا. واتە: ئەو شوێنەی کەلەکاتی دروست کردنی کەعبەدا ئیبراهم تیادا رادەوەستا، دەمان کرد بەجێگەنوێژ، جابەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى)-بەقەرە. واتە: لەمەقامی ئیبراهیم جێگە نوێژ وەربگرن‌و نوێژی سوننەتی تیابکەن بۆ خۆتان، دوەم: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە فەرمانت دەکرد بەژنەکانت بەلەچك کردن‌و خۆداپۆشین، واتە: لەپیاوی بێگانە چارشێو بگرنەوە، یالەپشتی پەردەوە قسەو گوفتوگۆیان لەگەڵ دا بکەن، چونکە چاك‌و خراپ قسەیان لەگەڵ دەکەن، جابەم بۆنەیەشەوە ئایەتی حیجاب (بالاّ پۆشی) هاتەخوارەوە کە دەفەرموێ: (وإذا سألتموهن متاعا فاسألوهن من وراء حجاب)-ئەحزاب-٣٣/٣٥. واتە: کاتێ قسەو گوفتوگۆتان لەگەڵ ژنەکانی پێغەمبەردا کرد، وەك ئەوە داوای شتێکتان لێ کردن، لەپشتی پەردەوە، وەك دیوارو دەرگاو پەردەی ناوبارەگا، قسەیان لەگەڵ دا بکەن. سێیەم: کاتێ کەژنەکانی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرهەوێ باری یەکتری، کۆبوونەوەیان لە حەزرەت کرد، منیش پێم گوتن: (عسى ربه إن طلقكن أن يبدله أزواجاً خيراً منكن). جا لەم هۆیەشەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارێ: هیوا وایە ئەگەر تەلاقتان بدا خودا لەباتی ئێوە چەند ژنێکی باشتری پێ بدا).

بسم الله الرحمن الرحيم

## (١١) باسەکانی مزگەوت (أبواب المساجد)

٢٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى نُخَامَةً فِي الْقِبْلَةِ فَشَقَّ ذلِكَ عَلَيْهِ حَتَّى رُئِيَ فِي وَجْهِهِ فَقَامَ فَحَكَّهُ بِيَدِهِ فَقَالَ إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذا قَامَ فِي صَلَاتِهِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ فَلَا يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ ثُمَّ أَخَذ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَصَقَ فِيهِ ثُمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْض فَقَالَ: (أَوْ يَفْعَلُ هَكَذا). (الحديث:٤٠٥ طرفه في: ٤١ ٢)[٢١٧].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا بەڕووی قیبلەوە بەڵغەمێکی بینی،زۆری پێ ناخۆش بوو، جاهەڵسا بەشتێ بەدەستی خۆی کڕاندی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێوە کەلەناو نوێژدا دەبن ئەوە رازو قسەی نهێنیو گوفتوگۆ لەگەڵ خودای پەروەردگاری خۆتاندا دەکەن) یا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) : (ئەوە وەك ئەوە وایە کەخودا لەنێوانی ئەوو نێوانی رووگەدا بێ، کەوابوو لەڕووی ڕووگەوە تفو بەڵغەمو چڵم ڕۆمەکەن، بەڵام ئەگەر هەرچارتان نەبوو لەلای چەپتانەوە، یالەژێر پێتانا تف داکەنو، بەخۆڵو چەوی ناو مزگەوتەکە دایپۆشن). ئینجا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) چمکی لەشپۆشەکەی خۆی گرتو تفی تێ کردو ولّی بەسەریەکاو، فەرمووی: (یاخودا وابکەن وەك ئەوەی من کردم!).(ت/١/٣٥٨/٩ز-١١٨ز-٧١٤=ش/د)

---

(٢١٧)أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهى عن البصاق في المسجد رقم:٥٥١=١٢٢٢-١٢٣٠.

٢٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الخدري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ الْمَسْجِدِ فَتَنَاوَلَ حَصَاةً فَحَكَّهَا فَقَالَ إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى). (الحديث:٤٠٨ طرفاه في: ٤١٠، ٤١٦).[٢١٨]

ئەبوهورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویان: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەڵغەمێكی بەدیواری ڕووی قیبلەوە لەناو مزگەوتا چاو پێكەوت، بەچەوێ كرِاندی، فەرموشی: (كاتێ كەسێكتان ویستی بەڵغەمێ ڕۆ بكا، باڕۆی نەكاتە بەردەمی خۆی، هەروا با لەلای ڕاستیشەوە ڕۆی نەكا، بالەلای چەپیەوە تف ڕۆبكا، یالەژێرپێی چەپیدا ڕۆی بكا).

## راڤەو شیكردنەوە:

بەپێ ی ئەم فەرموودەیە: تف ڕۆكردن لەبەردەم داو، لەلای راستەوە، لەناو نوێژداو، لەگشت كاتێكی تردا ناباشە، بەشێوەیەكی گشتی ئیسلام بایەخ بەپاكو خاوێنی دەدا، پێشگیری لەپیسیو پۆخڵیو قێزەونی دەكا، وەهەوڵی داوە كەبەپێی تواناو بەپێ ی كاتو شوێن بایەخی تەواو بەپاكیو خاوێنی بدرێ. كەواتە: ئەمە ڕێ لەهۆكارە نوێكانی خۆپاك ڕاگرتن ناگرێ، وەك بەكارهێنانی دەستەسڕو كرێنستو شتی وا.

٢٥٨-عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا). (الحديث-٤١٥).[٢١٩]

---

(٢١٨)أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهى عن البصاق في المسجد رقم: ٥٤٨.=١٢٣٠.

(٢١٩) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهى عن البصاق في المسجد رقم: ٥٥٢.=١٢٣١، ١٢٣٢.

پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تف ڕۆکردن لەناو مزگەوتا گوناهە، کەفارەتەکەی ئەوەیە کەبەخۆڵی ناومزگەوتەکە دایپۆشێ). (ت/١/٣٥٧/٧ ز-١١٨ ژ-٧١٢).

٢٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هَا هُنَا فَوَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلَا رُكُوعُكُمْ إِنِّي لَأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي). (الحديث:٤١٨ طرفه في: ٧٤١).[٢٢٠]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەئێوە وایە کەمنیش وەك ئێوە هەر ڕووی قیبلە، کەوا لەبەردەممەوە دەبینم و بەس، بەخودا زۆرباش ئاگام لەخوشوع و لەروکوعتانە لەناو نوێژەکەما، چونکە من لەپشتی سەریشمەوە بەباشی دەتان بینم، خودا بەهرەیەکی وای پێداوم کەبەردەم و پشتی خۆم هەردوولا لەیەك کاتا دەبینم!). (ت/١/٢٨٤/١ ز-٩٠ ژ-٥٥٠).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:** ئەم فەرموودەیە لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتی یە.

٢٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي أُضمِرَتْ مِنْ الْحَفْيَاءِ وَأَمَدُهَا ثَنِيَّةُ الْوَدَاعِ وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضمَرْ مِنْ الثَنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا). (الحديث: ٤٢٠ أطرافه في: ٢٨٦٨، ٢٨٦٩، ٣٨٧٠، ٧٣٣٦).[٢٢١]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) کەناسراوە بەئیبنوعومەر، واتە: کوڕی عومەر، فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکەیەکی وڵاخی بەرزەی سازدا، ئەسپ و ماینەکانی کرد بەدووتاقم، ئەو وڵاخانەی کەئامادە

---

(٢٢٠) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الأمر بتحسين الصلاة وإتمامها والخشوع فيها، رقم: ٤٢٤.-٩٥٧.

(٢٢١) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: المسابقة الخيل وتضميرها، رقم: ١٨٧٠.=٤٨٢٠.

کرابوون بۆ قۆشمه، ئەمسەری مەیدانی تەراتێنەکەیان حەیفاء بوو، ئەوسەری ئەنییەتولوەداع بوو، ئەو ماینو ئەسپانەیشی کە ئامادە نەکرابوون بۆ قۆشمە، گۆڕەپانی پێشبڕکێکەیان کورت تر بوو، لەثەنییەتولوەداعەوە بوو، هەتا مزگەوتی بەنی زورەیق. وەمن خۆم یەکێك بووم لەو کەسانەی کەبەشداریان لەم پێشبڕکێ یەدا کرد. (ت/٨/١٠٢/١ = تاج-٤ ز-٣٣ ژ-٤٤٢٣ ج-٤).

٢٦١- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَالٍ مِنْ الْبَحْرَيْنِ فَقَالَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْثُرُوهُ فِي الْمَسْجِدِ وَكَانَ أَكْثَرَ مَالٍ أُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الصَّلَاةِ وَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهِ فَلَمَّا قَضى الصَّلَاةَ جَاءَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ فَمَا كَانَ يَرَى أَحَدًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِذ جَاءَهُ الْعَبَّاسُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِنِي فَإِنِّي فَادَيْتُ نَفْسِي وَفَادَيْتُ عَقِيلًا فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُذ فَحَثا فِي ثَوْبِهِ ثمَّ ذهَبَ يُقِلُّهُ فَلَمْ يَسْتَطِعْ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ اؤْمُرْ بَعْضَهُمْ يَرْفَعْهُ إِلَيَّ قَالَ لَا قَالَ فَارْفَعْهُ أَنْتَ عَلَيَّ قَالَ لَا فَنَثرَ مِنْهُ ثمَّ ذهَبَ يُقِلُّهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ اؤْمُرْ بَعْضهُمْ يَرْفَعْهُ عَلَيَّ قَالَ لَا قَالَ فَارْفَعْهُ أَنْتَ عَلَيَّ قَالَ لَا فَنَثرَ مِنْهُ ثمَّ احْتَمَلَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى كَاهِلِهِ ثمَّ انْطَلَقَ فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُتبِعُهُ بَصَرَهُ حَتَّى خَفِيَ عَلَيْنَا عَجَبًا مِنْ حِرْصِهِ فَمَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَثمَّ مِنْهَا دِرْهَمٌ). (الحديث: ٤٢١ طرفاه في: ٣٠٤٩، ٣١٦٥).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی بۆیەکەمجار ماڵی وازۆر لەسەرانەی وڵاتی بەحرەین بێت بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەناو گۆشەیەکی مزگەوت دا هەڵیڕێژن).

کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی ڕۆیشت بۆ مزگەوت بۆ نوێژ ئاوڕی لەو ماڵە نەدایەوە تانوێژەکەی تەواوکرد، ئەوسا ڕۆیشت بەلایەوە دانیشت، جاهەرکەسێکی دەدی بەشی دەدا لێی، لەپڕ عەباسی مامەی

پێغەمبەر هات، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم سامانە بەشم بدە، چوونكە من پارەی دوو سەرانەم داوە، سەرانەی خۆمو سەرانەی عەقیلی برازام، كەهەردووكمان لەغەزای بەدردا بەدیل گیرابووین، لەبەرئەوە شایەنی باربوو و یارمەتیم، پێغەمبەر پێی فەرموو: (فەرموو بۆخۆت ببە)، ئەوجا عەباس بەلەپ لەسامانەكەی مالّی یە ناو عاباكەیەوە، كەهات هەلّی بگرێ نەیتوانی بیدا بەكۆلّیا، جا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بكە بەیەكێ كەبیدا بەكۆلّما، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) (ناشتی واناكەم) فەرمووی: دەخۆت بیدە بەكۆلّما، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوەیش ناكەم) جاهەندێكی لەكۆلّەكەی داكردو، دیسان ویستی هەلّیبگرێ، وەعەرزی حەزرەتی كردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بكە بەكەسێ ئەمجا بیدا بەكۆلّما، فەرمووی: (خەیر) فەرموویەوە: دەخۆت بیدە بەكۆلّما، فەرمووی: (خەیر) جاهەندێكی تری لێ داكردو ئەوسا هەلّی گرتو دای بەكۆلّیداو رۆیشت، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوی تێ بڕیو سەرنجی عەبباسی مامی دا، هەتا لەبەرچاومان ون بوو، ئەوەندە سەیری لەسوور بوونو هەلّپەو پەرۆشی ی عەباس بۆمالّ هات، سامانەكە هەمووی سەدهەزار دیرهەم بوو، هەر لەوشوێنەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەلّنەسا هەتا هەمووی دابەش كردو یەك درەمی نەمایەوە.

## راڤەو شیكردنەوە:

ئەم فەرموودەیە تەعلیقە، بەلاّم ئەبونەعیم لە (مستخرج) ی خۆیداو، حاكم لەموستەدرەكی خۆیدا، بەرِشتەیێ، بەپێ ی مەرجی بوخاری، گێراویانەتەوە. بڕوانە (فتح الباری ب/١/٤٢١ ل ـ ٦١٤)

٢٦٢-عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ الْأَنْصَارِيِ (رَضي اللهُ عَنـهُ) (أَنَّ عِتْبَـانَ بْـنَ مَالِـكٍ وَهُوَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنْ الْأَنْـصَارِ أَنَّـهُ أَتَى رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَـدْ أَنْكَـرْتُ بَـصَرِي وَأَنَـا

أُصَلِّي لِقَوْمِي فَإِذا كَانَتْ الْأَمْطارُ سَالَ الْوَادِي الَّذي بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ آتِـيَ مَسْجِدَهُمْ فَأُصَلِّيَ بِهِمْ وَوَدِدْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّكَ تَأْتِينِي فَتُصَلِّيَ فِـي بَيْتِـي فَأَتَّخِـذَهُ مُصَلًّى قَالَ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ قَالَ عِتْبَـانُ فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ فَاسْـتَأْذَنَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَذِنْتُ لَهُ فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ ثُمَّ قَالَ أَيْنَ تُحِـبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ قَالَ فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنْ الْبَيْتِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَبَّرَ فَقُمْنَا فَصَفَّنَا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَـلَّمَ قَـالَ وَحَبَـسْنَاهُ عَلَـى خَزِيـرَةٍ صَنَعْنَاهَا لَهُ قَالَ فَثَابَ فِي الْبَيْتِ رِجَالٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ ذَوُو عَدَدٍ فَاجْتَمَعُوا فَقَالَ قَائِـلٌ مِنْهُمْ أَيْنَ مَالِكُ بْنُ الدُّخَيْشِنِ أَوِ ابْنُ الدُّخْشُنِ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ ذَلِكَ مُنَـافِقٌ لَـا يُحِـبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا تَقُلْ ذَلِكَ أَلَا تَرَاهُ قَدْ قَـالَ لَـا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يُرِيدُ بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّـهِ قَـالَ اللَّـهُ وَرَسُـولُهُ أَعْلَـمُ قَـالَ فَإِنَّـا نَـرَى وَجْهَـهُ وَنَصِيحَتَهُ إِلَى الْمُنَافِقِينَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَـى النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِـذَلِكَ وَجْـهَ اللَّـهِ). (الحـديث: ٤٢٥ طرفـه في: ٤٢٤).[٢٢٢]

**مەحموودی کوڕی ڕەبیع** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: عیتبانی کوڕی مالیک** (ڕەزای خوای لێ بێ) **کەلەهاوڕێیانی پێغەمبەر بوو، کەیەکێك بوو لەوئەنصاریانەی کەئامادەی جەنگی بەدربوو بوون، بەرنوێژی بۆ هۆزەکەی خۆی دەکرد، ڕۆژێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (ڕەزای خوای لێ بێ) **عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! گەلێ جار ڕێ دەکەوێ دەبێ بەتاریکستانو باران، منیش پیاوێکی کوێرمو ناتوانم بەوبارانو تاریکەشەوە بڕۆم بۆ مزگەوت بەرنوێژیان بۆ بکەم، بەتایبەتی کەباران ببارێ شیوەکەی والەنێوانی منو ئەواندا ڕێگەم نادا، جالەبەرئەوە**

---

(٢٢٢) أخرجه مسلم مسلم في الايمان، باب: الدليل على من مات على التوحيد دخل الجنة وفى المساجد ومواضع الصلاة، باب: الرخصة في التخلف عن الجماعة بعذر، رقم: ٣٣-١٤٨، ١٤٩٤.

ئەی پێغەمبەری خودا! حەزدەکەم تەشریف بێنی بۆلام، لەشوێنێکی ماڵەکەما بۆ پیرۆزیو موبارەکی نوێژێ بکە، تائەو شوێن نوێژەی تۆ بکەم بەنوێژگای خۆم، فەرمووی: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خوا یاربێ وادەکەم).

عیتبان دەیفەرموو: جابۆسبەینێ، کەخۆر بەرزەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ دەستەیێ لەیارانی، کەئەبوبەکریان تێدابوو، تەشریفیان هات، جا حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) ڕێخوازی کرد، منیش فەرمووم لێ کردن، کەهاتە ژوورەوە تەشریفی دانەنیشت تافەرمووی: (لەکوێ ی ماڵەکەتدا حەزدەکەی نوێژی لێ بکەم؟) منیش گۆشەیەکم لەناو ماڵەکەدا پێنیشان دا.

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێدا بەرەو قیبلە راوەستاو، ئەڵلاهوئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو، ئێمەیش لەپشتیەوە ریزبووینو ، پێغەمبەر خۆی ڕیزی کردین، وەنوێژمان بەکۆمەڵ لەپشتیەوە دابەست، ئەوجا دوو رکات نوێژی سوننەتی بۆمان کردو، سلاوی دایەوە.

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەرو میوانەکانی ترمان گل دایەوەو، ئاردەوای قیمەمان بۆ دروست کردن. جالەخەڵکی گەڕەك بەرەبەرە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆبوونەوەو هاتن بۆخزمەتی، گوتیارێ لەوان گوتی: ئەوە بۆ مالیکی کوڕی دوخەیشین دیار نیە، دەبێ لەکوێ بێ وانەهاتووە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئامادەی ئەم کۆڕە پیرۆزە نەبووە؟ پیاوێکیان وەڵامی دایەوەو گوتی: کورە! ئەوە ناپاکە، دوو رووە، هەربەدەم موسوڵمانە، لەدڵەوە ڕقی لەخواو پێغەمبەری خودایە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا، وامەڵێ، ئەوەتا بەبەرچاوەوە ئاشکرا دەڵێ: (لاإلە الا الله) مەبەستی لەگوتنی ئەم وشە پیرۆزە رەزای خودایە!) فەرمووی: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: بەڵام ئێمە واهەست دەکەین کەبەدڵ لەگەڵ ناپاکانەو، بەدەمیش پاسی ئەوان دەکا. سەرومریش (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (دەسا مالیك

شایەتمانی ساخ لەبەر رەزای خودا هێناوەو، هەرکەسێکیش ساخ لەبەر رەزای خودا بلێ (لا الە الا الله: جگە لە پەروەردگاری پاك خوای تر نییە) خودا لەقیامەتا لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرامی دەكا). (ت/١/٣٧٨/٢=ز-١٢٤ ژ-٧٥٣ چ-٤).

## راڤەو شیكردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن: بەرنوێژیی کوێر، دواکەوتن لەنوێژی کۆمەڵ لەبەر مەهانەی رەوا، دیاریکردنی نوێژگا لەناو ماڵ دا، پیرۆزیی وەرگرتن لەجێگەی نوێژو خواپەرستی پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئینشائەڵڵا کردن، چوون بۆ خزمەتی پیاوچاکان کاتێ دێنی شوێنێ بکەن، نوێژی سوننەت بەڕۆژ بەجەماعەت دروستە، واباشیشە دوو رکات بکرێ، دروستە بگوترێ: مزگەوتی فیسارەکەس.

٢٦٣- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِي اللهُ عَنْها) (أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ إِنَّ أُولَئِكَ إِذا كَانَ فِيهِمْ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ فَأُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). (الحديث: ٤٢٧ أطرافه في: ٤٣٤، ١٣٤٣، ٣٥٧٣).[٢٢٣]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو حەبیبەو ئوممو سەلەمە، کەهەردووکیان هاوسەری پێغەمبەر بوون - دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرو یارانی - لەوڵاتی حەبەشە، لەکاتی کۆچ کردنیاندا بۆ ئەوێ، کلیسایەکیان دیبوو، بەناوی مارییە، باسی ئەو پەیکەرو وێنانە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، کەلەناو ئەو کلێسایەدا دیبوویانن.

---

(٢٢٣) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهى عن بناء المساجد على القبور، رقم: ٥٢٨=١١٨١.

فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەوانە هۆزێكن كاتێ بەندەیەكی باش، یاپیاوچاكێ لەناویاندا هەڵدەكەوێ، كەدەمرێ دەچن مزگەوت لەسەر گۆڕەكەی دروست دەكەن و ئەو وێنانەی تیا دەكێشن، ئەم جۆرە كەسانەیش ئەم جۆرە رەوشتە ناپەسەندەیان داهێناوە بەدترینی دروستكراوانی خودان، لەلای خودای مەزن لەرۆژی قیامەتدا) (ت/١/٣٦٦/١ ز-١٢١ ژ-٧٣٥ ج-٤).

## راڤەو شیكردنەوە:

شێخی عەسقەلانی (سەلامی خوای لێ بێ) لەفەتحول باریدا لەم جێگەیەدا دەفەرمووێ: ئەم فەرموودەیە بەلگەیە لەسەرئەوە كە لەبڕیارو حوكمە شەرعی یەكاندا بایەخ بەشەرعە، نەك بەئەقڵ و هۆش.

٢٦٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ فَنَزَلَ أَعْلَى الْمَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فَأَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ وَمَلَأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُصَلِّيَ حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ وَأَنَّهُ أَمَرَ بِبِنَاءِ الْمَسْجِدِ فَأَرْسَلَ إِلَى مَلَإٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ فَقَالَ يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا قَالُوا لَا وَاللَّهِ لَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا إِلَى اللَّهِ فَقَالَ أَنَسٌ فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ لَكُمْ قُبُورُ الْمُشْرِكِينَ وَفِيهِ خَرِبٌ وَفِيهِ نَخْلٌ فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ ثُمَّ بِالْخَرِبِ فَسُوِّيَتْ وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ الْمَسْجِدِ وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ الْحِجَارَةَ وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَهُمْ وَهُوَ يَقُولُ:

اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَهْ     فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ [٢٢٤]

---

(٢٢٤) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: إنشاء مسجد النب (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) رقم: ٥٢٤.=جهاد: ٤٦٤٧-٤٦٥٢، ١١٧٣.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەکۆچی کرد بۆ مەدینە، لەپێشا لەعەوالی مەدینە دابەزی، لەناو خێڵێکا کەپێیان دەگوتن: بەنی عەمری کوڕی عەوف، لەناویانا چواردەشەو مایەوە، ئەوجا هەواڵی نارد بۆ بەنی نەججاری خاڵوانی، کەهاتن هەموو شمشێرەکانیان کردبووە شانیان، ئێستایش ئەڵێ ی ئەو دیمەنە لەبەرچاومە، کەچۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواریی وشترەکەی ژێری بوو، بۆ زێدە ڕێز ئەبوبەکر لەپاشکۆیەوە سوار بوو بوو، لەگەڵیا بەرەو شاری مەدینە دەڕۆیشتن، تاگەیشتنە ناوشار ئێشکی پێغەمبەریان لەناحەز دەگرت، کەگەیشتنەجێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بارگەکەی لەحەوشەی ئەبوئەیوبا خست، وەلەپێش دروستکردنی مزگەوتەکەیدا لەکوێدا نوێژی لێ دەبوو لەوێدا نوێژی دەکرد، ڕێ دەکەوت لەناو پەچەرانیشا نوێژی دەکرد، تالەپاشتر فەرمانیکرد بەدروست کردنی مزگەوت، جاناردی بەشوێن کۆمەڵەی بەنی نەجاردا، کەهاتنە خزمەتی پێ ی فەرموون: (ئەی بەنی نەجار! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن‌و نرخەکەیم پێ بڵێن؟) گوتیان: نەبەخودا بەفرۆشتن نایدەین، بەڵام بەخۆڕایی پێشکەشی دەکەین بەخوداو پێغەمبەری خوداو بەهاکەیمان هەر لەخودا دەوێ، ئەنەس دەیفەرموو: باپێتان بڵێم کەچی تیادابوو: چەند گۆڕێکی بتپەرستان‌و چەند کەلاوەیەك‌و برێ دارخورمای تیادابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دەرکرد گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵتەکاندو چاڵایی شوێن گۆڕەکانیان پڕ کردەوەو دارخورماکانیان بڕی‌و لەلای ڕووگەی مزگەوتەکەوە ڕیزیان کردن‌و، هەردوولاشیپانی دەرگاکەشیان لەتاشەبەرد دروست کرد، کاتێ کەتلە بەردەکانیان دەگواستەوە سۆزیان دەکردو پێغەمبەریش لەگەڵیان سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَهْ    فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

واتە:

خێر ئەوخێرە سبەی لەخوانە! ڕەحمەت لەئەنصار، لەکۆچکارانە!

(ت/١/٢/٥٧٨ ز-٢٢٣ ژ-١١٤٢ چ-٤ /ت/٤/٣١٦/٤).

٢٦٥- عَنْ إبنْ عُمَر (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: (إنه كان يُصَلّي إلَى بَعِيرِهِ وَقَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ). (الحديث: ٤٣٠ طرفه في: ٥٠٧).[٢٢٥]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) جاری وادەبوو وشترەکەی لەبەردەم خۆیدا رادەگرت‌و دەیکرد بەبەربەست، واتە: بەسوترەی نوێژ، ئەوجا لەئاستی وشترەکەی بەرەو رووگە نوێژەکەی دەکرد، وەدەیشی فەرموو: بۆخۆم پێغەمبەرم دیوە کەئاوای کردووە! (ت/١/٤/٢٣٧ ز-٦٧ ژ-٤٤٩ چ-٤).

٢٦٦- عَنْ أَنسْ (رَضي اللهُ عَنـهُ) قـالَ: قـالَ الـنبيُّ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) (عَرِضتْ عَلَيَّ النارُ وأنا أُصَلي). (الحديث: ٤٣١ طرفه في: ٢٩).[٢٢٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ لەناو نوێژدا بووم کەخوای گەورە ئاگری دۆزەخی پێنیشان دام).

## راڤەو شیکردنەوە:

لەفەتحولباریدا ئاماژە بۆئەمە دەکا: کەبەئارەزوو لەناو نوێژدا رووکردنە ئاگر باش نییە، بەلاّم لەبەرناچاری قەیناکا

٢٦٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنها) عَنْ النَّبيِّ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذوهَا قُبُورًا). (الحديث: ٤٣٢ طرفه في: ١١٨٧).[٢٢٧]

---

(٢٢٥) أخرجه مسلم منقطعا (عينى/ ٤/١٨٢/٩١) المترجم. = ١١١٧.

(٢٢٦) أخرجه مسلم في فضائل النبى (عينى/٤/١٨٥/٩٢) المترجم.

٢٦٨- عَنْ عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَا (لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَفِقَ يَطرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَإِذا اغْتَمَّ بِهَا كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ فَقَالَ وَهُوَ كَذلِكَ لَعْنَةُ اللّٰهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصارَى اتَّخَذوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ يُحَذرُ مَا صَنَعُوا). (الحديث: ٤٣٥ أطرافه في: ١٣٣٠، ١٣٩٠، ٣٤٥٣، ٤٤٤١، ٤٤٤٣، ٥٨١٥).

عائیشەو ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموون: (کاتێ فریشتەی گیانکێشان هات بۆ خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەکاتی سەرەمەرگا، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) پۆپەشمینێکی گوڵ گوڵی دابوو بەسەر روخساری خۆیدا، ناوبەناو کەپۆپەشمینەکە خەفەو تەنگەنەفەسی دەکرد، رووی خۆی لادەدا، وەلەکاتی ئەم سەخڵەتی سەرەمەرگەدافەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەعنەتو نەفرینی خودا لەسەر جوولەکەو گاور بێ، کەگۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوت ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم فەرمایشتە هەڕەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد، نەبادا موسوڵمانانیش چاو لەوان بکەن و، هەمان تاوان بکەن و، گۆڕی پێغەمبەر بکەن بەمزگەوت و، نوێژو پەرستشی تێدا بکەن و، بەرەبەرە لەپاش رۆژگارێکی دوورو درێژ گۆڕەکە خۆشی بپەرستن!(ت/٢/٣٦٧:ش)

٢٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنها) أَنَّ وَلِيدَةً كَانَتْ سَوْدَاءَ لِحَيٍّ مِنْ الْعَرَبِ فَأَعْتَقُوهَا فَكَانَتْ مَعَهُمْ قَالَتْ فَخَرَجَتْ صَبِيَّةٌ لَهُمْ عَلَيْهَا وِشَاحٌ أَحْمَرُ مِنْ سُيُورٍ قَالَتْ فَوَضَعَتْهُ أَوْ وَقَعَ مِنْهَا فَمَرَّتْ بِهِ حُدَيَّاةٌ وَهُوَ مُلْقًى فَحَسِبَتْهُ لَحْمًا فَخَطِفَتْهُ قَالَتْ فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ قَالَتْ فَاتَّهَمُونِي بِهِ قَالَتْ فَطَفِقُوا يُفَتِّشُونَ حَتَّى فَتَّشُوا قُبُلَهَا

---

(٢٢٧) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهى عن بناء المساجد على القبور، رقم: ٥٣١=١١٨٧.

قَالَتْ وَاللَّهِ إِنِّي لَقَائِمَةٌ مَعَهُمْ إِذ مَرَّتْ الْحُدَيَّاةُ فَأَلْقَتْهُ قَالَتْ فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ قَالَتْ فَقُلْتُ هَذا الَّذي اتَّهَمْتُمُونِي بِهِ زَعَمْتُمْ وَأَنَا مِنْهُ بَرِيئَةٌ وَهُوَ ذا هُوَ قَالَتْ فَجَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمَتْ قَالَتْ عَائِشَةُ فَكَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الْمَسْجِدِ أَوْ حِفْشٌ قَالَتْ فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَحَدَّثُ عِنْدِي قَالَتْ فَلَا تَجْلِسُ عِنْدِي مَجْلِسًا إِلَّا قَالَتْ:

وَيَوْمَ الْوِشَاحِ مِنْ أَعَاجِيبِ رَبِّنَا    أَلَا إِنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الْكُفْرِ أَنْجَانِي

قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ لَهَا مَا شَأْنُكِ لَا تَقْعُدِينَ مَعِي مَقْعَدًا إِلَّا قُلْتِ هَذا؟ قَالَتْ فَحَدَّثَتْنِي بِهَذا الْحَدِيثِ: (الحديث: ٤٣٩ طرفه في: ٣٨٣٥).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: هۆزێکی عەرەب هەبوو، کەنیزێکیٚ ڕەشیان هەبوو، کاتێ ئازادیان کرد هەر لەگەڵیان مایەوە، کەنیزەکەکە بۆی گێڕامەوە وتی: کچۆڵەیەکیان هەبوو، تازە بووك بوو، دەچێ بۆ کولٚو کانی، بەر مووریێکی سووری کشتەك چەرمینی لەخۆدابوو، دوو گورزە بوو، دوو ڕەنگ بوو، بەمرواریو کوژەکە هۆنرابۆوەو، بەسیرمە لەسەر تەختی چەرم لەسەر شێوەی کەمەرەو هەیاسە دروست کرابوو، گوتی: جاکیژەکە بەرمموورەکە لەشوێنێ دادەنێ، یاگوتی: لێ ی دەکەوێ، کۆلارەیێ بەدانراوی دەیبینێ، لەبەرسووریی چەرمەکەو سپێتی مرواری یەکە وادەزانێ پارچەیێ گۆشتو بەزە، پڕی پیادا دەکاو دەیفڕێنێ.

گوتی: گەلێ بۆیگەڕان نەیاندۆزیەوە، گوتی: ئیتر منیان کرد بەدزو تۆمەتی ناهەقیان لەبارەیەوە لەمندا، وەدەستیان کرد بەپشکنینم، وتی: تەنانەت ناوگەڵیشیان پشکنیم! وەناو شەرمیشم گەڕان بۆی!

جاگوتی: منیش بەکوڵی دلٚ لەخودا پاڕامەوە کەپاکی ی و بێ تاوانی من ئاشکرا بکا، ئیتر هێشتا من لەناویاندا بەپێوە ڕاوەستابووم کەلەپڕ لەولاوە کۆلارەکە لەئاسمانەوە هات، بەرموورەکەی فڕێ دایە نێوانی کۆمەڵەکەیانەوە،

گوتی: جاگوتم: ئەوا خودا پاکی‌و بێ تاوانی ی منی دەربڕی‌و بوختان‌و شەڵتاخەکەی ئێوەی پووچ کردەوە، ئەوەتا ئەمە بەرمووورەکەتانە.

عائیشه فەرمووی: جا ژنەکە هاتە خزمەتی حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) وەموسوڵمان بوو، عائیشه فەرمووی: ئەم ژنە چاتۆڵێکی لەناو مزگەوتا هەبوو، ستاری تیادا دەکرد، یا فەرمووی: کولێنێکی لەناو مزگەوتا هەبوو، عائیشه فەرمووی: گەلێ جار دەهات بۆلام‌و قسەی بۆ دەکردم، هەمووجارێ کەدادەنیشت لەلام دەیگوت:

وَيَوْمَ الْوِشَاحِ مِنْ أَعَاجِيبِ رَبِّنَا ... أَلَا إِنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الْكُفْرِ أَنْجَانِي

رۆژەکەی بەرموور، سپری یەزدانی
رزگاری کردم لەگاورسانی

بەپەخشانیش واتە: رۆژەکەی بەرموورو کۆلارەکە یەکێکە لەرۆژە سەیرەکانی پەروەردگارمان، ئۆخەی کەڕزگاری کردم لەگاورسانی. منیش جارێ پێیم گوت: ئەوە چییە لەهەموو کۆڕێکا ئەم هەڵبەستە دەخوێنیتەوە؟ ئیتر ئەویش ئەم داستانەی بۆم باس کرد.

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە مرۆڤی بێ جێگەو ڕێگە، ژن بێ یان پیاو، دروستە بۆی لەناو مزگەوتا ستاربگرێ، چ بەشەو، چ بەڕۆژ، بەمەرجێ مەترسی تووشبوونی ئاژاوەی نەبێ، بەڵگەی ئەوەیشە کەنزای ستەمبار با بێبڕوا (کافر)یش بێ گیرا دەبێ.

٢٧٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْتَ فَاطِمَةَ فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي الْبَيْتِ فَقَالَ أَيْنَ ابْنُ عَمِّكِ قَالَتْ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ شَيْءٌ فَغَاضَبَنِي فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

لِإِنْسَانٍ انْظُرْ أَيْنَ هُوَ فَجَاءَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ فِي الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ وَأَصَابَهُ تُرَابٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُهُ عَنْهُ وَيَقُولُ: (قُمْ أَبَا تُرَابٍ، قُمْ أَبَا تُرَابٍ). (الحديث: ٤٤١ أطرافه في: ٣٧٠٧، ٦٢٠٤، ٦٢٨٠).[٢٢٨]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەکەسوکاری مەڕوان بوو بەسەرکاری سەر شاری مەدینەی نازدار، ناردی بەشوێنما گوتی: وەرە جنێو بەعەلی بدە! گوتم: من شتی واناکەم. پێ ی گوتم: کەئەوەناکەی بڵێ: لەعنەتو نەفرینی خودا لەئەبوتوراب. گوتم: من هەڵەی واناکەم، چوونکە هیچ ناوێکی عەلی وەکوو ئەم ناوەی لەلای خۆش نەبوو، کەبەئەبوتوراب بانگیان دەکرد کەیفخۆش دەبوو، جاپێیان گوت: لەبەرچی بەعەلی دەڵێن ئەبوتوراب، واتە: خۆڵاوی، فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڕوا بۆ ماڵی فاطیمەی کچی دەڕوانی عەلی لەماڵەوە نییە، دەفەرموێ: ئامۆزات کوا؟ فاطیمە دەڵێ: شتێ لەنێوانماندا ڕوی دا، تۆزێ عاجزی کەوتە نێوانمانو لەبەرئەوە چووەتە دەرەوەو وچانی نیوەڕۆی لەلای من نەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمرۆڤێ دەفەرموێ: (ئادەی بزانە عەلی لەکوێ یە؟) کەدێتەوە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی لەمزگەوت نووستووە، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەچێ بۆلای، دەڕوانێ واڕاکشاوەو پۆشاکەکەی لەلایا کەوتووەو خۆڵاوی بووە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی خۆڵەکەی لێ دەتەکێنی خۆش خۆش دەفەرموێ: (هەڵسە ئەی خۆڵاوی! هەڵسە ئەی ئەبوتوراب!) (ت/٥/٦٤/٥ تاج-٣ ز-٩ ژ-٣٢٩٢ چ-٤).

---

(٢٢٨) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل علي بن أبي طالب (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ)، رقم: ٢٤٠٩=٦١٧٩.

٢٧١- عَنْ أَبي قتادةَ السلمي (رَضي اللهُ عَنهُ) أنَّ رسول الله (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ). (الحديث: ٤٤٤، طرفه في: ١١٦٣).[٢٢٩]

ئەبو قەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ( هەرکاتێ چوونە ناو مزگەوت، لەپێش ئەوەدا کەدابنیشن دوو ڕکات نوێژی دیاری مزگەوت بکەن). ( ت/١/٣٥٦/ ٥ ز-١١٨ ژ-٧١٠ ج-٤ = ش/ د/ ت/ ن).

ڕوونکردنەوە: ئەبو قەتادەی ئەل سولەمی (ڕەزای خوای لێ بێ) ناسراوە بەشاسواری پێغەمبەری خودا (فارس رسول الله) سەدو حەفتا فەرموودەی لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، سیازدە فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، ئەبوقەتادە دەفەرموێ: ( لەڕۆژی غەزای ذی قەررەدا، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی فەرمووم: ( ئەوە چییە بەدەمو چاوتەوە؟) گوتم: ئەوە زامی تیرە بەرم کەوتووە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (دە وەرە نزیکمەوە) منیش ڕۆیشتمە بەردەمی، تفی پیرۆزی دا لەجێگەی تیرەکە، بڕای بڕای نەپڵی داو نەکولایەوە! لەپەنجاو چواری کۆچیدا لەمەدینە مرد، بێژراویشە: لە (٣٨) دا مردووە، عەلی نوێژی مردووی لەسەر کردوە.

٢٧٢- عَنْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللّهُ عَنهُمَا) قالَ: (أَنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَبْنِيًّا بِاللَّبِنِ وَسَقْفُهُ الْجَرِيدُ وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخْلِ فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئًا وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ وَبَنَاهُ عَلَى بُنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّبِنِ وَالْجَرِيدِ وَأَعَادَ عُمُدَهُ خَشَبًا ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً وَبَنَى جِدَارَهُ بِالْحِجَارَةِ الْمَنْقُوشَةِ وَالْقَصَّةِ وَجَعَلَ عُمُدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ وَسَقَفَهُ بِالسَّاجِ). (الحديث ٤٤٦).[٢٣٠]

---

(٢٢٩) اخرجه مسلم في الصلاة المسافرين وقصرها باب: استحباب تحية المسجد بركعتين، رقم: ٧١٤-١٦٥١.

(٢٣٠) اخرجه مسلم عن طريق مسلمة عن ابي نضرة عن ابي سعيد (فتح الباري/١/٦٤٦/ رقم/٤٤٧) المترجم. = ١٢١٧ مسلم. مساجد. الشيخ شيحا.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) مزگەوتەکەی مەدینە، کەناودارە بەمزگەوتی پێغەمبەر، بەخشتی کاڵ دروست کرابوو، دارە ڕاکەی‌و پەردووەکەی پەلکە خورما بوو، کۆڵەکەو دەستەك‌و نیرگەکانی لەدارخورما بوون، ئەبوبەکر لەماوەی جێنشینی خۆیا هیچ دەستکاری نەکرد، بەلاّم عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستکاری کردو لەپانی‌و بەرزی لێی زیادکرد، بەلاّم هەروەك سەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیوارەکەی بەخشتی کاڵ‌و، دارەڕاو پەردوەکەی لەدارخورمای تازە دانایەوە، بەلاّم لەپاشا عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆی دا، دەستکارییەکی چاکی کردو، زۆرشتی گۆڕی‌و ، گەلێکی لێ پتر کرد، ئەوە بوو دیوارەکەی بەبەردی نەخشاوو گەچ دروست کرد، وەلەباتی کۆڵەکە پایەی بەبەردی نەقاڕی نەخشین دانا، وەبەداری ساجیش بانەکەی دارەڕاکرد. (ت/١/٣٦٤/١ = ز-١١٩ ژ-٧٣٠ = ب/ د)

٢٧٣-عَنْ عِكْرِمَةَ (رحمه الله تعالى) قَالَ: قَالَ: (لِي ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) وَلِابْنِهِ عَلِيٍّ انْطلِقَا إِلَى أَبِي سَعِيدٍ فَاسْمَعَا مِنْ حَدِيثِهِ فَانْطَلَقْنَا فَإِذا هُوَ فِي حَائِط يُصْلِحُهُ فَأَخَذ رِدَاءَهُ فَاحْتَبَى ثمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثنَا حَتَّى أَتَى ذِكْرُ بِنَاءِ الْمَسْجِدِ فَقَالَ كُنَّا نَحْمِلُ لَبِنَةً لَبِنَةً وَعَمَّارٌ لَبِنَتَيْنِ لَبِنَتَيْنِ فَرَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَنْفُض التُّرَابَ عَنْهُ وَيَقُولُ وَيْحَ عَمَّارٍ تَقْتُلُهُ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ يَدْعُوهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ وَيَدْعُونَهُ إِلَى النَّارِ قَالَ يَقُولُ عَمَّارٌ أَعُوذ بِاللَّهِ مِنْ الْفِتَنِ). (الحديث: ٤٤٧ طرفه في: ٢٨١٢)*.

عیکریمە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) بەمن‌و بەعەلی کوڕی فەرموو: بڕۆن بۆ خزمەتی ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) گوێ لەفەرمووده بگرن، ئێمەیش چووین، کەچووینە خزمەتی لەناو ڕەزێکی خۆیا بوو، خەریکی ڕێکخستنی بوو، کەئێمەی دی لەشپۆشەکەی هەلگرت‌و

---

* مسلم. فتن. ٧٢٤٩، ٧٢٥٠، ٧٢٥١، ٧٢٥٢.

پێچای لەخۆیەوەو، بەرگی زانایانی پۆشی، ئەوجا دەستی کرد بەگوتنی فەرمووده بۆمان، هەتا هاتە سەرباسی دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر لەمەدینە، فەرمووی: ئێمە یەك خشت یەك خشتمان هەڵدەگرت، بەڵام عەممار گشت جارێ دووخشت دووخشتی هەڵدەگرت، ئەوەندە شەوقی لەسەر ئیشەکە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرئەم حاڵە چاوی پێ کەوت، بەدەستی خۆی تەپوتۆزەکەی لەسەرو لەشی عەممار دەتەکاند، بەوە ئەوپەڕی ڕێزو ڕەزامەندی بەرابەری دەنواندو، مژدەی شەهید بوونی پێ داو، فەرمووی: (هاوار لەخۆم بۆ عەممار! دەستەی ستەمکار دەیکوژن، عەممار بانگیان دەکا بۆ قەبوولکردنی مایەی بەهەشت، دەستەی ستەمکاریش ئەو بانگ دەکەن بۆ سەر کاری ناهەق کەدەبێ بەهۆی چوونە ناو ئاگری دۆزەخ!) فەرمووی: عەممار یش فەرمووی: پەنا دەگرم بەپەنای خودا لەتووشبوونی ئاژاوە. (ت/٢/١٣٩/٥ تاج-٣ ز-٢٩ ژ-٣٤١٢).

٢٧٤- عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ حِينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ). (الحديث: ٤٥٠).[٢٣١]

پێشەوا عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆیدا ویستی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەورە بکا، خەڵکەکەیش پێیان ناخۆش بوو، بێزاری یان دەربڕی، ئیمامی عوثمان فەرمووی: ئەمە کردتان بەچی ئەوەندە لەسەری دەڕۆن، من خۆم لەم لایەنەوە لەئێوە باشتری لێ دەزانم، چونکە بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (هەرکەسێ مزگەوتێ دروست

---

(٢٣١) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة وفى الزهد والرقائق رقم: ٥٣٣ =١١٨٩، ١١٩٠.

بكا، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، خودایش لەقیامەتا، لەپاداشی ئەوەدا، لەبەهەشتا تەلارێکی بۆ دروست دەکا، لەوێنەی ئەو مزگەوتە)

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

واتە: مزگەوتە دروستکراوەکە تاگەورەترو باشتربێ، تەلارەکەیش باشتر دەبێ لەبەهەشتا

٢٧٥-عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (مَرَّ رَجُلٌ فِي الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ سِهَامٌ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْسِكْ بِنِصَالِهَا). (الحديث: ٤٥١ – طرفاه في: ٧٠٧٣، ٧٠٧٤).[٢٣٢]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەناو مزگەوتەوە تێپەڕ بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (دەست بگرە بەنووکەکانیانەوە، باکەسێ زامار نەکەن)

٢٧٦- عَنْ أَبِي موسى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ مَرَّ فِي شَيْءٍ مِنْ مَسَاجِدِنَا أَوْ أَسْوَاقِنَا بِنَبْلٍ فَلْيَأْخُذ عَلَى نِصَالِهَا لَا يَعْقِرْ بِكَفِّهِ مُسْلِمًا). (الحديث: ٤٥٢ طرفه في: ٧٠٧٥).[٢٣٣]

ئوبوموسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێك، تیرو شیرو نێزەو شتی وای پێ بوو، وەچوو بۆ مزگەوتو بازاڕەکانمان، بادەستی بگرێ بەنووکەکەیەوە، نەبادا موسوڵمانێ زاماربکا). (ت/١/٣٦٢/١٩ ز-١١٨ ژ-٧٢٤ چ-٤).

---

(٢٣٢) أخرجه مسلم في البر والصلة والأدب، باب: أمر من مر بسلاح في مسجد، رقم: ٢٦١٤ = ٦٦٠٤.

(٢٣٣) أخرجه مسلم في الادب (عينى/٤/٢١٦/١٢) المترجم. = ٦٦٠٧.

## راڤەو شیکردنەوە:

دیارە کەچەکی نوێش وەك تفەنگو دەمانچەو شەستیر هەمان بڕیاری بۆ هەیە، مەبەست لەدەست گرتن بەنووکی شیرو تیرەوە نموونە هێنانەوەیە بۆ رزگاربوونی مەردووم لەزیانی ئەم چەکانە، دەنا مەبەست قەیدنییە، چونکە ئەگەر قەید بێ بەغەیری دەستپێوەگرتن چاری نییە، کەواتە: رزگاربوونی مەردوم بەدەمانچەو شتی وا بەوەدەبێ، کەزامنەکەی داخەی، یاخاڵی کەی لەتەقەمەنی.

٢٧٧- عَنْ حَسَّانَ بْنَ ثابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنهُ استشهد أَبَا هُرَيْـرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) : أَنْشُدُكَ اللهَ هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَا حَسَّانُ أَجِبْ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ اللّٰهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ) قَالَ أَبُو هُرَيْـرَةَ نَعَمْ). (الحديث: ٤٥٣ طرفاه في: ٣٢١٢، ٦١٥٢).[٢٣٤]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەسسانی کوڕی پابیتی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هۆنراوەی دەخوێندەوە. عومەر (رەزای خوای لێ بێ) لەلایەوە ڕەت بوو، بەگۆشەی چاو خێسەیەکی لێ کردو لێی مۆڕبۆوە، ئەویش گوتی: من نابەجاییم نەکردووە، ئالەم شوێنی حازریەدا هۆنراوەم تیادا خوێندۆتەوەو لەوکاتەدا پیاوێ لەتۆ باشتریش لەوێ بووە، کە پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکارەکەی منی لەلا پەسەند بوو، ئەوجا حەسسان رووی کردە منو فەرمووی: توخوا ئایا تۆبۆخۆت لە پێغەمبەرت نەبیستووە کەبەمن بفەرموێ: (ئەی حەسسان! لەجیاتی ی من تۆ بەشیعر وەرامو بەرپەرچی تانەوتەشەری بێبڕواکان بدەرەوە، خودایە! بەگیانی پاك پشتیوانی بکە) واتە: بەهۆی جوبرائیلەوە یاریدەی حەسسان بدە لەدانانی شیعردا بۆلەسەر کردنەوەی پێغەمبەری خودا، ئایا تۆئەمەت لە پێغەمبەر

(٢٣٤) اخرجه مسلم في الفضائل(عيني/٤/٢١٧/١١٣) المترجم=مسلم.فضائل. ٦٣٣٤، ٦٣٣٥،٦٣٣٦.

بیستووه یانا؟ منیش گوتم: خودا ئاگاداره کەچۆن دەڵێی وایەو قسەکەت ڕاستو دروستە. (ت/٥/١٩٠/١ تاج-٣ ز-٥٧ ژ-٣٤٩٥ ج-٤). (رقم: الحديث في فتح الباري: ٤٥٣ ـ طرفاه في: ٣٢١٢، ٦١٥٢).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

حەسسان (ڕەزای خوای لێ بێ) ناسراوەبە شاعیری پێغەمبەری خودا، سەدوبیست ساڵ ژیاوە شەستی لەسەردەمی نەزانیداو شەستی لەسەردەمی ئیسلامدا، لەساڵی پەنجای کۆچیدا مردووە.

٢٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا عَلَى بَابِ حُجْرَتِي وَالْحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ وَرَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ أَنْظُرُ إِلَى لَعِبِهِمْ في رِواية: يَلْعَبُونَ بِحِرَابِهِمْ). (الحديث رقم: ٤٥٤ ـ أطرافه في: ٤٥٥، ٩٥٠، ٩٨٨، ٢٩٠٦، ٣٥٢٩، ٣٩٣١، ٥١٩٠، ٥٢٣٦)[٢٣٥]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کات ڕۆژی جەژن بوو، حەبەشیەکان بەقەڵخانو نێزە یاریان دەکرد، یاخۆم داوام لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، یاخۆی فەرمووی: حەزدەکەی تەماشا بکەی؟ منیش گوتم: بەڵێ، ئیتر منی لەپشتی خۆیەوە وەستانو، چەناگەم نایە سەرشانیو، ڕوومەتم نابەڕوومەتیەوە، جا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاری خۆتان بن، ئیتر منیش تەماشام کرد، تاخۆم تاقەتم نەما، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر بەستە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەبڕۆ). لەگێڕانەوەیەکا: جارێکیان ڕۆژی جەژن بوو، ڕۆژەکانی میناببوو،

---

(٢٣٥) أخرجه مسلم في الصلاة العيدين، باب: الرخصة في اللعب الذى لامعصية فيه، رقم: ٨٩٢=٢٠٦٢، ٢٠٦٦.

حەبەشییەکان هاتن بۆ مزگەوت، دەستیان کرد بەنێزەبازی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردمو سەرم لەسەرشانی داناو، دەستم کرد بەتەماشا کردنی یاری یەکەیان، تاخۆم وازم هێنا، لەتەماشا کردنیان (ش/ن ـ ت/١/٤٦٠/٢ = ز-١٦٣ ژ-٩١٦ ج-٤).

## راڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەنەوەی ئەرفیدە حەبەشییەکانە. لەم فەرموودە پیرۆزەدا زۆر مەبەستی گرنگ رەچاودەکرێ، ئەگەر هەموو گێڕانەوەو طەریقو وجوەو ئەطرافەکانی بەوردی رەچاوبکرێن، دەبن بەدەروازەیێ بۆ چارەسەری گەلێ لەکێشە گەورەکانی ئەم چاخە. وەك روانینی ژنو پیاو بۆیەکتری، لەسنووری ئەدەبو دەستووروو باوی دامەزراوی ناوکۆمەڵ دا، وەك یاریو گەمەکردنو گۆرانی گوتنو دەنگی ئافرەتو رابواردنی رەوا ـ واتە: لەهوی موباح ـو مۆسیقاو تەپڵو دەفو یاری کردن لەناو مزگەوتدا ئەگەر کەسێ دەیەوێ لەبارەی ئەم بابەتانەوە شتێکی دروست لەسوننەت کۆ بکاتەوە باتەماشای فەتحولباریو شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمو شەرقاویو عەینیو تاجوول ئوصولو قەسطەلانی بکا.

٢٧٩- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ تَقَاضى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى يَا كَعْبُ قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ ضعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذا وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَيْ الشَّطْرَ قَالَ لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ قُمْ فَاقْضِهِ). (الحديث ٤٥٧ ـ أطرافه في: ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠).

کەعبی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قەرزێکم لەسەر ئیبنوئەبو حەدرەد بوو لەناو مزگەوتا داوایم لێ ی کردەوە بەهۆی ئەوەوە دەنگمان

بەرزەوە بوو، تارادەیەکی وا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو ماڵی خۆیەوە گوێی لەدەنگە دەنگمان بوو، جاتەشریفی هاتە دەرەوە کەبێ بۆلامان، چوو پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆیی کلاکردو بانگی کرد: (ئەی کەعب!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! سەرم لەرێتایە. فەرمووی: (ئەوەندە لەقەرزەکەت دابشکێنە) بەئاماژە تێی گەیاند کەلەنیوەی قەرزەکەی خۆش ببێ لێ ی. کەعب فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەوا دام شکان ئەی پێغەمبەری خودا! جا حەزرەت بەئیبنوئەبی حەدرەدی فەرموو: (دەتۆیش هەڵسە برۆ ئەو نیوەکەی تری پێ بدەرەوە!).

## شیکردنەوە:

کەعب (رەزای خوای لێ بێ) تاقانەی باوکی بووە، ناودارە بەکەعبی شاعیر، یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا، یەکێکە لەوسێ کەسەی کەئەم ئایەتە لەبارەیانەوە هاتووە: (وعلى الثلاثة الذين خلفوا حتى إذا ضاقت عليهم الأرض) تا کۆتایی ئایەت، هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، چوار فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەکۆتایی تەمەنیدا کوێر بوو بوو، عەبدوڵڵای کوڕی چاوساغی بوو: (ریاض الصالحین بەرگی یەکەم ل-٣٤ ف-٩ = ز-٢ ژ-٢١/٩ چ-٢).

٢٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا أَسْوَدَ أَوْ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ فَمَاتَ فَسَأَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْهُ فَقَالُوا مَاتَ قَالَ أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي بِهِ دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ أَوْ قَالَ قَبْرِهَا فَأَتَى قَبْرَهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا). (الحديث ٤٥٨ ـ طرفاه في: ١٣٣٧, ٤٦٠) [٢٣٦]

---

(٢٣٦) اخرجه مسلم في الجنائز، باب الصلاة على القبر، رقم: ٩٥٦ = ٢٢١٦.

ئـەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێکی ڕەش (یافـەرمووی: ژنێکـی ڕەش) مزگەوتی دەماڵی، ئـەمری خـودای کـردو فـەرمانی هـەقی بـەجێ هێنـا، رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی پرسی، گوتیـان: مـرد! فـەرمووی: ئـەی نــەدەبوو پــێم بڵــێن! گوڕەکــەیم پــێ نیــشان بــدەن، ئــەوجا چــوو بۆســەر گووڕەکەی‌و نوێژی لەسەرکرد (ت/١/ ٣٥٨/ ١٠ ز-١١٨ ژ-٧١٥ ج-٤ = ش/د)

٢٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (لَمَّا أُنْزِلَتْ الْآيَاتُ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الرِّبَا خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ حَرَّمَ تِجَارَةَ الْخَمْرِ). (الحديث ٤٥٩ ـ أطرافه في: ٢٠٨٤، ٢٢٢٦، ٤٥٤٠، ٤٥٤١، ٤٥٤٢,٤٥٤٣)[٢٣٧]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئایەتـەکانی سـوورەتی بەقـەرە لـەبارەی سووخۆرییەوە هاتن، کەدەفەرموون: (الذين يأكلون الربا لايقومون إلا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس) هـەتا (لاتظلمـون ولا تظلمـون) پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتــە دەرەوەو هـات بـۆ مزگـەوت‌و لـەوێ ئایەتـەکانی بـۆ خەڵکەکـە خوێندەوە، بڕیاری ناڕەوابوونی سوودی پێ ڕاگەیاندن، لەپاشتر بازرگانی بادەو مەیشی ناڕەوا کرد)

٢٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ عِفْرِيتًا مِنْ الْجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ الْبَارِحَةَ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلَاةَ فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ فَذَكَرْتُ قَوْلَ أَخِي سُلَيْمَانَ رَبِّ اغفر لي وَ هَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي). (الحديث ٤٦١ ـ أطرافه في: ١٢١٠، ٣٢٨٤، ٣٤٢٣، ٤٨٠٨)[٢٣٨]

---

(٢٣٧) اخرجه مسلم في المساقاة، تحريم بيع الخمر، رقم: ١٥٨٠ = ٤٠٢٣.

(٢٣٨)اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة باب جواز لعن الشيطان في الصلاة رقم: ٥٤١=١٢٠٩.

**ئـەبوهورەیرە** (رەزای خوای لـێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: (دوێ شەو دێویکی جنۆکە لەپڕ پەلاماری دام، یا وشەیەکی ئاوای فـەرموو، بـۆ ئەوە پەلاماری دام تاکوو نوێژەکەم پێ ببڕێ، بەڵام لەسایەی خوداوە دەستم لێ ی گیربوو گرتم، ویـستم کـەبی بەسـتمەوە بەیـەکێ لەکۆڵەکـەکانی مزگەوتـەوە هـەتا بـەیانی هـەمووتان سـەیری بکـەن، بـەڵام کەفەرمایـشتەکەی سـولەیمان پێغەمبەری برام بیرکەوتەوە ئیتر خوێڕیم کـرد، مەبەسـت ئـەو فەرمایـشتەی سولەیمانە کە دەفـەرموێ: (رَبِّ هَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَـدٍ مِـنْ بَعْـدِي) واتـە: ئەی پەروەردگارم! موڵكو دەسەڵاتو سامانێکی وام پێببەخـشە کەلـەپاش مـن بۆکەسی تر دەست نەدات). (ت/١/٣٦٠/١٥ ز-١١٨ ژ-٧٢٠ =ش).**

٢٨٣ –عَنْ عَائِشَةَ (رَضِـي اللهُ عَنهَـا) قَالَـتْ: (أُصِـيبَ سَـعْدٌ يَـوْمَ الْخَنْـدَقِ فِـي الْأَكْحَلِ فَضرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ لِيَعُـودَهُ مِـنْ قَرِيـبٍ فَلَمْ يَرُعْهُمْ وَفِي الْمَسْجِدِ خَيْمَةٌ مِنْ بَنِي غِفَارٍ إِلَّا الدَّمُ يَـسِيلُ إِلَـيْهِمْ فَقَـالُوا يَـا أَهْـلَ الْخَيْمَةِ مَا هَذا الَّذي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ فَـإِذا سَـعْدٌ يَغْـذو جُرْحُـهُ دَمًـا فَمَـاتَ فِيهَـا). (الحديث ٤٦٣ ـ اطرافه في: ٢٨١٣، ٣٩٠١، ٤١١٧، ٤١٢٢) [(٢٣٩)]

**عائیـشە** (رەزای خوای لـێ بێ) **فـەرمووی: لەغـەزای خەنـدەقا، سـەعدی کـوڕی موعـاژ زامار بوو، ئیبنولعەرەقـە نـاوێ لـەهۆزی قـوڕەیش، تیرێکـی دابـوو لەشادەماری بـاڵی، کەبەعـەرەبی پێـی دەڵـێن: (ئەکحـەل: عـرق الحیـاە) بـەکوردیش پێـی دەڵێن: رەگی حەیات، یاڕەگی ژیـان، حـەزرەت** (رەزای خوای لـێ بێ) **لـەناو مزگەوتەکـەدا چـاتۆڵێکی بۆهەڵـدابوو، لەپـەناوە زوو زوو سـەری لێ دەداو تەشـریفی دەچـوو بۆهەواڵپرسی ی، لەناو مزگەوتەکەدا چادرێکی تریش هەبوو، هی هۆزی بـەنی غیفار بوو هەڵیان دابوو بـۆ روقیـەی ئەنـصارییە کـە دەسـتی پزیـشکی هـەبوو زامارەکانی دەرمـان دەکـرد، جاکـاتێ بـەنی غیفارییـەکان چـۆڕاوگەی خوێنیـان**

---

(٢٣٩) أخرجه مسلم في المغازى (عينى/٤/٢٣٨/١٢٣) المترجم = ٤٥٧١.

بینی هات بۆناو چادرەکەی خۆیان راچەنین و هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئەرێ ئەی دانیشتوانی ناو ئەو چادرەی تەنیشتمان! ئەم جۆگەلە خوێنە چییە لەلای ئێوەوە دێ بۆلای ئێمە؟ کەتەماشایان کرد وابرینەکەی سەعد تەقیوەو کفارەی خوێنی دێو چۆڕاوگەی وەك جۆگەلە ڕۆیوە، ئیتر لەناو ئەو چادرەدا سەعد بەو پێکانە شەهید بوو. (ت/٨/٢٢٠/١ تاج-٤ ز-٨٩ ژ-٤٦٠٧ + تاج-٣ ز-٤٥ ژ-٣٤٦٩).

٢٨٤-عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنِّي أَشْتَكِي قَالَ طوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ فَطفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ يَقْرَأُ بِالطورِ وَكِتَابٍ مَسْطورٍ). (الحديث: ٤٦٤ أطرافه في: ١٦١٩، ١٦٢٦، ١٦٣٣، ٤٨٥٣).[240]

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سکاڵای حاڵم لەلای حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کرد، کەنەخۆشم، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) (لەپاش خەڵکەکەوە بەسواری تەواف بکە، جامنیش وام کرد، لەوکاتەدا کەمن تەوافم دەکرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتەنیشتی کەعبەوە نوێژی دەکرد، سورەتی (والطور وکتاب مسطور) ی لەونوێژەدا خوێند). (ت/٢/١٨٤/٤ ز-٩٤ ژ-١٥٤٢ ل-١٩٩ چ-٤).

٢٨٥- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ وَمَعَهُمَا مِثْلُ الْمِصْبَاحَيْنِ يُضيئَانِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ). (الحديث ٤٦٥ - طرفاه في: ٣٦٣٩، ٣٨٠٥)

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دووپیاو لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوێ لەخزمەت حەزرەتدا دەبن، لەمزگەوت چاوەڕوانی نوێژی خەوتنان

(٢٤٠) أخرجه مسلم في الحج، باب: جواز الطواف على البعير وغيره، رقم: ١٢٧٦=٣٠٦٧.

دەکەن، کەلەلای حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دەردەچن بۆ ماڵەوە، شەوەکەی زۆر تاریك دەبێ، جابۆ ڕێزلێگرتنی ئەم دوو هاوڕێ ئازیزانەی پێغەمبەر، دوو پارچە نوور لەچەشنی دووچرای ڕۆشن، بەفەرمانی خودا، لەگەڵیان دەڕۆن و لەبەردەمیانەوە ڕۆشنایی یان بۆ دەکەن، کەلەڕێ لەیەك جیادەبنەوە هەرکەسەیان پارچە نووری لەگەڵی دەڕوا تادەگاتە ماڵەوە (ت/٥/٦/٥+ت/١٧٦/٥/١ = تاج-٣ ز-١ ژ-٣٢٢٥ چ-٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەمە بەهرە (واتە: کەرامەت) ێکی گەورەیە، بۆئەو دوو پیاوە، کەئوسویدی کوڕی حوضەیرو عەبادی کوڕی بیشر بوون، نموونەی تری ئەم کەراماتە، لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا زۆر زۆرە، وەك سڵاوکردنی فریشتە لەعیمرانی کوڕی حوصەین، وەك ئەو هەمکە نموونە ڕاستو دروستانەی کەوان لەزنجیرە -٢٥٣- دا، لەبەرگی سێی ریاض الصالحين دا، زنجیرە:٢٣٥ لاپەڕە (١٠٧٢) شێخی عەینی لەعومدەتولقاریدا لەم جێگەیەدا دەفەرموێ:

(بەتەواتوور چەسپاوە، کەکۆمەڵێ فەقێ ی بڕوا پێکراوی ڕاستو دروست گێڕاویانەتەوەو فەرموویانە: شەوێکی زۆر تاریکی ئەموستەچاوی تۆف کۆمەڵێ فێرخواز بووین، لەخزمەت شێخی پێشەوا زانای پایەبەرز حسان الدینی ئەل رەهاویدا لەسەر دەعوەت بووین، کەدانەری کتێبی (البحر)و چەندین کتێبی ناوداری ترە، لەشاری عینتاب بووین، کاتێ بڵاوەمان لێ کرد، چەند کەسێ ویستیان بەچراوە لەخزمەتیدا بچن هەتا بەردەرگاکەی، چونکە شەوەکەی زۆر تاریكو نوتەك دەبێ، بەڵام شێخ قەبووڵ ناکا، ئیتر ئەوانیش دەگەڕێنەوە، بەڵام دوا ئەوان کۆمەڵێ تر دوورو نزیك شوێنی دەکەون، سوێندیان لەسەر ئەمەدەخوارد: کەبەچاوی خۆمان دوو پارچە نووری گەورەمان دەبینی وەك فانۆس وابوون، یەکێکیان لەلای ڕاستی مامۆستاوەو

ئـەوی تریـان لـەلای چـەپیەوە بـوون، لەگەڵیـدا دەڕۆیـشتن، هـەتا گەیـشتە بەردەرگاکەی خۆیان، کەدەرگاکە کرایەوەو شێخ ڕۆیشتەوە ماڵەوە دوو پارچـە نوورەکە بەرزەوە بوونو نەمان. گەلێ بەهرەی تری گەورە گـەورە لـەم زاتـەوە، دەگێڕنەوە، سوپاس بۆخودا ئەم زاتـە یەکێکـە لـەو مامۆستاپێشەوایانە کـەمن زانستم لێ وەرگرتوون. فەرمایشتی مامۆستای عەینی تەواو).

بەنـدەیش بـەم بۆنـە گەورەیـەوە ئـەم بەهرەگەورەیـەی تـاجول ئوصـولتان عەرز دەکەم، چونکە مەرج نییـە کـەخاوەن کەرامـەت هـەر مـرۆڤ بـێ، بـەڵکوو کتێـبو درەخـتو گیانلەبـەرانی تـریش بەهرەوکەرامـەتی سـەیر سـەیریان لێ بینـراوە، (بڕوانـە فـەرموودەی ژمـارە ـ ٢٦٩و ١٩٢و ١٥٩و ٩٨، ١٠١وت/٤/٣٤٧/١+٢). بەرگی سێیەمی تاجول ئوصول لەژێر چاپدابوو، زۆر مەبەستم بـوو کـەبزانم لەچاپ دەرچووە یانـا، شـەوێ خـۆم خـەریك کـرد، کەخـەوتم گـوتم: خودایـە! خەوێ روون کەرەوە نیشانەی حاڵ بێ لەم بارەیـەوە ببینـم، جا هەرئەوشـەوە لەخــەوما پیـاوێکی شـێوە شـیرین جەلالـەینێکی بـەرگ زەردی داپـێم، کـاتێ خەبەرم بۆوە وام هەست دەکرد جەلالەینەکـە بەڕاستی وابەدەستمەوە، بـەڵام کەتەماشـای دەسـتمم کـرد هیچم نـەدی! دوایـی هەرچـەنم دەکـرد سـەرم لـەم خەونە دەرنەدەکرد، لەدڵی خۆمـا گـوتم: پەیوەنـدی بەنیازەکـەی منەوەنییـەو خەوتمەوە!

کەچی بۆجاری دووەم هەمان پیـاو هاتـەوە خـەوەو لەگوفتوگۆیـەکا ئەمـەی بۆ روون کـردمەوە: دانـەری (جلالـین) دووکەسـن، ئێـوەیش دووکەسـن: دانـەرو وەرگێڕ، بـەرگی سـێ دەرچـووە، واتـە: سـێ بـەرگی تـاج بـەکوردی تـەواو بـووە، لەبەرئەوە دانەرو وەرگێڕ یەکی (٣٠ـ سی) خێریان بۆ نووسراوە، چونکە خێـر یەك بەدەیە، وشەی (جلالین) بەحیسابی جومەل رەمزی ئەمەی تیایە لەسـەر ئـــەم شـــێوەیە: ج =٣ ل=٣٠، ا= ١ ل= ٣٠ ی= ١٠ واتـــە: ٣×١×١٠= ٣٠ =ج×١×ی = ل بۆدانەرو بەقەد ئەویش بۆ وەرگێڕ، واتە (ل) ێ بۆدانەرو (ل) ێ بۆ وەرگێڕ!

جاكاتێ خەبەرم بۆوە زۆرم بەلاوە سەيربوو، لەدڵی خۆم دا گوتم: خۆهێشتا پيتی (ن) ماوە، دەبێ ئەم هێمای چی بێ؟ بۆجاری سێيەم پياوەكە هاتەوە خەوم بەر لە مەلابانگدان فەرمووی: ن= خمسين = خمس × ی= ن = ١٠×٥ = ٥٠ واتە: پەنجا خێری تەواوی تريش بۆدانەر نووسراوە، چونكە ئەصڵە عەرەبی يەكەی بەپێنج بەرگ چاپ كراوە!

يەك دوو رۆژی نەبرد بەرگی سێيەمی تاج دەرچوو، بەرگەكەی زەرد بوو، ئومێد دەكەم سێجار دووبارە بوونەوەی ئەم خەونە هێمابێ بۆ تەواوبوونی تاج و رياض و تەجريدی بوخاری. ئەمەی نووسيم پاڵفتەی مەبەست بوو والله أعلم.

گەلێ جار بەهرەی گەورە گەورەم لەتاجول ئوصول ديوە، ئەگەر تۆماريان بكەم دەبن بەپەڕاوێ. جارێكيش ماتۆڕێكی موبەريدەو وەتەرپەمپێكی موبەڕيدەو دوو تەلەفوونم پێ بوو، لەپاش دەوام خستمنە ناو گونيەيەك و خستمنە بەردەمی خۆم لەئوتومبێلێكی خەستەخانەداو رۆيشتمەوە بۆماڵ. شوێن مستشفی كركوك العسكری بوو، كاتێ گەيشتينە دەرگای موستەشفا تەماشام كرد ئوتۆمبێلەكان يەك لەدوايەك ريزبوون!

مەفرەزەيێ ئەمنی فەيلەق و ئەمنی نەخۆشخانەی سەربازی كەركووك ئوتومبيل بەئوتومبيل، وەك بۆدەرزی بگرێن ئاوا دەيانپشكنی، لەپێشمەوە خۆشرۆی ئامێرو موساعيدو دوكتۆرەكان بەرێز وەستابوون يەكە يەكە دايان دەبەزاندن، ژێر كوشنەكانيش دەگەڕان، ئەوسا دەيان گوت: تۆ برۆ! ئەوسا ئوتۆمبێلێ تريان دەپشكنی، منيش ئاگام لەهيچ نەبوو جالەسايەقەكەمم پرسی: ئەمە چييە؟ گوتی: تەلەفوون و موتورو وەتەرپەمپی موبەڕيدەی زۆری نەخۆشخانە دزراوە، ئەمە مەفرەزەی ئاسايشە لەناكاو هاتوون، هەتا دزەكە بدۆزنەوە!

بەڕاستی هەناسەم سوار بوو، حەیای هەزار ساڵەم چوو، کێ بڕوا دەکا کەمن ئەم شتانەم نەدزیوە، هەرچیش دزراوە بەسەرمندا ساخ دەبێتەوە، وەکی تریش من کوردم، بێ کەسم، خەڵکی بەناهەق دەستەچەوەری خۆیان بەسەرمانا دەسڕن، دەوەرە تڕەبیانوویەکیشیان هەبێ. یەك سەرهات بەدڵما: (تاجول ئوصول راوبەخت) نەزیاد نەکەم، گەشکەیێ گرتمی وەك کەسێ بچپێنێ بەگوێما: مەترسە خوا کەریمە!!

مقدم طبيب إخصائي باطنی/ غسان نوری أحمد لەپێشمەوە بوو، دایان بەزاندو زۆر بەوردی ئوتومبێلەکەیان پشکنی هیچیان نەدۆزی یەوە.

سەرە گەیشتە سەرمن مەسئولی ئەمنی فەیلەق فەرمانی دەرکرد: تفضل إنزل: فەرمووو دابەزە! دەرگاکەم کردەوە کەدابەزم، مەسئوولی قەڵەمی تەوجیە سیاسی ناوی ئەزهەر بوو، جەعفەری بوو خەڵکی بەسرە بوو، لەولاوە وەك لەزەوی هەڵقوڵێ پەیدابوو، رووی کردە مەسئوولی ئاسایشی فەیلەق و پێ ی گوت: منو مقدم عزالدين ئەم سەیارەیەمان تەفتیش کردووە هیچی تیانییە بابڕوا، ئەوجا یەکسەر رووی کردە من و گوتی: قوربان! فەرموو بڕۆ! منیش رۆیشتم و رزگارم بوو، لەخودا بەزیادبێ، خودا شایەتی حاڵە من بێ تاوان بووم، ئاگام لەدزیو فزی نەبوو، بەڵام ئەگەر ئەو شتانەم لەورۆژەدا پێ بگیرانایە خۆشم دادگایی خۆمم بکردایێ خۆم حوکم دەدا سوپاسی بێ پایان بۆ خودای میهرەبان

٢٨٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَطَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُلْتُ فِي نَفْسِي مَا يُبْكِي هَذَا الشَّيْخَ؟ إِنْ يَكُنْ اللَّهُ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هُوَ الْعَبْدَ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَا قَالَ يَا أَبَا بَكْرٍ لَا تَبْكِ إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ

فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذا خَلِيلًا مِنْ أُمَّتِي لَاتَّخَذتُ أَبَا بَكْرٍ وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الْإِسْلَامِ وَمَوَدَّتُهُ لَا يَبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ بَابٌ إِلَّا سُدَّ إِلَّا بَابُ أَبِي بَكْرٍ). (الحديث ٤٦٦- طرفاه في: ٣٦٥٤، ٣٩٠٤).[٢٤١]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ) وتارێکی دا بۆیاران، فەرمووی: (خودا بەندەیەکی خۆیی کردووە بەسەرپشك: کەیالەجیهاندا بمێنێ، یا ئەوبەشو یارەیە هەڵبگرێ کەلەلای خودا بۆی دانراوە، ئەوبەندەیەیش ئەو بەشو بارەیەی هەڵبژارد کەلەلای خودایە).

فەرمووی: جائەبوبەکر دەستی کرد بەگریان، ئێمە ئەم گریانەی ئەومان بەلاوە سەیر بوو، تەنانەت من لەدڵی خۆما گوتم: ئەم پیرە مێردە بۆ دەگری لەبەرئەوەی کەخودا بەندەیەکی کردووە بەسەرپشك لەنێوانی جیهانو لەنێوانی ئەو بەشو بارەیەی کەوا لەلای خودا، وەبەندەکەیش بەشو بارەکەی لای خودای هەڵبژاردبێ، شتی وا گریانی بۆچی یە؟

تومەز ئەوبەندەیەی کەکرابوو بەسەرپشكو خاترخۆکرابوو لەنێوان ئەم جیهانو ئەوجیهاندا پێغەمبەر خۆی بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) وەئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) تێگەیشتبوو، جا حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبوبەکر! مەگری، بەڕاستی ئەبوبەکر لەهەموو پترپیاوەتی بەسەر منەوە هەیە چ بەگیان، چ بەسامان، ئەگەر من لەئۆمەتم کەسێکم بگرتایە بەدۆست بۆخۆم ئەبوبەکرم دەگرت بەخەلیلو دۆست بۆخۆم، بەڵام کەسێ لەئومەتم ناگرم بەدۆستو خەلیلی تایبەتی بۆ خۆم، چوونکە من خودا کردوومی بەدۆستی خۆی، بەڵام لەگەڵ ئەمەیش دا هەتابڵێی برایەتیو دۆستایەتی ئایینی ئیسلام لەنێوانمانا پتەوو بەهێزە لەسایەی خوداوە) هەتائەوکاتە گەلێ لەهاوڕێیان دەرگای

(٢٤١) اخرجه مسلم في الفضائل (عينى/٤/٢٤٤، ١٢٥، فتح البارى/١/٦٦٥/٤٦٦) المترجم.

ماڵیان لەسەر مزگەوت هەبوو، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە فەرمووی: (هەردەرگایێ لەسەر مزگەوتە دەبێ بگیرێ، تەنیا دەرگای ماڵەکەی ئەبوبەکر نەبێ!)

٢٨٧- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ عَاصِبٌ رَأْسَهُ بِخِرْقَةٍ فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ النَّاسِ أَحَدٌ أَمَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي قُحَافَةَ وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ النَّاسِ خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا وَلَكِنْ خُلَّةُ الْإِسْلَامِ أَفْضَلُ سُدُّوا عَنِّي كُلَّ خَوْخَةٍ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ غَيْرَ خَوْخَةِ أَبِي بَكْرٍ). (الحديث ٤٦٧ أطرافه في: ٣٦٦٥، ٣٦٥٧، ٦٧٣٨).

ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، بەپارچەیێ پەڕۆ سەری خۆیی پێچابوو، لەماڵ دەرچوو هات بۆ مزگەوت، لەسەر دوانگە (منبر)ە کە دانیشتو سوپاسو ستایشی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (لەڕاستیدا ئەبوبەکر لەهەمووکەسێ زیاتر چاکەو پیاوەتی بەسەرمنەوە هەیە، چ بەگیان، چ بەسامان، گریمان من کەسێکم - لەنەتەوەی ئیسلام - بگرتایە بەدۆست (خەلیل) ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قەحافەم هەڵدەبژاردو ئەوم دەکرد بەدۆستی گیانی بەگیانی خۆم، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا لەسایەی خوداوە هەر برای ئایینیمەو هەم هاوڕێمە، دیارە کەدۆستایەتی ی ئیسلام گەلێ باشترە لەهەموو جۆرە دۆستایەتییەکی تر، ئەو دەرگا بچکۆلانەی کەوان لەسەر مزگەوت هەموویان بگرن، نابێ دەرگای ماڵەکانتان لەسەر مزگەوتەکەی من بمێنێ تەنیا دەرکۆڵەکەی ئەبوبەکرنەبێ). (ت/١/١١/٥ تاج-٣ ز-٣ ژ-٣٢٣٤ ج-٤).

٢٨٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ مَكَّةَ فَدَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ فَفَتَحَ الْبَابَ فَدَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِلَالٌ

وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ ثُمَّ أَغْلَقَ الْبَابَ فَلَبِث فِيهِ سَاعَةً ثُمَّ خَرَجُوا قَالَ ابْنُ عُمَرَ فَبَدَرْتُ فَسَأَلْتُ بِلَالًا فَقَالَ صَلَّى فِيهِ فَقُلْتُ فِي أَيٍّ؟ قَالَ بَيْنَ الْأُسْطوَانَتَيْنِ قَالَ ابْنُ عُمَرَ فَذَهَبَ عَلَيَّ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى). (الحديث: ٤٦٨ طرفه في: ٣٩٧).[242]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ئازادکردنی مەککە، عوثمانی کوڕی طەلحەی بانگکرد، کەکلیلداری کەعبە بوو، فەرمانی پێ کرد عوثمان دەرگاکەی کردەوە ئەوجا پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ)و بیلال‌و ئوسامەی کوڕی زەیدو عوثمانی کوڕی طەلحە چوونە ناوکابەوە، ئەوجا دەرگاکە داخرا، تاوێ لەناویدا مانەوە، ئەوجا هاتنەدەرەوە، من گورج لەبیلالم پرسی: ئایا پێغەمبەر نوێژی تیاکرد؟ فەرمووی: ئا نوێژی تیا کرد. گوتم: لەکوێدا؟ فەرمووی: لەنێوانی دوو کۆڵەکە یەمەنیەکاندا. ئیبنوعومەر دەیفەرموو: لەدەستم چوو لێی بپرسم چەند رکاتی تیادا کرد).
(ت/٢/٢٧٢/ ٢+٥ ز-١٣٥ ژ-١٧١٨ چ-٤).

٢٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْمِنبَرِ مَا تَرَى فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ قَالَ مَثْنَى مَثْنَى فَإِذا خَشِيَ الصُّبْحَ صَلَّى وَاحِدَةً فَأَوْتَرَتْ لَهُ مَا صَلَّى وَإِنَّهُ كَانَ يَقُولُ اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ وِتْرًا فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِهِ). (الحديث ٤٧٢ ـ اطرافه في: ٤٧٣، ٩٩٠، ٩٩٣، ٩٩٥، ١١٣٧)[243]

دیسان عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەردوانگە بوو، وتاری دەدا، پیاوێ لێ ی پرسی: قوربان! رات

---

(٢٤٢) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب دخول الكعبة للحاج وغيره رقم: ١٣٢٩=٢٣١٧.

(٢٤٣) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة الليل مثنى مثنى والوتر ركعة، رقم: ٧٤٩ ـ ٧٥٣=١٧٤٥، ١٧٤٧،١٧٤٦.

چۆنه لەبارەی شەونوێژەوە؟ فەرمووی: (واخێرترە شەونوێژ دووركات دووركات بكرێ، واتە: لەهەموو دوو ركاتێكا سڵاو بداتەوە، شەونوێژ خوێن كەترسی ئەوەی بۆپەیدا بوو كەوا خەریكە بەیان بدا بایەك ڕكات بەتەنها بكا، ئیتر چەندەی شەونوێژ كردووە ئەو تاقەڕكاتە دەیانكات بەتاك) نافیع دەیفەرموو: ئیبنو عومەر دەیفەرموو: یەك ڕكاتەكەی وەتر بكەن بەدواترین نوێژی شەوتان، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمە فەرمانی كردووە. (تاج/١/٤٩٧/٢ ز-١٨٢ ژ-٩٧٩ چ-٤ = ش/د/ت/ ن).

## شیكردنەوە:

ئەمە بەڵگەی ئەوەیە: كەدروستە كۆڕ گرتن‌و دانیشتن‌و ئەڵقەدان لەناو مزگەوتا، لەخزمەت مامۆستادا، بۆ مەبەستی شیكردنەوەو فێربوونی زانستی شەرعی، وەك دەورو دەرس‌و یادكردنی خوداو خوێندنی قورئان، بەمەرجێ سەرنەكێشێ بۆسەرلێشێوان لەنوێژكەران.

٢٩٠–عَنْ عَبْدِاللهِ بنْ زَيْد الأَنصاري (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى). (الحديث ٤٧٥ ـ طرفاه في: ٥٩٦٩، ٦٢٨٧).[٢٤٤]

عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی، دووردی خودای لێ بێ، لەناو مزگەوتا لەسەر پشت ڕاكشابوو، لاقی نابووە سەرلاقی. (ت/١/٣٥٩/١٢ ز-١١٨ ژ-٧١٧ چ-٤ = ش/د/ت/ ن).

٢٩١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلَاةُ الْجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلَاتِهِ فِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً

---

(٢٤٤) اخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: في إباحة الإستلقاء و... رقم: ٢١٠٠=٥٤٧١، ٥٤٦٨، ٥٤٧٠.

فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذا تَوَضأَ فَأَحْسَنَ وَأَتَى الْمَسْجِدَ لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ لَمْ يَخْط خَطْوَةً إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَط عَنْهُ خَطِيئَةً حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ وَإِذا دَخَلَ الْمَسْجِدَ كَانَ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتْ تَحْبِسُهُ وَتُصَلِّي يَعْنِي عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذي يُصَلِّي فِيهِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ مَا لَمْ يُحْدِث فِيهِ). (الحديث: ٤٧٧ طرفه في: ١٧٦).[٢٤٥]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی کۆمەڵ، کەبەجەماعەت دەیکەن، بیستو پێنج جار پاداشو خێری زۆرترە لەنوێژیماڵەوەوبازاڕ، کەمرۆڤ بەتەنیا خۆی دەیکا ئەوەیش لەبەر ئەمەیە چونکە هەرکاتێ یەکێ لەئێوە دەسنوێژێکی جوان بشۆرێو بچێ بۆ مزگەوتو لەوچوونەی تەنیا مەبەستی نوێژبێ، ئەم بەهرە گەورەیەی بۆهەیە: هەرهەنگاوێ دەنێ خودا پلەیێ پێ ی بەرزی دەکاتەوەو، گوناهێکی پێ ی لێی هەڵ دەوەرێنێ هەتا دەچێتە ناومزگەوت ئەمە حاڵیەتی، کاتێکیش کەدەچێتە مزگەوت ئیتر والەناو نوێژداو مانەوەی لەناو مزگەوتابەنوێژ دادەنرێ بۆی، هەتا نوێژ لەوێدا گلی بداتەوە، فریشتەیش بۆی دەپاڕێنەوەو خۆش خۆش دەڵێن: خودایە! لێ ی خۆش بە، خودایە! میهری لەگەڵ بنوێنە، بەمەرجێ لەوشوێنەدا بێ کەنوێژەکەی تیاداکردووە، بەمەرجی ئەوەیش کەدەسنوێژەکەی نەشکێ). (ت/١/٣٧٠/١ = ز-١٢٢ ژ-٧٤٣ ج-٤ = ت ش/د/ت/ ن).

٢٩٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضهُ بَعْضا وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ). (الحديث ٤٨١ - طرفاه في: ٢٤٤٦، ٦٠٢٦)[٢٤٦]

---

(٢٤٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل الصلاة الجماعة ... رقم: ٦٤٩=١٥٠٤، ١٤٧٣ — ١٤٧٨.

(٢٤٦) اخرجه مسلم في البر والصلة والادب، باب: تراحم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم، رقم: ٢٥٨٥ = ٦٥٢٨.

ئەبوموووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (موسوڵمان قەڵایە بۆ موسـوڵمان، وەك چۆن چینی دیوار چـنگ دەدەنەیـەك، موسوڵمانانیش لەگەڵ یەکتردا دەبێ ئاوابن) ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ روون کردنەوەی لێکچوونەکە پەنجەی هـەردوو دەسـتی خـۆی تێـك ئـاڵان. (ریاض الصالحین/١/٢٦٠- ش).

٢٩٣-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّى بِنَـا رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِحْدَى صَلَاتَيْ الْعَـشِيِّ فَـصَلَّى بِنَـا رَكْعَتَـيْنِ ثـمَّ سَـلَّمَ فَقَـامَ إِلَـى خَـشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَاتَّكَأَ عَلَيْهَا كَأَنَّه غَضبَانُ وَوَضعَ يَـدَهُ الْيُمْنَـى عَلَـى الْيُـسْرَى وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ وَوَضعَ خَدَّهُ الْأَيْمَنَ عَلَى ظهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَخَرَجَـتْ الـسَّرَعَانُ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ فَقَالُوا قَصُرَتْ الصَّلَاةُ وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ فِي يَدَيْهِ طولٌ يُقَالُ لَهُ ذو الْيَـدَيْنِ قَـالَ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ أَنَـسِيتَ أَمْ قَصُرَتْ الصَّلَاةُ؟ قَالَ لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصرْ فَقَـالَ أَكَمَـا يَقُـولُ ذو الْيَـدَيْنِ فَقَـالُوا نَعَـمْ فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى مَا تَرَكَ ثمَّ سَلَّمَ ثمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطـوَلَ ثـمَّ رَفَـعَ رَأْسَـهُ وَكَبَّرَ ثمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطوَلَ ثمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ ثمَّ سَلَّمَ). (الحـديث ٤٨٢- أطرافـــــه في: ٧١٤، ٧١٥، ١٢٢٧، ١٢٢٨، ١٢٢٩، ٦٠٥١، ٧٢٥٠)[٢٤٧]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆ - یاعەسر- ی بـۆ دەکـردین، دوو رکـاتی بۆمـان کـردو سڵاوی دایەوە، تەختەیەك لـەناو مزگـەوتا هـەڵ سـەپێنرابوو، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا پاڵی دابەوتەختەیەوە، وەك عاجزو زیزوابـوو، دەسـتی راسـتی نایە سەردەستی چەپێو پەنجەکانی تێـك پەڕانـدو رووومـەتی لای راسـتی دانـا

---

(٢٤٧) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: السهو في الصلاة والسجود لـه. رقـم: ٥٧٣=١٢٨١ — ١٢٩٠.

لەسەرپشتی دەستی چەپی، وەئەوانەی بەپەلەبوون لەدەرگاكانی مزگەوتەوە چوونە دەرەوە، نوێژكەرەكانی تریش لەبەرخۆیانەوە گوتیان: نوێژ كورت كراوەتەوە؟ ئەبوبەكرو عومەریش لەناو كۆمەڵەی نوێژخوێنەكانابوون، پرکێشیان نەكرد كەلەم بارەیەوە قسە لەگەڵ حەزرەتدا بكەن، لەناو كۆمەڵەكەدا پیاوێ هەبوو، هەردوودەستێ كەمێ درێژ بوون، لەبەرئەوە پێیان دەگوت: ذولیەدەین (واتە: دەست درێژكەلە) جائەو پیاوە هەڵسا عەرزی حەزرەتی كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نوێژ كورت كراوەتەوە یاتۆ لەیادت نەبوو، كەوا لەباتی چوار ركات دووركاتت كرد؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم دووشتە هیچیان رووی نەداوە، نەمن لەبیرم چووەو نەنوێژیش كورت بۆتەوە، ئەویش عەرزی كرد: با، ئەی پێغەمبەری خوا! یەكێ لەم دووشتە روی داوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: ئایا شتی وا رووی داوە، وەك ذولیەدەین دەڵێ وایە؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! قسەكەی تەواوە. ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆ جێگەی نوێژەكەی خۆی و، پێشكەوتەوەو دووركاتی تری كردو بەدانیشتنەوە (لەپاش سلاودانەوە) دوو كڕنووشی هەڵەی لەسەر ئەم شێوەیە برد: لەپاش سلاودانەوەی دوەم ئەللاهوئەكبەری كردو كوڕنوشێكی ئاسایی برد، یان كەمێ درێژتر، ئەوجا سەری بەرز كردەوەو ئەللاهوئەكبەری كردو كوڕنووشێكی ئاسایی تری برد، یان كەمێ درێژتر لەكووڕنووشی ئاسایی، دیسانەوە سەری بەرز كردەوەو ئەللاهوئەكبەری كردو بۆجاری سێیەم سلاوی دایەوە. (ت/١/٣٢٦/٧/٨/٩/١٠ ز-١٠٩ ژ-٦٤٠ ج-٤).

٢٩٤- عَنْ إِبْنِ عُمَر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) (أَنَّهُ كَانَ يُصَلي فِي أَمَاكِنَ مِنْ الطرِيقِ فَيُصَلِّي فِيهَا وَيُحَدِّث أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يُصَلِّي فِيهَا وَأَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي تِلْكَ الْأَمْكِنَةِ وَحَدَّثنِي نَافِعٌ عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي فِي تِلْكَ الْأَمْكِنَةِ).
(الحديث ٤٨٣- أطرافه في: ١٥٣٥، ٢٣٣٦، ٧٣٤٥).

گـەڵێ جـار عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەڕێگەوبانـەکانی دەوروبەری مەدینە، بۆ نوێژکردن منەی ئەو شوێنانەی دەکرد کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی تیـا کـردوون، ئـەویش لەوشـوێنانەدا نوێـژی دەکـرد، وەئـەوەی دەگێڕایـەوە: کەبـەخوودی خـۆی پێغەمبـەری دیـوە لەوجێگایانـەدا نوێژی کردووە.

٢٩٥- عَنْ نافع (رحمه الله تعالى) أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْزِلُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ حِينَ يَعْتَمِرُ وَفِي حَجَّتِهِ حِينَ حَجَّ تَحْتَ سَمُرَةٍ فِي مَوْضِعِ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ وَكَانَ إِذا رَجَعَ مِنْ غَزْوٍ كَانَ فِي تِلْكَ الطريقِ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ هَبَط مِنْ بَطْنِ وَادٍ فَإِذا ظَهَرَ مِنْ بَطْنِ وَادٍ أَنَاخَ بِالْبَطحَاءِ الَّتِي عَلَى شَفِيرِ الْوَادِي الشَّرْقِيَّةِ فَعَرَّسَ ثَمَّ حَتَّى يُصبِحَ لَيسَ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِحِجَارَةٍ وَلَا عَلَى الْأَكَمَةِ الَّتِي عَلَيْهَا الْمَسْجِدُ كَانَ ثَمَّ خَلِيجٌ يُصَلِّي عَبْدُ اللَّهِ عِنْدَهُ فِي بَطنِهِ كُثبٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَّ يُصَلِّي فَدَحَا السَّيْلُ فِيهِ بِالْبَطحَاءِ حَتَّى دَفَنَ ذَلِكَ الْمَكَانَ الَّذِي كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي فِيهِ).[٢٤٨] (الحديث ٤٨٤ ـ أطرافه في: ١٥٣٢، ١٥٣٣، ١٧٩٩).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى حَيْثُ الْمَسْجِدُ الصَّغِيرُ الَّذِي دُونَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِشَرَفِ الرَّوْحَاءِ وَقَدْ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَعْلَمُ الْمَكَانَ الَّذِي صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ثَمَّ عَنْ يَمِينِكَ حِينَ تَقُومُ فِي الْمَسْجِدِ تُصَلِّي وَذَلِكَ الْمَسْجِدُ عَلَى حَافَةِ الطريقِ الْيُمْنَى وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمَسْجِدِ الْأَكْبَرِ رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ أَوْ نَحْوُ ذَلِكَ). (٤٨٥ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُصَلِّي إِلَى الْعِرْقِ الَّذِي عِنْدَ مُنْصَرَفِ الرَّوْحَاءِ وَذَلِكَ الْعِرْقُ انْتِهَاءُ طَرَفِهِ عَلَى حَافَةِ الطريقِ دُونَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُنْصَرَفِ وَأَنْتَ

---

(٢٤٨) اخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب المبيت بذى طوى. برقم:١٢٥٩، ١٢٦٠=٣٠٣٥-٣٠٣٦.

ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ وَقَدْ ابْتُنِيَ ثَمَّ مَسْجِدٌ فَلَمْ يَكُنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يُصَلِّي فِي ذَلِكَ الْمَسْجِدِ كَانَ يَتْرُكُهُ عَنْ يَسَارِهِ وَوَرَاءَهُ وَيُصَلِّي أَمَامَهُ إِلَى الْعِرْقِ نَفْسِهِ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنْ الرَّوْحَاءِ فَلَا يُصَلِّي الظهْرَ حَتَّى يَأْتِيَ ذَلِكَ الْمَكَانَ فَيُصَلِّي فِيهِ الظهْرَ وَإِذا أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ فَإِنْ مَرَّ بِهِ قَبْلَ الصُّبْحِ بِسَاعَةٍ أَوْ مِنْ آخِرِ السَّحَرِ عَرَّسَ حَتَّى يُصَلِّيَ بِهَا الصُّبْحَ). (٤٨٦ رقم الحديث في فتح البارى)

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنزِلُ تَحْتَ سَرْحَةٍ ضخْمَةٍ دُونَ الرُّوَيْثَةِ عَنْ يَمِينِ الطريقِ وَوِجَاهَ الطريقِ فِي مَكَانٍ بَطِحٍ سَهْلٍ حَتَّى يُفْضِيَ مِنْ أَكَمَةٍ دُوَيْنَ بَرِيدِ الرُّوَيْثَةِ بِمِيلَيْنِ وَقَدْ انْكَسَرَ أَعْلَاهَا فَانْثَنَى فِي جَوْفِهَا وَهِيَ قَائِمَةٌ عَلَى سَاقٍ وَفِي سَاقِهَا كُثُبٌ كَثِيرَةٌ). (٤٨٧- رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (صَلَّى فِي طَرَفِ تَلْعَةٍ مِنْ وَرَاءِ الْعَرْجِ وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى هَضْبَةٍ عِنْدَ ذَلِكَ الْمَسْجِدِ قَبْرَانِ أَوْ ثَلَاثَةٌ عَلَى الْقُبُورِ رَضمٌ مِنْ حِجَارَةٍ عَنْ يَمِينِ الطرِيقِ عِنْدَ سَلَمَاتِ الطرِيقِ بَيْنَ أُولَئِكَ السَّلَمَاتِ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنْ الْعَرْجِ بَعْدَ أَنْ تَمِيلَ الشَّمْسُ بِالْهَاجِرَةِ فَيُصَلِّي الظهْرَ فِي ذَلِكَ الْمَسْجِدِ). (٤٨٨ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (نَزَلَ عِنْدَ سَرَحَاتٍ عَنْ يَسَارِ الطرِيقِ فِي مَسِيلٍ دُونَ هَرْشَى ذَلِكَ الْمَسِيلُ لَاصِقٌ بِكُرَاعِ هَرْشَى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطرِيقِ قَرِيبٌ مِنْ غَلْوَةٍ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي إِلَى سَرْحَةٍ هِيَ أَقْرَبُ السَّرَحَاتِ إِلَى الطرِيقِ وَهِيَ أَطوَلُهُنَّ). (٤٨٩ رقم الحديث في فتح البارى/ طرفاه في: ١٧٦٧، ١٧٦٩).

وأنَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنْزِلُ فِي الْمَسِيلِ الَّذِي فِي أَدْنَى مَرِّ الظهْرَانِ قِبَلَ الْمَدِينَةِ حِينَ يَهْبِط مِنْ الصَّفْرَاوَاتِ يَنْزِلُ فِي بَطنِ ذَلِكَ الْمَسِيلِ عَنْ يَسَارِ الطرِيقِ وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ لَيْسَ بَيْنَ مَنْزِلِ رَسُولِ

اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الطرِيقِ إِلَّا رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ). (٤٩٠- رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنْزِلُ بِذِي طوًى وَيَبِيتُ حَتَّى يُصْبِحَ يُصَلِّي الصُّبْحَ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ وَمُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ لَيْسَ فِي الْمَسْجِدِ الَّذي بُنِيَ ثمَّ وَلَكِنْ أَسْفَلَ مِنْ ذلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ). (٤٩١ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اسْتَقْبَلَ فُرْضَتَيْ الْجَبَلِ الَّذي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَبَلِ الطوِيلِ نَحْوَ الْكَعْبَةِ فَجَعَلَ الْمَسْجِدَ الَّذي بُنِيَ ثَمَّ يَسَارَ الْمَسْجِدِ بِطرَفِ الْأَكَمَةِ وَمُصَلَّى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْفَلَ مِنْهُ عَلَى الْأَكَمَةِ السَّوْدَاءِ تَدَعُ مِنْ الْأَكَمَةِ عَشَرَةَ أَذرُعٍ أَوْ نَحْوَهَا ثم تُصَلِّي مُسْتَقْبِلَ الْفُرْضَتَيْنِ مِنْ الْجَبَلِ الَّذي بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ ). (٤٩٢- رقم الحديث في فتح الباري).

**نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) هەواڵی پێدام: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ دەچوو بۆ عەمرە، کەدەگەیشتە ذولحەلیفە، کەچوار میل لەمەدینەوە دوورە، کەئێستا پێی دەگوترێ بیری عەلی، لەوێ لەژولحەلیفە دادەبەزیو لای دەدا بۆ وچان گرتن، لەحەجی ماڵاواییشدا لەوێ دابەزی، لەژێردارموغەیلا نێکالای دەدا، لەشوێنی ئەو مزگەوتەدا بوو کەوا لەذولحولەیفە.**

**جاران دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کەلەوڕێگەوە، لەغەزا، یالەحەج، یالەعەمرە، دەگەڕایەوە بۆمەدینە، لەناو شیوی عەقیقەوە دادەپەڕی، کەلەناو شیوەکە دەردەچوو لای دەدا، وڵاخەکەی لەوزیخەڵانە پانو بەرینە دا پیخ دەدا، کەدەکەوێتە سەرقەراخی شیوەکە، لەخۆرهەڵاتی کەوانەی شیوەکەوە، ئەوزیخەڵانە ناودارە بە بەطحای ذولحەلیفە، ئالەوێدا وچانی دەگرتو هەتا بەیانی لێ دەدا لەوێ دەمایەوە، لەلای ئەو ئەومزگەوتەدا**

نـا كـەوا لەسـەر گـردە بەردینەکـە، وەلەسـەر ئـەو تەپۆڵکەیـەیش نـا کەمزگەوتێکی وابەسەرەوە، لەوێدا دەرەیێ هەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لـێ بـێ) لـەناو ئـەو دەرەیـەدا نوێـژی دەکـرد، لـەناو ئەودەرەیـەدا چـەند تەپۆڵکە لـێ هـەبوو، جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێـدا نوێـژی دەکـرد، بەڵام بەرەبەرە لافاو پاڵی نا بەزیخو لی زیخەڵانەکەوەو، لەقوڕولیتەی بەطحا کە ناو ئەودەرەیەی پڕکردەوەو، ئەو شوێنەی کەعەبدوڵڵا بۆ پیرۆزی نوێژی تیادا دەکرد لەو چەوو قوڕو لیتە دایپۆشی.

دیسان نـافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: وەعەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خوایان لـێ بێ) گێڕایەوەبۆم: کـە پێغەمبـەری سـەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێـدا نوێژی دەکرد کەمزگەوتە بچکۆلەکەی لێیە، کەوا لـەنزیکی مزگەوتـە نـاونجی یەکـەوە، کـەوا لەسـەر ئـەو بـەرزای یـەی کـەدەڕوانێ بەسـەر گونـدی ڕەوحـادا، ڕەوحاو دووڕۆژ ـ کەدەکاتە سیی‌و شەش میـل ـ لەمەدینـەوە دوورە، عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوشوێنەی دەزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لێ کردبـوو، ئاوا نیشانەی ئەو جێگەیـەی هەڵدەدا: کـاتێ لەمەدینـەوە دەچیت بۆ مەککە، لـەوێ لـەلای ڕاسـتتەوە کـاتێ لـەناو مزگەوتەکـەدا ڕادەوەسـتیت نوێـژ دەکـەی، مزگەوتـە نـاونجی یەکـە دەکەوێتـە سـەر قـەراخی لای ڕاسـتی ڕێگەکـە، کەلەمەدینـەوە بـچیت بـۆ مەککـە، بەردەماوێـژێ، یـادەوری بەردەماوێـژێ لەمزگەوتە گەورەکەوە دوورە!

وەئیبنوعومـەر لـەپاڵ ئـەو یاڵەیـشدا نوێـژی دەکـرد، کـەوا لـەلای کۆتـایی ڕەوحادا، کەناودارە بەیاڵی (عرق الظبية) کلکەی ئەم یاڵە کۆتایی دێ، لەسـەر قـەراخی ڕێگەکـە، لـەنزیك ئـەو مزگەوتـەوە کـەوا لـەنێوانی یاڵەکـەو کۆتـایی ڕەوحادا، کەلەمەدینەوە بچێ بۆ مەککە. ئالەوێدا مزگەوتێ دروست کرابوو، عەبـدوڵڵا لـەو مزگەوتـەدا نوێـژی نـەدەکرد، بـەڵکوو ئـەو مزگەوتـەی بـەجێ دەهێـشت‌و لـەلای چـەپیەوە دەیخـستە پـشت خـۆی‌و لەبـەردەم مزگەوتەکـەوە

بەرەو خودی یاڵی عیرقول زەبیە نوێژی دەکرد، وەجاران عەبدوڵلای کوڕی عومەر سەرلەبەیانیان لەرەوحائەوە بەرەو مەککە دەکەوتەڕێ، نوێژی نیوەڕۆی نەدەکرد، تا دەهاتە ئەوشوێنەو لەوێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد بەڵام ئەگەر لەمەککەوە بهاتایەتەوە، وەبەتاوێ لەپێش بەیانا بگەیشتایەتە ئەوێ، یا لەبەرە بەیانا بگەیشتایەتە ئەوێ لەوێ لای دەدا، هەتا نوێژی بەیانی لێ دەکرد.

وەنافیع فەرمووی: وەعەبدوڵلا گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەژێر شێخەڵێکی گەورەدا، لەنزیك گوندی رووەیثەوە لای لای دەدا، لەلای راستی ڕێگەکەوە ڕێك لەبەرابەری ڕێگەکە، لەشوێنێکی دەشتانی تەختانی پان و پۆڕدا دادەبەزی، لەو تەپۆڵکەوە سەری هەڵدەدا کە دوو میل دوورە لەو جێگەیەوە کەبەریدی رووەیثەی لێ دادەبەزێ. ئەو تەپۆڵکە لەیش لووتکەی شکاوەتەوە نووشتاوەتەوە ناوخۆی، لەبەرئەوە ڕێك وەك خانوو لەسەر دیوار ئاوا قنج راوەستاوە، نەك وەك گرد لەبنەوە پان و لەسەرەوە تەسك بێ، لەبنیدا کۆمەڵێ تەپکە لمی زۆری لێ بوو.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەعەبدوڵلا گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەدامێنی تافگەیێ نوێژی دەکرد، لەپشت عەرجەوە، کەبەرەو یاڵێ برۆی، لەلای ئەو مزگەوتە دوو گۆڕ یاسێ گۆڕ هەیە، گۆڕەکان کۆمەڵە بەردیان والەسەر، وان لەلای راستی ڕێگەکەوە، لەلای تاوێرەکانی سەر ڕێگەکەدان، لەناو ئەو تاوێرانەوە عەبدوڵلا لەپاش فرچەی نیوەڕۆ کەخۆر لاردەبۆوە لەعەرجەوە دەچووبۆ ئەو مزگەوتەو نوێژی نیوەڕۆی لەوێ دەکرد.

دیسان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای کۆمەڵێ شێخەڵا، لەچەپی ڕێگەکەوە، لەئاوەڕۆگەیەکی لافاوا، لەنزیك ملەی هەرشاوە، لای دا بۆ وچان، ئەو ئاوەڕۆگەیە لکاوە بەدامێنی لاپاڵی هەرشاوە، لەنێوانی

ئـەو و ڕێگەکـەدا نزیکـەی تیرەهاوێـژێ دەبـێ، وەعەبـدوڵڵا ڕووەو شـێخەڵێ لەوشـێخەڵانە نوێـژی دەکـرد، کـەنزیکترین شـێخەڵێ بـوو لەوشـێخەڵانەی کەلەڕێگەکەوە نزیك بوون، وەلەگشت شێخەڵەکانی تریش درێژتر بوو.

دیـسان نـافیع (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خوایان لـێ بـێ) ئـەم فەرموودەیـەی پـێ گـوتم: کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) جاران لەوئاوە ڕێژگەی لافاوەدا دادەبەزی کەوا لـەخوارووی مـەڕوظەهرانـەوە، لەئاسـتی مەدینـە، لەوێـدا کەبـەرەو شـیوە زەردەکـان دادەپـەڕێت لـەناو ئـەو ئاوڕێژگەیـەدا دادەبـەزیت، کـەوا لـەلای چـەپی ڕێگەکـەوە، کەبـەرەو مەککـە بڕۆیـت، جێگـەی دابەزینەکـەی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) بەردەهاوێـژێ لەڕێگەکەوە دوورە.

دیـسان نـافیع (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خوایان لـێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتـەوە بـۆم کـەجاران پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لـەذیطـەوا دادەبـەزی، وەشـەو لـەوێ دەمایـەوە تابـەیانی، وەنوێـژی بەیانی لـەوێ دەکـرد، ئـەوجا دەڕۆیـشتە نـاو مەککـەوە، نوێژگاکـەی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەذی طـەوا، لەسـەر تەپۆڵکەیـەکی گـەورە بـوو، لـەناو ئـەو مزگەوتـەدا نـا کەئێـستا لـەوێ دروسـت کـراوە، بـەڵام لـەخوار ئـەوەوە لەسـەر گردێکی گەورە.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گێڕایەوە بۆم: کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕووی کـردە سـەرکەل، کەڕێگەکـە لەسـەر شاخەکەبەینیدا دەڕوا، ئەو شاخەی کەدەکەوتـە نێوانی پێغەمبـەرو نێوانی شاخەدرێژەکەی لای کەعبەوە، ئەو مزگەوتـەی کەئێـستا لـەوێ دروسـت کـراوە دەیخـستە لای چـەپی مزگەوتەکـەوە کەلـەئاخری گردەکـەوە بـوو، نوێژگاکـەی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەخواریـەوە بـوو، لەسـەر گـردە ڕەشـەکە، دەگـەز

یالەدەوری دەگەز لەوگردە بەجێ بهێڵە، ئـەوجا رووبکـەرە سـەرکەلەکە لەسـەر کێوەکەو نوێژ بکە، کێوەکە لەم کاتەدا دەکەوێتە نێوانی تۆو نێوانی کەعبەوە.

**راڤەو شیکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم چەند فەرموودەیە پێویـست بەنەخـشەیەکی ئـەم ڕێگەوبانانـە هەیـە، شـێخی عەسـقەلانی لـە فەتحولباریـدا دەفـەرموێ: (لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا لـەم مزگەوتانـە تـەنیا دوو مزگەوتەکـەی ذولحولەیفـەو مزگەوتەکانی رەوحاء دەزانـرێن و بـەس) وەهـەروا دەفـەرموێ: (پوختـەی ئـەم فەرموودانە بەڵگەی ئەوەیە: کەئیبنوعومەر خۆی پیرۆز دەکرد لەپیتو فەڕی ئەو شوێنە پیرۆزانـە.. سوودی زانینـی ئـەم جێگایانـەیش ئەوەیـە کەبەغـەوی دەفەرموێ: هەر مزگەوتێ ساخ ببێتـەوە کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی تیـادا کـردووە، ئەگـەر کەسـێ ئاە و نـەزربکا کەنوێـژی تیـادا بکـا، نەزرەکـەی دادەمەزرێو لەسەریەتی کەجێ بەجێ ی بکـا، هـەروەك چـۆن کەسـێ نـەزربکا کەنوێـــژ لەمەســـجیدولحەراما، یالەمزگەوتەکـــەی پێغەمبـــەردا، یالەمەسجیدولئەقصادا بکا ئاوا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## (١٢) باسەکانی بەربەست (سوترە)ی نوێژکەر

## (أبواب سترة المصلى)

٢٩٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ إِذا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ فَتوضعُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَيُـصَلِّي إِلَيْهَـا وَالنَّـاسُ وَرَاءَهُ وَكَانَ يَفْعَلُ ذلِكَ فِي السَّفَرِ فَمِنْ ثمَّ اتَّخَذهَا الْأُمَرَاءُ). (الحديث ٤٩٤- أطرافـه في: ٤٩٨، ٩٧٢، ٩٧٣)[٢٤٩]

---

(٢٤٩) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: سترة المصلى، رقم: ٥٠١ = ١١١٥.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەڕۆژی جەژنا، کەلەشار دەردەچوون و دەچوون بۆ نوێژگاکە لەدەرەوەی شار، بۆ کردنی نوێژی جەژن، فەرمانی بەنۆکەرەکەی دەکرد، نێزەیەکی هەڵدەگرت و، لەبەردەم پێغەمبەرەوە دەڕۆیشت، تادەگەیشتنە نوێژگاکە، لەوێ لەبەردەم پێغەمبەرەوە نێزەکەی دادەچەقاند، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دەکرد، خەڵکەکەیش لەپشتیەوە بەجەماعەت نوێژیان دەکرد، ئەم نێزەداچەقاندنەی لەلەسەفەریشدا دەکرد، لەشوێنێ کەدیواری لێ نەبووایە بۆ کردنی بەبەربەست، جائەم کارەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرچاوەی ئەو دەستوورو باوەیە کەفەرمانڕەواکان کردویانە بەیاسا لەجەژن و ئەمانەدا کەسێ نێزەیێ هەڵدەگرێ و لەبەردەمیانەوە تانوێژگاکە دەڕوا).

٢٩٧-عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ بِالْبَطحَاءِ وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ، الظهْرَ رَكْعَتَيْنِ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ تَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ). (الحديث: ٤٩٥ طرفه في: ١٨٧).[٢٥٠]

ئەبوجوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەبەطحای مەککە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی دەکرد نیوەڕۆو عەصری کورت کردەوە، بەکۆکردنەوەی کورتەوەکراوی پێشخراو لەسەر ئەم شێوەیە کردنی، لەپێشا نوێژی نیوەڕۆی بەدوو ڕکات بۆ کردن، دوابەدوای ئەو نوێژی عەصریشی بەدوو ڕکات بۆکردن، لەوکاتەدا لەبەردەمیەوە لەودیو نێزەکەوە ژن و گوێدرێژ هاموشۆیان دەکرد ئەوەیش زیانی بۆ نوێژەکەیان نەبوو. (ت/١/٢٤١/١/٢ ژ-٤٦٢ چ-٤).

٢٩٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ). (الحديث: ٤٩٦ طرفه في: ٧٣٣٤).[٢٥١]

---

(٢٥٠) أخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٤/٢٧٨/١٤٤) المترجم = ١١٢٢.

سەهل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نوێژگە (موصەللا) کەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجێگەی پێکانیەوە تادیوارەکە - بەقەد گوزەرگای مەڕێ، یابزنێ، دەبوو. (ش/د/تاج/ ١/٢٣٦/١).

٢٩٩- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ تَبِعْتُهُ أَنَا وَغُلَامٌ وَمَعَنَا عُكَّازَةٌ أَوْ عَصًا أَوْ عَنَزَةٌ وَمَعَنَا إِدَاوَةٌ فَإِذا فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ نَاوَلْنَاهُ الْإِدَاوَةَ). (الحديث: ٥٠٠).[٢٥٢]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەچوو بۆسەراو، منو کوڕێکی تر لەسێرەی مندا، جەوەندەیێ ئاومان هەڵدەگرتو شوێنی دەکەوتین، کەسەراوەکەیی تەواو دەکرد ئاوەکەمان دەدایە دەستی تاراتی پێ دەگرت.

هەروا دارشەقێ یاداردەستێ یانێزەیەکیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد لەپاش تاراتکردنو دەسنوێژ گرتن ئەگەر لەشوێنێ نوێژی بکردایێ کەبەربەستی ترێ لێ نەبوایە، ئەوەی دەکرد بەبەربەست. (تاج/١/١٢٢/١ ز-٢٥ ژ-٢٠١ چ-٤).

٣٠٠- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوعِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ كانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْأُسْطوَانَةِ الَّتِي عِنْدَ الْمُصْحَفِ فَقُلْتُ يَا أَبَا مُسْلِمٍ أَرَاكَ تَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَ هَذِهِ الْأُسْطوَانَةِ؟ قَالَ فَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَهَا). (الحديث: ٥٠٢).[٢٥٣]

یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەید فەرمووی: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستووری وابوو لەلای کۆڵەکەکەی لای صندووقی قورئانەکەدا منەیی نوێژی دەکرد، منیش عەرزیم کرد: ئەی ئەبوموسلیم! سەرەنجت دەدەم لەلای ئەم

---

(٢٥١) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: الاستنجاء بالماء من التبرز، رقم: ٢٧١=١١٣٤.

(٢٥٢) أخرجه مسلم في الصلاة باب: دنو المصلى من السترة، رقم: ٥٠٩=٦١٨، ٦١٩.

(٢٥٣) أخرجه مسلم في الصلاة باب: دنو المصلى من السترة، رقم: ٥٠٨ = ١١٣٥.

کۆڵەکەیەدا منەیی نوێژ دەکەی، هۆی ئەوە چییە؟ فەرمووی: دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێرەدامنەیی نوێژی دەکرد.(ت/١/٢٣٦/٢=ز-٦٧ ژ-٤٤٧).

**شیکردنەوە:**

ئەم کۆڵەکەیە کۆڵەکەی ناوەڕاستە لەکۆڵەکەکانی ڕەوضەی موکەڕڕەمە، کەوا لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر، لەمەدینەی نازدار، ناسراوە بەکۆڵەکەی کۆچکاران (اسطوانة المهاجرين).

دەگێڕنەوە: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر مەردمەکە بەمە بزانن لەسەری دەیکەن بەشەڕە تیر، چونکە هەرکەسەیان خۆی دەیویست لەوێدا نوێژبکا). عائیشە بەنهێنی ئەم ڕازەی لای ئیبنوزوبەیر درکاندبوو، بۆیە ئیبنوزوبەیر زۆر لەوێدا نوێژی دەکرد.

٣٠١- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ الْكَعْبَةَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلَالٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ وَمَكَثَ فِيهَا فَسَأَلْتُ بِلَالًا حِينَ خَرَجَ مَا صَنَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَسَارِهِ وَعَمُودًا عَنْ يَمِينِهِ وَثَلَاثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ ثُمَّ صَلَّى؟ وفي رواية: عَمُودَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ).(الحديث: ٥٠٥ طرفه في: ٣٩٧).

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیو بیلالو ئوسامەی کوڕی زەیدو عوثمانی کوڕی طەلحەی ئەل ـ حەجەبی چوونە ناوماڵی کابەوە، وەدەرگایان لەسەرخۆیان داخستو تاوێ لەناویدا مانەوە، جاکەدەرگاکەیان کردەوە یەکەم کەس کەچووە ژوورەوە من بووم، بەبیلال گەیشتم لێیم پرسی: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی تیادا کرد؟ فەرمووی: بەڵێ: کۆڵەکەیەکی خستەلای چەپیەوەو دوو کۆڵەکەی خستەلای ڕاستیەوەو سێ کۆڵەکەیشی خستە پشت خۆیەوە، کەئەمە

سەرجەمیان دەکەنە شەش کۆڵەکە، ئەو سەردەمەیش بەیت لەسەر شەش ئەستون بوو (بڕوانە فەرموودەی ژمارە:٢٨٨).

٣٠٢- عَنْ عُبَيْدالله عَنْ نافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَنَّهُ كَانَ يُعَرِّض رَاحِلَتَهُ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا قُلْتُ أَفَرَأَيْتَ إِذا هَبَّتْ الرِّكَابُ؟ قَالَ كَانَ يَأْخُذ هَذا الرَّحْلَ فَيُعَدِّلُهُ فَيُصَلِّي إِلَى آخِرَتِهِ أَوْ قَالَ مُؤَخَّرِهِ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ يَفْعَلُهُ). (الحديث: ٥٠٧ طرفه في: ٣٨٢).[٢٥٤]

عوبەیدوڵلا فەرمووی: نافیع فەرمووی: ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی ی لەبەردەمی خۆیدا لەسەرلا درێژ دەکردو ئەوجا نوێژی بەرەو وڵاخەکە دەکردو وڵاخەکەی دەکرد بەبەربەست (سوترە). نافیع فەرمووی: گوتم بەئیبنوعومەر: باشە لەکاتی وشتر شەڵەژانا چۆن؟ فەرمووی: لەکاتی وادا کۆپانە وشترەکەی دەهێناو بەڕێکی لەبەردەم خۆیەوەدای دەناو ڕێك دەیی وەستانو ئەوجا بەرەو کۆپارەی پاشەوەی کورتانەکە نوێژی دادەبەست، ئیبنوعومەریش هەمان شتی دەکرد. واتە: ئەگەر وشترەکەی هێمن بوایە لەسەرباری پانی خودی وشترەکەی دەکرد بەبەربەست دەنا کۆپانەکەیی دەکرد بەبەربەست. (ت/١/٢٣٧/٤ ز-٦٧ ژ-٤٤٩ چ-٤).

٣٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (أَعَدَلْتُمُونَا بِالْكَلْبِ وَالْحِمَارِ لَقَدْ رَأَيْتنِي مُضطَجِعَةً عَلَى السَّرِيرِ فَيَجِيءُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَتَوَسَّط السَّرِيرَ فَيُصَلِّي فَأَكْرَهُ أَنْ أُسَنِّحَهُ فَأَنْسَلُّ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيْ السَّرِيرِ حَتَّى أَنْسَلَّ مِنْ لِحَافِي). (الحديث: ٥٠٨ طرفه في: ٣٨٢).[٢٥٥]

---

(٢٥٤) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: سترة المصلى، رقم: ٥٠٢ = ١١١٧.

(٢٥٥) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: الاعتراض بين يدى المصلى، رقم: ٥١٢ = ١١٤٣.

**هەندێ کەس لەخزمەتی عائیشەی دایکی موسوڵمانانـدا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **باسـی ئەوشـتانەیان دەکـرد کەگوایـە ئەگـەر بەبـەردەم نوێژکـەردا بـڕۆن نوێژەکـەی دەبڕن، وەگوتیان: سەگ‌و کەروژن نوێـژ دەبـڕن! عائیشـەیش فـەرمووی: ئەمـە چۆن قسەیەکە، ئێمەی ژنان دەکەن بەهاوتای سەگ‌و کەر؟!**

**شتی وا راست نییە، چونکە ڕێکەوتووە مـن خـۆم لەسـەر تـەخت راکشاوم کـاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **تەشریفی دەهاتـەوە، ڕێـك لەناوەڕاستی چارپایەکەی مـن لەسـەری راکشابووم رادەوەسـتاو نوێـژی دادەبەست، جائەگـەر لەوکاتـەدا بـۆ کـارێ هەڵبـستامایە حـەزم نـەدەکرد کـەڕێك رووبـەڕووی حـەزرەت راسـت ببمـەوە، لەبەرئـەوە بەهێواشـی لـەلای پـاینی چـارپایەکەوە خـۆم دەدزییـەوەو خـۆم لـەژێر لێفەکەمەوە دەکێشایەوە. (ت/١/٢٤٤/٤ = ز-٧١ ژ٤٦٦ = ش/د/ ن).**

٣٠٤-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنهُ كانَ يُصَلِّي فِي يَـوْمِ جُمُعَـةٍ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ فَأَرَادَ شَابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْط أَنْ يَجْتَازَ بَـيْنَ يَدَيْـهِ فَـدَفَعَ أَبُو سَعِيدٍ فِي صَدْرِهِ فَنَظرَ الشَّابُّ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغًا إِلَّا بَيْنَ يَدَيْهِ فَعَـادَ لِيَجْتَـازَ فَدَفَعَـهُ أَبُو سَعِيدٍ أَشَدَّ مِنْ الْأُولَى فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ ثمَّ دَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ خَلْفَهُ عَلَى مَرْوَانَ فَقَالَ مَا لَكَ وَلِـابْنِ أَخِيـكَ يَـا أَبَـا سَعِيدٍ! قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذا صَـلَّى أَحَـدُكُمْ إِلَـى شَـيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنْ النَّاسِ فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ فَإِنْ أَبَـى فَلْيُقَاتِلْـهُ فَإِنَّمَـا هُـوَ شَيْطَانٌ). (الحديث ٥٠٩- طرفه في: ٣٢٧٤) [٢٥٦]

**ئەبوصالح** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فـەرمووی: رۆژێ هـەینی بـوو، ئەبوسـەعیدی خـودری** (ڕەزای خوای لێ بێ) **نوێـژی دەکـرد، شـتێکی کردبـوو بـە بەربەسـت هـەتا کـەس بەبـەر نوێژەکەیدا نـەڕوا، لاوێکیش لـەخێڵی ئـەبوموعیط ویستی بەبەرنوێژەکەیدا تێ پەڕێ، ئەبوسەعید نەیهێشت‌و پـاڵێکی نابەسـینگیەوەو تەسـی پـێ کـردەوە**

(٢٥٦) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: منع المارين يدى المصلى، رقم: ٥٠٥ = ١١٢٨.

دواوە، لاوەکەیش سەرنجی دا تەنیا لەبەردەم ئەووەوە ڕێگەی گوزەر هەیە، لەبەرئەوە دووبارە ویستی لەوێوە بڕوا، ئەبوسەعیدیش دیسان ڕێگەی پێ نەداو ئەمجارە توندتر لەجاری یەکەم پاڵی پێوەی نا، لاوەکەیش قسەی ناشیرینی بەئەبوسەعید گوت لەسەرئەوە، ئەوجا چوو بۆلای مەڕوان و لەلای مەڕوان ـ کەئەوسەردەمە فەرمانڕەوای سەرشاری مەدینە بوو ـ سکاڵای حاڵی لەئەبوسەعید کرد،ئەبوسەعیدیش(بەدوا ئەودا)چووە ژوورەوە بۆلای مەڕوان.

مەڕوان عەرزی کرد: ئەی ئەبوسەعید: ئەی باوکی سەعید! ئەوە چیتانە لەگەڵ ئەم لاوەدا، خۆتۆو ئەو بەپێی ئایەتی قورئان، مامەو برازای ئایینین، قورئان دەفەرموێ: (إنما المؤمنون إخوة) کەواتە خێرە وانێوانتان تێك چووە؟

ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیستووە، دروودی خودای لەسەربێ، دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێکتان بەرەو بەربەستێ نوێژی دەکردو ئەو بەربەستەی کردبوو بەنێوانی خۆیو خەڵکی تر، هەتا کەسێ بەبەردەم نوێژەکەیدا نەڕوا، لەوکاتەدا یەکێ تر ویستی بەبەرنوێژەکەیدا تێپەڕێ بانەهێڵێ‌و بەدەستی پاڵی پێوەنێ، جائەگەر کابرا هەرسەرەخەریێ یی کردوو بەلاساری ویستی بەبەرنوێژەکەیدا بڕوا، بانەیهێڵێ، ئەگەر هەر وازی نەهێنا بابچێ بەگژیدا، چونکە ئەو جۆرە کردارە لەڕەفتاری شەیتانەو شەیتان ئەوەی پێدەکا)(ت/١/٢٤٠/٣ز-٦٩ژ-٤٦٠ج-٤).

٣٠٥- عَنْ أَبِي جُهَيْمٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: قالَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيْ الْمُصَلِّي مَاذا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ قَالَ أَبُو النَّضرِ لَا أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً. (الحديث: ٥١٠).[٢٥٧]

---

(٢٥٧) أخرجه مسلم في الصلاة باب: منع المار بين يدى المصلى، رقم: ٥٠٧ =١١٣٢.

ئەبوجوهەیم (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاموشۆکەر کاتێ لەبەردەمی نوێژکەرەوە ڕەت دەبێ ئەگەر بزانێ بەوە چەندێ گوناهی تووش دەبێ، حەزی دەکرد کەچل .. ڕابوەستایەو لەبەردەمیەوە ڕەت نەبوایە. ئەبونەضر (ڕەزای خوای لێ بێ) کەیەکێکە لەفەرموودە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە، دەفەرموێ: بوسری کوڕی سەعید کەئەمەی بۆ من گێڕاوەتەوە نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ ڕابوەستایە، یاچل مانگ، یاچل ساڵ. (ت/١/٢٤٠ ز-٦٩ ژ-٤٥٨ = ش/ د/ت/ ن).

٣٠٦-عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَأَنَا رَاقِدَةٌ مُعْتَرِضَةٌ عَلَى فِرَاشِهِ فَإِذا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ). (الحديث: ٥١٢ طرفه في: ٥٩٩٦).[٢٥٨]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: گەلێ جار وادەبوو من لەسەر نوێنەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕادەکشام‌و دەخەوتم، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) لەپشت منەوە نوێژی دەکرد، من لەسەرشێوەی دانانی تەرم لەبەردەم نوێژکەیدا، دەکەوتمە نێوانی پێغەمبەرو ڕووگەیەوە، کەواتە نوێژ کردن لەسەر ئەم شێوەیە قەیدی نییە، جاکاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیویست نوێژی وەتر بکا منی لەخەوهەڵدەستان، وەترەکەمم دەکرد.

٣٠٧- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلِأَبِي الْعَاصِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ فَإِذا سَجَدَ وَضَعَهَا وَإِذا قَامَ حَمَلَهَا). (الحديث: ٥١٦ طرفه في: ٥٩٩٦).[٢٥٩]

---

(٢٥٨) أخرجه مسلم في الصلاة باب: الإعتراض بين يدى المصلى، رقم: ٥١٢ = ١١٤١.

(٢٥٩) أخرجه مسلم في المساجد وموضع الصلاة، باب: جواز حمل الصبيان في الصلاة، رقم: ٥٤٣ = ١٢١٢ – ١٢١٤.

ئەبوقەتادەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی بۆ مەردوم دەکرد، لەوکاتەدا ئومامەی کچی ئەبوعاصی بەسەرشانەوە بوو، کچی زەینەبی کچی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ)، جالەکاتی چەمینەوە (روکوع) دا دایدەنا، تاکاتێ لەکوورنوش هەڵ دەسایەوە ئەوسا دەیکردەوە قەلاندۆشکانی. (ت/١/٣٣٨/١ ز-١١٣ ژ-٦٦٤ ج-٤). ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەم دوو مەبەستە گرنگە:

یەکەم: کاری کەم لەناو نوێژدا لەبەرناچاری دروستە.

دوەم: لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: فاکهانی دەفەرموێ: حیکمەتی ئەم هەلگرتنی ئومامەیە لەم کاتەدا لەسەرئەم شێوەیە بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکردەوە بیسەلمێنێ کەکچیش وەك کوڕ ئازیزو خۆشەویستو نازدارەو، جێگەی قەدرو ڕێزە، هەتا ئەو باوە کۆنە ناشرینە لەناو دڵی عەرەبەکاندا بسڕێتەوە، کەبەچاوی سووكو بەبێزەوە تەماشای کچیان دەکرد، دیارە کەئەمەیش لەسەر ئەم شێوەیەو لەناو نوێژی جەماعەتدا چاتر دەبێ بەپەندو ئامۆژگاری بۆ عەرەبەکانو، باشتر لەو ڕەوشتە بەدە چاوترسێنیان دەکا..) فەرمایشتی عەسقەلانی تەواو.

کابرایێ هەبوو، خۆی بەشت دەزانی، ویستی بۆچاولێکەری لاسکایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکاتەوە، گوایە ئەویش دەیویست بیسەلمێنێ ژن لەکۆمەلگای ئێمەدا ڕێزدارە. کچۆڵەیەکی هەبوو ناوی وەك ناوی (شیرین) بوو، یەك دووجار دەیکردە قەلاندۆشکانیو لەناو خەڵکا هاموشۆی پێوەی دەکردو وێنەی دەگرت لەتەلەفیزیۆنا پیشانی دەدا. بەلام فێڵ لەخودا ناکرێ، خودا پێی نواند، کەکچەکەی گەورە بوو دای بەشوو، بەلام بەدەستی خۆی مێردەکەی کوشتو منداڵەکانی هەتیو کرد. فتأمل*.

---

* مەبەست لەم کابرایە صەددامو حەلای کچی بوو. (وەرگێڕ – ٩-٧-٢٠٠٩).

٣٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنْ مَسْعُود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ وَجَمْعُ قُرَيْشٍ فِي مَجَالِسِهِمْ إذ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ أَلَا تَنْظُرُونَ إِلَى هَذا الْمُرَائِي... إلى آخر الحديث). (الحديث: ٥٢٠ طرفه في: ٢٤٠).[٢٦٠]

ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە رابوورد، بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ١٧٢ لەم شوێنەدا لەئاخرەوە دەفەرموێ: (هاوملانی ئەم بیرە بەدە لەعەنتو نەفرەت لەشوێنن!).

## بسم الله الرحمن الرحيم

## (١٣) نامەی کاتەکانی نوێژ (كتاب مواقيت الصلاة)

٣٠٩- عَنْ إبنْ مَسْعود الأنصاري (رَضي اللهُ عَنْهُ) ( أَنَهُ دَخَلَ عَلـىَ المغـيرة بـنْ شعبة وقدْ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا وَهُوَ بِالْعِرَاقِ فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ مَا هَذا يَا مُغِيرَةُ أَلَيْسَ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ جِبْرِيلَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ فَصَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ قَالَ بِهَذا أُمِرْتُ). (الحديث ٥٢١- طرفه في: ٣٢٢١، ٤٠٠٧) [٢٦١]

موغیرەی کوڕی شوعبە لەوسەردەمەدا کەفەرمانڕەوای کووفە بوو لەعێراق نوێژی عەصری دواخست، ئەبومەسعودی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) رۆیشت بۆسەری و پێی فەرموو: ئەمەچییە؟ ئەی موغیرە! ئایا نازانی کە پێغەمبەر

---

(٢٦٠) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: مالقي النبيُ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) من أذى المشركين رقم: ١٧٩٤ = ٦٤٢٥.

(٢٦١) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: أوقات الصلاة الخمس رقم: ٦١٠، ٦١١ = ١٣٧٨، ١٣٧٩.

(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرائیل (سەلامی خودای لێ بێ) هاتەخوارەوە بۆئەوەی کەفێری نوێژم بکا، جاهەرنوێژەی لەکاتی خۆیدا بەرنوێژییەکەی بۆکردم، لەپێش دا نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ دا کرد، لەکاتی عەصریش دا نوێژی عەصرەم لەگەڵدا کرد، هەروا نوێژی شێوان‌و نوێژی خەوتنان‌و نوێژی بەیانی، هەرنوێژەی لەکاتی تایبەتی خۆیدا لەگەڵ جوبرائیل دا کردم) لەپاشا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (خودای گەورە فەرمانی پێ کردووم بەکردنی ئەم پێنج نوێژە لەم پێنج کاتەدا). (ت/١/١٩٣/١ = ز-٤٧ ژ-٣٤٨ ج-٤ = ش/د/ ن).

٣١٠- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ أَيُّكُمْ يَحْفَظ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْفِتْنَةِ قُلْتُ أَنَا كَمَا قَالَهُ قَالَ إِنَّكَ عَلَيْهِ أَوْ عَلَيْهَا لَجَرِيءٌ قُلْتُ فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالْأَمْرُ وَالنَّهْيُ قَالَ لَيْسَ هَذا أُرِيدُ وَلَكِنْ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ قَالَ لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا قَالَ أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ قَالَ يُكْسَرُ قَالَ إِذا لَا يُغْلَقَ أَبَدًا قُلْنَا أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ قَالَ نَعَمْ كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيث لَيْسَ بِالْأَغَالِيط فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ فَأَمَرْنَا مَسْرُوقًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ الْبَابُ عُمَرُ). (الحديث ٥٢٥- أطرافه: ١٤٣٥، ١٨٩٥، ٣٥٨٦، ٧٠٩٦) [٢٦٢]

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی عومەردا دانیشتبووین، فەرمووی: کێتان فەرمایشتەکەی پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی ئاژاوەو فەرتەنەکانەوە لەبەرە؟ منیش گوتم: من لەبەرمە دەق وەك خۆی فەرموویەتی، عومەر فەرمووی: بەراستی تۆ کۆی لێ ناکەیتەوەو چاونەترسی دوورنییە لەخۆتەوە سەبارەت بەفەرتەنەکان شتێ بڵێی! منیش عەرزیم کرد:

---

(٢٦٢) اخرجه مسلم في الايمان: باب: بيان أن الاسلام بدأ غريباً، وفى الفتن واشراط الساعة رقم: ١٤٤ = ٣٦٩.

حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: ئەو ئاشووبو ئاژاوەیەی کەتووشی پیاو دەبێ، بەهۆی کەسو کارو ماڵو منداڵو هاوسێو دراوسێوە، نوێژو ڕۆژوو خێرکردنو فەرمانکردن بەچاکەو نەی ی کردن لەخراپە، دەبن بەکەفارەتیو پاکی دەکەنەوە.

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەستم ئەمەنییە، بەڵکوو لەو فیتنەو ئاژاوەیە دەپرسم کەوەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدا، گوتم: قوربان! ئەوەیان زیانی بۆتۆنابێ، ئەوە والەپشتی دەرگایەکی داخراوەوە، ئەودەرگایە وا لەنێوانی تۆو ئەودا، تائەودەرگایە داخرابێ ئەو ئاژاوەیە ڕوونادا.

فەرمووی: جائایا ئەو دەرگایە دەشکێنرێ یادەکرێتەوە؟ گوتم: دەشکێنرێ. فەرمووی: کەواتە هەتایە داناخرێتەوە. بێژرا: ئایا عومەر دەیزانی مەبەست لەو دەرگایە چییە؟ حوژەیفە فەرمووی: بەڵێ زۆرباش ئەوەی دەزانی، وەك سوور دەیزانی کەڕۆژ ڕۆیشت شەو دادێ، ئاوایش دەیزانی کەمەبەست لەودەرگایە چییە، چوونکە من فەرموودەیەکی دروستو قسەیەکی دۆغری وام بۆیگێڕایەوە کەهەڵەشەو پەڵەشەوتێکەڵو پێکەڵ نەبێ! جا لەحوذەیفە پرسیار کرا: ئەودەرگایە کێ بوو؟ فەرمووی: عومەر خۆی بوو، واتە: هەتا عومەر لەژیاندابێ ئاژاوە سەرهەڵ نادا. (ت/١/٧٢/ ٥)

٣١١- عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنْ امْـرَأَةٍ قُبْلَـةً فَـأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَقِـمْ الـصَّلَاةَ طَرَفَـيْ النَّهَـارِ وَزُلَفًا مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ فَقَالَ الرَّجُلُ يَا رَسُولَ اللَّـهِ أَلِي هَـذَا قَالَ لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ). (الحديث ٥٢٦ ـ طرفه في: ٤٦٨٧) [٢٦٣]

ئیبنومەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ ماچێ لەئافرەتێ دەسەنێ، لەپاشان هاتە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وەئەمەی باس کرد بۆی،

---

(٢٦٣) اخرجه مسلم في التوبة، باب: قوله تعالى: (إن الحسنات...) رقم: ٢٧٦٧ = ٦٩٣٢.

جاخودا ئەمەی ناردەخوارەوە: (أقم الصلاة طرفي النهار وزلفاً من الليل إن الحسنات يذهبن السيئات) ١١٤/١١ ـ واتە: هەموو شەوو رۆژێ پێنج نوێژە فەرزەكان لەكاتی خۆیاندا بەرێكو پێكی بكەن، دڵنیا بن كەئەم نوێژانە لەكردەوەهەرەباشەكانی ئێوەن، بەڕاستی كارێكی فرەجوانو شیرینن، بزانن كەیاسایەكی دامەزراوی خودایی یە، كەكردەوەی باشو كاری چاكەو رەفتاری جوان، هەمیشە كردەوەی خراپو تاوان لادەبەنو گوناه دەسڕنەوە. پیاوەكەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بەتایبەتی هەر بۆمن وایە؟ فەرمووی: (ئەم بڕیارە بۆگشت ئۆمەتەكەمە بۆهەموویان هەروایە). (ت/١/١٨٥/٩ ز-٤٣ ژ-٣٣١ ج-٤ = ش/د/ ت).

وعنه في رواية: (لمن عمل بها من أمتي):

دیسان لەوەوە لەگێڕانەوەیەكدا: (بۆهەموو كەسێ لەنەتەوەی من ـ واتە لەگەلی ئیسلام سەرجەم ـ كەكار بەم ئایەتە بكەن).

٣١٢– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللّٰهِ؟ قَالَ الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا قَالَ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ قَالَ حَدَّثَنِي بِهِنَّ رسول الله (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَوْ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي (الحديث ٥٢٧– أطرافه في: ٢٧٨٢، ٥٩٧٠، ٧٥٣٤)[٢٦٤]

عەبدوڵڵا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم پرسی كام كارو كردەوەیە زۆر خۆشەویستە لەلای خوای گەورە؟ فەرمووی: (نوێژی فەرز لەكاتی خۆی دا)، گوتم: پاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: (پاش ئەو باشبوون لەگەڵ باوكو دایك). گوتم: پاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: (خەباتگێڕانو تێكۆشان لەڕێگەی خودا دا، ئیبنو مەسعود فەرمووی: (ئەمانەم لەدەمی پێغەمبەر خۆی بیستووە، وەئەگەر لەم بارەیەوە زیاتریشم لێ داوا بكردایە بۆی پتر دەكردم).

---

(٢٦٤) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان كون الايمان بالله تعالى افضل الأعمال رقم: ٨٥.

٣١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا مَا تَقُولُ ذَلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ قَالُوا لَا يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا قَالَ فَذَلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا). (الحديث ٥٢٨). (طرفه في: ٢٤١).[265]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر جۆگە ئاوێ لەبەر دەرگای یەکێکتانابێ، وەهەموو ڕۆژێ پێنج جار خۆی تیا بشۆرێ ئایا هیچ چڵکی پێوە دەمێنێ؟ یاران گوتیان: نەء هیچ چڵکی پیوەنامێنێ، فەرمووی: ( دەئەمە وێنەی ئەم پێنج نوێژە فەرزەیە، خودا گوناهیان پێ دەکوژێنێتەوە).(ت/١/١٨٣/ ٥ = ز-٤٣ ژ-٣٢٦ چ-٤ = ش/ت/ن).

٣١٤-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ وَلَا يَبْسُط ذِرَاعَيْهِ كَالْكَلْبِ وَإِذا بَزَقَ فَلَا يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ). (الحديث ٥٣٢)[266]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ لەکڕنووش سەرهەڵدەبڕن پشتتان ڕێك ڕاست بکەنەوە، لەناو کوڕنووشیش دا، لەچەشنی سەگ کەلەسەردەم ڕابکشێ ئاوا باڵتان لەسەر زەوییەکە ڕامەخەن، وەهەرکاتێ تفێ، یابەڵغەمێکتان ڕۆکرد، ڕۆی مەکەنە بەردەمی خۆتان، هەروا لەلای ڕاستیشتانەوەرۆی مەکەن، چونکە ڕازو قسەی نهێنی ی بەندە لەگەڵ پەروەردگاریدا جاری وادەبێ ڕووبەڕوودەبێ، جاری وادەبێ لەلای ڕاستەوەدەبێ). (ت/١/٢٧٦/٢ = ز-٨٥ ژ-٥٢٩ چ-٤ = ش/د/ت/ ن).

---

(٢٦٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: المشي الى صلاة تمحى الخطايا. رقم/ ٦٦٧ = ١٥٢٠.

(٢٦٦)انظر رقم: ٢٥٧- أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الاعتدال في السجود ووضع الكفين على الأرض (شرح نووي/٤/٢٠٩) المترجم = ١١٠٢.

**ڕوونکردنەوە:**

بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٢٥٧و ٢٥٦و ٢٥٨ کەلەپێشەوە لەباسەکانی مزگەوتدا ڕابووردن.

لەعەینیو لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: مەبەست لە(اعتدال) لەکوڕنووشدا ئەوەیە: کەنوێژخوێن هەردوو ئەژنۆیو بەری دەستیو تەوێڵی لەسەر نوێژگاکەی دابنێو، قوورسی سەری بخاتە سەر شوێن کوڕنووشەکەیو هەردوو ئانیشکی لەزەوی بەرزەوە بکا، هەروا لە لاقەبرەغەکانی خۆشیەوە کەمێ دووریان بخاتەوەو، خۆی نەنووسێنێ بەیەکەوەو متیش نەبێ بەزەوییەکەوە، لەهەمان کاتا لای خوارووی لەشی کەمێ بەرزتربێ لەلای سەرووی بالای، وەلەم کردارانەدا ڕادەی میانەو حەددی وەسەط بگرێ، کەمێکیش سکی لەڕانەکانی بەرزەوە بکا، بەمە دەگوترێ ئیعتیدال لەنێوان خۆگرمۆڵە کردنو خۆفشەوەکردندا.

٣١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ وَاشْتَكَتْ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا فَقَالَتْ يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضا فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ فَهُوَ أَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الْحَرِّ وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الزَّمْهَرِيرِ). (الحديث ٥٣٧- طرفه في: ٣٢٦٠)[٢٦٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گەرما دادێ، بەفێنکی نوێژی نیوەڕۆ بکەنو ماوەیێ دوای بخەن، لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا مەیکەن، چونکە قرچەی گەرما لەهاڵاوی ئاگری دۆزەخە، ئاگر لەلای خودا سکاڵا لەحاڵی خۆی دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم!

---

(٢٦٧) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب الإبراد بالظهر في شدة الحر، رقم: ٦١٥، ٦١٧ = ١٤٠٠.

ناوسکی خـۆمم خواردۆتـەوەو پیـشاوم بەسـەریەکا، لـەناو خۆمـا پـەنگم خواردۆتـەوە، پـشوویەکم بـدەرێ، جـاخودا ڕێگـەی دا کـەدوو هەناسـەبدا، هەناسـەیێ لەزسـتاناو هەناسـەیێ لـەهاوینا، دەی قرچـەی گـەرمای هـاوینو تەشقی سـەرمای زسـتان - کـەئێوە هەسـتیان پـێ دەکـەن - بـرێتین لـەو دوو هەناسەیەی دۆزەخ، کەلەزستانو هاوینا دەیـان دا). (ت/١/١٩٧/٨ ز-٤٧ ژ-٣٥٥ ج-٤ = ش/د/ت/ ن).

بۆنموونـە لەسـەر لێکۆڵینـەوەی پـسپۆڕانە، هـەتا بەباشـی لـەکورۆکی دەقو ئامـاژەی ئـەم فەمایـشتە نەسـتەقانە حـاڵی بـبینو، شـوێن بۆچـوونی لاوازی ناپـسپۆڕان نەکـەوین، ئـەم نموونـە لەشـیکردنەوەو بۆچـوونی جیاجیـا، لەفەتحولباری یەوە، راگوێز دەکەم:

(راجیایی هەیە لەناو زانایانا، کەئایا ئەم سکالایە، بـەزمانی حاڵە، یابـەزمانی گوتارە؟ هەردەستەیێ یـەکێ لـەم دوورایـەی بـەلاوە پەسـەندە، ئیبنوعەبدولبـەڕ دەفەرموێ: هەریەکێ لەم دوو فەرمایشتەرووی ئاراستەی هەیـە، وەوێنـەی تـری لەدەقی ئایینی دا هەیە، بـەڵام بۆچوونی یەکـەم دامـەزراوترە) قازی عـەیازیش دەفەرموێ: (رای یەکەم دیاری ترە) قـورطوبـی دەفـەرموێ: (گفتـەو لـەفظەکـە ببڕدرێ بەسەر حەقیقەتدا، شتی وا بۆخوا کارێکی ئەستەمو مـەحاڵ نییـە، لـەم جێگەیەدا، هەرکاتێکیش پێغەمبەری راستگۆ، لەبابەت کـارێکی واوە، کـەڕوودانی لـەتوانادا هـەبێ، وەپێویـستی بەتـەئویل (سـاخ کردنـەوە) نـەبێ، هـەواڵێکی راگەیانـد، لـەکاتی وادا ئـەو فەرمایـشتە بـبڕدرێ بەسـەر واتـای راستەقینەیی دا باشـترە، نـەك بەسـەر واتـای مەجازیـدا) نـەوەویش هـەروا دەفـەرموێ: بۆیـە دەفەرموێ: بڕینی بەسەر راستەقینەییدا دروستی تـەواوە. تۆرپـشتیش هـەروا دەفەرموێ: بەڵام شێخی بەیضاوی دەفەرموێ: (بڕینـی بەسـەر واتـای مەجازیـدا لـەبارترە: کەواتـە: مەبەسـت لەسـکالای دۆزەخ کلپەسـەندنو تـاو سـەندنیەتی، وەمەبەسـت لـەوە کـەدەڵێ ناوسـکی خـۆمم خواردۆتـەوەو پیـشاوم بەسـەریەکا،

پاڵەپەستۆو بەسەریەکا ترشانی پارچەکانیەتی، وەمەبەست لەهەناسەدانی بڕێتی یە لەو گەرماو سەرمایەی کەڵ ی دەردەچێ. زەینی کوڕی مونیریش دەفەرموێ: هەڵبژاردە بڕینیەتی بەسەر واتای راستەقینەدا، چونکە شتی وا لەتوانای دەستەڵاتدا هەیە، وەلەبەر ئەوەیش گەرچی گوتار ئیستیعارە دەکرێ بۆتەعبیر لەحاڵی، وەشتی واکارێکی ناسراوو بیسراوە، لەگوفتوگۆدا، بەڵام لەسەر ئەم شیوەی وا لەم فەرموودەدا، دوورە لەمەجازەوە، لەشێوازی گوفتوگۆی ئاسایی کەباوو سانایی بێ بەدەرە، چونکە ئەوەتا لەسەرەتاوە وشەی سکاڵا بەکارهێنراوە، ئەوسا روون کراوەتەوە کەدەقی سکاڵاکە چۆنە، سکاڵاکە قەبووڵکراوەو ڕێگەی پێ دراوە دووهەناسە بداو، دوایی روونیش کراوەتەوە کەهۆی سەرمای زستان‌و گەرمای هاوین ئەو دوو هەناسەی دۆزەخە، وەهەناسەکانیش تەنیا دوانن‌و بەس). فەرمایشتی فەتحولباری تەواو.

وشەیەکی دڵ هەژین: لەعەینی دا دەفەرموێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەدۆزەخ شت تێ دەگاو هۆشی هەیە، لەکتێبا دەڵێ: شت نیەە کەوەك بەهەست‌و دۆزەخ گوێی سووك بێ. هەروا لەڕیوایەت دا هاتووە کە دۆزەخ گوفتوگۆ لەگەڵ حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دا دەکا، وەبانگی موسوڵمان دەکا: (تێپەڕبە ئەی خاوەن بڕوا، واشەوقی رووناکی تۆ گڕی منی کوژانەوە!).

٣١٦- عَنْ أَبِي ذرّ الْغِفَارِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَأَرَادَ الْمُؤَذِنُ أَنْ يُؤَذِنَ لِلظهْرِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبْرِدْ ثمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِنَ فَقَالَ لَهُ أَبْرِدْ حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ). (الحديث: ٥٣٩ طرفه في: ٥٣٥).[٢٦٨]

(٢٦٨) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب الإبراد بالظهر في شدة الحر، رقم: ٦١٦ = ١٣٩٩.

ئـەبوذەڕی غیفـاری (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەسـەفەرێکا لەخزمـەتی پێغەمبـەردا بـووین، بانگـدەر کـەبیلال بـوو، ویـستی بـانگی نیـوەڕۆ بـدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (بیخەره فێنکی) لەپاشا پاش ماوەیێ تریش بیلال ویستی بانگ بدا، دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرموو: (زیاتریش بیخەره کاتی فێنکی) ئـیتر هـەمووجارێ کـەبیلال دەیویـست بـانگ بـدا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پـێ ی فـەرموو: (زیـاتریش بافێنـك بـێ) هـەتا روانیمـان واتـە تەپۆڵکـەکانی دەورو بـەرمان سـێبەری لای ئێوارەیـان بۆپەیـدا بوو، ئەوجا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕێگەی بیلالی دا بانگی ئەو نیوەڕۆیەی دا).

٣١٧- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنـهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ حِينَ زَاغَتْ الشَّمْسُ فَصَلَّى الظهْرَ فَقَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فذكَرَ السَّاعَةَ فَذكَرَ أَنَّ فِيهَا أُمُورًا عِظامًا ثمَّ قَالَ مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْأَلَ عَنْ شَيْءٍ فَلْيَسْأَلْ فَلَا تَـسْأَلُونِي عَـنْ شَيْءٍ إِلَّا أَخْبَرْتُكُمْ مَا دُمْتُ فِي مَقَامِي هَذا فَأَكْثرَ النَّاسُ فِي الْبُكَـاءِ وَأَكْثـرَ أَنْ يَقُـولَ سَلُونِي فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذافَةَ السَّهْمِيُّ فَقَالَ مَنْ أَبِي قَالَ أَبُوكَ حُذافَةُ ثمَّ أَكْثـرَ أَنْ يَقُولَ سَلُونِي فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ رَضينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًـا وَبِمُحَمَّـدٍ نَبِيًّا فَسَكَتَ ثمَّ قَالَ عُرِضتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ آنِفًا فِي عُرْض هَـذا الْحَـائِط فَلَـمْ أَرَ كَالْخَيْرِ وَالشَّرِّ). (الحديث: ٥٤٠ طرفه في: ٩٣).(٢٦٩)

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خـەڵك گـەلێ پرسـیاریان لـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکـرد، بگـره بەپرسـیار بێزاریـان کردبـوو، جارۆژێ حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەوکاتەدا کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسمـان لادەدا کەسـەرەتای نوێـژی نیوەڕۆیـە، لـەماڵ دەرچـوو نوێـژی نیـوەڕۆی کـرد، ئەوسـا ڕۆیـشتە سـەردوانگەو بەڕاوەسـتانەوە وتـارێکی فـەرموو، باسـی قیامـەتی کـردو باسـی ئـەوەی کـرد کـەزۆر کـاری گـەورەو کارەسـاتی سامناکی تیـادا روودەدا، ئـەوجا

---

(٢٦٩) انظر رقم: (٨٠) الذى سبق في الكتاب العلم.

فەرمووی: (هەرکەسێ حەزی لەچی پرسیارێکە باپرسیار بکا، هەرچی شتێکم لێ پرسیار بکەن پێتان دەڵێم، مادام لەم شوێنەدا بم).

کاتێ مەردوم حاڵەکەیان بینی، ترسیان لێ نیشتو زۆر گریان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆش خۆش دەیفەرموو: (دەی پرسیارم لێ بکەن) جاعبدوڵلای کوڕی حوژافەی ئەل ـ سەهمی هەڵسا گوتی: باوکی من کێیە؟ فەرمووی: باوکی تۆ حوژافەیە) ئیتر خۆش خۆش هەر دەیفەرموو: (دەی پرسیارم لێ بکەن) جاعومەر مەترسی ئەوەی لێ نیشت کە ئەمە هەڕەشەبێو سەرەتابێ بۆهاتنی سزایەکی سەخت، لەبەرئەوە عومەر هات بەچۆکاو فەرمووی: خودامان بەپەروەردگاری خۆمان قەبووڵەو، ئیسلاممان بەئایین قەبووڵە، موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە. ئەوسا حەزرەت خامۆش بوو، لەپاشتر فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەرگیزاو هەرگیز وەك ئەمڕۆ لەبابەت چاکەو لەبابەت خراپەوە شتم نەدیوە، چونکە بەهەشتو دۆزەخیان هێنایە بەرچاومو لەپاڵ ئەم یوارەدا وێنەی هەردووکیانم دی!) (ت/ ١/ ٢/٣٦٩)

٣١٨-عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الصُّبْحَ وَأَحَدُنَا يَعْرِفُ جَلِيسَهُ وَيَقْرَأُ فِيهَا مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ وَيُصَلِّي الظُّهْرَ إِذا زَالَتْ الشَّمْسُ وَالْعَصْرَ وَأَحَدُنَا يَذهَبُ إِلَى أَقْصَى الْمَدِينَةِ ثمُ رَجَعَ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ وَلَا يُبَالِي بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ إِلَى ثلُث اللَّيْلِ ثمَّ قَالَ إِلَى شَطرِ اللَّيْلِ). (الحديث ٥٤١ ـ أطرافه في: ٥٤٧، ٥٦٨، ٥٩٩، ٧٧١) [٢٧٠]

ئەبوبەرزە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ کە لەنوێژی بەیانی دەبۆوە، بەری دنیا رووناك دەبۆوە، بەڕەنگێکی واکە هاونشینی خۆمان دەناسییەوە، بەڵام لەسەرەتای نوێژ دابەستنەوە بەباشی

(٢٧٠) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في الصبح والمغرب، رقم: ٤٦١ = ١٦٣٢، ١٦٣١.

نەماندەناسییەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەوری شەست ئایەت تادەوری سەد ئایەتی تیا دەخوێند. ئەوکاتەیش نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەکردین، کەخۆر لادەدا بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان، کەنوێژی عەصریشی بۆمان دەکرد هێشتا خۆر بەگووڕ بوو، بەتین بوو، هەمان بوو لەپاش نوێژی عەصر دەچوو بۆئەوپەڕی مەدینە، کەدەهاتەوە هێشتا خۆر بەگوڕوبەتین بوو، ئەبومینهال فەرمووی: ئەو گوتەیەم لەیاد نەماوە کەئەبوبەرزە بۆکاتی داهاتنی نوێژی شێوان فەرموی، ئەبوبەرزە فەرمووشی: حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) هەتا سێیەکی شەویش دەربەستی دواخستنی نوێژی خەوتنان نەبوو). (ت/١/١٩٦/٦/٤ = ز-٤٧ ژ-٣٥٣ چ-٤).

٣١٩-عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ سَبْعًا وَثَمَانِيًا الظهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ). (الحديث ٥٤٣- طرفاه في: ٥٦٢، ١١٧٤)[٢٧١]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارەجارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆدەکردەوەو بەجەمع هەشت ڕکاتی دەکرد، بەڵام بەدووجار، لەپێشا چوار ڕکات نوێژی نیوەڕی دەکردو سڵاوی دەدایەوە، دوابەدوای ئەوە یەکسەر چوار ڕکات نوێژی عەصری دەکردو سڵاوی دەدایەوە، هەروەها شێوانو خەوتنانیشی کۆدەکردەوەو بەکۆکردنەوە حەوت ڕکاتی دەکرد بەڵام بەدوسڵاو دانەوە). (ت/١/٢٠٢/٥ ز-٤٩ ژ-٣٧٠ چ-٤ ش/د/ت/ن).

### ڕوونکردنەوە:

پێشەوا عەسقەلانی لەفەتحولباریدا، دەفەرموێ: کۆمەڵێ لەپێشەوایانی شەریعەت، بەپێی ڕواڵەت (ظاهیر) ی ئەم فەرموودەیە، بڕیاریان داوە،

---

(٢٧١) أخرجه مسلم في صلاة الليل (عينى/٥/٣٠/٢٠) المترجم = ١٦٣٢ شيحا.

کەجەمعو کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەماڵەوە بۆ نیشتەجێ، بەبێ بەهانە، جاروبار دروستە، بەمەرجێ ئەم جەمعە نەکا بەپیشەی هەمیشەیی، وەك ئیبنوسیرینو رەبیعەو ئەشهەبو ئیبنولمونزیرو قەففالی کەبیر، خەطابی دەفەرموێ: کۆمەڵێ لەدەستەی فەرمووده (ئەصحابی حەدیث) یش هەمان رایان هەیە، بەڵگەشیان فەرموودەکەی موسلیمە، کەلەکۆتای یەکەیدا دەفەرموێ: عەرزی ئیبنووعەبباسم کرد: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەرچی ئاوای کردوە، بەبێ ئەوە کەلەسەفەردا بێ، یاترسی دوژمنی هەبێ، یاباران بێ، نوێژی کۆکردۆتەوە؟ فەرمووی: مەبەستی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەم کۆکردنەوە ئەوەبوو نەتەوەکەی تووشی سەراسێو ناڕەحەتی نەکا. فەرمایشتی عەسقەلانی هاتە کۆتایی. منیش کەوەرگێڕم دەڵێم: کارکردن بەم رایە بۆهەموو کەسێ دروستە، چونکە ئەم زانایانە هەمووخاوەن پایەی بەرزن، بەڵام بەمەرجێ، وەك ئەوزانایانە دەفەرموون، کۆکردنەوەکە لەبەرپێویستی بێ، واتە: لەبەرحاجەت، وەك ئەوە نوێژکەر لەوکاتەدا کارێکی گرنگی هەبێ، مەسەلا پزیشك بێو خەریکی عەمەلیات بێ، کرێکاربێو سەرگەرمی کاربێو دەستی نەپەرژێ دەست لەکارەکەی هەڵبگرێ.

٣٢٠- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) وَقَدْ قِيلَ له: (كيفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ؟ فَقَالَ كَانَ يُصَلِّي الْهَجِيرَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الْأُولَى حِينَ تَدْحَض الشَّمْسُ وَيُصَلِّي الْعَصْرَ ثمَّ يَرْجِعُ أَحَدُنَا إِلَى رَحْلِهِ فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيث بَعْدَهَا وَكَانَ يَنْفَتِلُ مِنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ حِينَ يَعْرِفُ الرَّجُلُ جَلِيسَهُ وَيَقْرَأُ بِالسِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ). (الحديث ٥٤٧ طرفه في: ٥٤١).[٢٧٢]

---

(٢٧٢) اخرجه مسلم في استحباب التبكير بالصبح في أول وقتها ـ المترجم = ١٤٦٢.

سەییاری کوڕی سەلامە دەفەرموێ: لەخزمەت باوکم دا چووین بۆخزمەتی ئەبوبەرزەی ئەسلەمی (رەزای خوای لێ بێ) باوکم عەرزی کرد: پێغەمبەری خودا (دروودی خوادای لێ بێ) نوێژە فەرزەکانی چۆن دەکردو لەکەیا دەیکردن؟ فەرمووی: نوێژی قرچەی نیوەڕۆی ئەوکاتە دەکرد کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کەئێوە پێ ی دەڵێن:نوێژی یەکەم. کاتێ عەصریشی ەکرد خۆرهێشتا زیتو زیندوو بوو، واتە: بەگوڕو بەتین بوو، زەرد هەڵ نەگەڕابوو، جاری وادەبوو هەمان بوو لەپشت پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عەصری بەکۆمەڵی دەکردو دەگەڕایەوە بۆماڵەوەی کەلەوپەڕی مەدینەوە بوو، وەلحاڵ هێشتا خۆر زیتو بەگووڕ بوو، سەییار فەرمووی: لەیادم نەماوە کەئەبوبەرزە سەبارەت بەکاتی نوێژی شێوان چی فەرموو، دەستووری حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) وابوو: لەپێش کردنی نوێژی خەوتناندا حەزی لەنووستن نەبوو، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانیش حەزی لەگوفتوگۆ نەبوو، کاتێکیش لەنوێژی سبەینێ دەبۆوە پیاو هاونشینی خۆی دەناسییەوە، حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دەوری شەست ئایەت تاسەد ئایەتی لەنوێژی بەیانیدا دەخوێند). (رياض الصالحين/٤/١٢٦٦/١).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەبوبەرزە لەموسوڵمانە پێشینەکانە، ئامادەی ئازادکردنی شاری مەککە بووە، لەوەدوایش هەتا حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) وەفات دەکا هەر لەخزمەتیدا غەزا دەکا، لەشەستو چواری کۆچیدا لەمەرو، یالەبەصرە، یالەبیابانی سەجستان دەمرێ، چوار فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە.

٣٢١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يَخْرُجُ الْإِنْسَانُ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فَنَجِدُهُمْ يُصَلُّونَ الْعَصْرَ). (الحديث ٥٤٨- أطرافه في: ٥٤١، ٥٥٠، ٥٥١، ٧٣٢١)[٢٧٣]

---

(٢٧٣) أخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٥/٣٦/٢٥) المترجم = ١٤١٠.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا کاتێ نوێژی عەصرمان دەکرد، هەمان بوو لەپاش نوێژ دەچوو بوخێڵی بەنی عەمری کوڕی عەوف کەلەقوباء بوون، کەدوو میل لەمەدینەوە دوور بوون کەدەگەیشتە ئەوێ دەیڕوانی خەریکی نوێژی عەصرن).

٣٢٢-عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ فَيَذهَبُ الذاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ وَبَعْض الْعَوَالِي مِنْ الْمَدِينَةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَمْيَالٍ أَوْ نَحْوِهِ). (الحديث ٥٥٠)[٢٧٤]

دیسان ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتی نوێژی عەصری بۆمان دەکرد، هێشتا خۆر بەرزو بەتینو بەشەوق بوو، هەبوو دەچوو بۆ عەوالی، کەدەگەیشتە ئەوێ هێشتا هەر خۆر بەرزبوو، عەوالی چەند گوندێك بوون لەدەوری مەدینە بوون، نزیکەکەیان دوو میل بوو، دوورەکەیان هەشت میل دەبوو، هەیان بوو دەوری چوار میل دەبوو).

٣٢٣-عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُما) (أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ الّذي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ). (الحديث ٥٥٢)[٢٧٥]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ نوێژی عەصری بچێ وەك ئەوە وایە کەماڵو مناڵی بەفیڕۆدابنێ) (ت/١/١٩٠/٤ ز-٤٤ ژ-٣٤٠ ج-٤ = ش/د/ ت).

(٢٧٤) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب استحباب التبكير بالعصر، رقم: ٦٢١=١٤٠٧.

(٢٧٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: التغلض في تفويت صلاة العصر، رقم: ٦٢١ = ١٤١٦.

٣٢٤–عَنْ بريدة (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: أنه قالَ في يَوْمٍ ذي غَيْمٍ: فَقَالَ بَكِّرُوا بِصَلَاةِ الْعَصْرِ فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ). (الحديث ٥٥٣– طرفه في: ٥٩٤)

ئەبومەلیح (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایەکا، لەڕۆژێکی هەورە ڕۆژدا، لەگەڵ بورەیدەدا بووین، فەرمووی: زوو نوێژی عەصر بکەن چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ نوێژی عەصر نەکا کردەی ئەوو بردەی با). (ت/ ١/١٩١/ ٥ + =ز-٤٤ ژ-٣٤١ چ-٤ = ریاض الصالحین/٣/٨٣٥/٦).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بورەیدەی کوڕی ئەل ـ حوصەیب (ڕەزای خوای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەرە، سەدوشستو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، سێ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەمەرو لەکاتی غەزاکردندا وەفاتی کردووە، دواترین هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووە کەلەخۆراسان لەساڵی شەستو دوودا مردووە، ڕەزای خودای لێ بێ.

٣٢٥– عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً يَعْنِي الْبَدْرَ فَقَالَ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لَا تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ فَإِنْ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا ثُمَّ قَرَأَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ). (الحديث ٥٥٤– اطرافه في: ٥٧٣، ٤٨٥١، ٧٤٣٥، ٧٤٣٦)[٢٧٦]

جەریر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەخزمەتی حەزرەت دا بووین، شەوی چاردەی مانگ بوو، تەماشایەکی مانگی کردو فەرمووی: چۆن ئێستاکە

---

(٢٧٦) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة باب فضل صلاتى الصبح والعصر، رقم: ٦٣٣ = ١٤٣٢.

هـەمووتان بەئاسـانی‌و ئاسـوودەیی ئـەم مانگـە دەبیـنن بـەبێ پاڵەپەسـتۆ، لەقیامەتیشا ئاوا خودای خۆتـان دەبیـنن، بـۆبینینی تووشـی هـیچ ناڕەحـەتی‌و پاڵەپەستۆییێ نابن، جاتـادەتوانن ئاگاداری نوێـژی بـەیانی‌و نوێـژی عەسـربن‌و مەیان چۆێنن، چوونکە ئەم دوونوێژە هۆی چوونە بەهەشت‌و دیتنـی خـودان، ئینجا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (وسـبح بحمـد ربـك قبـل طلـوع الـشمس وقبـل غروبهـا) ٢٠/١٣٠/ ـ واتـە: بەباشـی ئاگاداری ی نوێـژی بەیانی‌و نوێژی عەصر بکەن‌و هەمیشە لەناو نوێژدا سوپاس‌و ستایشی خودای خۆتان بکەن). (ت/١/١٩٠/٢- ش/د/ ت)

٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَـمُ بِهِـمْ كَيْـفَ تَـرَكْتُمْ عِبَـادِي؟ فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُـمْ يُـصَلُّونَ). (الحـديث ٥٥٥- أطرافـه في: ٣٢٢٣، ٧٤٢٩، ٧٤٨٦)[٢٧٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: چەن فریشتەییێ بەشەوو چەن فریشتەیەکی تـر بـەڕۆژ بـەرودوا بەدیارتانـەوە دەبـن‌و، بەسەرەنێـشکتان دەگـرن، وەهـەردوو لایـان لەنوێـژی بـەیانی‌و نوێـژی عەصردا یەکتر دەگرن‌و یەکتری دەگۆڕن، جاکاتێ ئەوتاقمـە فریـشتەیەی کـەوا شەو لەدیارتان بوون، سەردەکەونەوە بۆ خزمەتی خودای گەورەو پـەروەردگار، لێیـان دەپرسـێ ـ هەرچـەندە کەخۆشـی باشـتر حاڵیـان دەزانـێ ـ دەفـەرموێ: کـەئێوە هاتنـەوە لـەلای ئـەو بەندانـەی منـەوە چییان دەکـردو خـەریکی چـی بـوون؟ دەڵـێن: کەئێمـە چـووین بۆلایـان ئـەوان نوێـژیان دەکـرد، کەئێمـەیش هاتینەوە دیسان هەر نوێژیان دەکرد). (ت/١/١٨٤/٦ ز-٤٤ ژ-٣٣٨ چ-٤ = ش/ ن).

---

(٢٧٧) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب:فضل صلاتى الصبح والعصر رقم: ٦٣٢ = ١٤٣٠.

٣٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِذا أَدْرَكَ أَحَدُكُمْ سَجْدَةً مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلَاتَهُ وَإِذا أَدْرَكَ سَجْدَةً مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطلُعَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلَاتَهُ). (الحديث ٥٥٦- طرفاه في: ٥٧٩، ٥٨٠ )[٢٧٨]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ فریای یەك رکاتی نوێژی بەیانی لەپێش خۆرکەوتندا بکەوێ ئەوە فریای نوێژی ئەو بەیانی یە بەتەواوی دەکەوێ، بەواتا بەحازر دەیکا، نەك بەقەزا، وە هەروەها کەسێ فریای ڕکاتێکی نوێژی عەصر بکەوێ، لەپێش خۆرئاوابووندا، ئەوە فریای نوێژی عەصری ئەو ڕۆژە بەتەواوی دەکەوێ). (ت/١/٢٠٠/ ٢ ز-٤٨ ژ-٣٦٤، ٣٦٥ = ش/د/ ت/ ن)

٣٢٨- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى الْمِنبَرِ يَقُولَ إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَا سَلَفَ قَبْلَكُمْ مِنَ الْأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ أُعْطِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ فَعَمِلُوا بِهَا حَتَّى انْتَصَفَ النَّهَارُ ثمَّ عَجَزُوا فَأُعْطوا قِيرَاطا قِيرَاطا ثُمَّ أُعْطِيَ أَهْلُ الْإِنْجِيلِ الْإِنْجِيلَ فَعَمِلُوا بِهِ حَتَّى صَلَاةِ الْعَصْرِ ثمَّ عَجَزُوا فَأُعْطوا قِيرَاطا قِيرَاطا ثُمَّ أُعْطِيتُمْ الْقُرْآنَ فَعَمِلْتُمْ بِهِ حَتَّى غُرُوبِ الشَّمْسِ فَأُعْطِيتُمْ قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ قَالَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ رَبَّنَا هَؤُلَاءِ أَقَلُّ عَمَلًا وَأَكْثَرُ أَجْرًا قَالَ هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ أَجْرِكُمْ مِنْ شَيْءٍ قَالُوا لَا فَقَالَ فَذلِكَ فَضلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ). (الحديث ٥٥٧- أطرافه في: ٢٢٦٨، ٢٢٦٩، ٣٤٥٩، ٥٠٢١، ٧٤٦٧، ٧٥٣٣)[٢٧٩]

---

(٢٧٨) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: من ادرك ركعة من الصلاة فقد أدرك، رقم: ٦٠٨ = ١٣٧٠.

(٢٧٩) أخرجه مسلم (العينى/٤٣/٥١/٥) لاحظ: فتح البارى ج/٢/٩١/٦٠٢/حيث يعده من افراد البخاري-المترجم.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خوایان لێ بێ) **دەفەرموێ: لە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **خۆیم** بیست دەیفەرموو: (ماوەی مانەوەی ئێوە لەچاو مانەوەی ئەونەتەوانەی تردا کەلەپێش ئێوەوە لەجیهانا بوون کەمە، بەقەد نێوانی نوێژی عەسرو شێوانە، تەورات خەلات کرا بەدەستەی تەورات، هەتا نیوەڕۆ کاریان پێ کرد، ئیتر کۆڵیان دا، وەهەریەکەی سەرو قیراتیان پێ درا، لەپاش دا ئینجیل خەلات کرا بەدەستەی ئینجیل، ئەوانیش هەتا نوێژی عەسر کاریان پێ کردو کۆڵیان دا، ئەوانیش یەکی سەرو قیراتی خۆیان وەرگرت، ئینجا ئەم قورئانە بەخەلاتی درا بەئێمە، وەئێمە تانوێژی شێوان کارمان پێی کرد، واتە: هەتا کاتی نزیکی کۆتایی جیهان، وەیەکی سەرو دوو قیراطمان وەرگرت). جا دەستەی تەورات‌و ئینجیل گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆبەمانە یەکی سەرو دوقیراتت داو، بەلام بەئێمە یەکی سەرو یەك قیرات؟ لەگەڵ ئەوەشدا کەئێمە کارمان لەوان زۆرتر کردووە!؟ خودای گەورەو سەروەریش دەفەرموێ: ئایا لەپاداشی خۆتان هیچ کەمترم پێتان داوە؟ دەڵێن: نەخێر، دەفەرموێ: دەئەوە بەش‌و بارەوبەهرەی خۆمە بەکێ ئارەزوو بکەم دەیدەمێ). (ت/٥/٢٦٣/٢ ز-٧٥ تاج-٣ ژ-٣٥٨٣ ج-٤).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئیمامی حەرەمەین (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (بڕیاری شەرع لەو فەرموودانە وەرناگیرێن کەدەکرێن بەضەربولمەثەل) ئەم فەرموودەیەیش ضەربولمەثەلەو، بەنموونە هێنراوەتەوە، لەبەرئەوە مەرج نییە کەموشەبەهـ و موشەبەهوبیهی لەهەموو روویەکەوە چوون یەك بن.

٣٢٩-عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ). (الحديث ٥٥٩)[(٢٨٠)]

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوسا کەلەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی شێوانمان دەکردو،دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان هێشتا دنیا ئەوەندە ڕووناك بوو شوێنی دەمەتیرمان دەبینی، کەتیرمان دەتەقاند دەمان بینی لەکوێ دەدا لەزەوی. (ت/١/١٩٨/١٢ ز-٤٧ ژ-٣٥٩ چ-٤).

٣٣٠-عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الظهْرَ بِالْهَاجِرَةِ وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ وَالْمَغْرِبَ إِذا وَجَبَتْ وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا وَأَحْيَانًا إِذا رَآهُمْ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ وَإِذا رَآهُمْ أَبْطَوْا أَخَّرَ وَالصُّبْحَ كَانُوا أَوْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ). (الحديث ٥٦٠ ـ طرفه في: ٥٦٥)[(٢٨١)]

لەجابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیار کرا: لەچ کاتێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژە فەرزەکانی دەکرد؟ فەرمووی: لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، کەنوێژی عەصریشی دەکرد خۆر هێشتا بەگوڕ بوو، تینی مابوو، زەرد هەڵنەگەڕابوو، کەخۆریش ئاوادەبوو نوێژی شێوانی دەکرد، نوێژی خەوتنانیشی جاروبار پێشی دەخستو، جاروباریش دوای دەخست، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر نوێژخوێنەکان زوو کۆببونایەتەوە، زووبەزوو جەماعەتی خەوتنانی بۆ دەکردین، بەلام ئەگەر نوێژکەرەکان

---

(٢٨٠) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: بيان أن أول وقت المغرب عند غروب الشمس، رقم: ٦٣٧ = ١٤٣٩.

(٢٨١) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب التبكير بالصبح، رقم: ٦٤٦ = ١٤٥٨.

درەنـگ بهاتنایـە، ئـەویش خـەوتنانی دوادەخـست، بەتاریکولێڵەکـەیش نوێـژی بەیانی بۆ دەکردن). (ت/١/١٩٦/٤ ز-٤٧ ژ-٣٥١ چ-٤ ش/د/ ن).

٣٣١-عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيُّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا تَغْلِبَنَّكُمْ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ الْمَغْرِبِ قَالَ وَتَقُولُ الْأَعْرَابُ هِيَ الْعِشَاءُ). (الحديث٥٦٣) [٢٨٢]

عەبـدوڵڵای کـوڕی موغەففـەلی ئـەل -مـوزەنی- (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (عەرەبە دەشت نشینەکان نـاوی نوێـژی شێوانتان لێ نـەگۆڕنو، نەکـەن ئێـوەیش چاو لـەوان بکـەنو، بەنوێـژی شـێوان بڵـێن: عیـشاء، چـونکە نوێـژی شـێوان خـودا نـاوی نـاوە مغریـب). عەبـدوڵڵا دەیفەرموو: عەرەبە سارانشینـەکان بەنوێژی مەغریب دەڵێن: نوێژی عیشاء.

## راڤەو شیکردنەوە:

عەبـدوڵڵای کـوڕی موغەففـەل یەکێکـە لەدەسـتەی پـەیمانی خۆشـنوودی (بەیعـەتوریـضوان) کەپێـشیان دەگـوترێ: (اصـحاب الـشجرة: یـارانی درەخـت) عەبدوڵڵا دەیفەرموو: بەدەستی خۆم لقو پۆپی ئـەو درەختـەم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوور دەخـستەوە، کەلـەکاتی ڕێکـەوتنی حودەیبیـەدا پـەیمانی بەیعەتوریضوانـی لـەژێردا سازدرا، چلو سـێ فـەرموودەی هەیـە، لەبوخاریـدا پێنجـی هەیـە، کـاتێ شـاری (تـستر) ئـازادکرا عەبـدوڵڵا یەکـەم کـەس بـوو لەدەروازەکەیـەوە چـوە ژوورەوە، لەهـەموو کەسـێ زیـاتر حەسـەنی بەصـری فەرموودەکانی دەگێڕێتەوە، یەکێ بوو لەو دەکەسە کـەئیمامی عومـەر ناردنی بۆ بەصرە، هەتا دانیشتوانی شارەزای ئایین بکەن، حەوت منـاڵی هـەبوو، سـاڵی

---

(٢٨٢) من أفراد البخارى عن مسلم ـ فتح البارى/ ٢/ ٩١/ ٦٠٢ ـ المترجم = ١٤٤١.

شەستی کۆچی لەبەصرە مرد، لەسەر راسپێری خۆی ئەبوبەرزەی ئەسلەمی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد! (ف ـ ٣٢٠)

٣٣٢–عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يَفْشُوَ الْإِسْلَامُ فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى قَالَ عُمَرُ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ فَخَرَجَ فَقَالَ لِأَهْلِ الْمَسْجِدِ مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْض غَيْرَكُمْ). (الحديث ٥٦٦ ـ أطرافه في: ٥٦٩، ٨٦٢، ٨٦٤) [٢٨٣]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەرلەوەی کەئیسلامەتی لە شوێنانی تریش جگە لەناوشاری مەدینە، بڵاوببێتەوە، شەوێ لەشەوان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی دواخستو درەنگ کردی، هەتا عومەر هاواری لێ هەڵساو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو جەماعەتەکەمان بۆ بکە، درەنگە، ژنانو منالان لەناو مزگەوتا خەویان لێ کەوتووە، لەمە زیاتر ناتوانن چاوەڕوانی جەماعەت بکەن، ئەوسا حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) هاتەدەرەوەو هات بۆناو مزگەوتو، بەئامادەبوانی ناومزگەوتەکەی فەرموو: (ئەم چاوەنواڕی کردنە بەکەم مەزانن، ئەمە بەهرەیەکی گەورەیە، خودا لەم کاتەدا بەس بەئێوەی داوە، کەسێ ترنییە جگە لەئێوە، لەدانیشتوانی سەر رووی زەوی، کەلەم دەمەدا چاوەنواڕی ئەم نوێژەبکا، وەك ئێوە چاوەنواڕی دەکەن!)

**راڤەو شیکردنەوە:** بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٣٣٤ کەوا لەدواوە.

٣٣٣– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ أَنَا وَأَصْحَابِي الَّذِينَ قَدِمُوا مَعِي فِي السَّفِينَةِ نُزُولًا فِي بَقِيعِ بُطحَانَ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ فَكَانَ يَتَنَاوَبُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ كُلَّ لَيْلَةٍ نَفَرٌ مِنْهُمْ فَوَافَقْنَا

---

(٢٨٣) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: وقت العشاء وتأخيرها رقم: ٦٣٨ =١٤٤٩، ٦٣٦٠.

النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَأَصْحَابِي وَلَهُ بَعْض الشُّغْلِ فِي بَعْض أَمْرِهِ فَأَعْتَمَ بِالصَّلَاةِ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ ثُمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِهِمْ فَلَمَّا قضى صَلَاتَهُ قَالَ لِمَنْ حَضرَهُ عَلَى رِسْلِكُمْ أَبْشِرُوا إِنَّ مِنْ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكُمْ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ النَّاسِ يُصَلِّي هَذِهِ السَّاعَةَ غَيْرُكُمْ أَوْ قَالَ مَا صَلَّى هَذِهِ السَّاعَةَ أَحَدٌ غَيْرُكُمْ لَا يَدْرِي أَيَّ الْكَلِمَتَيْنِ قَالَ قَالَ أَبُو مُوسَى فَرَجَعْنَا فَفَرِحْنَا بِمَا سَمِعْنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٥٦٧) (٢٨٤)

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەیەمەن بووین هەواڵمان بیست کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە، جاخۆم و دووبرام و پەنجاو سێ کەسی لەخزمەکانم، کۆچمان کرد بۆلای، سواری پاپۆڕێ بووین لەحەبەشە هەڵی ڕشتین لەلای نەجاشی، لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب و هاوڕێکانی بووین، وەلەوێ ماینەوە هەتا کاتێ گشتمان پێکەوە بەگەمێ گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بوو، هەموو شەوێ دەستەیێ لەیارانی، لەکاتی نوێژی خەوتنانا بەنۆرە ئێشکی پێغەمبەریان دەگرت، کاتێ خۆم و هاوڕێکانم چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) واڕێکەوت خەریکی سوپا ڕێکخستن بوو، لەبەرئەوە نوێژی خەوتنانی دواخست،هەتا شەو تەواودرەنگ بوو،شەوتەواو زرنگایەوە، ئەوجاهاتەدەرەوەو هات بۆ مزگەوت و نوێژی خەوتنانی بەکۆمەڵ بۆکردین، کەنوێژەکەی ی تەواو کرد بەئامادەبوانی فەرمووو: (هێواش بن، لەجێگەی خۆتان مەبزوێن، مژدەتان لێ بێ، یەکێکە لەنازو بەهرەکانی خودا کەرژاندوویەتی بەسەر ئێوەدا، ئەوەیە کەلەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن، کەجگە لەئێوە لەم دەمەدا کەسی تر ئەم نوێژە ناکا) یا حەزرەت فەرمووی: (بەس ئێوە لەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن) ڕاوی دەفەرموێ: نازانم حەزرەت

---

(٢٨٤) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة باب وقت العشاء وتأخيرها رقم: ٦٤١.

(رەزای خوای لێ بێ) **کام لەم دووشتەی فەرموو. ئەبوموسا فەرمووی: ئیتر زۆر زۆر بەشادمانی گەڕاینەوە لەخۆشی ئەم مژدە خۆشەی کەلەپێغەمبەرمان بیست).**

**(بڕوانە: تاج/ ١/٣٢٧/٤از ـ ١٠٢ تاج-٣ ژ-٣١٦٧ ج-٤ = کوردی).**

٣٣٤-عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يَفْشُوَ الْإِسْلَامُ فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى قَالَ عُمَرُ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ فَخَرَجَ فَقَالَ لِأَهْلِ الْمَسْجِدِ مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ غَيْرَكُمْ). (الحديث ٥٦٩ طرفه في: ٥٦٦).[٢٨٥]

**بڕوانە فەرموودەی ژمارە ٣٣٢ لێرەدا ئەمەی زیاترە: عائیشە فەرمووی: ئەوسەردەمە نوێژ بەجەماعەت هەر لەمەدینە دەکرا، چوونکە لەمەککە نوێژ بەدزی دەکرا، شوێنەکانی تریش ئیسلامەتی یان پێ نەگەیشتبوو، دەستووری پێغەمبەرو یارانی وابوو: نوێژی خەوتنانیان لەنێوانی ئاوابوونی سوورایی کەناری ئاسمانو تێپەڕبوونی سییەکی یەکەمی شەودا دەکرد.**

وفي رِواية: عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنهُما) (فَخَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ الْآنَ يَقْطُرُ رَأْسُهُ مَاءً وَاضِعًا يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوهَا هَكَذا فَاسْتَثْبَتُّ عَطاءً كَيْفَ وَضَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَأْسِهِ يَدَهُ كَمَا أَنْبَأَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَبَدَّدَ لِي عَطاءٌ بَيْنَ أَصَابِعِهِ شَيْئًا مِنْ تَبْدِيدٍ ثُمَّ وَضَعَ أَطْرَافَ أَصَابِعِهِ عَلَى قَرْنِ الرَّأْسِ ثُمَّ ضَمَّهَا يُمِرُّهَا كَذلِكَ عَلَى الرَّأْسِ حَتَّى مَسَّتْ إِبْهَامُهُ طَرَفَ الْأُذنِ مِمَّا يَلِي الْوَجْهَ عَلَى الصُّدْغِ وَنَاحِيَةِ اللِّحْيَةِ لَا يُقَصِّرُ وَلَا يَبْطشُ إِلَّا كَذلِكَ. وروى عَنْ أَنَسْ (رَضي اللهُ عَنهُ) هذا الحديث فقال فيه: كأني أنظر إلى وبيص خاتمه ليلتئذ). (رواية ابن عباس ٥٧١ ـ طرفه في: ٧٢٣٩. ورواية أنس الحديث ٥٧٢ ـ أطرافه في: ٦٠٠، ٦٦١، ٨٤٧، ٥٨٦٩)[٢٨٦]

---

(٢٨٥) بڕوانە ژمارە: ٣٣٢ ـ وەرگێڕ.

(٢٨٦) ٥٧١ و ٥٧٢ ـ اخرجهما مسلم (العينى/٥/٦٧/٥+٤٧/٦٩/٤٨) المترجم = ١٤٤٤-١٤٤٧.

لەگێڕانەوەی ئیبنوعەباسدا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: جاکەعومەر هەڵساو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو جەماعەتەکەمان بۆ بکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی شۆردبوو، کەلەهۆدەکەی خۆی هاتەدەرەوە بۆناو مزگەوت هێشتا سەری تەڕبوو، ئێستایش هەردەڵێی شێوەی ئەوکاتەی والەبەرچاوم، سەری ئاوی لێ دەتکا، هەردوو دەستی لەسەر سەری دانابوو، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (مەبادا زەحمەتی ئۆمەتم بدەم، دەنا فەرمانم پێ دەکردن کەلەم دەمەدا نوێژی خەوتنان بکەن) ئیبنوعەباس بەکردەوە گێڕایەوە کەچۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەسەر سەری خۆی دانابوو: جاتۆزێ پەنجەکانی بڵاو کردەوەو ئەوجا نووکی پەنجەکانی لەسەر لاسەری داناو، ئەوجا پەنجەکانی بەیەکەوە لکان، وەئاوا پەنجەکانی راکێشا بەسەر سەریدا بەرەولای خوارەوە، هەتا هەردوو پەنجەکەڵەی لەئاستی لاجانی دایان لەنووکی گوێکانی، لەلای روویەوە. وەلەسەر هەمان شێوە دەستی هێنا بەسەر لاجانگی‌و بەسەر سەریشیدا، پێشەوا ئەنەسیش (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، لەگێڕانەوەیەکا لەدواکەیەوە دەفەرموێ: ئێستایش دەڵێی بریسکەی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) والەبەرچاوم، کەلەوشەوەدا دەدرەوشایەوە). (ت/١/١٩٩/١٣ + ز-٤٧ ژ-٣٦٠ ت/٤ ز-٣٥ ل-١١٦).

**شیکردنەوە:**

بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ١١٤. ئەم فەرموودەیەیش یەکێکە لەو دەدوازدە حەدیثەی کە ئیبنوعەباس بەخودی خۆی لە پێغەمبەر خۆیی بیستووە. هەروا بڕوانە شەرحی نەوەی لەسەر صەحیحی موسلیم ج/٥ ص ١٤١، مبحث (باب وقت العشاو وتأخيرها)

٣٣٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ) (الحديث ٥٧٤).[٢٨٧]

---

(٢٨٧) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل صلاتى الصبح والعصر، رقم: ٦٣٥ = ١٤٣٦.

ئەبوموسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) (هەرکەسێ دوو نوێژە فێنکەکە بکا، کەنوێژی بەیانیو نوێژی عەصرن، دەچێتە بەهەشت) (ت/١/١٩٠/٣ ز-٤٤ ژ-٣٤٠ ج-٤ = ش).

٣٣٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثابِتٍ حَدَّثَهُ أَنَّهُمْ تَسَحَّرُوا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قُلْتُ كَمْ بَيْنَهُمَا قَالَ قَدْرُ خَمْسِينَ أَوْ سِتِّينَ يَعْنِي آيَةً). (الحديث ٥٧٥ ـ طرفه في: ١٩٢١)[٢٨٨]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: زەیدی کوڕی ثابیت بۆیگێڕامەوە فەرمووی: چەندکەسێ بووین لەخزمەت پێغەمبەردا پارشێومان کردەوە ئینجا هەڵساین چووین بۆنوێژی بەیانی، گوتم: نێوانی پارشێوەکەو بانگەکە چەندێ دەبوو؟ فەرمووی: دەوری پەنجا تاشەست ئایەت دەبوو).

٣٣٧- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ قَالَ: (كُنْتُ أَتَسَحَّرُ فِي أَهْلِي ثُمَّ يَكُونُ سُرْعَةٌ بِي أَنْ أُدْرِكَ صَلَاةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٥٧٧- طرفه في: ١٩٢٠)[٢٨٩]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەماڵی خۆمان لەناو خێزانما پارشێوم دەکرد، ئەوجا بەپەلە دەچووم بۆ مزگەوت، هەتا فریای جەماعەتی نوێژی بەیانی بکەوم لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) .

٣٣٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ وَأَرْضاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَشْرُقَ الشَّمْسُ وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ). (الحديث ٥٨١)[٢٩٠]

---

(٢٨٨) أخرجه مسلم في الصيام، باب: فضل السحور وتأكيد استحبابه، رقم: ١٠٩٧ = ٢٥٤٧.

(٢٨٩) من افراد البخارى عن المسلم (رَضِي اللهُ عَنهُ) (عينى/١٠/٢٩٨/٢٩) المترجم.

(٢٩٠) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: الأوقات التى نهى عن الصلاة فيها: ٨٢٦ = ١٩١٨.

ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: چەن پیاوچاكێ، كەیەكێكیان عومەر بوو، كەبەلامەوە ئەو لەهەموویان بوڕاست گۆیی‌و ئایینداری پەسەندتر بوو، شایەتیان لادام‌و فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش كردنی نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵ دێ، ڕێگەی كردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا، هەروەها لەپاش كردنی نوێژی عەصریش ڕێگەی كردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا هەتا خۆرئاوادەبێ. (ت/١/٢٠٣/ ١= ز-٥٠ ژ-٣٧٢ ج-٤ = ش/د/ت/ ن).

٣٣٩-عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ (لَا تَحَرَّوْا بِصَلَاتِكُمْ طلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا). (الحديث ٥٨٢- أطرافه في: ٥٨٥، ٥٨٩، ١١٩٢، ١٦٢٩، ٣٢٧٣) وقال ابن عمر (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قال رسول الله (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) : (إذا طلع حاجب الشمس فأخروا الصلاة حتى تغيب) (الحديث ٥٨٣ ـ طرفه في: ٣٢٧٢) [٢٩١]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەقەستی لەكاتی خۆركەوتن، یاخۆرئاوابوونا نوێژ مەكەن) لەگێڕانەوەیەكا: ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەخۆر لەئاسۆوە سەری كێشا ئیتر نوێژ مەكەن تابەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە، كەخۆریش گەیشتە دەم كەل‌و نووكی لای خوارووی ئاوابوو ئیتر نوێژ مەكەن تابەتەواوی ئاوا دەبێ). (ت/١/٢٠٤/٢ = ز-٥٠ ژ-٣٧٣ = ش/ ن).

٣٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ وَعَنْ لِبْسَتَيْنِ تقدم وزاد في هذه الرواية: وَعَنْ صَلَاتَيْنِ نَهَى عَنْ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطلُعَ الشَّمْسُ وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ). (انظر: ٢٣٣).

(٢٩١) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: الأوقات التى نهى عن الصلاة فيها، رقم: ٨٢٨ = ١٩٢٢.

(بڕوانه: فەرموودەی ژماره: ٢٣٣) لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئەمەی پترە: وەنەی کردووە لەم دووکاتەیش کەنوێژیان تیادا بکرێ: لەپاش کردنی نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵ دێ، وەلەپاش کردنی نوێژی عەصر هەتا خۆرئاوادەبێ. (بڕوانه: ٣٣٨).

٣٤١- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (إِنَّكُمْ لَتُصَلُّونَ صَلَاةً لَقَدْ صَحِبْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا رَأَيْنَاهُ يُصَلِّيهَا وَلَقَدْ نَهَى عَنْهُمَا يَعْنِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ). (الحديث ٥٨٧- طرفه في: ٣٧٦٦)[٢٩٢]

موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئێوە لەم سەردەمەدا دوو رکات نوێژی سوننەت لە پاش نوێژی عەصرەوە دەکەن، ئێمە کە هاوڕێتیی پێغەمبەری خودامان کردووە (دروودی خوای لێ بێ) نەمان دیوە کە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەو نوێژە بکا، بەڵکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی دەکرد لە کردنی ئەم دوو رکاتە لە پاش نویژی عەصرەوە).

٣٤٢-عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (وَالَّذِي ذَهَبَ بِهِ مَا تَرَكَهُمَا حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ وَمَا لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى حَتَّى ثَقُلَ عَنْ الصَّلَاةِ وَكَانَ يُصَلِّي كَثِيرًا مِنْ صَلَاتِهِ قَاعِدًا تَعْنِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّيهِمَا وَلَا يُصَلِّيهِمَا فِي الْمَسْجِدِ مَخَافَةَ أَنْ يُثَقِّلَ عَلَى أُمَّتِهِ وَكَانَ يُحِبُّ مَا يُخَفِّفُ عَنْهُمْ). (الحديث ٥٩٠ ـ أطرافه في: ٥٩١، ٥٩٢، ٥٩٣، ١٦٣١)

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەوخودایە کە پێغەمبەری بردەوە بۆلای خۆی، پێغەمبەری خودا هەتا مردو گەیشتەوە بەخزمەتی خودای گەورە، ئەم دوو رکاتە سوننەتەی لەپاش نوێژی عەصرەوە تەرك نەکردووە، کاتێکیش وەفاتی کردو چووەوە بۆدیوانی خودا کەبەگران‌و بەزەحمەت نوێژی بۆدەکرا، چوونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ چووەناو ساڵەوە کەمێ گۆشتی گرت‌و

(٢٩٢) من افراد الخاری (فتح الباری/٦٠٢/٩١/٢) المترجم.

قورس بوو، ئیتر زۆربەی شەونوێژی بەدانیشتنەوە دەكرد. پێغەمبەری خودا (درودی خوادای لێ بێ) ئەم دوو ركاتە سوننەتی پاش نوێژی عەصرەی لەماڵەوە دەكرد، لەمزگەوت نەیانی دەكرد، لەترسی ئەوە نەبادا باری ئۆمەتی گران بكا، ئەوانیش چاو لەوبكەن و بیانكەن و نوێژە سوننەتەكانی بەرودوای نوێژەفەرزەكان زۆر ببن و نوێژخوێن بەئاسانی بۆی نەكرێن، چونكە هەمیشە حەزی دەكرد كەكار بۆنەتەوەی ئیسلامی خۆی ئاسان بكا). (ب/١/٥٠٦/ ٨+٩+١٠+ ز-١٨٥ ژ-٩٩٥، ٩٩٦، ٩٩٧ ج-٤ ب/١/٥٠٤/٣+٤+ شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج/٦ ص ١٣ + ص ٢٧).

٣٤٣-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (رَكْعَتَانِ لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَعُهُمَا سِرًّا وَلَا عَلَانِيَةً رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ الْعَصْرِ). (الحديث ٥٩٢ طرفه في: ٣٩٠).[٢٩٣]

دیسان عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوونوێژ هەن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەبەنهێنیو نەبەئاشكرا تەركی نەدەكردن: دووركات لەپێش نوێژی بەیانی یەوەو دووركات لەپاش نوێژی عەصرەوە).

٣٤٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنهُ) قَالَ: (سِرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً فَقَالَ بَعْض الْقَوْمِ لَوْ عَرَّسْتَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَخَافُ أَنْ تَنَامُوا عَنْ الصَّلَاةِ قَالَ بِلَالٌ أَنَا أُوقِظُكُمْ فَاضطجَعُوا وَأَسْنَدَ بِلَالٌ ظَهْرَهُ إِلَى رَاحِلَتِهِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَنَامَ فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَقَالَ يَا بِلَالُ أَيْنَ مَا قُلْتَ قَالَ مَا أُلْقِيَتْ عَلَيَّ نَوْمَةٌ مِثْلُهَا قَط قَالَ إِنَّ اللَّهَ قَبَض أَرْوَاحَكُمْ حِينَ شَاءَ وَرَدَّهَا عَلَيْكُمْ حِينَ شَاءَ يَا بِلَالُ قُمْ فَأَذِنْ بِالنَّاسِ بِالصَّلَاةِ فَتَوَضَّأَ فَلَمَّا ارْتَفَعَتْ الشَّمْسُ وَابْيَاضتْ قَامَ فَصَلَّى). (الحديث ٥٩٥ ـ طرفه في: ٧٤٧١).[٢٩٤]

---

(٢٩٣) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين،باب معرفة الكعتين اليتن كان يصليها، رقم: ٨٣٥.

(٢٩٤) من أفراد البخاری (فتح الباری ٩١/٢ حديث/٦٠٢) المترجم.

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا خۆم لەخزمەت حەزرەتدا بووم، شەوێ کەوتینەڕێ، هەندێ لەبرادەران عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە سەرخەوێکمان دەشکان و لەپێش بەیانا وچانێکمان دەگرت، فەرمووی: (ئاخر دەترسم خەوتان لێ بکەوێ و ئاگاتان لەنوێژی بەیانی نەمێنێ) بیلال فەرمووی: بخەون من خەبەرتان دەکەمەوە. جا ئەوانیش پاڵکەوتن و خەویان لێ کەوت، بیلالیش ولاخەکەی خۆی ییخ داو پشتی پێوەی دا. جا بیلالیش خەوزۆری بۆهێناو چاوی چووە خەوو نووست، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەبەری بۆوە خۆرلەئاسۆوە گوێچکەی کێشا بوو، فەرمووی: (ئەی بیلال! کوا ئەوەی تۆ گوتت؟ تۆ نەتگوت من خەبەرتان دەکەمەوە؟) بیلالیش فەرمووی: هەرگیز خەوی وا قوورس نەیگرتووم. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە خواستی خوا وابووە، خوا لەئەزەلدا ئەمەی لەچارە نووسیوین، لەراستیدا ئەودەمەی کەخەوتان لێ کەوتووە خوا خەوی لێ خستوون و لەسەر خواستی خوا خەوتان لێ کەوتووەو لەو دەمەدا کەخۆی خواستی لەسەر بووە گیانتانی بردۆتەوە بۆلای خۆی، وەلەودەمەدا کەخۆی خواستی لەسەر بووە گیانتانی گێڕاوەتەوە بۆناو جەستەتان). ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەست نوێژی گرت، کاتێ دەستیان کرد بەجەماعەت خۆر بەرز بوو، تەواو سپی هەڵ گەڕابوو). (ت/١/٢٠١/٣ ز-٤٩ ژ-٣٦٨).

## نوێژی قەزا بەجەماعەت دەکرێ

٣٤٥-عَنْ جابر بن عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أن عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتْ الشَّمْسُ فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ الشَّمْسُ تَغْرُبُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا فَقُمْنَا إِلَى بُطحَانَ فَتَوَضأَ لِلصَّلَاةِ وَتَوَضأْنَا لَهَا فَصَلَّى

الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتْ الشَّمْسُ ثمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ). (الحديث ٥٩٦- أطرافه في: ٥٩٨، ٦٤١، ٩٤٥، ٤١١٢)[٢٩٥]

جابيرى كورِى عەبدوللا (ڕەزاى خوايان لىٚ بىٚ) فەرمووى: ڕۆژى غەزاى خەندەق لەپاش خۆرئاوا ، عومەرى كوڕى خەططاب (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) هاتو دەستى كرد بەجنێودان بەبێبڕواياني قوڕەيش، فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خودا! خەريك بوو خۆرئاوادەبوو ئەوسا نوێژى عەصرم بۆكرا؟ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (بەخودا من هێشتا نەيم كردووە!). ئەوجا هەڵساين چووين بۆ شيوى بوطحان كەوا لەمەدينە، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەوێ دەستنوێژى گرت بۆ نوێژو، ئێمەيش دەسنوێژمان گرت بۆى، ئەوجا نوێژى عەصرى بەكۆمەڵ بۆكردين لەپاش خۆرئاوابوون. لەپاشتر نوێژى شێوانيشى بەجەماعەت بۆ كردين).

## باسى قەزاى نوێژى لەبير چوو

٣٤٦-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذا ذكَرَهَا لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذلِكَ وَأَقِمْ الصَّلَاةَ لِذكْرِي). (الحديث ٥٩٧)[٢٩٦]

ئەنەسى كوڕى ماليك (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەفەرموێ: (هەركەسێ هەرنوێژێكى لەبيرچوو، لەكاتى خۆيدا نەيكرد باهەركاتێ يادى كەوتەوە ئەوكاتە بيكا، ئيتر جگە لەمە برێتى (كەفارەت) ى

(٢٩٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب الدليل لمن قال الصلاة الوسطى العصر رقم: ٦٣١.

(٢٩٦) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: الصلاة، باب: قضاء الصلاة الفائتة، واستحباب تعجيل قضائها، رقم: ٦٨٤ = ١٥٦٧.

تـرى نييـه، وەك خـودا دەفـەرموێ: (أقـم الـصلاة لـذكرى) طـه/٢٠/١٤ ـ واتـە: بەتايبـەتى ئاگـادارى نوێژەكـەت بكـەو لـەكاتى خۆيـا بيكـە بۆيـاد كـردن و ناوبردنى من). (ت/١/٢٠١/ ١ ز-٤٩ ژ-٣٦٦ +٢+٣+٤ ـ ش/د/ ت/ ن)

٣٤٧-عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: قالَ النَّبِيَّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَمْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظرْتُمْ الصَّلَاةَ). (الحديث ٦٠٠) [٢٩٧]

ديـسان ئەنـەس (رەزاى خواى لىّ بىّ) فـەرمووى: شـەوێ پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بىّ) نوێـژى خـەوتنانى دواخـست، لەنيوەشـەودا كـردى، كەلەنوێـژ بـۆوە فـەرمووى: خـەڵكى تـر نوێژى خۆيان كردو خەوتن، بەڵام ئێوه ئەوەتى چاوەنوارى ئـەم نوێـژە دەكـەن ئـەم ماوەيەتان هەموو بەنوێژ بۆحسێبە). (ت/١/١٩٩/ ١٣ ز-٤٧ ژ-٣٦٠ ج-٤).

٣٤٨-عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صلاة الْعِشَاءَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَـالَ أَرَأَيْـتَكُمْ لَيْلَـتَكُمْ هَـذِهِ فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ. يريـد بـذلك أنهـا تخرم ذلك القرأن. (الحديث ٦٠١ طرفه في: ١١٦). [٢٩٨]

(بڕوانـە فـەرموودەى ژمـارە: ٩٥). لێـرەدا ئـەم پـترييـەى هەيـە: مەبەسـتى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىّ) لەم فەرموودەيە ئەوەيە: كەلەپاش سەد ساڵى تر لەم ڕۆوە كەس نامێنىّ لەم خەڵكەى كەئێستا هەن و وان لەسـەر رووى زەوى و ئـەم چينەى ئێستا هەيە كۆتايى دێ، مەبەست ئەوە نييە كەلـەپاش سـەد سـاڵى تـر قيامەت هەڵ دەسىّ و كەس نامێنىّ (ت/٤/٣٦٥/٣ تاج-٣ ز-١١٢ ژ-٣١٨٩).

---

(٢٩٧) اخرجه مسلم (عينى/٥/٩٦/٧٦) باب وقت العشاء وتأخيرها ـ المترجم = ١٤٤٤-١٤٤٧.

(٢٩٨) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: قوله (صَلى اللـهُ عَليـهِ وَسَلمَ) لا تـأتى مائـة سنة وعلى الأرض ...، رقم: ٢٥٣٧ = ٦٤٢٦.

## باسی گوفتوگۆ لەپاش نوێژی خەوتنان

٣٤٩-عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُما) (أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاسًا فُقَرَاءَ وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلَاثَةٍ فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَشَرَةٍ قَالَ فَهُوَ أَنَا وَأَبِي وَأُمِّي فَلَا أَدْرِي قَالَ وَامْرَأَتِي وَخَادِمٌ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ لَبِثَ حَيْثُ صُلِّيَتْ الْعِشَاءُ ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى تَعَشَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضَى مِنْ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ وَمَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ أَوْ قَالَتْ ضَيْفِكَ قَالَ أَوَمَا عَشَّيْتِيهِمْ قَالَتْ أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ قَدْ عُرِضُوا فَأَبَوْا قَالَ فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ فَقَالَ يَا غُنْثَرُ فَجَدَّعَ وَسَبَّ وَقَالَ كُلُوا لَا هَنِيئًا فَقَالَ وَاللَّهِ لَا أَطْعَمُهُ أَبَدًا وَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا قَالَ يَعْنِي حَتَّى شَبِعُوا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ مِنْهَا فَقَالَ لِامْرَأَتِهِ يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا قَالَتْ لَا وَقُرَّةِ عَيْنِي لَهِيَ الْآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلَاثِ مَرَّاتٍ فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنْ الشَّيْطَانِ يَعْنِي يَمِينَهُ ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ فَمَضَى الْأَجَلُ فَفَرَّقَنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ أَوْ كَمَا قَالَ). (الحديث ٦٠٢ – أطرافه في: ٣٥٨١، ٦١٤٠، ٦١٤١).[299]

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: دانیشتوانی میوانخانەی صوففە خەڵکێکی هەژار بوون، جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی نانی دووکەسی هەیە بایەکێ لەم میوانانە لەگەڵ خۆی بباتەوەو بیکا بەسێهەمیان، هەروا ئەوەی نانی چوار کەسی هەیە

(٢٩٩) أخرجه مسلم في الاشربة، باب: إكرام الضيف وفضل إثارة، رقم: ٢٠٥٧.

باپێنج هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە، یا فەرمووی: باپێنج هەمێ یاشەشە هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە) ئیتر ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ کەسی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆماڵەوە، پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) دەکەسی لەگەڵ خۆی بردەوە، عەبدوڕەحمان فەرمووی: ئێمە منو باوکمو دایکم بووین، راوی فەرمووی: وابزانم عەبدورەحمان فەرموشی: ژنەکەی منو نۆکەرێکیشمان لەگەڵ بوو. نۆکەرەکە هی ئێمەو ماڵی باوکم بوو، بەلام ئەبوبەکر خۆی چووەوە بۆلای حەزرەتو لەلای ئەو شێوی کردەوە، هاتەوە ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەربوو لەشەو رابووردبوو، جاژنەکەی پێ ی گوت: بۆچی درەنگ هاتیتەوەبۆلای میوانەکانت؟ ئەویش بەدایکمی فەرموو: ناشێ هەتا ئێستا شیوت بۆدانەنابن؟ دایکیشم فەرمووی: خۆلکیان کردن تانانیان بۆدابنرێ، بەلام رازی نەبوون تاخۆت نەیەیتەوە. عەبدورەحمان فەرمووی: جامنیش لەترسی باوکم چووم خۆم شاردەوە نەبادا لەسەر میوانەکان قسەم پێ بڵێ. جاباوکم بانگی کردمو فەرمووی: خوێڕی! ئەوە لەکوێ ی؟ ئەی لچو لێوت بکرێ، ئەی واوالێکراو؟ ئەوە بۆنانت بۆئەم میوانانە دانەناوە؟ جا کەلەحاڵەکە حاڵی بوو بەمیوانەکانی فەرموو: دەبخۆن، بەنۆشی گیانتان نەبێ، دیارە سووچی خۆتان بووە، سابەوخودایە بەهیچ جۆرێ نابێ من لێی بخۆم، عەبدورەحمان فەرمووی: شتێکی سەیر رووی دا، بەهەقی خوا هەرپارووییەکمان لەخواردەمەنیەکە هەڵدەگرت لەبن پاروەکەوە بەرز دەبۆوەو پترو زۆرتر دەبوو، ئیتر هەروا هەتا تێرمان خوارد، کەچی نانەکە زیادی کردبوو، کەمی نەکردبوو، ئەبوبەکریش بەووردی سەرنجێکی ئەم حاڵەی داو فەرمووی: ئەرێ کچەکەی بەنی فیراسی ئەوە چییە؟ دایکیشم فەرمووی: منیش وەك تۆی لێ دەزانم، بەلام سوێندم بەوەی کەبووە بەمایەی ئەم چاوو دڵ رۆشنی یەم نانەکە ئێستا سێ قاتی پێشتریەتیو، لەپیتو فەڕی تۆو میوانەکانتەوە خودا پیتو فەڕی تێ خستووە، لەبەرئەوە ئەبوبەکریش

(درودی خودای لەسەر بێ) سوێندەکەی خۆی شکاندو تیکەیەکی بۆ موفەڕکی لەونانە موفەڕکە خواردوو فەرمووی: دیارە ئەو سوێندەی کەخواردم لەم نانە نەخۆم ئەوە لەشەیتانەوە بوو، چونکە نانی پیرۆزی وا حەیفە مرۆڵێ ی نەخوا' ئەوجا قەرەوانەکەی بەخواردەمەنییەکەوە هەلگرتو بردی بۆ خزمەتی حەزرەت، لەوێ دای نا بۆبەیانی، عەبدورەحمان فەرمووی: لەوەوپێش لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی هۆزێکی تردا پەیمانێ هەبوو، ماوەی پەیمانەکەمان تەواو بوو بوو، سوپاکە کەهاتنەوە بۆمەدینە؟، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کردنی بەدوازدە بەشەوە هەر بەشێ لەوسوپایە سەرکردەیەکی بۆدانا، هەر سەرکردەیێ مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ چەند کەسی لەگەڵ دا بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو نانو چێشتە کەمە کەلەو قەرەوانەدا بوو، لەسەرەتاوە بەبەرەکەتی ئەبوبەکری صەدیقو لەدوایی دا بەپیرۆزیی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەرەکەتێکی ئاشکرای وای تێ کەوت بەشی ئەو هەموو سوپایەی کردو ئەوانیش گشتیان لێیان خواردو بەسیانی کرد). (رياض الصالحين/٣/١٠٨٢/ ١).

## شیکردنەوە:

لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: نامەی کاتەکانی نوێژ (كتاب مواقيت الصلاة) برێتییە لەسەدو حەڤدە فەرموودە، سیی‌و شەشیان تەعلیقن، ئەوانەی تریان موتتەصیلن، لەمانە چلو هەشتیان پوختەوپاڵفتەن - واتە: خالیصەن - سەشتو نۆشیان دووبارەن، جایا لەم نامەیە خۆیا دووبارە کراونەتەوە، یالەپێشەوە. هەموویان پێشەوا موسلیمیش (ڕەزای خوای لێ بێ) پەسەندی کردوونو ئەویش گێڕاونیەتیەوە، جگە لەم سیازدەیەیان:

١- فەرموودەی ئەنەس: (كنا إذا صلينا .. سجدنا على ثيابنا اتقاء الحر) گەرچی موسلیم ئەم فەرموودەیەی بەمەعنا گێڕاوەتەوە.

٢- ئەم فەرموودەیەی تری ئەنەس کەتیایدا دەفەرموێ: (ما أعرف شیئاً مما کان علی عهد النبی (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

٣- ئەم فەرموودەیەی تریشی کەهەر بەواتا فەرموودەی دوەمیەتی کەتیادا دەفەرموێ: (وهذه الصلاة قد ضیعت).

٤- فەرموودەی ئیبنوعومەر (إژ أشتد الحر فأبردوا عن الصلاه) رقم-٣١٥.

٥- فەرموودەی ئەبوسەعید: (أبردوا بالظهر....).

٦- فەرموودەی ئیبنوعومەر: (إنما بقاؤکم فیها سلف قبلکم...) رقم-٣٢٨.

٧- فەرموودەی ئەبومووسا: (مثل المسلمین والیهود والنصاری...).

٨- فەرموودەی ئەنەس: (کنانصلی العصر ثم یخرج الانسان...) بەلام هەردوو پیر لەسەرئەصلی ئەم فەرموودەیە یەکن.

٩- فەرموودەی عەبدوللای کوڕی موغەففەل (لایغلبنکم الأعراب) رقم-٣٣١.

١٠- فەرموودەی ئیبنوعەباس: (لولا أن أشق علی أمتی.....) رقم-٣٣٤.

١١- فەرموودەی سەهلی کوڕی سەعید (کنت أتسحر..).

١٢- فەرموودەی موعاوییە: (إنکم لتصلون صلاة...) رقم-٣٤١.

١٣- فەرموودەکەی ئەبوقەتادە: (أخاف أن تناموا عن الصلاة..) هەروا دەفەرموێ سێ ئەثەری مەوقوفیشی تیادایە. اهـ، کەواتە: سەرجەمی فەرموودەو ئەثەرەکانی ئەم (نامەی کاتەکانی نوێژ)ە دەکاتە: (١٢٠) لەم (١٢٠)ە چلو یەکیان لەتەجریدەکەدا هاتووە. عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە، خۆیو باوکیو باپیری لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بوون، کوڕێکی بووە ناوی موحەممەد ئەبوعەتیق بووە، ئەویش لەپێش مەرگی پێغەمبەردا لەدایك بووە، برای هەقی عائیشەیە، لەڕیزی لەشکری بێبڕوایانی قوڕەیشا ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕی ئوحود بووە، داوای کرد

کەپاڵەوانێ بۆی بچێتە مەیدان، باوکی ویستی بچێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیهێشتو پێی فەرمووە: (خۆتمان پێ بهێڵە!) لەپاشتر موسوڵمان بوو موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، لەئاگربەستەکەی حودەیبییەدا لەگەڵ پێغەمبەر بوو، پاڵەوانێکی زۆر ئازاو دلێر بوو، تیرەندازێکی‌چاك بوو، لەگەڵ خالیدا ئامادەی شەڕی یەمامەبوو، حەوتی لەسەرکردەکانیان کوشت، کەیەکێکیان (محکم) ی یەمامە بوو، کەلەسەر کەلێنێ لەکەلێنەکانی قەڵاکە بوو، ئیتر سوپای ئیسلام لەو کەلێنەوە هەڵڕژانە ناو قەڵاکە. عەبدوڕەحمان کوڕی گەورەی ئەبوبەکرە، لەئوم ڕۆمانە، پیاوێکی پیاوچاکی دین قایمی خاوەن پەیمانی راستگۆ بوو، قەت درۆی لێ نەبینراوە. لەرووداوی ئەل ـ جەمەل دا لەگەڵ عائیشەی خوشکی بوو، بەڵام موحەممەدی برای لەگەڵ پێشەوا عەلی بوو، رۆژێ موعاوییە لەسەر دوانگە ووتار دەدا، لەخەڵکەکە داوا دەکا کەلەپاش خۆی یەزیدی کوڕی هەڵبژێرن بەجێ نشین!! عەبدوڕەحمانیش دەفەرموێ: (بۆ ئەمە هیرقەلییەتە؟ کەدەستووریان وایە هەرکاتێ قەیصەر دەمرێ قەیسەرێ تر لەشوێنی دادەنیشێ!).

موعاوییە لەپاش ئەم هەڵوێستە سەد هەزار درهەمی زیوینی بۆدەنێرێ، بەڵام ئەو وەری ناگرێو دەفەرموێ: (ئایینم نافرۆشم بۆجیهانم) جابەرەو مەککە دەکەوێتەڕێ، لەڕێ لەناو خەودا بەمەرگی کوتوپڕ دەمرێ، تەرمەکەی دەبەن بۆ مەککە لەوێدەینێژن، ساڵی پەنجاوسێ ی کۆچی دەبێ، کاتێ عائیشە هەواڵی مەرگی دەبیستێ دەچێ بۆحەج، لەمەککە دەچێتە سەرگۆڕەکەیو دەگریو ئەم شیعرەی موتەممیمی کوڕی نووەیرە دەخوێنێتەوە کەبەسەر مالیکی برایدا هەڵی داوە لەبەحری طویل:

وكنـا كـنـد مـانى جذيمـة حـقبة
مـن الـدهر حتـى قيـل لـن يتـصدعا
فلمـا نغـرقْنَا كأنـي ومالـكاً

لطــول اجتمــاع لم نبــت ليلــة مــعا

واته:

وەك دووهــاودەمی گیــانی بــەگیانی
ڕۆژگــاریٚ زۆرمــان پیٚکــەوە رانــی
گــەردوون لــەناکاو بــیٚ چــاوەڕوانی
ڕۆژگــاری دووریو جــودایی هــانی
تــەونی جــودایی وەهــا تــەنیوە
ڕیٚگــەی پەیوەنــدی تــەواو بڕیــوە
منــی لــەکاکم وادابڕیــوە
دەڵیٚــی لەمەوبــەر یــەکمان نــەدیوە!

عەبوڕەحمان لەسەرەتاوە ناوی عەبدولکەعبە بووە، پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ناوەکەی گۆڕیو کردی بەعەبدوڕەحمان، چەند فەرموودیەکی لەصەحیح دا هەیە، سالیٚ لەپاش مەرگی عەبدوڕەحمان عائیشەی خوشکیشی دەمریٚ، رەزای خودایان لیٚ بیٚ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ١٤) نامەی بانگ (كتاب الأذان)

## سەرەتای داهاتنی بانگ (باب: بدء الأذان)

٣٥٠- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) كَانَ يَقُولُ: (كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَاةَ لَيْسَ يُنَادَى لَهَا فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ فَقَالَ بَعْضُهُمْ اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى وَقَالَ بَعْضُهُمْ بَلْ بُوقًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ فَقَالَ عُمَرُ أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ). (الحديث ٦٠٤)[٣٠٠]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەیفەرموو: كاتێ موسوڵمانان كۆچیان كرد بۆ مەدینە، هێشتا بانگ دانەمەزرا بوو، خۆیان چاودێری كاتی نوێژیان دەكردو بۆی كۆدەبوونەوە. ڕۆژێ لەم بارەیەوە دەستیان كرد بەگوفتوگۆ. هەندێكیان فەرموویان: بازەنگێ دابنێین وەك هی نەصرانی یەكان، وەك ئەوان لەكاتی نوێژدا ناقووس لێ بدەین، هەندێ تریان فەرموویان: ئەی بۆئێمەیش وەك جوولەكەكان كەڕەنایەك دروست نەكەین بۆخۆمان. عومەریش فەرمووی: ئەی بۆ پیاوێ نەچێ بانگ بدا بۆنوێژ؟ ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی بیلال! هەڵسە بانگ بدە بۆ نوێژ)

٣٥١-عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذانَ وَأَنْ يُوتِرَ الْإِقَامَةَ). (الحديث ٦٠٥ طرفه في: ٦٠٣).[٣٠١]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەبیلال كرد كەوتەكانی بانگ جووتە بڵێ، وەوتەكانی قامەت بەتاك بڵێ،

(٣٠٠) اخرجه مسلم في الصلاة، باب بدء الأذان، رقم: ٣٧٧ = ٨٣٥.

(٣٠١) أخرجه مسلم في الأمر بشفع الأذان ـ المترجم = ٨٣٦.

وتەی: (قد قامت الصلاة) نەبێ، بەڵام ئەم وتەیە لەقامەت دا دووجار بڵێ) (ت/١/٢٢٦/٢ ز-٦١ ژ-٤٢١ چ-٤ = ش/ د/ت/ ن).

٣٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إذا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطانُ وَلَهُ ضرَاط حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذينَ فَإذا قَضى النِّدَاءَ أَقْبَلَ حَتَّى إذا ثوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ حَتَّى إذا قَضى التَّثويبَ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ اذكُرْ كَذا اذكُرْ كَذا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذكُرُ حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى). (الحديث ٦٠٨ ـ أطرافه في: ١٢٢٢، ١٢٣١، ١٢٣٢، ٣٢٨٥)[٣٠٢]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆنوێژ شەیتان هەڵدەتوڕێنێو جرت لێ دەدا، تاگوێ ی لەبانگەکە نەبێ، جا کەبانگەکە تەواو دەبێ دیسان دێتەوە تاقامەت دەکرێ بۆنوێژ ئەوجا دووبارە هەڵدەتوڕێنێتەوە، کەقامەت تەواو دەبێ دیسان دێتەوە دەچێتە بنکلێشەی پیاوەو پێی دەڵێ: بیرلەمە بکەرەوەو بیر لەوە بکەرەوە، وەئەوشتانەی وەبیردێنێتەوە کەلەوەپێش لەبیری نەبوون، هەتا بەرادەیەکی وا دڵی بێ ئاگادەکا کەنازانێ چەن رکات نوێژ دەکا). (ت/١/٢٢٢/ ١ ز-٥٩ ژ-٤١٤ چ-٤ ش/ د/ ن).

٣٥٣- عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سمعت رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول: (لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذن جِنٌّ وَلَا إنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث ٦٠٩- طرفاه في: ٣٢٩٦، ٧٥٤٨).[٣٠٣]

عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی صەعصەعە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێم: دەتبینم تۆ حەزت لەماڵاتو

---

(٣٠٢) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: فضل الأذان وهرب الشيطان عند سماعه، رقم: ٣٨٩ = ١٣٦٧.

(٣٠٣) من افراد البخاري (فتح الباري/٢/١٤٧/ حديث ٦٤٣) المترجم.

مەڕداریو دەشتە، جاهەرکاتێ لەناو مەڕو ماڵاتەکەتا بوویتو بانگت دا، یالەو دەشتە بوویتو بانگت دا، تەواو دەنگ لەبانگەکە هەڵبڕە، چونکە هەرچی لەقەرەی دەنگی بانگدەردابێو گوێ ی لێ بێ، چ جنۆکەبێو، چ مرۆڤ بێ، چ فریشتەبێو، چ شتێ تربێ وەك دارو بەردو شتی بێ گیانی تر، لەڕۆژی قیامەتدا شایەتی بۆدەدەنو بەو شایەتییە چاوو دڵی ڕۆشن دەکەنەوەو، سەری پێ ی بەرزدەبێ. ئەبوسەعید فەرمووی: ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بیستووە. (ب/١/٢٢٣/ ٣ ز-٥٩ ژ-٤١٦ ج-٤ = ب/ ن).

٣٥٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا غَزَا بِنَا قَوْمًا لَمْ يَكُنْ يَغْزُو بِنَا حَتَّى يُصْبِحَ وَيَنْظرَ فَإِنْ سَمِعَ أَذانًا كَفَّ عَنْهُمْ وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذانًا أَغَارَ عَلَيْهِمْ). (الحديث: ٦١٠ طرفه في: ٣٧١).[٣٠٤]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: کەدەڕۆیشت بۆغەزا بۆسەر هۆزێ، هەتا بەیانی نەدایێ نەیدەدا بەسەریانا، جا ئەگەر لەکاتی بەیانیدا گوێی لەدەنگی بانگ بوایە ئەوا وازی لێ دەهێنان، ئەگینا لەپاش بەیان هێرشی دەبردە سەریانو، پەلاماری دەدان. (ت/٨/١٢٠/٢ تاج-٤ ز-٤٦ ژ-٤٤٦٣ = ش/ د/ ت).

٣٥٥-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذنُ). (الحديث ٦١١) وعن معاوية (رَضي اللهُ عَنْهُ) مثله إلى قوله: وأشهد أن محمدا رسول الله. وكما قال: حي على الصلاة، قال: لاحول ولا قوة إلا بالله وقال: هكذا سمعنا نبيكم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول) (الحديث ٦١٢- طرفاه في: ٦١٣، ٩١٤) [٣٠٥]

---

(٣٠٤) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: استحباب القول مثل قول المؤذن لمن سمعه (صحيح مسلم بشرح النووي ج/٤ ص ٨٤) المترجم = ٣٤٨٢.

(٣٠٥) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: استحباب القول مثل قول المؤذن لمن سمعه، رقم: ٣٨٣.

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لەبانگ دەبێ بانگدەر چ دەڵێ ئێوەیش ئەوە بڵێنەوە). (ت/١/٢٣٠/١ ز-٦٣ ژ-٤٢٩ = ش/د/ ت/ ن).

٣٥٥- (دووبارە- مكرر) موعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) جارێ گوێی لەبانگ بوو، لەسەرەتای بانگەوە بانگدەر هەرچی دەفەرموو ئەویش گووتەکەی ئەوی دووبارە دەکردەوە، هەتا (وأشهد أن محمداً رسول الله) بەلام کاتێ بانگدەر گوتی: (حي على الصلاة) موعاوییە فەرمووی: (لاحول ولاقوه إلا بالله) کاتێکیش بانگدەر گوتی: (حي على الفلاح) موعاوییە فەرموویەوە: (لاحول ولاقوة الا بالله) ئیتر لەپاش (حي على الفلاح) بانگدەر هەرچی فەرموو موعوییە ئەوەی دووبارە کردەوە، بەبێ زیادوکەم. لەپاشا فەرمووی: لەسەر ئەم شێوەیەی کەڕابوورد وەلامی سەندنەوەی بانگم بەگوێی خۆم ژنەوتووە لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستی ئێوە. (درووده سلاوی خودای لەسەربێ).

**ڕوونکردنەوە:**

**یەکەم:** بۆمەشق کردن لەسەر وەرگێڕانی زاراوەکانی زانستی فەرمووده، هەروەها بۆ شارەزا بوون بەرەبەرە لەمەرجەکانی هەردووپیر -کەبوخاریو موسلیمن، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەڵێین: پێشەوا عەسقەلانی لەم شوێنەدا دەفەرموێ: پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەعومەری کوڕی خەطابەوە، فەرموودەیێ دەردەهێنێ، وێنەی ئەم فەرموودەیەی موعاوییەیە، بەلام بوخاری دەری نەهێناوە، چونکە ڕاجیایی هەیە لەوەدا کەئەم فەرموودەی عومەرە پەیوەست (موصول)ە، یا بەرەلایە واتە مورسەلی صەحابی یە، وەك پێشەوای فەرموودەناسی گەورە دارەقوطنی ئاماژەی بۆکردووە. ئەم فەرموودەیەی

---

(٣٠٥) (مكرر) من افراد البخاری (فتح/٦١٣/١١/٢) المترجم = ٨٤٧.

موعاوییـــەیش موســـلیم دەری نـــەهێناوە، واتـــە: نەیگێڕاوەتـــەوە، چـــوونکە ئەوپترییەی کەجێگـەی مەبەسـتە لـەم فەرموودەیـە بەپێی مـەرجی موسـلیم نیە، چونکە ڕشتەکەی نەناسێکی تێدایـە. واتـە: زیـادە مەقصوودەکەی بـەپێی مەرجی موسلیم نیە،

**دووەم**: بـانگ‌و قامـەت لـەم کاتانـەدا سـوننەتن: لـەپێش نوێـژدا، لـەکاتی ناونـانی منـاڵی ساوادا، لـەکاتێکا کەسـێ دەنگـێ بـەرگوێی بکـەوێ‌و لەجنۆکـەو پـەری‌و شتی وا بترسـێ سـوننەتە بـانگ بـدا، یاقامـەت بکـا، چـونکە شـەیتان لـەدەنگی بـانگ‌و قامـەت هەڵـدێ، بیـسەر هـەموو وشـەیێ، خـودی وشـەکە یاذیکرەکـەی کەلـەکاتی بیستنی ئـەو وشـەیەدا دەگـوترێ، لـەپاش بانگـدەرەوە، بەشێنەیی، بەدەنگی نزم لەبەرخۆیەوە دەڵێتەوە، ئەمەش بۆگشت موسـوڵمانێ کەگویێ لەبانگ بێ سوننەتە، تەنانەت بۆ بێ دەستنوێژو لەشپیسیش، مەگـەر بۆکەسـێ کەمەهانـەی هـەبێ، وەك سـەراوکەرو نوێژکـەرو کەسـێ لەگـەڵ حەڵاڵیدا دروست بـووبێ، ئەمانـە بۆیـان هەیـە لـەپاش تـەواوبوونی کارەکـەیان بەڕیز بانگەکە بسێننەوە، بەمەرجێ زۆر بەینی نەکەوتبێ! مەرجـە بانگـدەرو قامەتکەر موسوڵمان بـن، مەرجـە بانگـدەر فامیـدەبێ‌و خـاوەن تـەمیزو هـۆش بێ‌و نێرینەیش بێ، خوێندنی قورئان‌و ویردو یادەکانی تـر، وەك تەسـبیحات‌و صـەڵاوات، بـۆ سـەندنەوەی بـانگ‌و قامـەت دەبـڕێ. تەسـبیحات کـردن لـەپێش نوێژی بـەیانی‌و نوێـژی هـەینی دا دروسـتە، سـەڵاواتدانیش لەسـەر پێغەمبـەر هـەروا، گەرچـی ئەمانـە تـازە قـەڵان‌و لەسـەردەمی پێغەمبـەردا نـەبوون لەبەرئەوە بگرە ئەگەر نەکرێن باشترە، بەڵام کردنیان زیـانی نییـە. تـەرجیع‌و تـەثویب سـوننەتن، سـوننەتە وەقفـەو وەسـتان بەزەنـەی ڕێ لـەکاتی گـوتنی هـەموو (الله اکـبر) ێکـا، بانگـدەر هـەموو وشـەیێ بەسـەریەکەوە بەیـەك هەناسـەبڵێ، وەسـوننەتە بۆبانگـدەرو قامەتکـەر لـەپێش بـانگ‌و قامەتەکـەوە سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر بدەن‌و نزا ناسراوەکە بخوێنن کەدەفەرموێ: (اللـهم

صل وسلم وبارك على النبيُّ الكريم... الخ) وەسوننەتەلەنێوانی بانگو قامەتدا هەمووکەسێ نزای باش بکا بۆ ئیشی دینو دنیای خۆیو موسوڵمانان. (بڕوانە: شەرحی نەوەوی، فەتحولباری، فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە/ ١٤٤ - ١٤٦).

٣٥٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ قَالَ حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ). (الحديث ٦١٤ - طرفه في: ٤٧١٩).[٣٠٦]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەکاتی بیستنی بانگدا بڵێ: اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذی وعدته)، واتە: ئەی خودایە! ئەی خواوەندی ئەم بانگەوازی تەواوە! ئەی پەروەردگاری ئەم نوێژە دابەستراوە! ببەخشە بەموحەممەد پایەی هەرەبەرزی ئەلوەسیلەو پلەی هەرە گەورەی ئەل - فەضیلە، وەبیبەرە ئەو بارەگا پەسەندەی کەخۆت بەڵێنت پێی داوەو، ڕەوانەی ئەوێی بکە، کەمەقامەمی شەفاعەتی گەورەیە. هەرکەسێ لەوکاتەدا ئەمەبڵێو ئەم نزایە بخوێنێ، لەڕۆژی قیامەتا تکای من بۆئەو قەبووڵ دەبێ). (ت/١/٢٣١/٢ ز-٦٣ ژ-٤٣٠ = ب/د/ ن).

## ڕوونکردنەوە:

مەبەست لەم بارەگاو بەڵێنە ئەم ئایەتەیە: (عسى أن يبعثك ربك مقاماً محموداً). ئەم نزایە واباشترە لەپاش تەواوبوونی بانگەکە بخوێندرێ، مەبەست لەبانگەوازی تەواویش بانگەوازی یەکتاپەرستییە، کەپوختەکەی وا لەبانگ دا.

---

(٣٠٦) من افراد البخاری (فتح/٢/١٤٧/٦٤٣) المترجم.

٣٥٧-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا). (الحديث ٦١٥- اطرافه في: ٦٥٤، ٧٢١، ٢٦٨٩)[٣٠٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر ئەم مەردوومەدەیانزانی خێری بانگدانو ڕیزی یەکەمی جەماعەت چەنێ گەورەیە، وەچارەی تریان نەبوایە کەجگە لەوەتیروپشکیان لەسەر بکەن، ئەوا تیروپشکیان لێ دەکردن، جاپشکی کێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا، یالەڕیزی یەکەما دەوەستا، ئەگەر دەیشیانزانی کەخێری زووچوون بۆنوێژی فرچەی گەرمای نیوەڕۆ چەند گەورەیە بەهەڕاکردن دەچوون بۆی، ئەگەر دەیشیانزانی خێری جەماعەتی خەوتنانو جەماعەتی بەیانی چەنێ گەورەیە، ئەگەر بەگاگۆڵکەیش بوایە دەهاتن بۆیان).

٣٥٨-عَنْ ابنْ عمَر (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ثُمَّ قَالَ وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى لَا يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ). (الحديث ٦١٧- أطرافه في: ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨)[٣٠٨]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیلال هێشتا شەوی دەمێنێ کەبانگ دەدا، جالەبەرئەوە ئەگەر ویستتان لەپاش بانگی بیلالیش، هەر شت بخۆنو بخۆنەوە، تائیبنوئوممی مەکتووم بانگ دەدا ئیتر واز لەهەموو شتێ بهێنن کەڕۆژووی پێ دەشکێ). قسەگێڕەوە

---

(٣٠٧) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: تسوية الصفوف وإقامتها وفضل الأول رقم: ٤٣٧=٩٨٠.

(٣٠٨) اخرجه مسلم في الصيام، باب: بيان أن الدخول في الصوم يحصل..، رقم: ١٠٩٢ = ٢٥٣١، ٢٥٣٦.

(راوی) فەرمووی: ئیبنوئوممی مەکتووم پیاوێکی کوێر بوو، بانگی نەدەدا هەتا لەهەمووڵایەکەوە خەڵکەکە پێیان دەگوت: وابەیانە بانگدە. (ت/٢/٧٩/٥ ز-٢٧ ژ-١٣١٠ چ-٤ = ش).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئیبنوئوممی مەکتووم ناوی عەبدوڵڵایە، لەموسوڵمانە پێشینەکانە پێغەمبەر زۆر ڕێزی دەگرت، زۆرجاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیکرد بەئەمیر لەسەر مەدینە، لەجێنشینی ی عومەردا ئامادەی جەنگی قادسییە بوو، لەوجەنگەدا شەهید بوو، ئەو کوێرەیە کەلەسورەتی عەبەسەدا باس کراوە.

٣٥٩- عَنْ حَفْصَةُ (رَضيَ اللَّهُ عَنْها) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا اعْتَكَفَ الْمُؤَذنُ لِلصُّبْحِ وَبَدَا الصُّبْحُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تُقَامَ الصَّلَاةُ). (الحديث٦١٨ ـ طرفاه في: ١١٧٣، ١١٨١) (٣٠٩)

حەپسە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ بەیانی دەداو بانگدەر لەبانگ دەبۆوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوورکات نوێژی سوننەتی سووکەڵەی دەکرد، بەرلەوە قامەت بکرێ بۆنوێژی بەیانی.

## روونکردنەوە:

حەفصە هاوسەری پێغەمبەری خودایە، لەساڵی سێیەمی کۆچیدا بەبێوەژنی لەدوا عائیشە شووی کرد بە پێغەمبەر، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (جوبرائیل پێ ی فەرمووم: حەفصە رۆژووەوانێکی باش و شەونوێژکەرێکی زۆرچاکە، لەبەهەشتیشا هاوسەری تۆیە!) حەفصە هەتا مرد هەمیشە بەرۆژووبوو، کچی عومەری کوڕی خەطاب بوو،لەژنەکۆچکارەکان

(٣٠٩) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب ركعتي سنة الفجر.. رقم: ٧٢٣ = ١٦٧٣.

بوو، سەروەسێتی باوکی بوو. پێنج فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە خوێنەوار بوو، بڕوانە: بەرگی پێنجەمی تاجول ئوصولْ بەکوردی لاپەڕە/ ١٦٢ ە= تاج-٣ ز-٣٥ هەتا زنجیرە ٤١.

٣٦٠-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَوْ أَحَدًا مِنْكُمْ أَذانُ بِلَالٍ مِنْ سَحُورِهِ فَإِنَّهُ يُؤَذِنُ أَوْ يُنَادِي بِلَيْلٍ لِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَلِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ الْفَجْرُ أَوْ الصُّبْحُ وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ وَرَفَعَهَا إِلَى فَوْقُ وَطَأْطَأَ إِلَى أَسْفَلُ حَتَّى يَقُولَ هَكَذا بِسَبَّابَتَيْهِ إِحْدَاهُمَا فَوْقَ الْأُخْرَى ثُمَّ مَدَّهَا عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ). (الحديث ٦٢١- طرفاه في: ٥٢٩٨، ٧٢٤٧) [٣١٠]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان بەبانگی بیلال واز لەپارشێوکردن مەهێنن، چونکە ئەو شەوی دەمێنێ کەبانگ دەدا، مەبەستی ئەوەیە شەونوێژکەرتان ئاگادار بکاتەوە کەوا بەیان نزیکە، ئەگەر دەیەوێ باسەرخەوێ بشکێنێ، یائەگەر دەیەوێ پارشێوبکا تازووە بیکا،هەروەها مەبەستی ئەوەیە خەوتووتان لەخەوهەڵبستێنێ هەتا خۆی ئامادەبکا بۆبەیان، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەکانی سەرەوژوور هەڵبڕیو سەرەوخواری کردنەوە بەئاماژە نەخشەی بەیانییە درۆزنەی کێشاو فەرمووی: (شەبەقدان ئاوانییە، بەڵام شەبەقدان ئاوایە) جاهەردوو پەنجەی لەسەریەك داناو ئاماژەی پێیان کردو نەخشەی بەیانی ڕاستەقینەی کێشاو فەرمووی: (هەتا ئاوا ڕووناکی لەکەناری ئاسمانەوە، لەخۆرهەڵاتەوە بەڕاستو چەپا بڵاو دەبێتەوەو دەبێ بەڕۆژی تەواو!) (ت/٢/٨٠/١ ز-٢٨ ژ-١٣١١).

---

(٣١٠) أخرجه مسلم في الصيام، باب: بيان أن الدخول في الصوم يحصل.. رقم: ٨٣٨ = ٢٥٣٦.

٣٦١-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (بَيْنَ كُلِّ أَذانَيْنِ صَلَاةٌ ثَلَاثا لِمَنْ شَاءَ). (الحديث ٦٢٤ ـ طرفه في: ٦٢٧) [٣١١]

عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلی ئەل- موزەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار فەرمووی: (لەنێوانی هەموو بانگو قامەتێکا نوێژێکی سوننەت هەیە، بۆکەسێ ئارەزووی هەبێ).

وفي ريواية: (بين كل أذانين صلاة، بين كل اذانين صلاة). ثم قال في الثالثة: (لمن شاء).

واتە: لەبەینی هەموو بانگو قامەتێکا نوێژێکی سوننەت هەیە لەسەری جاری سێیەما فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە بۆکەسێ کە ئارەزووی ئەم نوێژەی هەبێ). (ت/١/٣٠٨/١ ژ-٦٠٥ ز-١٠٤ چ-٤ = ش/ د/ ن).

٣٦٢-عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِث (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً وَكَانَ رَحِيمًا رَفِيقًا فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهَالِينَا قَالَ ارْجِعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَصَلُّوا فَإِذا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ). (الحديث ٦٢٨ ـ أطرافه في: ٦٣٠، ٦٣١، ٦٥٨، ٦٨٥، ٨١٩، ٢٨٤٨، ٦٠٠٨، ٧٢٤٦) [٣١٢]

مالیکی کوڕی حووەیریت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ دەستەیێ لەخزمانم، چووین بۆ مەدینە بۆخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیست شەو لەخزمەتیدا ماینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر میهرەبانو دڵسۆز بوو، جا کاتێ هەستی کرد کەوا ئێمە تاسەی لای کەسوکارمان دەکەین فەرمووی: (بچنەوە بۆناو کەسو کارتان لەناویانا بن‌و فێری ئایینیان بکەن‌و

---

(٣١١) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها باب: بين كل أذانين صلاة، رقم: ٨٣٨ = ١٩٣٧، ٢٥٣٩.

(٣١٢) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: من أحق بالإقامة، رقم: ٦٧٤ = ١٥٣٣.

فێری نوێژیان بکەن، وەمن ئەم ماوەیە چۆن نوێژم بۆئێوە دەکرد ئاوا نوێژیان بۆبکەن، کاتێ کەنوێژ دەبێ یەکێك لەخۆتان بابانگتان بۆبدا، وەکێتان گەورەتربوو بائەو بەرنوێژیتان بۆبکا).

عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِث (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أَتَى رَجُلَانِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدَانِ السَّفَرَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أَنْتُمَا خَرَجْتُمَا فَأَذنَا ثُمَّ أَقِيمَا ثمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا). (الحديث ٦٣٠ أطرافه في: ٦٢٨، ٦٣١، ٦٥٨، ٦٨٥، ٨١٩، ٢٨٤٨، ٦٠٠٨، ٧٢٤٦).

دیسان ئەو (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دووپیاو هاتنە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیانویست بچن بۆسەفەر، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ کەوتنەڕێ، لەهەموو شوێنێ کەنوێژ بوو بانگ بدەن، لەپاشا قامەت بکەن، ئەوجا کێتان گەورەتربوو بائەو بەرنوێژیتان بۆبکا). (ت/١/٣٨٠/١ ز-١٢٦ ژ-٧٥٧ چ-٤).

## ڕوونکردنەوە:

مالیکی کوڕی حووەیریث چەند فەرموودەیەکی لەصەحیحەین دا هەیە لەبەصرە دادەنیشت، لەنەوەدوپێنجی کۆچیدا لەوی مردووە، ئەم زاتانە فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە: ئەبوقلابەو ئەبوعەطییەو سەلەمەی ئەل - جرمیو عەبدوڵڵای کوڕی مالیك. ئەم فەرموودەیەی بەڵگەیە لەسەرئەوە کە هاوڕێی پێغەمبەر بووە.

٣٦٣-عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) ( أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُ مُؤَذنًا يُؤَذنُ ثمَّ يَقُولُ عَلَى إِثرِهِ أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ فِي اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ أَوْ الْمَطِيرَةِ فِي السَّفَرِ). (الحديث ٦٣٢ - اطرافه في: ٦٦٦).[٣١٣]

---

(٣١٣) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين وقصرها، باب: الصلاة في الرحال في المطر رقم: ٦٩٧ = ١٤٨٤.

**ئیبنوعومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەشەوی سەرماو سۆڵەدا، یالەشەوی باراندا، فەرمانی دەکرد بەبانگدەر، بانگی دەدا، گورج بەشوێن بانگەکەدا لەسەرفەرمانی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بانگدەر بەدەنگی بەرز دەیفەرموو: (ألا صلوا في الرحال: ئاگادار بن مەیەن بۆجەماعەت، لەجێگەی خۆتان نوێژ بکەن). (ت/١/٣٧٧/ ١ ز-١٢٤ ژ-٧٥٢ چ-٤ = ش/د).**

**ڕاڤەو شیکردنەوە:** بڕوانە: ژمارە: ٣٧٨.

**٣٦٤-عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ فَلَمَّا صَلَّى قَالَ مَا شَأْنُكُمْ قَالُوا اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلَاةِ قَالَ فَلَا تَفْعَلُوا إِذا أَتَيْتُمْ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا). (الحديث ٦٣٥).[٣١٤]**

**ئەبوقەتادە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕۆژێ بەرنوێژیی بۆدەکردین، لەوکاتەدا گوێی لێ بوو کەوا چەن پیاوێ کردوویانە بەگاڵەگاڵو غەڵبە غەڵبو زرمە زرم، جاکەنوێژەکەیی تەواو کرد فەرمووی: (ئەوە چیتان بوو بۆ واتان کرد؟) یاران** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرموویان: پەلەی نوێژمان بوو کەبگەین بەجەماعەتا. فەرمووی: (وامەکەن، بەڵکوو کاتێ دێن بۆ نوێژ لەسەرەخۆبن، بەهیوریو هێمنیو شێنەیی بچن بۆنوێژ، ئیتر چەندە فریا کەوتن بەجەماعەت بیکەن، ئەوەیشی پیانەگەیشتن خۆتان بەتەنها تەواوی بکەن). (ت/١/٣٧٩/ ١ ـ ش/د).**

**٣٦٥- وعنه (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِذا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي). (الحديث ٦٣٧ ـ طرفاه في: ٦٣٨، ٩٠٩)[٣١٥]**

---

(٣١٤) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب إتيان الصلاة بوقار وسكينة رقم: ٦٠٣.

(٣١٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: متى يقوم الناس للصلاة، رقم: ٦٠٤-١٣٦٤.

دیسان ئەو (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێ هەڵ مەسن بۆنوێژ هەتا کاتێ کەوا من دەبینن دەێم بۆنوێژ). (ت/١/٣٨٠/٢- ش/ت)

٣٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنَاجِي رَجُلًا فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ). (الحديث ٦٤٢ ـ طرفاه في: ٦٤٣، ٦٢٩٢) [٣١٦]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا، لەگۆشەیەکی مزگەوتا، لەگەڵ پیاوێکا دانیشتبوو، دووبەدوو چپەیان دەکرد، هەر نەهات بەلای نوێژەوە هەتا هەندێ لەنوێژکەرەکان خەویان لێ کەوت، ئەوسا هەڵساو هات بەرنوێژی یەکەی بۆکردین).

## ڕوونکردنەوە:

پێشەوا عەسقەلانی لەفەتحولباریدا لەکۆتایی ئەم نامەیەدا دەفەرموێ: (نامەی بانگ برێتییە لەچل و حەوت فەرموودە، شەشیان تەعلیقن، بیست و سێیان دووبارەن، بیست و چواریان پوختەیانن، گشتیان پەسەندی پێشەوا موسلیمیشن، جگە لەم چوارەیان:

١- فەرموودەی ئەبوسەعیدا (لایسمع مدى صوت المؤذن).

٢- فەرموودەی موعاوییە (هكذا سمعنا من نبيكم).

٣- فەرموودەی جابیر (من قال حين يسمع النداء).

---

(٣١٦) أخرجه مسلم في الحيض، باب: الدليل على أن نوم الجالس لاينقض الوضوء رقم: ٣٧٦=٨٣١.

٤- فەرموودەی بیلال، کەباسی ئەوە دەکا بیلال لەکاتی بانگا دووپەنجەی خۆی دەخستە هەردوو کونەگوێی خۆی. وەدەفەرمووێ: سێ بیسراو (ئەثەر)یشی تیادایە کەلەیارانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بیسراون، یاگێڕدراونەتەوە. ا‌ه.

کەواتە: ٤٧+٣= ٥٠، لەم پەنجایە (بیستیان) لەتەجریدەکەدا هاتوون، لە: ژمارە (٣٥٠) هەتا (٣٦٦) لەگەڵ ڕەچاو کردنی ژمارە دووبارەکان و زیادەی ریوایەتەکان.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ١٥) نامەی جەماعەت و پێشنوێژی (كتاب الجماعة والإمامة)

٣٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ النَّاسَ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ). (الحديث ٦٤٤ ـ أطرافه في: ٦٧٥، ٢٤٢٠، ٧٢٢٤)[٣١٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) سەرنجی دا کەوا چەن کەسێ لەچەن نوێژێکا بۆماوەیەکە دیارنین. جا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەتووڕەیی فەرمووی: (بەوکەسە کەگیانی منی بەدەستە، نیازم هەبوو کەگاڵ بدەم گزرەدارێکی زۆر کۆبکرێتەوە کاتێکیش بانگ بوو، بەپیاوێ بڵێم کەبانگ بدا بۆ نوێژ ئەوجا بەپیاوێ بڵێم کەلەجیاتی خۆم بەرنوێژی یەکە بۆخەڵکەکە بکا، وەخۆشم بڕۆم بۆسەر ئەو پیاوانەکەلەنوێژی جەماعەت دوادەکەون، وەفەرمان بدەم کەبەباوشەدار ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنن،

(٣١٧) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل صلاة الجماعة، رقم: ٦٥١=١٤٧٩.

سوێندەم بەوکەسەی کەگیانی منی والەدەستا: ئەوانە ئەگەر گرتکێکی چەوریان لەمزگەوت گومان ببردایە دەهاتن بۆنوێژی خەوتنان بۆ مزگەوت هەتا بەبیانووی نوێژەکەوە گرتکەکەبخۆن، هەروا ئەگەر دوو سەنجووقیان لەمزگەوت شك ببردایە، کەسەنجوقێنیان پێ دەکرێ، دەهاتن بۆ نوێژکردن بۆ مزگەوت، بەوبیانووەوە). (ت/١/٣٧٥/١ ز-١٢٣ ژ-٧٤٩ = ش/د/ت/ ن)

٣٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضلُ صَلَاةَ الْفَذ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً). (الحديث ٦٤٥ طرفه في: ٦٤٩)[٣١٨]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی جەماعەت بەبیست‌و حەوت پلە گەورەترە لەنوێژی کەسێ کەهەربەتەنها خۆی بێ). (ت/١/٣٧١/٢ ز-١٢٢ ژ-٧٤٤ چ-٤ = ش/ت/ ن).

٣٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (تَفْضلُ صَلَاةُ الْجَمِيعِ صَلَاةَ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا وَتَجْتَمِعُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا). (الحديث ٦٤٨)[٣١٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (نوێژ بەکۆمەڵی لەگەڵ کۆمەڵدا بیست‌و پێنج جار خێرترە لەنوێژی کەسێ کەبەتەنها خۆی بێ، ئەو فریشتانەی کەلەشەودا پاسەوانی ئادەمیزادن لەگەڵ ئەو فریشتانەدا کەلەڕۆژدا نیگابانی ئەون لەکاتی نوێژی بەیانیان دا یەك دەگرن). پاشتر ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم قسەوباسەتان لەقورئانا پێ نیشان بدەم، فەرموون ئەم ئایەتە بخوێنن:

---

(٣١٨) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل صلاة الجماعة، رقم: ٦٥٠=١٤٧٥.
(٣١٩) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل صلاة الجماعة، رقم: ٦٤٩=١٤٧١.

(وقرآن الفجر إن قرآن الفجر كان مشهوداً) ئيسراء - ٧٨/١٧ - واته: وەنوێژی کاتی دەرکەوتنی سبەینێش بەجێ بهێنە، چونکە بەڕاستی نوێژی بەیانی فریشتە پۆل پۆل دێنە دیاری!) (ب/٦/٢٧٢/١٣ تاج-٤ ز-١٨ ژ-٣٩٦٣ ج-٤ = ب/ت).

٣٧٠-عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ). (الحديث ٦٥١) [(٣٢٠)]

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەردوم کاتێ دەڕۆن بۆ نوێژ هەتا ڕێگەکەیان دوورتر بێ پاداشیان گەورەترە، ئەوکەسەشی کەچاوەڕوانی نوێژ دەکا هەتا بەجەماعەت بیکا لەگەڵ پێشنوێژدا، ئەوە پاداشی گەڵێ گەورەترە لەوکەسەی کەنوێژەکەی دەکاو دەخەوێ). (ت/١/٣٧١/ ٣ ز-١٢٢ ژ-٧٤٤ = ش/د).

٣٧١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ). (الحديث ٦٥٢- طرفه في: ٢٤٧٢)

ثُمَّ قَالَ: (الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ وَالْمَبْطُونُ وَالْغَرِيقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالَ لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا لَاسْتَهَمُوا عَلَيْهِ). (الحديث ٦٥٣ أطرافه في: ٧٢٠، ٢٨٢٩، ٥٧٣٣).

(وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا). (انظر: ٣٥٧)[(٣٢١)]

---

(٣٢٠) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: فضل كثرة الخطأ إلى .. رقم: ٦٦٢=١٥١١.

ئەبوهورەيرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ بەڕێگەیەکا دەڕۆیی، لقێ دڕکی بینی لەسەر ڕێگەکە کەوتبوو، دووری خستەوە لەڕێگەکە، خودا لەسەرئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی باشی دایەوەو لێ ی خۆش بوو).

لەپاشتر فەرمووی: (ئەم پێنج کەسەیە شەهیدن: کەسێ بەتاعوون بمرێ شەهیدە، کەسێ بەدەردی ناوسك بمرێ شەهیدە، کەسێ لەئاودا بخنکێ شەیدە، کەسێ لەخەباتی ڕێگەی خودادا بکوژرێ شەهیدە) ا (ژمارە: ٣٥٧)

٣٧٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) ( أَنَّ بَنِي سَلِمَةَ أَرَادُوا أَنْ يَتَحَوَّلُوا عَنْ مَنَازِلِهِمْ فَيَنْزِلُوا قَرِيبًا مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعْرُوا الْمَدِينَةَ فَقَالَ: (أَلَا تَحْتَسِبُونَ آثَارَكُمْ) (الحديث ٦٥٦ طرفه في: ٦٥٥).[٣٢٢]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خێڵی بەنی سەلەمە،ماڵەکانیان لەقەراخ شارەوە بوو، دوور بوون لەمزگەوت، ویستیان خانووەکانیان بفرۆشن‌و لەمزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە نزیك ببنەوە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی پێ ناخۆش بوو، چونکە حەزی نەدەکرد کەدەوری شار چۆڵ بێ‌و پشتی مەدینە رووت ببێ. لەبەرئەوە نەیهێشتن‌و پێی فەرموون: (ئەی خێڵی بەنی سەلەمە! لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، چوونکە کەهاتووچۆی مزگەوت دەکەن شەقاو بەشەقاو پاداشتان بۆ دەنووسرێ). (ب/١/٣٤٦/١٢ ز-١١٤ ژ-٦٨٦ چ-٤ = ش).

---

(٣٢١) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: بيان الشهداء، وفى البروالصلة، باب فضل إزالة الأذى عن الطريق، رقم: ١٩١٤.

(٣٢٢) أخرجه مسلم عن جابر باب فضل الصلاة المكتوبة في جماعة وفضل انتضار الصلاة وكثرة الخطأ ـ المترجم = ١٥١٨.

٣٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَيْسَ صَلَاةٌ أَثقَلَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنْ الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا). (الحديث ٦٥٧)[٣٢٣]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هیچ نوێژێ وەك نوێژی بەیانیو نوێژی خەوتنان، زەحمەت نییە لەسەر شانی ناپاکەکان، کەلەزاراوی شەریعەتدا پێیان دەگوترێ: مونافیق، خۆئەگەر دەیانزانی خێری ئەم دوو نوێژە چەندە گەورەیە بەگاگۆڵکەیش بوایە دەهاتن بۆ جەماعەتەکەیان!). (بڕوانە: ژمارە: ٣٥٧)

٣٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ الْإِمَامُ الْعَادِلُ وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ). (الحديث ٦٦٠- أطرافه في: ١٤٢٣، ٦٤٧٩، ٦٨٠٦)[٣٢٤]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (حەوت تاقم هەن، خودا لەڕۆژی قیامەتدا، دایان دەنێ لەژێر سێبەری تەختو بارەگا (عەرش) ی خۆیدا، لەو ڕۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێکی ترنییە بێجگە لەسایەو سێبەری خودا خۆی،

**یەکەم:** پادشای عادڵو پێشەوای دادپەروەرو کاربەدەستی بەداد،

**دوەم:** لاوێ کەلەعیبادەتو خوداپەرستی دا قاڵ بووبێو پێ گەیشتبێو بەرەبەرە گەورەبووبێ،

---

(٣٢٣) أخرجه مسلم (فتح الباری/٢/٢٥٣ ـ خاتمة) ـ المترجم.

(٣٢٤) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل إخفاء الصدقة، رقم: ١٠٣١ = ٢٣٧٧.

**سێیەم**: پیاوێ کەدڵی ئالوودەی مزگەوت بێ،

**چوارەم**: دووکەس کەساخ لەبەر رەزای خودا یەکتریان خۆش بوێ، لەبەر رەزای خودا کۆببنەوەو هەر لەبەر رەزای خودایش لەیەکتر جیاببنەوە، لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان،

**پێنجەم**: پیاوێ کەئافرەتێکی خانەدانی خانوومانی شۆخو شەنگی جوان داوای ئیشی خراپی لێ بکاو خۆیی تەسلیم بکا، ئەویش نەیکاو پێی بڵێ: من ئیشی بێ شەرعی واناکەم، چونکە لەخودا دەترسم،

**شەشەم**: پیاوێ خێرێ بەپەنامەکی بکا، کەئەم دەستی بەودەستی نەزانێ،

**حەوتەم**: کەسێ کەبەتەنیا خۆی بێو یادی خودا بکاو فرمێسک بەچاوەکانیدا لەترسی خودا هۆن هۆن بێتەخوارەوە) (ت/١/٣٤٤/٧ــ ریاض/١/٣٦٢/٢ - ش/ت/ ن).

**روونکردنەوە:**

ئەم جۆرە هێمایانە واتایان وایە: (ت/١/٣٤٤/٧= تاج/ ١ ل/ ٣٤٤ فەرموودەی/ ٧) وشەی پیاو لەم فەرموودەیەدا بۆنموونەیە، لەبەرئەوە چەمكو مەفهوومی نییە، کەواتە: ئەم حەوت تاقمە ژنیش وەك پیاو دەگرێتەوە، بڕوانە: ژمارە: ١٣).

٣٧٥-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنْ الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ). (الحديث ٦٦٢).[٣٢٥]

---

(٣٢٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: المشى إلى الصلاة تمحى به الخطايا، رقم: ٦٦٩ = ١٥٢٢.

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (گشت جارێ کەکەسێ دەچێ بۆ مزگەوت، یالەمزگەوت دەگەڕێتەوە خودا لەبەهەشتا نانێ کەشایانی میوان بێ بۆی دروست دەکا).

٣٧٦-عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) ابْنِ بُحَيْنَةَ رجل من الأزدِ قَالَ: (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلًا وَقَدْ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَاث بِهِ النَّاسُ وَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ أَرْبَعًا الصُّبْحَ أَرْبَعًا). (الحديث ٦٦٣) [٣٢٦]

عەبدوڵڵای کوڕی مالیك (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەتی نوێژی بەیانی کرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) روانی واپیاوێ دوورکات نوێژی سوننەت دەکا، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆوە، نوێژکەرەکان دەورەیان لێ دا، حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) بەپیاوەکەی فەرموو: (چۆن شتی وادەکەی؟ ئەمە لەشێوەی ئەوەیە کەنوێژی بەیانی بەچوار رکات بکەی!).

٣٧٧- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا قَالَتْ: (لَمَّا مَرِض رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَضهُ الَّذي مَاتَ فِيهِ فَحَضرَتْ الصَّلَاةُ فَأُذنَ فَقَالَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ فَقِيلَ لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ إِذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ وَأَعَادَ فَأَعَادُوا لَهُ فَأَعَادَ الثالِثَةَ فَقَالَ إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى فَوَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ كَأَنِّي أَنْظرُ رِجْلَيْهِ تَخُطانِ مِنْ الْوَجَعِ فَأَرَادَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَتَأَخَّرَ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ مَكَانَكَ ثمَّ أُتِيَ بِهِ حَتَّى جَلَسَ إِلَى

(٣٢٦) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: كراهة الشروع في نافلة بعد شروع المؤذن... رقم: ٧١١ = ١٦٤٧.

جَنْبِهِ وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلَاتِهِ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ). (الحديث ٦٦٤)[٣٢٧]

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، کاتێ کەتەواو نەخۆشیەکەی کەشەنگ بوو، کاتێ نوێژ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بلێین بەئەبوبەکر، لەزمانی منەوە، بابەرنوێژییەکە بۆ مەردومەکە بکا) منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەبوبەکر پیاوێکی غەمگینی دڵ نەرمە، ئەگەر لەجێگەکەی تۆدا رابوەستێ دڵی گەرم دەبێو لەبەرگریان خۆی بۆ راناگیرێو ناتوانێ پێشنوێژیی بۆخەڵکەکە بکا، بەڵام عائیشە لەدڵەوە مەبەستی ئەوەبوو، کەباوکی لەم کاتی سەرەمەرگەدا لەجێگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمیحرابەکەدا نەوەستێ، نەبادا خەڵکەکە بلێن: ئەبوبەکر پێی رەش بوو. جادیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمایشتەکەی خۆی دووبارە کردەوە، عائیشەیش دیسانەوە قسەکەی خۆی دووبارە کردەوە، جابۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەری جاری سێیەما فەرمووی: (لەزمانی منەوە بەئەبوبەکر بلێن بالەجیاتی من بەرنوێژییەکە بۆ مەردومەکە بکا، ئێوەی ژنان وەك زلێخای یووسف وان، قسەی دەمتانو نیازی دڵتان لەیەك جیان!).

جائەبوبەکر رۆیشت بۆمزگەوت، لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشنوێژی یەکەی بۆخەڵکەکە کرد، وەچەند رۆژێ بەردەوام بوو لەسەرئەوە، هەتا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەمێ لەشی سووك بوو، رۆیشت بۆمزگەوت، دووپیاو چووبوونە ژێربالی، بەلارە لارە بردیان، دەڵێ ئێستایش والەبەرچاوم کەچۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرئازاری نەخۆشیەکەی هەردوو پێی بەسەر زەوییەکەدا بەخشکە بەکێش دەکرد، کاتێ

---

(٣٢٧) اخرجه مسلم في الصلاة باب: استخلاف الإمام إذا عرض له عذر، رقم: ٤١٨=٩٤٠.

ئەبوبەکر هەستی پێ کرد کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا ویستی جێگەکەی بۆچۆڵ بکاو بکشێتە دواوە، بەلاّم حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ئاماژەی بۆکرد: ومزع لەخۆت تێك مەدەو خەریکی کاری خۆت بە، ئەوجا پێغەمبەریان برد ڕێك لەئاستی ئەبوبەکر لەتەنیشتیەوە دانیشتو دەستی کرد بەنوێژکردن، ئیتر ئەبوبەکر بۆنوێژی خۆی پەیڕەویی پێغەمبەری دەکردو خەڵکەکەی تریش بۆنوێژی خۆیان پەیڕەویی نوێژەکەی ئەبوبەکریان دەکرد. لەگێڕانەوەیەکا: حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەلای چەپی ئەبوبەکرەوە دانیشت، بەلاّم ئەبوبەکر بەپێوە نوێژی دەکرد. (ت/١/٤٠٨/٣ ز-١٣٨ ژ-٨١٦ ج-٤) بڕوانە (ژمارە/١٤٦).

وعنها (رَضي اللهُ عَنْها) في ريواية: لما ثقُل النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) واشـتدَّ وجعه استأذن أزواجه أن يمرض في بيتي فأذن له. وباقي الحديث تقدم آنفا:

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆشییەکەی لەپێ ی خستو ئازارەکەی سەخت بوو، ڕوخسەتی لەهاوسەرەکانی خواست کەلەماڵی من بمێنێتەوەو لەوێ خزمەت بکرێ، هاوسەرەکانیشی ڕێگەی ئەوەیان دا. بڕوانە: ژمارە: ٣٧٧)

٣٧٨–عَنْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ الْحَارِث (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ فِي يَوْمٍ ذي رَدْغٍ فَأَمَرَ الْمُؤَذِنَ لَمَّا بَلَغَ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ قَالَ قُلْ الصَّلَاةُ فِي الرِّحَالِ فَنَظرَ بَعْضهُمْ إِلَى بَعْض فَكَأَنَّهُمْ أَنْكَرُوا فَقَالَ كَأَنَّكُمْ أَنْكَرْتُمْ هَذا إِنَّ هَذا فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي يَعْنِي النَّبِيَّ صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِنَّهَا عَزْمَةٌ وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ). (الحديث ٦٦٨ ـ طرفاه في: ٦١٦، ٩٠١) [٣٢٨]

عەبدوڵلاّی کوڕی حاریث (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) وتاری ڕۆژی هەینی خوێندەوە، هەورە ڕۆژو سەرماو سۆڵەو قوڕو لیتە

(٣٢٨) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها باب: الصلاة في الرحال رقم: ٦٩٩=١٥٩٨.

بوو، لەبەرئەوە فەرمانی کرد بانگدەرەکە کەگەیشتە سەر (حي على الصلاة) لە باتی ئەوە بڵێ: (الصلاة في الرحال) نوێژکەرەکانیش لەناو خۆیاندا تەماشای یەکتریان کرد، وەك بڵێ ی فەرمایشتەکەی ئیبنوعەباسیان بەدڵ نەبێ. بەلام ئیبنوعەباس فەرمووی: دەڵێ ی ئەمەتان بەلاوە پەسەند نییەو رەخنەتان لێ ی هەیە، بەلام ئەمە سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی، دیارە کە پێغەمبەر لەهەموو روویەکەوە لەمن باشترەو گشت کردارو گوتارێکی سەرمەشقە بۆ نەتەوەی. ئەوجا فەرمووی: بەڵێ راستە کەنوێژی هەینی فەرزی حەتمی یە، بەبێ بەهانەی رەوا نەکردنی دروست نییە، بەلام باران‌و قوڕو لیتە یەکێکن لەبەهانە رەواکانی نەکردنی نوێژی هەینی، لەبەرئەوە حەزناکەم بەگیرتان بهێنم‌و زۆرتان لێ بکەم کەهەردەبێ بێن بۆنوێژی هەینی!(٣٦٣)

٣٧٩-عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (قَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ إِنِّي لَا أَسْتَطِيعُ الصَّلَاةَ مَعَكَ وَكَانَ رَجُلًا ضَخْمًا فَصَنَعَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا فَدَعَاهُ إِلَى مَنْزِلِهِ فَبَسَط لَهُ حَصِيرًا وَنَضحَ طرَفَ الْحَصِيرِ فَصَلَّى عَلَيْهِ رَكْعَتَيْنِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ آلِ الْجَارُودِ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الضحَى قَالَ مَا رَأَيْتُهُ صَلَّاهَا إِلَّا يَوْمَئِذ). (الحديث ٦٧٠- طرفاه في: ١١٧٩، ٦٠٨٠)[٣٢٩]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری لەش قەبە، عەرزی حەزرەتی کرد: من لەبەرقەڵەوی ناتوانم بێم بۆ جەماعەت بۆ مزگەوتی تۆ، حەزدەکەم کەنانێکت بۆ دروست بکەم، تەشریف بهێنی بۆماڵی ئێمە، لەشوێنێکی تایبەتدا بۆ پیرۆزی‌و مووفەرکی نوێژ بکەی، تائەو شوێن نوێژەی تۆبکەم بەنوێژگا بۆخۆم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵێنی پێ یدا. ئەویش نانەکەی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دروست کرد، ئەوجا حەزرەتی بانگ کرد

---

(٣٢٩) من افراد البخارى (فتح البارى/٢/٢٥٣/٧٣١ ـ خاتمة) المترجم.

بۆماڵـەوەی، حەسـیرێکی لەگۆشـەیەکا بـۆ راخـستو قـەراخی حەسـیرەکەی ئاوپەرژێن کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەری دوورکـات نوێـژی سـوننەتی چێـشتەنگاوی بەجەماعـەت بـۆکردن. پیـاوێ لەبـەرەی جـاروود بەئەنەسـی فـەرموو: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی سـوننەتی چێـشتەنگاوی دەکـرد؟ فەرمووی: من بەش بـەحاڵی خـۆم هـەر لـەورۆژەدا دیومـە کەئـەو نوێـژە بکـا. (بڕوانە ژمارە: ٢٤٢، ٢٦٢ +٣٢ فیقهی ئاسان/١/١٧١+ت/٤٨٤ز - ١٧٩).

٣٨٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: (إِذا قُـدِّمَ الْعَشَاءُ فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلَاةَ الْمَغْرِبِ وَلَا تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ). (الحديث ٦٧٢ - طرفه في: ٥٤٦٣) [٣٣٠]

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر شێو دانرا دەستی پێ بکەن لـەپێش کردنـی نوێـژی شێوانا، وەهیچ پەلە لەشێوەکەتان مەکەنو نانەکـەتان بەشـێنەیی بەتـەواوی بخۆنو، ئەوسا نوێژەکەتان بکەن، وە هەروەها نوێـژەکانی تـریش). (ت/١/٣٠٠/١ ز-٩٨ ژ-٥٨٣).

٣٨١-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنها سُئِلَتْ: (مَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ تَعْنِي خِدْمَةَ أَهْلِهِ فَإِذا حَـضَرَتْ الصَّلَاةُ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ). (الحديث ٦٧٦- طرفاه في: ٥٣٦٣، ٦٠٣٩) [٣٣١]

ئەسـوەدی کـوڕی یەزیـد (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لەعائیـشەی هاوسـەری حەزرەتم پرسی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەماڵەوە دەبوو خـەریکی چـی دەبـوو؟ فـەرمووی: خـەریکی خزمـەتی خێزانەکـەی دەبـوو، ئیـشی ناومـاڵی

---

(٣٣٠) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: كراهة الصلاة بحضرة الطعام، رقم: ٥٥٧=١٢٤١.

(٣٣١) لاحظ (فتح الباری/٢/٢٥٣/٧٣١ - خاتمة) المترجم.

دەکرد، وەك ئـەوە چێشتی دەکـرد، گسکی دەدا، ئـاژەڵی دەدۆشی، جلی خۆی پینـەدەکرد، جلـی خـۆیی دەدۆزی، ئـالیکی دەدا بـەئاژەڵ، وشـتری ئەشـکێل دەکرد، درووماني دەکرد، پێڵاوی پینەدەکرد، خزمەتی خۆیی دەکـرد، لەگـەڵ کارەکەردا، لەبەر بێ هەوایی نـانو ئـاوی دەخـوارد، هـەویری لەگەڵدا دەشێلا، شمەکی خۆی لەبازاڕەوە دەهێنایـەوە، لەماڵـەوە ئەمـەکاری بـوو، بـەپێی بواری گونجاو خەریکی خزمەتی کەسوکاری بوو، کاتێکیش نوێژ دەبوو دەچوو بـەلای نوێژەوەو بەزوویی دەیکرد). (ریاض/٢/ ٥٥٠/ ٥ ز-٧١ ژ-٦٠٦).

٣٨٢-عَنْ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِث (رَضي اللهُ عَنـهُ) (إِنِّـي لَأُصَـلِّي بِكُـمْ وَمَـا أُرِيـدُ الصَّلَاةَ أُصَلِّي كَيْفَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ). (الحـديث ٦٧٧ ـ اطرافـه في: ٨٠٢، ٨١٨، ٨٢٤)[٣٣٢]

ئەبوقیلابە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: مـالیکی کوڕی حـووەیریـث (ڕەزای خوای لێ بێ) تەشریفی هـات بۆئـەم مزگەوتـەی ئێمـە لەبەصـرە، فـەرمووی: لەڕاسـتیدا مـن کەئەم نوێژەتان بەجەماعەت بۆدەکەم مەبەستم زاتی نوێژەکـە نییـە، بـەڵکوو دەمـەوێ لەبەرچـاوی ئێـوە نوێـژ بکـەم وەك پێغەمبـەر خـۆی (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد لەبەرچاوی ئێمە، هەتا ئێوەیش نوێژ بەجوانی فێربن).

## روونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە روونترین بەڵگەیە لەسەر ئەم مەبەستانە:

١- فێر کردن بەکردار گەلێ جار، لەبارترە لەفێرکردن بەگوتار.

٢- سوننەتە نوێژکەری تازە لەسەرئەم شێوە فێر بکرێ.

٣- راگـەیێن (مبلـغ: واوێـژ: دەنگـەوەر) کارەکـەی دروسـتە، زیـان لـەخودی پەرستییەکەی نادا.

---

(٣٣٢) من افراد البخاري (فتح الباري/ ٢/٢٥٣/٧٣١ ـ خاتمة) المترجم.

٤- ئەم جۆرە کارە، کەبۆنی هاوبەشی کردنی لەخودا پەرستیدا لێ دێ، بەم جۆرە کارە ناگوترێ هاوبەشی کردن لەپەرستشدا، کەلە زاراوەی شەرع دا پێی دەگوترێ (التشريك في العبادة).

٥- رابەری حەج و موطەوویف و رابەری سەردان (موزەووير)و پێشنوێژو ئەو جۆرە کەسانە، کەلەپاڵ کردنی ئەم پەرستی یانەدا، دەبن بەسەرمەشق و مامۆستا، بۆکەسانی تری نوێکار، وەك ئەوەبەدەنگی بەرز هەندێ وشەو رستە دەڵێن، تاپەیڕەوەکانیان چاویان لێ بکەن و وەك ئەوان هەمان شت بڵێن، یابکەن، ئەم جۆرەکەسانە کارەکەیان دروست و قەبوولە، لەسوننەت سەرچاوە هەڵدەگرێ.

٦- کەسێ لەگەڵ ئەنجامدانی عیبادەتدا، کەزاتی کردنی ئەو عیبادەتە ساخ بۆڕەزای خودابێ، ئەگەر مەبەستێکی تری رەوای هەبێ دروستە، وەك کاسبی کردن لەکاتی حەج و عەمرە کردندا، وەك وەرگرتنی کرێ لەسەر فێرکردنی قورئان و خەتمەو شتی تری لەم بابەتە، وەك بۆ پیرۆزی و موففەڕکی جێگە، بڕوانە: (٣٧٩، ٢٤٢، ٢٦٢,٢٤١).

٣٨٣- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا قَالَتْ: (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي مَرَضِهِ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ قَالَتْ عَائِشَةُ قُلْتُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعْ النَّاسَ مِنْ الْبُكَاءِ فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ قُولِي لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعْ النَّاسَ مِنْ الْبُكَاءِ فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَهْ إِنَّكُنَّ لَأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ مَا كُنْتُ لِأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا (الحديث : ٦٧٩ طرفه في: ١٩٨).[٣٣٣]

(٣٣٣) انظر رقم (٣٧٧) المترجم.

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بێ‌و سەروماڵ‌و حاڵ‌و مناڵ‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرئاستانەی ئارامگای نازدارو پیرۆزی بێ فەرمووی: (لەزمانی منەوە فەرمان بەئەبوبەکر بکەن کەپێشنوێژییەکە بۆخەڵکەکە بکا) منیش عەرزیم کرد: ئەبوبەکر پیاوێکی دڵ نەرمە، کەلەجێگەی تۆدا رابوەستێ، دڵی گەرم دەبێ‌و لەبەر گریان نوێژکەرەکان گوێیان لەدەنگی نابێ، کەواتە فەرمان بکە بە عومەر کە نوێژ بۆ خەڵکەکە بکا، هەروا بەحەفصەی هەوێمم گوت: عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکە: کەئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە، کەلەجێگەکەی تۆدا ڕابوەستێ دڵی گەرم دەبێ‌و لەبەرگریان نوێژکەرەکان گوێ یان لەدەنگی نابێ، کەواتە: فەرمان بەعومەر بکە کەنوێژەکان بۆمەردومەکە بکا. حەفصەیش ئەمەی عەرز کرد، حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (وسبە! بێ گومان ئێوەی ژنان وەك زلێخای یووسف وان، قسەی دەمتان وەك نیازی دڵتان لەیەکترجیان! لەزمانی منەوە فەرمان بەئەبوبەکر بکەن، کەبەرنوێژییەکە بۆ موسوڵمانان بکا). جا حەفصە بەعائیشە دەفەرموێ: قەت نەبوو لەتۆوە تووشی خێر ببم).

٣٨٤- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيُّ (رَضي اللهُ عَنْـهُ) (أَنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَعِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الِاثْنَيْنِ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلَاةِ فَكَشَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتْرَ الْحُجْرَةِ يَنْظُرُ إِلَيْنَا وَهُوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ ثُمَّ تَبَسَّمَ يَضحَكُ فَهَمَمْنَا أَنْ نَفْتَتِنَ مِنْ الْفَرَحِ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ وَظَنَّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَارِجٌ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَشَارَ إِلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَتِمُّوا صَلَاتَكُمْ وَأَرْخَى السِّتْرَ فَتُوُفِّيَ مِنْ يَوْمِهِ). (الحديث ٦٨٠- أطرافه في: ٦٨١، ٧٥٤، ١٢٠٥، ٤٤٤٨) [٣٣٤]

---

(٣٣٤) أخرجه مسلم في الصلاة باب: استخلاف الإمام إذا عرض له عذر رقم: ٤١٩=٩٤٢.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەونەخۆشینەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر بەرنوێژی بۆمەردوم دەکرد، ڕۆژی دووشەممە لەنوێژدا ریز بووبووین، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆی لادا، کەلەسەر ژووری مزگەوت بوو، تەماشایەکی بەدڵو بەکوڵی کردین، دیمەنێکی گەڵ شیرینو ڕەنگین بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپێوە وەستا بوو سەرنجی ئێمەی دەدا، دیاربوو بۆدواجار ئۆمەتەکەی لەژیانیدا بەسەردە کردەوەو، مالاوایی لەیارانی دەکرد، ڕەنگو روخساری لەبەرگەشیو نازداری لەرەنگو روخساری نەخۆشی نەدەکرد، بەڵکوو دەتگوت پەڕەی گوڵو رووپەڕەی قورئانە، نوور لەڕوخساری دەتکاو گوڵو گەوهەرو جەوهەری لێ دەباری، ئینجا زەردەخەنەیەکی کردو پێکەنی، جاکاتێ پێغەمبەرمان لەسەرئەم حاڵە بینی، لەخۆشییانا خەریك بووین بپەشۆکێینو وەختەبوو گەشکە بمان گرێو نوێژەکە بەجێ بهێڵین! جائەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) وایزانی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دێ بۆنوێژ لەبەرئەوە پاشەو پاش گەڕایەوە دواوە، تابچێتە ناو ڕیزەکەوەومیحرابەکە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆڵ بکا، بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهاتو بەدەستی ئاماژەی بۆکردین: کەنوێژەکەتان تەواو کەن، ئینجا دیسان پەردەکەی دادایەوە، ئیتر هەر ئەوڕۆژە گوڵ لەگوڵشەن بڕاو یار لەیاران دابڕاو، خۆری زانستو حیکمەت مالاوایی کرد لەگۆی زەویو دانیشتووەکانی، وەسەر رووی خاك خۆزگەی خواست بەناو توێی خاك، وەگوڵ خۆزگەی خواست بەگڵ، وە پێغەمبەری نازدار، ئەوکێوی نوروعیلمو عیرفانە کۆچی دوایی ی کردو نوبووەتو پێغەمبەرایەتی کۆتایی هاتو دەرگای وەحیو سرووش مۆرکرا. (تاج/ ١/٤٠٩/٥ = ز-١٣٨ ژ-٨١٨ = ش).

٣٨٥-عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضي اللّهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذهَبَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ فَحَانَتْ الصَّلَاةُ فَجَاءَ

الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ أَتُصَلِّي لِلنَّاسِ فَأُقِيمَ قَالَ نَعَمْ فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ فِي الصَّلَاةِ فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ فَصَفَّقَ النَّاسُ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لَا يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ امْكُثْ مَكَانَكَ فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَدَيْهِ فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ذَلِكَ ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذ أَمَرْتُكَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ مَا كَانَ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمْ التَّصْفِيقَ مَنْ رَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ فَإِنَّهُ إِذا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ). (الحديث ٦٨٤ ـ أطرافه في: ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٠)[٣٣٥]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووبۆناو هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف، بۆناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە، کاتێ نوێژبوو، بانگدەر کەبیلال بوو، هات بۆلای ئەبوبەکر عەرزی کرد: ئەگەر قامەت بکەم بەرنوێژییەکە دەکەی بۆخەڵکەکە؟ فەرمووی: بەڵێ، دەیکەم، جاکەئەبوبەکر نوێژی دابەست پاش کەمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە، هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەیەکە دڕی بەڕیزەکان دا، تاخۆی گەیاندە ڕیزی یەکەمو لەوێ وەستا، خەڵکەکە دەستیان کرد بەچەپڵە لێدان، ئەبوبەکریش عادەتی نەبوو کەلەناو نوێژدا لابکاتەوە بەڵام کەدی خەڵکەکە چەپڵەیەکی زۆر لێ دەدەن ئەویش

(٣٣٥) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: تقديم الجماعة من يصلى بهم إذا تأخر الإمام، رقم: ٤٢١=٩٤٨.

ئاوڕی دایەوەو پێغەمبەری بینی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆی کرد: کەلەشوێنی خۆت بمێنەرەوەو نوێژەکەمان بۆتەواوکە. بەلام ئەبوبەکر هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو سوپاسی خودای کرد لەسەر ئەم دەستی خێرەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوی نا، ئنجا پاشەو پاش گەڕایەوە دواوە، هەتا ڕێك چووە ناو ڕیزەکەوەو لەوێ وەستا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشکەوتو بەرنوێژییەکەی کرد، کەلەنوێژەکە بۆوە فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی ئەبوبەکر کەفەرمانم پێ کردیت بۆنەمایتەوە لەشوێنی خۆت؟ ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆمن نەهاتووە کەپێش تۆبکەوم ئەی پێغەمبەری خودا! ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەنوێژکەرەکانی فەرموو: (ئەوە بۆئەو گشتە چەپڵەیەتان لێ دا، هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ ڕوویدا بابڵێ سوبحانەڵڵاە، چونکە کەسوبحانەڵڵای کرد، ئیتر تێ دەگەن لەمەسەلەکە، وەلێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بۆژنانە). (ت/١/٤٠٦/١ ز-١٣٨ ژ-٨١٤ = ش/د/ ن).

٣٨٦-عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (لما ثقُلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَصَلَّى النَّاسُ قُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ قَالَ ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ قَالَتْ فَفَعَلْنَا فَاغْتَسَلَ فَذهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَلَّى النَّاسُ قُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ قَالَتْ فَقَعَدَ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ أَصَلَّى النَّاسُ قُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ فَقَعَدَ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ أَصَلَّى النَّاسُ فَقُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُونَ النَّبِيَّ عَلَيْهِ السَّلَام لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ بِأَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فَأَتَاهُ الرَّسُولُ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَكَانَ رَجُلًا رَقِيقًا يَا عُمَرُ صَلِّ بِالنَّاسِ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ

تِلْكَ الْأَيَّامَ ثُمَّ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ لِصَلَاةِ الظهْرِ وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَنْ لَا يَتَأَخَّرَ قَالَ أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ قَالَ فَجَعَلَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي وَهُوَ يَأْتَمُّ بِصَلَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاعِدٌ). (الحديث ٦٨٧ طرفه في: ١٩٨).[٣٣٦]

**عائیشه** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەچەند ڕۆژێ لەپێش مەرگی پێغەمبەردا** (درودی خودای لەسەر بێ) **کاتێ نەخۆشینەکەی قورس بوو، موسوڵمانان لەمزگەوت خڕبوونەوە بۆجەماعەتی نوێژی خەوتنان، حەزرەت** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: (ئەرێ مەردوم نوێژیان کرد؟) عەرزمان کرد: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە، بەرنوێژییەکەیان بۆبکەی. فەرمووی: (لەسوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما لەحەوت کوندەکە دەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە) عائیشە فەرمووی: ئێمەیش وامان کر، کەخۆی شۆرد ئەزنەکی دا هەڵسێ بەڵام نەیتوانیو بوورایەوە، کەهۆشی هاتەوە فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە کەبەرنوێژییەکەیان بۆبکەی. فەرموویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاوبکەن بەسەرما). عائیشە فەرمووی: جالەناو سوێنەکەدا دانیشت، دیسان کەخۆی شۆرد ئەزنەکی دا، ویستی هەڵسێ بەڵام نەیتوانیو دیسانەوە بوورایەوە، لەپاش کەمێ کەهۆشی هاتەوە هەمدیسان فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەو، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە کەخۆت بەرنوێژیەکەیان بۆبکەی. فەرموویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاوبکەن بەسەرما) جالەناو سوێنەکەدا دانیشت، هەمدیسانەوە کەخۆی شۆرد**

(٣٣٦) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: استخلاف الامام إذا عرض له عذر رقم: ٤١٨ = ٩٣٥.

ئەزنەکی دایەوە کەهەڵسێ‌و بچێ بۆ مزگەوت پێشنوێژییەکە بۆخەڵکەکە بکا، بەڵام نەیتوانی‌و هەمدیس بوورایەوە، لەپاشتر کەهۆشی هاتەوە دیسان فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژیان کرد یانا؟). عەرزمان کردەوە: نەخێر هێشتا نوێژیان نەکردووە، لەمزگەوت گلێر بوونەتەوە، چاوەنواڕی تۆیانە کەتەشریفت بچێ پێشنوێژەیەکەی خەوتنانیان بۆبکەی.

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فروستادەیەکی نارد بۆلای ئەبوبەکر، کەپێشنوێژیی بۆ موسوڵمانان بکا، کاتێ فروستادەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانەکەی پێغەمبەری بەئەبوبەکر ڕاگەیاند، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرم بوو، لەبەرئەوە بەعومەری کوڕی خەتابی فەرموو: ئەی عومەر! تۆجەماعەتەکە بۆ موسوڵمانان بکە، عومەریش پێی فەرموو: تۆشایانتری بۆئەمە جائەبوبەکر ئەو چەند ڕۆژە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆشییەکەی گران بوو جەماعەتی بۆ موسوڵمانان دەکرد، هەتا ڕۆژێ.... بڕوانە: ژمارە: ٣٧٧، ٣٨٣، ٣٨٤، ٢٤٦).

٣٨٧-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ فَصَلَّى جَالِسًا وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ اجْلِسُوا فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وإذا صلى جالساً فَصَلوا جلوساً). (الحديث ٦٨٨ ـ أطرافه في: ١١١٣، ١٢٣٦، ٥٦٥٨).[٣٣٧]

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری ئەسپێ گلا، سکاڵای لەدەست ئەم حاڵەبوو، لەماڵەکەی مندا بەرنوێژی بۆکۆمەڵێ لەیارانی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، کۆمەڵەکەیش لەپشتیەوە بەپێوە وەستان،

(٣٣٧) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: ائتمام المأموم بلامام، رقم: ٤١٢=٩٣٠ شيحا.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆکردن: (کەئێوەیش دانیشن) جاکاتێ لەنوێژەکەی لێ بۆوە فەرمووی: (پێشنوێژ بۆیە کراوە بەپێشنوێژ هەتا بکرێ بەپێشەواو سەرمەشق و چاوی لێ بکرێ، کەواتە هەرکاتێ پێشنوێژ چووبۆ چەمینەوەو روکوعی برد، ئێوەیش یەکسەر بچەمێنەوەو روکوع ببەن، وەهەرکاتێ ئەو لەچەمینەوە یالەکڕنووش سەر بەرزەوە دەکا ئێوەیش بەشوێن ئەودا سەر بەرزەوە بکەن، وەهەرکاتێ ئەوبەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەیش بەدانیشتنەوە نوێژبکەن) (ت/١/٣٩٠/١ = ز-١٣٠ ژ-٧٧٧ چ-٤).

٣٨٨-عَنْ الْبَرَاءُ ينْ عاذبْ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا قَالَ سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَقَعَ النَّبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاجِدًا ثمَّ نَقَعُ سُجُودًا بَعْدَهُ). (الحديث ٦٩٠ - طرفاه في: ٧٤٧، ٨١١).[٣٣٨]

بەرائی کوڕی عاذیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەدەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) ئیتر ئێمە رادەوەستاین و هەتا ئەو نەچوایە بۆکڕنوش ئێمە بۆی دانەدەوینەوە، ئەو کڕنووشی دەبرد ئێمەش لەپاش ئەوەوە دەچووین بۆ کڕنوش.

٣٨٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ أَوْ لَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللّٰهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أَوْ يَجْعَلَ اللّٰهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ). (الحديث ٦٩١)[٣٣٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوکەسەتان کەلەجەماعەتا لەپێش پێشنوێژدا، سەرلەچەمینەوە (روکوع) یالەکوڕنووش بەرزدەکاتەوە، ئەدی ئەوە چۆن لەوە ناترسێ کەخودا لەسەر

---

(٣٣٨) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: متابعة الامام والعمل بعده، رقم: ٤٧٤=١٠٦٣.

(٣٣٩) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: تحريم سبق الامام بركوع أو سجود رقم: ٤٢٧=٩٦٣.

ئەو پەلە پەلە، سەری بکا بەسەری کەر) یا فەرمووی: (کەخودا شکلّی بکا بەشکلّی کەر).

٣٩٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنْ اسْتُعْمِلَ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ). (الحديث ٦٩٣- طرفاه في: ٦٩٦، ٧١٤٢).(٣٤٠)

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەمیشە بەگوێی فەرمانڕەواکانی خۆتان بکەن‌و لەفەرمانیان دەرمەچن، ئەگەر چی بەندەیەکی ڕەشی حەبەشیش بێ، کەسەری بەقەد دەنکە مێووژێ بێ). (ت/٣/٢٧٨/٣ = ز-١٠٥ ژ-٢٤٢٢، ٢٤٢٣).

٣٩١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُصَلُّونَ لَكُمْ فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ). (الحديث ٦٩٤).(٣٤١)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێشنوێژ (ئیمام)ەکانتان بەرنوێژیتان بۆ دەکەن، جائەگەر بەباشی کردیان ئەوا پاداشی باشی بۆ ئێوەیش‌و بۆ ئەوانیشە، خۆ ئەگەر بەباشی نەیان کرد، ئەوا پاداشی باشی بۆ ئێوەیەو گوناهەکەی بۆئەوانە!)(ت/١/٣٨٥/٣=ز-١٢٧ژ-٧٦٥).

٣٩٢- عن ابن عباس (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: بڕوانە: (٩٦,١٣٨).

٣٩٣-عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ مُعَاذ بْنُ جَبَلٍ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ فَصَلَّى الْعِشَاءَ فَقَرَأَ بِالْبَقَرَةِ فَانْصَرَفَ الرَّجُلُ فَكَأَنَّ مُعَاذا تَنَاوَلَ مِنْهُ فَبَلَغَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ فَتَّانٌ فَتَّانٌ فَتَّانٌ ثَلَاث مِرَارٍ أَوْ قَالَ فَاتِنًا فَاتِنًا فَاتِنًا وَأَمَرَهُ بِسُورَتَيْنِ مِنْ أَوْسَط الْمُفَصَّلِ). (الحديث ٧٠١ أطرافه في: ٧٠٠، ٧٠٥، ٧١١، ٦١٠٦).(٣٤٢)

(٣٤٠) أخرجه مسلم في طريق غندر (انظر فتح/٢/٢١٩/٦٩٣) المترجم.

(٣٤١) هذا الحديث انفرد به البخارى (عينى/٥/٢٢٨/٨٥) المترجم.

(٣٤٢) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في العشاء، رقم: ٤٦٥=١٠٤٠.

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: موعاژی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستووری وابوو، لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتی دەکرد، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆناو هۆزەکەی خۆیو بەرنوێژیی ئەو نوێژەی بۆ ئەوان دەکرد، جاشەوێ لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتی نوێژی خەوتنان دەکا، ئەوسا دەگەڕێتەوە بۆناو هۆزەکەی خۆی کەبەنی سەلەمە بوو، وەپێشنوێژیی خەوتنانیان بۆدەکا، لەپاش فاتیحە سورەتی بەقەرە لەرکاتی یەکەمدا دەحوێنێ، پیاوێکیش لەبەر درێژەکێشانی نوێژەکە، نوێژەکەی بڕیو لەجەماعەتەکە کشایەوە، وەك بڵێی موعاذ گلەیی لەم کارەی ئەم پیاوە کردبێ وابوو، گلەی یەکەی موعاذ دەگاتەوە بەپیاوەکە پیاوەکە سکاڵای ئەم حاڵە لەخزمەت پێغەمبەردا دەکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار لەسەریەك، بۆ ئاگادار کردنەوەی موعاذ کەشتی وانەکاو، بەنوێژی دوورو درێژ، خەڵك لەجەماعەت نەتەکێنێتەوە، پێی فەرموو: (سەر لەنوێژکەرەکان دەشێوێنی!).

٣٩٤-عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا قَالَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذ ثمَّ قَالَ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ فَإِنَّ فِيهِمْ الضعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ). (الحديث ٧٠٢ طرفه في: ٩٠).

ئەبومەسعوود (بڕوانە ژمارە: ٧٨).

٣٩٥- عَنْ جابر بنْ عبدالله (رَضي اللهُ عَنْهُما) حديث معاذ، وأن النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ لَهُ: ( فلولا صليت بسبح ربك، والشمس و ضحاها، والليل إذا يغشى). (انظر: ٣٩٣)

لەگێڕانەوەی ئێرەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەموعاذ دەفەرموێ: ( ئەی موعاذ! ئەوە بۆچی لەجیاتی سوورەتی بەقەرە یەکێ لەم سوورەتە کورتانەت

نەخوێند، سوورەتی (سبح اسم ربك الاعلى) یاسوورەتی (والشمس وضحاها) یاسوورەتی (والليل إذا يغشى) یاسوورەتێکی تری وەك ئەمانە)

٣٩٦- عَنْ أَنَس (رَضي اللهُ عَنْهُما) قالَ: (كانَ النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يوجزُ الصلاة و يكملها). (الحديث ٧٠٦) (٣٤٣)

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: نوێژێکی کورتی بەپوختیو بەتەواوی دەکرد).

٣٩٧-عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنِّي لَأَقُومُ فِي الصَّلَاةِ أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ). (الحديث ٧٠٧ ـ طرفاه في: ٨٦٨) (٣٤٤)

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕێ دەکەوێ کەدەست دەکەم بەنوێژ دەمەوێ درێژی بکەمەوە، بەڵام کەدەنگی گریانی منالێ دەبیستم، کەدایکەکەی لەپشت منەوە نوێژ دەکا، ئیتر نوێژێکی سووکەڵەی پوختو تەواو دەکەمو، درێژی ناکەمەوە، مەبادا بەدرێژ کردنەوەی نوێژەکە، دایکی ئەو مندالە سەخڵەت بکەم). (ت/١/٣٨٤/٢ ز-١٢٧ ژ-٧٦٤ = ش/د/ ت/ ن).

٣٩٨-عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ). (الحديث ٧١٧). (٣٤٥)

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخودا ڕیزەکانتان ڕێك دەخەنو لەڕیزی نوێژدا ڕێكو ڕاست

(٣٤٣) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: امر الأمة بتخفيف الصلاة في تمام، رقم: ٤٦٩=١٠٥٣.
(٣٤٤) لاحظ (فتح البارى/٢/٢٥٣/٧٣١ ـ خاتمة) المترجم = ١٠٥٤ شيحا.
(٣٤٥) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: أمر الأئمة بتخفيف الصلاة في تمام، رقم: ٤٦٩=٩٧٧.

رادەوەستن یاخوود ئەگەر ئەوە نەکەن، خودا رووتان تاقو لۆق دەکاو، دژایەتیو ناکۆکیو دووبەرەکی دەخاتە ناوتانەوە).(ت/١/٣٩٨/١ = ز-١٣٤ ژ-٧٩٣).

٣٩٩-عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي). (الحديث ٧١٩ - طرفاه في: ٧١٨، ٧٢٥).[٣٤٦]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قامەتی نوێژکرا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رووی تێ کردینو فەرمووی: (ڕیزەکانتان راست بکەنەوەو پاڵ بدەن بەیەکتری یەوە، چونکە من لەپشتی سەریشمەوە چاوم لێتانەو سوور دەزانم کەڕیزەکانتان ناڕێکە، لەبەرئەوە فەرمانتان پێ دەکەم کەئەوهەڵەیە راست بکەنەوە، دەنا خودا تۆڵەی ئەوناڕێکییەتان لێ دەستێنێ!). (ت/١/٣٩٨ = ز-١٣٤ ژ-٧٩٦).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن: قسەکردن لەنێوانی قامەتو نوێژدابەستن دا دروستە، ڕێکخستنی ڕیزەکانی نوێژ پێویستە، واتە: فەرزە، هەروا پڕکردنەوەی کەلێنو کەلیو بۆشایی ناوڕیز، موعجیزەیەکی گەورەی تیادایە کەئەوەیە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپشت سەریشیەوە وەك بەردەمی خەڵکی بینیوە.

٤٠٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ فِي حُجْرَتِهِ وَجِدَارُ الْحُجْرَةِ قَصِيرٌ فَرَأَى النَّاسُ شَخْصَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ فَأَصْبَحُوا فَتَحَدَّثُوا بِذلِكَ فَقَامَ اللَّيْلَةَ الثَانِيَةَ فَقَامَ مَعَهُ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ صَنَعُوا ذلِكَ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثا حَتَّى إِذا كَانَ بَعْدَ

(٣٤٦) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: تسوية الصفوف وإقامتها...، رقم: ٣٤٣=٩٧٥.

ذِلكَ جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَخْرُجْ فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَلِكَ النَّاسُ فَقَالَ إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُكْتَبَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ). (الحديث ٧٢٩ ـ أطرافه في: ٧٣٠، ٩٢٤، ١١٢٩، ٢٠١١، ٢٠١٢، ٥٨٦١) [٣٤٧]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەشەوەکانی ڕەمەزان، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەهۆدەکەی خۆیا، دەستی کردبەشەونوێژ، دیواری هۆدەکە نزم بوو، لەبەرئەوە خەڵکەکە تارمایی و جموجوولی پێغەمبەریان لەناو نوێژەکەیا دەدی، ئیتر چەند پیاوێ هەڵسان لەپشتیەوە پەیڕەوی (ئیقتیدا) یان پێ کردو، دەستیان کرد بەشەو نوێژکردن لەگەڵیدا بەجەماعەت، کاتێ ڕۆژ بۆوە خەڵك لەناو خۆیانا ئەم باسەیان بۆیەکتری گێڕایەوە، بۆیە لەشەوی دووەما خەڵك زۆرتر گردەوەبوون و پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشەوی دووەما دەستی کردەوە بەشەونوێژ، دیسانەوە کۆمەڵێ پیاو لەپشت پێغەمبەرەوە دەستیان کردەوە بەجەماعەت. جایا دوو شەو یاسێ شەو ئەم شەونوێژەیان لەسەر ئەم شێوەیە کرد، ئیتر لەوەبەدوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشت و نەچوو بۆ نوێژگاکە، جابۆسبەینێ خەڵکەکە لەم بارەیەوە گوفتوگۆیان ئەنجام دا، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هۆی ئەوەی کەئەم شەو بەرنوێژیم بۆنەکردن دەترسم کەئەم جۆرە شەونوێژە فەرز بکرێ لەسەرتان). (ت/٢/٩٥/٢ ز-٣٧ ژ-١٣٤٨ = ش/د).

٤٠١- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اتَّخَذَ حُجْرَةً قَالَ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ مِنْ حَصِيرٍ فِي رَمَضَانَ فَصَلَّى فِيهَا لَيَالِيَ فَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَلَمَّا عَلِمَ بِهِمْ جَعَلَ يَقْعُدُ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ قَدْ عَرَفْتُ

---

(٣٤٧) أخرجه مسلم، لاحظ (فتح/٢/٢٥٢/ ـ ٧٣١ ـ خاتمة، عينى/٥/٢٦٢/١١٧/١١٨/ ١١٩) المترجم=١٧٨٠، ١٧٨١.

الَّذي رَأَيْتُ مِنْ صَنِيعِكُمْ فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ فَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَاةِ صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ). (الحديث ٧٣١ طرفاه في ـ ٦١١٣، ٧٢٩٠) [(٣٤٨)]

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەڕەمەزانا کۆختێ دروست دەکا، راوی فەرمووی: وادەزانم کە فەرمووی: لەحەسیر، جا چەند شەوێ لەو کۆختەدا شەونوێژدەکا، کۆمەڵێ لەیارانی نوێژی تەراویح لەپشتیەوە دەکەن، جاکاتێ حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەم حاڵەی یارانی دەزانێ وازدێنێ، ئەوانیش دەنگ هەڵ دەبڕنو سوبحانەڵڵا دەکەنو زیخ دەگرنە دەرگاکە، تا حەزرەت تەشریف بێنێو نوێژی تەراویحیان بۆبکا، تەشریفی دەرچوو هات بۆلایان، پێی فەرموون: (حاڵی بووم لەداواکەتان، بەقەستی نەهاتم، ئەی موسوڵمانینە! لەماڵەوەتان شەونوێژو نوێژی سوننەت بکەن، چونکە نوێژی فەرزی لێ دەرچێ خێرترین نوێژی پیاو، ئەو نوێژەیەتی کەلەماڵی خۆیا دەیکا). (ت/١/٥٠٧/١ = ز-٣٧ ز-١٣٤٨).

## ڕوونکردنەوە:

پێشەوا عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەفەتحولباریدا، لەکۆتایی ئەم نامەیەدا دەفەرموێ: (ئەم نامەیە بریتییە لەسەدو بیستو دوو فەرموودەی بەرزەوە بوو (حەدیثی مەرفووع) نەوەدوشەشیان پەیوەستن، نەوەدیان دووبارەن، سیو دوویان پوختەیانن، هەموویان پەسەندی پێشەوا موسلیمیشن جگە لەم نۆ فەرموودەیە:

١- فەرموودەی ئەبوسەعید، سەبارەت بەگەورەیی جەماعەت (صلاة الجماعة تفضل).

---

(٣٤٨) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب صلاة النافلة في بيته، رقم:٧٨١=١٧٨٠، ١٧٨١.

٢- فەرموودەی ئەبودەرداء: (ما أعرف شيئاً...).

٣- فەرموودەی ئەنەس: (كان رجل من الأنصار ضخماً).

٤- فەرموودەی مالیكی كوڕی حووەیریث: (إني لأصلي وما أريد...).

٥- فەرموودەی ئیبنوعومەر: (لما قدم المهاجرون).

٦- فەرموودەی ئەبوهورەیرە: (يصلون فإن أصابوا).

٧- فەرموودە بێ ڕشتەكەی نوعمان سەبارەت بەڕیزەكانی نوێژی جەماعەت.

٨- فەرموودەی ئەنەس (كان أحد يلزق منكبه).

٩- فەرموودەكەی تری: (ما أنكرتم شيئاً إلا أنكم لاتقيمون الصفوف).

وە دەفەرموێ: حەڤدە بیسراو (ئەثەر) یشی تیادایە، هەر حەڤدەیان بێ ڕشتەن، واتە: تەعلیقن، تەنیا بیسراوەكەی ئیبنوعومەر نەبێ، كە دەفەرموێ: (كان يأكل قبل أن يصلي) هەروا بیسراوەكەی عوثمان: (الصلاة أحسن مايعمل الناس) چونكە ئەم دووە پەیوەستن: واتە: مەوصوولن، ئەم بیسراوانە هەیانە هی صەحابی یە، هەیانە هی تابیعی یە) كەواتە: ١٢٢+١٧= ١٣٩. لەم (١٣٩) یە سیی‌و پێنجیان لەتەجریدەكەدا هاتوون لەژمارە: ٣٦٧ هەتا ژمارە: ٤٠١. لەگەڵ ڕەچاوكردنی دابەش كردنی فەرموودەی ژمارە: ٣٧١ بەسێ ژمارەی جیا جیا لەفەتحولباریدا.

چەن بەهرەیە كەلەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ:

١- نوێژی سوننەت بۆپیاوو ژن لەماڵەوە خێرترە، جگە لەونوێژانەی كەسوننەتە بەكۆمەڵ بكرێن، وەك نوێژی هەردوو جەژن‌و نوێژەبارانەو نوێژی خۆرگیران‌و مانگ گیران، ئەم نوێژانە لەدەرەوەی ماڵەوە خێرترن.

٢- بنەما (ئەصل) ی نوێژی تەراویح‌و كردنی بەجەماعەت لەمزگەوت‌و كردنی لەماڵەوە بەتەنیا، لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ.

٣- كردنی نوێژی سوننەت لەماڵەوە لەبەرئەم هۆیانەیە: چونکە نهێنی ترەو دوورترە لەریابازای‌و دوورترە لەپووچبوونەوەی پاداشەکەی، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا ماڵەکەی پێ فەڕدار دەبێ‌و میهرەبانی‌و رەحمەتی بەسەردا دەبارێ‌و فریشتە هاموشۆی ئەو ماڵە دەکەن، شەیتان لێ ی دوور دەکەوێتەوە.

٤- هەرنوێژێ دەق هەبێ لەسەر جێگەو کات‌و هۆی، مەرج نیە کردنی لەماڵا خێرتربێ، وەك سڵاوی مزگەوت‌و نوێژی طەواف‌و سوننەتی ئیحرام دابەستن، نوێژێ هۆی تایبەتی هەبێ وەك سڵاوی دەسنوێژ، سوننەتی زەوال، وەکی تریش نوێژی ماڵەوە دەبێ بەسەرمەشق بۆکەسانێ کەکەمتر هاتوچۆی مزگەوت دەکەن، وەك: ژن‌و کۆیلەو نەخۆش‌و ئەمانە.

زەیدی کوڕی ثابیتی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) یەکێ بوو لەزانا شەرعزانە ناودارەمەزنەکانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرائیز زانێکی گەورەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترین فەرائیز زانتان، کەشارەزایی هەبێ لەفرائیزدا زەیدی کوڕی ثابیتە). زەید قورئانزانێکی گەورەیش بوو، هەرلەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانی لەبەربوو، زەید یەکێ بوو لەنووسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاغەزی بۆ دەنووسی بۆخەڵك‌و کاغەزی خەڵکیشی بۆ دەخوێندەوە، یەکێ بوولەنووسەرانی سرووش، لەسەرفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی عیبری کەزمانی جوولەکەیە، لەماوەیەکی زۆرکەما فێربوو، بەپازدە ڕۆژ زمانی عیبری بەشارەزایی فێربوو، زمانی سەریانیش بەحەڤدە رۆژ فێربوو، لەسەردەمی جێنشینی ی ئەبوبەکردا، بەفەرمانی ئەبوبەکر، لەسەر راوێژی عومەر(رەزای خوایان لێ بێ) قورئانی کۆکردەوە، لەبەر مێردمنداڵی لەغەزای بەدردا ئامادەنەبوو، بەڵام ئامادەی غەزای ئوحودبووە، دەڵێن: لەخەندەقا بەکۆڵ خۆڵی خەندەقەکەی دەگواستەوە، پێغەمبەر کەبینی پێی فەرموو: (بەڕاستی ئەم کوڕە کوڕی چاکە). دەڵێن: لەدووبابەتا زەید باڵادەست بووە بەسەر

مەردوم دا: لەقورئانو لەفەرائیزدا. مەسرووق دەفەرموێ: چووم بۆمەدینە، روانیم وازەیدی کوڕی ثابیت یەکێکە لەزانا هەرە پایەبەرزەکان.

دەڵێن: لەناو خێزانی خۆیدا زۆر رووخۆشو مەشرەب خۆش بووە، بەڵام لەناو کۆڕو مەجلیس دا زۆر سەلارو سەنگین بووە.

جارێ لەکاتی سوواربونی وڵاخا، ئیبنوعەباس ئاوزەنگی یەکەی بۆدەگرێ، زەید پێی دەفەرموێ: ئەی ئامۆزای نازداری پێغەمبەر! ئەوە شایانی شانی تۆنییە، دەی ئاوزەنگیەکە بەردە). ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: نا، ئێمە ئاوا رەفتار لەگەڵ زانایانو گەورەپیاوان دەکەین. کۆمەڵێ فەرموودە لەزەیدەوە دەگێڕنەوە، لەهاوڕێیان: ئەبوهورەیرەو ئەبوسەعیدو ئیبنوعومەرو ئەنەسو کەسانی تریش، لەپەیڕەوان (تابعین): سەعیدی کوڕی موسەیەبو دوو کوڕەکەی خۆی خاریجەو سولەیمانو کەسانی تریش.

زۆرینەدەڵێن: ساڵی چلو پێنجی کۆچی مردووە، کەدەمرێ ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: (ئەمرۆ مەلای گەورەی نەتەوەی ئیسلام مرد، ئومێدە کەئیبنوعەبباس جێگای بگرێتەوە. حەسسانی کوڕی ثابیتیش بەم شیعرە لاواندیەوە:

فمن للقوا في بعد حسان وابنه؟
ومن للمعاني بعد زيد بن ثابت؟

واتە:

شیعر پاش حەسسان هەتیو دەکەوێ
مەعانیش پاش زەید، گەر راستت دەکەوێ

بڕوانە: تاج/٢/١/٣٣١/٥ = تاج-٤ ز-٩٤ ج-٤ ژ-٣٦٨٤ هەتا ٣٦٨٦.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ١٦) نامەی چۆنێتیی نوێژ (كتاب صفة الصلاة)

٤٠٢– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنْ عُمَر (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذوَ مَنْكِبَيْهِ إِذا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ وَإِذا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ وَإِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذلِكَ أَيْضا وَقَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ وَكَانَ لَا يَفْعَلُ ذلِكَ فِي السُّجُودِ). (الحديث ٧٣٥ ـ أطرافه في: ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩).[٣٤٩]

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: سەرنجم دەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئەڵلاهوئەكبەر نوێژی دادەبەست، وەلەوكاتەدا هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە، تاپشتی هەردوو دەستی دەگەیشتنە بەرابەر هەردووشانیو، سەرپەنجەكانی دەگەیشتنە ئاستی نەرمەی گوێكانی وەكاتێ دەچوو بۆچەمینەوە دیسانەوە ئەڵلاهوئەكبەری دەكردو دیسان بەوچەشنە دەستەكانی بەرز دەكردەوە، وەكاتێ لەچەمینەوە هەڵ دەسایەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) دیسان لەم كاتەیش دا هەردوو دەستی بەهەمان چەشن بەرز دەكردەوە تائاستی هەردوو سەرشانەكانی، ئەوجا دەیفەرموو: (ربنا ولك الحمد) بەڵام كاتێ كووڕنوشی دەبردو لەوكاتەدا كەسەری لەكوڕنوش هەڵدەبڕی ئەڵلاهوئەكبەری دەكرد بەڵام دەستی بەرز نەدەكردەوە. (ت/١/٢٥٥ ز-٧٣ ژ-٤٨٦ چ-٤).

٤٠٣– عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ). (الحديث ـ ٧٤٠)[٣٥٠]

---

(٣٤٩) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: استحباب رفع اليدين حذو المنكبين... رقم: ٣٩٠-٨٥٩ — ٨٦٢.

(٣٥٠) من أفراد البخاري (عينى/٥/٢٧٨/١٢٨) وله أصل في صحيح مسلم (ج/٤/١١٤) باب وضع يده اليمين على اليسرى. لاحظ فتح الباري/ ٢/٤٠٩/٨٧٤ ـ خاتمة ـ المترجم.

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەرفەرمانی خۆی فەرمان بەموسوڵمانان دەکرا، لەکاتی ڕاوەستانا، بۆخوێندنی فاتیحەو خوێندنی دوا فاتیحە، بەدەستی ڕاستیان مووچی دەستی چەپیان بگرن). (بڕوانە: فیقهی ئاسان/١/١٥٠ز- ٦٢)

٤٠٤- عَنْ أَنس (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أنَّ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وأبابكر و عمر (رَضِي اللهُ عَنْهُما) كانوا يفتتحون الصلاة: بالحمدلله رب العالمين). (الحديث ٧٤٣).[٣٥١]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و ئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) بەخوێندنی سوورەتی (الحمد لله رب العالمين) دەستیان دەکرد بەنوێژ.

٤٠٥-عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ (يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً فَقُلْتُ بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللّهِ إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ؟ قَالَ أَقُولُ اللّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَوْبُ الْأَبْيَض مِنْ الدَّنَسِ اللّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثلْجِ وَالْبَرَدِ). (الحديث رقم: ٧٤٤ في فتح الباري شرح صحيح البخاری).[٣٥٢]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، لەدوای ئەڵلاهوئەکبەری نوێژ دابەستن لەپێش دەست کردن بەخوێندنی فاتیحە، ئێست (سكته خفيفه: وێستانێکی کەم) ی دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەباوکم و دایکمەوە بەقوربانت بم لەم ئێستەدا

(٣٥١) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: حجة من قال لايجهر بالبسملة، رقم: ٣٩٩=٨٩٠.

(٣٥٢) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: مايقال بين تكبيرة الإحرام والقراءة رقم: ٥٩٨=١٣٥٣.

بەنهێنی چی دەخوێنی؟ فەرمووی: دەڵێم: (اللهم باعد بينی وبين خطايای كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقنی من خطايای كما ينقی الثوب الأبيض من الدنس، اللهم اغسل خطايای بالماء والثلج والبرد): خودایە! لەگوناه دوورم بخەرەوە وەك دووریی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، خودایە! لەگوناه پاکم بکەرەوە وەك پارچەیێ بلووری ی سپی ی بێ گەرد، خودایە! گوناهەکانم بەئاوو بەبەفرو بەتەرزە پاك پاك بشۆرەوە). (ت/١/٢٥٧/١ ز-٧٤ ژ-٤٩٢ چ-٤ = ش/د/ن).

**روونکردنەوە:**

نزای سەرەتای نوێژ چەند شێوەیەکی هەیە، ئەم نزایە یەکێکە لەوشێوانە، بۆزانینی ئەو شێوانە بڕوانە: (فیقهی ئاسان/١/١٥٢ز-٦٢).

ئێستا لەناو شافیعی مەزهەبەکانا واباوە، لەنێوانی ئێستێ پاش ئامین و لەنێوانی خوێندنی سورەتدا، پێشنوێژ بەنهێنی ئەم نزایە والەم فەرموودەیەدا دەخوێنێ، هەتا پاش نوێژەکان لەخوێندنی فاتیحە دەبنەوە، یاقورئان بەنهێنی دەخوێنێ، ئەوسا دەست دەکا بە سوورەت.

٤٠٦-عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (صَلَّى صَلَاةَ الْكُسُوفِ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ ثمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ ثمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ ثمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ ثمَّ رَفَعَ ثمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ ثمَّ رَفَعَ ثمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ ثمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ ثمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ ثمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ ثمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ ثمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ ثمَّ رَفَعَ ثمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ ثمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ قَدْ دَنَتْ مِنِّي الْجَنَّةُ حَتَّى لَوْ اجْتَرَأْتُ عَلَيْهَا لَجِئْتُكُمْ بِقِطَافٍ مِنْ قِطَافِهَا وَدَنَتْ مِنِّي النَّارُ حَتَّى قُلْتُ أَيْ رَبِّ وَأَنَا مَعَهُمْ فَإِذَا امْرَأَةٌ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ تَخْدِشُهَا هِرَّةٌ قُلْتُ مَا شَأْنُ هَذِهِ قَالُوا حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعًا لَا أَطْعَمَتْهَا وَلَا أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ مِنْ خَشِيشِ أَوْ خَشَاشِ الْأَرْضِ).

(الحديث ٧٤٥ ـ طرفه في: ٢٣٦٤) [٣٥٣]

---

(٣٥٣) أخرجه مسلم في كتاب الكسوف (عينى/٥/٢٩٧/١٣٣) المترجم = ٢٠٨٦-٢٠٨٨.

ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا نوێژی خۆرگیرانی بەکۆمەڵی لەناو مزگەوتا بۆ موسوڵمانان کرد، ماوەیەکی دوورودرێژ لەناو نوێژەکەدا بەڕاوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، ئینجا چەمی یەوەو روکووعی بردو درێژەی دا بەچەمینەوەکەی، ئەوجا لەچەمینەوە هەڵسایەوەو گەلێ بەپێوە ڕاوەستایەوەو قورئانی خوێندەوە، بەڵام لەڕاوەستانی یەکەمی کەمتر، ئینجا دووبارە رووکوعێکی دوورو درێژی تریشی بردەوە، بەڵام لەرووکوعی یەکەمی کەمتر، ئەوسا سەری لەچەمینەوە بەرزەوەکرد، ئەوجا دوو کوڕنووشی دوورودرێژی برد لەچەشنی دوو روکووعەکەی، یەکەم وەك یەکەمو دوەم وەك دووەم، ڕکاتی یەکەم تەواو، ئنجا چی کرد لەڕکاتی یەکەمدا لەڕکاتی دووهەمیشدا ئەوەی کردەوە، دوو ڕاوەستانو دوو چەمینەوەو دوو کوڕنووشی لەسەر شێوەی ڕکاتی یەکەم ئەنجام دا، ئەو لەنوێژ بۆوەو خۆریش بەربوو بوو. جا وتارێکی دا بۆ مەردومەکەو سوپاسو ستایشی خودای کردو فەرمووی: (.. وابەهەشتم لێوە نزیکەوە بوو، ئەگەر زاتم بکردایە هێشوویەکم لەمیوەکەی دەهێنا بۆتان بەڵام زاتم نەکرد چونکە بۆئەوە پرسم بە پەروەردگارم نەکردبوو، وەوایش دۆزەخم لێ نزیکەوە بوو، تەنانەت ترسم لێ نیشتو گوتم: ئەی پەروەردگارم! بۆچی منیش لەگەڵیانم؟

کەڕوانیم واژنێك پشیلەیێ تێ ی بەربووە، بەچڕنووك دەیرووشێنێو پێستەکەی دادەماڵێ، گوتم: ئەم ژنە لەسەرچی ئەم پشیلەیە وەهای لێ دەکا؟! فەرموویان: کاتی خۆی لەجیهانا، ئەم ژنە ئەم پشیلەیەی حەپس کردووە بەری نەداوە هەتا لەبرسانا مردووە، نەژنەکە خۆی خواردنی پێ داوەو نەبەرەڵای کردووە کەبۆخۆی لەجڕو جانەوەری زەوی بخوات). (ت/١/٤٦٣/٢ ز-١٦٦ ژ-٩٢١ چ-٤ = ش/د/ ت/ ن) + (فیقهی ئاسان/١/ ٢٤٠ - ز- ٦٩ هەتا ز- ٩٨).

## روونكردنەوە:

لەم فەرموودەیەوە ئەم چەند شتە دەردەكەون:

١- نوێــژی خــۆرگیران ســوننەتێكی گەورەیــە، ســوننەتە بەكۆمــەڵی بكــرێ، لەمزگەوتا بكرێ، خۆرگیران و مانگ گیران ئایەت و نیشانەن بۆتەخویف و هەڕەشەن، واباشە لەوكاتەدا خەڵك تەوبەو ئیستغفارو نزا بكەن، خێروچاكە بكەن.

٢- بەهەشت و دۆزەخ ئێستا دروست كراون و هەن، ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

٣- ئازاردانی گیانلەبەر دروست نیە، مەگەر زیانەخرۆبێ، لەڕۆژی قیامەتا گیانلەبەری ستەمبار تۆڵەی خۆی لەوكەسە دەستێنێ كەلەجیهان دا زۆرو ناهەقی لێ دەكا. وەك دەفەرموێ: (خوا هەقی بزنی كۆڵ لەبزنی شاخدار دەستێنێ).

٤- موعجیزەیەكی گەورەی تیایە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) .

٤٠٧- عَنْ خَبَّابٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قيل لَهُ: (أَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الظهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ نَعَمْ قُلْنَا بِمَ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ ذاكَ قَالَ بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ). (الحديث ٧٤٦ ـ أطرافه في: ٧٦٠، ٧٦١، ٧٧٧).[٣٥٤]

گوتیان بەخەباب (ڕەزای خوای لێ بێ) بەچیدا دەتانزانی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی نیوەڕۆو عەصردا سورەت لەپاش فاتیحەوە دەخوێنێ؟ فەرمووی: بەجووڵانەوەی ڕیشیا. (ت/١/٣/٢٦٥ ز-٧٨ ژ-٥٠٣ چ-٤).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

خەبابی كوڕی ئەرەتت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەموسوڵمانە هەرەپێشینەكانە، ئازاری زۆری چەشتووە لەسەر ئیسلامەتی، زۆربەی شەڕو شەڕگاكانی ئیسلامەتی

(٣٥٤) لاحظ (فتح البارى/٢/٤٠٩/٨٧٥) ـ المترجم.

چووه، سیی‌و دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری پێنجیانی گێڕاوەتەوە، لەسەردەمی نەزانیدا ئاسنگەر بوو شمشێری دروست دەکرد، خەبباب دەیفەرموو: جارێ لەسەر ئیسلامەتی ئاگرێکیان کردەوە بۆم، ئەوجا ڕایان کێشام بەسەریدا، بەرەبەرە چەوری‌و بەزی پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە! پشتی بەهۆی ئەو سووتاندنەوە چاڵ‌و چوێڵ بوو بوو. تەمەنی شەست‌و سێ ساڵ بوو، پێشەوا عەلی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد. (بڕوانە: ت/١/٥١٦/٤/ ز- ١٩١)

٤٠٨ -عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلَاتِهِمْ فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذلِكَ حَتَّى قَالَ لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ). (الحديث ٧٥٠).[355]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەبەرچی هەندێ کەس لەنوێژا چاو هەڵدەبڕن بۆئاسمان بۆوا دەکەن بۆ؟!) ئیتر حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم بارەیەوە گەلێ بەتوندی هەڕەشەی کرد، تەنانەت فەرمووی: (دەبێ واز لەمکارە ناشرینە بهێنن، ئەگینا کەبێ گومان کوێر دەبن). (ت/١/٢٩٦/١ ز-٩٦ ژ-٥٧٢ = ش/د/ ن). لەتاجا گفتەی موسلیم ئاوایە: (کەسانێ کەلەنوێژا چاویان هەڵ دەبڕن بەرەو ئاسمان، یادەبێ واز لەم کارە ناپەسەندە بهێنن یابێ گومان چاویان کوێردەبێ).

٤٠٩ - عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (سَأَلْتُ رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ). (الحديث ٧٥١ ـ طرفه في: ٣٢٩١)[356]

---

(٣٥٥) رواه مسلم عن جابر بن سمرة وأبى هريرة، باب النهى عن رفع البصر إلى السماء في الصلاة، شرح صحيح مسلم للنووى ج/٤/ ص ١٥٢. لاحظ عينى/١٣٨/٣٠٩/٥) وفتح/٢/٢٧٣/٧٥٠/ونفى الفتح في الخاتمة ص ٤٠٩ إخراج مسلم لهذا الحديث ـ المترجم = ٩٦٥، ٩٦٦. مسلم. شيحا.

(٣٥٦) من أفراد البخارى (فتح/٢/٤٠٩/٨٧٥ ـ خاتمة) ـ المترجم.

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا لە پێغەمبەرم پرسی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە لێ دزینەوەیە شەیتان دەیفڕێنێ لەنوێژی بەندە!). (ت/١/٢٩٧/٢ ز-٩٦ ژ-٥٧٣ = ب/ن/ د).

٤١٠-عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَ: (شَكَا أَهْلُ الْكُوفَةِ سَعْدًا إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَعَزَلَهُ وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ عَمَّارًا فَشَكَوْا حَتَّى ذَكَرُوا أَنَّهُ لَا يُحْسِنُ يُصَلِّي فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَقَالَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ إِنَّ هَؤُلَاءِ يَزْعُمُونَ أَنَّكَ لَا تُحْسِنُ تُصَلِّي قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ أَمَّا أَنَا وَاللَّهِ فَإِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي بِهِمْ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَخْرِمُ عَنْهَا أُصَلِّي صَلَاةَ الْعِشَاءِ فَأَرْكُدُ فِي الْأُولَيَيْنِ وَأُخِفُّ فِي الْأُخْرَيَيْنِ قَالَ ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ فَأَرْسَلَ مَعَهُ رَجُلًا أَوْ رِجَالًا إِلَى الْكُوفَةِ فَسَأَلَ عَنْهُ أَهْلَ الْكُوفَةِ وَلَمْ يَدَعْ مَسْجِدًا إِلَّا سَأَلَ عَنْهُ وَيُثْنُونَ مَعْرُوفًا حَتَّى دَخَلَ مَسْجِدًا لِبَنِي عَبْسٍ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ أُسَامَةُ بْنُ قَتَادَةَ يُكْنَى أَبَا سَعْدَةَ قَالَ أَمَّا إِذ نَشَدْتَنَا فَإِنَّ سَعْدًا كَانَ لَا يَسِيرُ بِالسَّرِيَّةِ وَلَا يَقْسِمُ بِالسَّوِيَّةِ وَلَا يَعْدِلُ فِي الْقَضِيَّةِ قَالَ سَعْدٌ أَمَا وَاللَّهِ لَأَدْعُوَنَّ بِثَلَاث اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ عَبْدُكَ هَذا كَاذِبًا قَامَ رِيَاءً وَسُمْعَةً فَأَطِلْ عُمْرَهُ وَأَطِلْ فَقْرَهُ وَعَرِّضهُ بِالْفِتَنِ وَكَانَ بَعْدُ إِذا سُئِلَ يَقُولُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَفْتُونٌ أَصَابَتْنِي دَعْوَةُ سَعْدٍ قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ فَأَنَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ قَدْ سَقَط حَاجِبَاهُ عَلَى عَيْنَيْهِ مِنْ الْكِبَرِ وَإِنَّهُ لَيَتَعَرَّض لِلْجَوَارِي فِي الطرُقِ يَغْمِزُهُنَّ). (الحديث ٧٥٥ ـ طرفاه في: ٧٥٨، ٧٧٠).[٣٥٧]

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خەڵکی کووفە لەلای عومەری کوڕی خەططاب (رەزای خوای لێ بێ) سکاڵایان لەسەعدی کوڕی ئەبووەقاص کرد، ئەویش لەسەرکار لای بردو عەمماری کوڕی یاسیری کرد بەسەرکاریان، سکاڵایەکی زۆریان لێ کرد، تەنانەت دەیانگوت: سەعد نازانێ نوێژیش بەجوانی بکا. ئیتر عومەر (رەزای خوای لێ بێ) ناردی بەشوێنی داو پێی فەرموو: ئەی

(٣٥٧) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في الظهر والعصر، رقم: ٤٥٣.

ئەبوئیسحاق! ئەمانە دەڵێن: گوایە تۆ هەتا نوێژیش بەجوانی نازانی بکەی! ئەویش فەرمووی: وەڵێ بەخودا من زۆر بەجوانی بەرنوێژیم بۆدەکردن، ڕێك وەك بەرنوێژیکردنی حەزرەت خۆی کەکاتی خۆی بۆئێمەی دەکرد، یەك دەنکم لێ کەم نەدەکردەوە، کەنوێژی شێوان و خەوتنان دەکەم لەڕکاتی یەکەم و دوەمیان دا رادەوەستم و فاتیحە دەخوێنم و لەپاش فاتیحە قورئانێکی زۆر دەخوێنم، وەڵێ لەڕکاتەکانی تریاندا قورئانخوێندنی پاش فاتیحە کورت دەکەمەوە، عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی باوکی ئیسحاق ئەوە بیروباوەڕی هەمووکەسێکە بەتۆ کەئاوا بەجوانی نوێژبکەی.. جابۆدڵنیایی، پیاوێ (یاچەند پیاوێکی) لەگەڵ سەعددا نارد بۆ کووفە، کەلەبارەی سەعدەوە لەخەڵکی کووفە بپرسێ، ئەویش مزگەوت نەما لەکووفە کەلەبارەی سەعدەوە پرسیاریان لێ نەکا، هەموو وەسپ و پەسنی سەعدیان دەکردو تاریفی باشیان دەکرد، هەتا گەیشتنە مزگەوتەکەی بەنی عەبەس، لەوێ پیاوێکیان هەڵسا، ناوی ئوسامەی کوڕی قوتادەبوو، کەسناوی ئەبوسەعدە بوو، هەستا گوتی: چونکە داوای شایەتیمان لێ دەکەی، دەسا من ئاگام لێ بێ سەعد ئەم سێ خراپەی هەبوو:

یەکەم: سەعد لەسوپا خۆی دەدزیەوەو لەگەڵیان دا نەدەچوو بۆبەرەی شەڕ،

دووەم: لەتالانی و بەخشیش دا شتی وای بەیەکسانی دابەش نەدەکردو خۆمانە خۆمانەی دەکرد،

سێیەم: لەدادپرسی و موحاکەمەیش دا دادپەروەرنەبوو.

سەعدیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی وای لێ هات! دەسا بەخودا منیش ئەم سێ نزایەت لێ دەکەم، هۆ خودایە! ئەگەر ئەم بەندەیەی تۆ درۆزنەو درۆدەکاو ئەم قسانەی بۆ ڕیایی دەکاو، بۆچاوەو ڕووپایی هەڵساوە ئەم قسانە دەکا، ئەوا تۆ خۆت تۆڵەی منی لێ بستێنەو لەباتی ئەم سێ بوختانە تووشی

ئـەم سێ سزایەی بکـە: یەکـەم: تەمـەنی درێژکـە. دووەم: بەدرێـژیی تەمـەنی هەژارو نەدارای بکە. سێیەم: تووشی ئاژاوەیشی بکە. ئـیتر کـابرا ڕێـك نزاکـەی سەعدی لێ گیرابوو، لەوەدوا کەلەئەبوسەعدەیان دەپرسی: چۆنیت؟ دەیگوت: پیرەمێدێکی دێوانەو شێتۆلکەم نزاکەی سەعدی کوڕی وەقاصم لێ گیرابووە.

عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر کەلـەجابیری کـوڕی سـەموورەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەم داستانە دەگێڕێتەوە دەفـەرموێ: لـەوەدوا مـن ئـەو کابرایـەم دەدی، لەبـەر پیریـی برۆکـانی بەسەرچاوەکانی دا شـۆڕبوو بوونـەوە، کەچـی هێـشتا ڕێگـەی بەگچان‌و کەنیزان دەگرت‌و چرنووکی لێ دەگـرتن!). (ریـاض/٣/١٠٨٨/ز- ٣/٢٥٣ = بەرگی-٣ ز-٢٥٣ ژ-١٥٠٣ = ش).

## ڕوونکردنەوە:

جـابیری کـوڕی سـەموورە خـۆی‌و بـاوکی هـاوڕێ ی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) بـوون، سەدوچل‌و شـەش فـەرموودەی هەیـە، دوانیـان پەسـەندی هـەردوو پـیرن، واتـە: شـێخی بوخـاری‌و شـێخی موسـلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئـەو دوو فەرموودەیـەیان گێڕاوەتــەوە. بیــست‌و شــەش فــەرموودەی تــری لەموسـلیم دا هەیــە. جـابیر خوشـکەزای سـەعدی کـوڕی ئەبووەقاصـە. لەفەرموودەیـەکا جـابیر دەفـەرموێ: (شـەوێ مانگەشـەو بـوو، لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووم، دەسـتێ جلـی سـووری لەبــەردا بــوو، سـەرنجی ئـەوو سـەرنجی مانگەکـەم دا، لەبەرچـاوم ئـەو گـەڵ لەمانگەکـە جـوانتر بـوو). لەفەرموودەیـەکی تـردا دەفـەرموێ: (سـەد جـار زیـاتر لەخزمەت پێغەمبەردا دانیشتووم) لەفـەرموودەی دروسـت دا، هـاتووە دەفـەرموێ: (لەدووهەزارجار زیاتر نوێژم بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە).

٤١١ –عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰـهِ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ). (الحديث ٧٥٦).[٣٥٨]

---

(٣٥٨) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة...، رقم: ٣٩٤=٨٧٢.

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەنوێژدا، لەهەموو ڕکاتێکدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێ، نوێژەکەی دروست نییە). (ت/١/٢٤٦/٣ ز-٧٢ ژ-٤٧١ = ش/د/ت/ ن).

٤١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَدَّ وَقَالَ ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ فَرَجَعَ يُصَلِّي كَمَا صَلَّى ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ثَلَاثًا فَقَالَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي؟ فَقَالَ إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْدِلَ قَائِمًا ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا). (الحديث ٧٥٧ ـ أطرافه في: ٧٩٣، ٦٢٥١، ٦٢٥٢، ٦٦٦٧) [(٣٥٩)]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆمزگەوت، پیاوێکیش کەناوی خەللادی کوڕی رافیع بوو - هاتەژوورەوەو نوێژی کردو چووبۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و سلاوی لێ کرد، ئەویش سلاوەکەی ی سەندەوەو فەرمووی: (بچۆرەوەو نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کەتۆ کردت) تاسێ جار پیاوەکە نوێژەکەی دەکردەوەو پێغەمبەریش دیسانەوە هەروای پێ دەفەرمووەوە، تالەسەری جاری سێیەمدا پیاوەکە گوتی: بەوخودایەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست لەمەباشتر نازانم، دەی ئەی پێغەمبەری خوا! بفەرموو نوێژم فێربکە. ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کەڕاوەستای بۆنوێژ لەپێشا نوێژ دابەستەوبلێ: ئەللاهوئەکبەر، ئنجا چەندمت بۆدەلوێ - لەو قورئانەی کەلەبەرتە - بیخوێنە، ئەوجا بچەمێرەوەو ئەوەندە لەچەمینەوە (روکووع) دا بمێنەرەوە هەتا لەشت

(٣٥٩) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة، رقم: ٣٩٧ = ٨٨٢.

لەجموجووڵ دەکەویۆ ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا ڕێك هەڵسەرەوەو پشت هەڵبڕە تارەپ رادەوەستیت، ئنجا دانەویۆ بۆ کورنوش و کورنووش بەرەو ئەوەندە لەکوورنووش دا بمێنەرەوە تائەندامەکانت ئارام دەگرن و جەستەت لەجموجووڵ دەکەوێ، ئەوجا سەرلەکورنووش بەرزکەرەوەو تاقنج دادەنیشیت، ئنجا دیسانەوە کورنووشێکی تری وەك کورنووشی یەکەم ببەرەوە، ئیتر هەموو ڕکاتەکانی تر هەتاسەر بەم شێوەیە بکەو، لەهەموو کاتێکا لەنووێژا ئەمەکارت بێ). (ت/١/٢٤٥/٢ ز-٧٢ ژ-٤٧٠ = ش/د/ ت/ ن).

٤١٣-عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلَاةِ الظهْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ يُطَوِّلُ فِي الْأُولَى وَيُقصِّرُ فِي الثانِيَةِ وَيُسْمِعُ الْآيَةَ أَحْيَانًا وَكَانَ يَقْرَأُ فِي الْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ وَكَانَ يُطوِّلُ فِي الْأُولَى وَكَانَ يُطوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَيُقَصِّرُ فِي الثانِيَةِ). (الحديث ٧٥٩ - أطرافه في: ٧٦٢، ٧٧٦، ٧٧٨، ٧٧٩)[٣٦٠]

ئەبوقەتادە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو لەڕکاتی یەکەم و لەڕکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحەو سوورەتێکی تری دەخوێند ئەو سوورەتە لەپاش فاتیحاوە کە لەرکاتی یەکەما دەیخوێند، درێژتربوو لەو سوورەتەی کەلەڕکاتی دووەما دەیخوێند، جارجارەیش دەنگی ئەوەندە بەرز دەکردەوە کەئایەتەکە دەبیسرا، لەنوێژی عەسریشا هەرەوای دەکرد، لەرکاتی یەکەمی بەیانیشا سوورەتی درێژتری دەخوێند لەسوورەتی رکاتی دووەم. (ت/١/٢٦٥/٢ ز-٧٨ ژ-٥٠٢ = ش/د/ ن).

٤١٤-عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ قَالَ: (إِنَّ أُمَّ الْفَضلِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَقَالَتْ يَا بُنَيَّ وَاللَّهِ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ إِنَّهَا

(٣٦٠) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في الظهر والعصر، رقم: ٤٥١=١٠١٢.

لَآخِرُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ). (الحديث ٧٦٣ ـ طرفه في: ٤٤٢٩) [٣٦١]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ سوورەتی (والمرسلاة عرفا) م دەخوێند، ئوم فەضل گوێ ی لێ بوو، فەرمووی: ( ڕۆڵە! بەخودا بەخوێندنی ئەم سورەتە ئەوەت یادخستمەوە کەئەم سوورەتە ئاخرەمین شت بوو، گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی شێوانا دەیخوێند. (ت/١/٢٦٧/١ ز-٨٠ ژ-٥٠٧ = ش/د/ ت/ ن).

ئوم فەضل دایکی ئیبنوعەباسە، خوشکی مەیموونەی کچی حاریثی هاوسەری پێغەمبەرە. عەرزی حەزرەت دەکا: قوربان لەخەوما بینیم کەئەندامێ لەئەندامەکانی تۆ لەماڵی منابوو؟ فەرمووی: ( ئەوە فاطیمەی کچم کوڕێکی دەبێ تۆشیری پێ دەدەیت، جا کە حوسەین ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ لەدایك دەبێ، ئوم فەضل دەیبا بۆ لای خۆی‌و شیری دەداتێ).

٤١٥– عَنْ زَيْدُ بْنُ ثابِتٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: سَمِعْتُ: النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ في المغرب بِطولَى الطولَيَيْنِ). (الحديث ٧٦٤).[٣٦٢]

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی شێوانا درێژترینی دووسوورەتە هەرە درێژەکانی دەخوێند).

## ڕافەو شیکردنەوە:

ڕاجیایی هەیە لەوەداکە مەبەست لەم دوو سورەتە هەرە درێژانە کامانەن؟ بڕێ دەفەرموون: مەبەست ئەعراف‌و ئەنعامە، بڕێ تر دەفەرموون: مەبەست

---

(٣٦١) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في الصبح، رقم: ٤٦٢=١٠٣٣.

(٣٦٢) من أفراد البخاري (فتح الباري/٢/٤٠٩ ـ خاتمة) ـ المترجم.

ئـەعراف‌و نیـسایە، بـڕێ تـر دەفـەرموون: مەبەسـت ئـەعراف‌و مائیدەیـە، درێژترینەکەشیان ئەعرافـە. لـەم فەرموودەیـەوە دەردەکـەوێ کـەکاتی نوێـژی شێوان زۆرە.

٤١٦-عَنْ جُبَيْرِ بنِ مُطْعِمٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِـالطورِ). (الحـديث٧٦٥ ـ أطرافـه في: ٣٠٥٠، ٤٠٢٣، ٤٨٥٤)[٣٦٣].

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: گـوێم لێ بـوو پێغەمبـەری خــودا (دروودی خــوادای لــێ بــێ) لەنوێــژی شـێوانا سـوورەتی (والطـور)ی دەخوێنـد. (ت/١/٢٦٧/٢ ز-٨٠ ژ-٥٠٨ = ش/د/ ن).

٤١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ صليت خَلْفَ أبي ألقاسم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْعَتَمَةَ، فَقَرَأَ: (إِذا السَّمَاءُ انشقت) فَسَجَدَ فَلَا أَزَالُ أَسْـجُدُ فِيهَـا حَتَّـى أَلْقَاهُ). (الحديث ٧٦٦ ـ أطرافه في: ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨)[٣٦٤].

ئــەبورافیع فــەرمووی: ئــەبوهورەیرە (ڕەزای خــوای لــێ بــێ) بەرنوێــژیی نوێــژی خـەوتنانی بـۆکردین، سوورەتی: (إذا الـسماء انـشقت) ی خوێنـد، کەگەیـشتە ئایەتی: (وإذا قرىء عليهم القرأن لايسجدون) کووڕنوشی قورئانخوێنـدنی بـرد، کەلەنوێـژ بووینـەوە گـوتم: ئـەم کوڕنووشەچـی بـوو؟ فـەرمووی: لەپـشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم کـردوەو، لـەدوای ئـەم ئایەتـەوە لـەناو ئـەو نوێـژەدا لەگـەڵ حەزرەتـدا سـەجدەی تـیلاوەتم بـردووە، لەبەرئـەوە هـەتا دەگەمەوە بەخزمەتی لەودنیا، لـەم شوێنەدا لـەم سـوورەتەدا ئـەم کووڕنوشـە هەردەبەم‌و هەرگیز تەرکی ناکەم. (ت/١/٣٣٣/ ١٠ ز-١١٠ ژ-٦٥٤ = ش/د/ ن).

---

(٣٦٣) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في الصبح، رقم: ٤٦٣ = ١٠٣٥، ١٠٣٣.

(٣٦٤) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: سجود التلاوة، رقم: ٥٧٨ = ١٣٠٤، ١٣٠٦.

٤١٨- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أن النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) في سـفر، فقرأ في العشاء في إحدى الركعتين با التِّينِ وَالزَّيْتُـونِ. وفي ريوايـة أخـرى قـال:مَـا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَـوْتًا مِنْـهُ أَوْ قـراءة). (الحـديث ٧٦٦ ـ أطرافـه في: ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨).(٣٦٥)

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەفەرێکا بـوو، نوێـژی خـەوتنانی بـەدوورکات کـرد، لـەرکاتی یەکـەما لـەپاش خوێنـدنی سوورەتی فاتیحە سوورەتی (والـتین والزیتـون) ی خوێنـد، کەسـی تـرم نـەدیوە کەوەك ئەو ئاوا دەنگی خۆشبێ‌و ئاوا بەجوانی قورئان بخوێنێ). (ت/ ٤/٢٦٧/١ ز-٨ ژ-٥١٠ = ش/ ت/ ن).

٤١٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (فِي كُـلِّ صَـلَاةٍ يُقْـرَأُ فَمَـا أَسْـمَعَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْمَعْنَاكُمْ وَمَا أَخْفَى عَنَّا أَخْفَيْنَا عَنْكُمْ وَإِنْ لَمْ تَزِدْ عَلَى أُمِّ الْقُرْآنِ أَجْزَأَتْ وَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ). (الحديث ٧٧٢) (٣٦٦)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (لەهەموو نوێژێکا قورئـان دەخـوێنرێ، جالەو جێگایانەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەنگی بـەرز دەیخوێنـد هـەتا ئێمـە گوێمـان لێ ی بـێ، ئێمـەیش کەبەرنوێـژی‌بۆ ئێـوە دەکـەین لەسـەرهەمان شێوە دەیخوێنین، وەلەو جێگانەیش دا کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەدەنگی نـزم دەیخوێنـدو، بەپەنامـەکی فاتیحـەو سوورەتی لـەناو نوێژەکـەدا دەخوێنـد ئێمەیش بەپەنامەکی لەسـەرهەمان شـێوە بۆئێـوەی دەخـوێنین. ئەگـەر تـەنیا سورەتی فاتیحەیش لەگشت ڕکاتێکا بخوێنی برێتـی دەکـەوێ‌و قورئانخوێنـدنی

---

(٣٦٥) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: القراءة في العشاء، رقم: ٤٦٤ = ١٠٣٧.

(٣٦٦) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة رقم: ٣٩٦ = ٨٨٢ شيحا.

پێویستی ناو ئەو ركاتەت لەكۆڵ دەكەوێ، بەڵام ئەگەر پتر بخوێنی ئەوە شتی چاكەو باشترە).

نمونەیێ لەشیكردنەوەی زانستی فەرموودەو ئاشنابوون لەحاڵی پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لێرەدا ئاوایە: بوخاری، موسەددەد، ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیم ئیبنو جورەیج، عەطاء، ئەبو هورەیرە ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیم كەناوداره بەإبن علیە، فەرموودەزانی گەورە یەحیای كوڕی موعین قسەی هەیە لەسەری، كاتێ كەلەئیبنوجورەیجەوە گێڕانەوە ئەنجام بدا، وەك ئەم فەرموودەی واین لەخزمەتیدا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم زاتانە پەیڕەوی (موتابەعە) ی ئیسماعیلیان كردووە، لەگێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، فەرموودەكە بێ ڕەخنەیە، عەبدوڕەزاق‌و موحەممەدی كوڕی بەكرو یەحیای كوڕیئەبوحەجاج لەلایەن ئەبوعەوانەوە، غوندەر لەلایەن ئیمامی ئەحمەدەوە، خالیدی كوڕی حاریث لەلایەنی نەسائییەوە، قەیسی كوڕی سەعدو عمارەی كوڕی مەیموون لەلایەن ئەبوداوودەوە، حوسەینی المعلم لەلایەن ئەبونەعیمەوە لەئەلموستەخرەجدا، بەڵام هەیانە درێژی كردۆتەوەو هەیانە كورتی كردۆتەوە، هەیانە بەمەرفووعی‌و هەیانە بەمەوقووف، ئەم گێڕانەوەی ئێرە بەڕواڵەت مەوقووفە لەسەر ئەبوهورەیرە، بەڵام بڕیار (حوكم) ی مەرفووعی هەیە، چونكە ئەم بڕگەیە (ما أسمعنا وما أخفى عنا) ئەوە دەگەیەنێ كەفەرموودەكە مەرفووع بێ نەك مەوقووف.

٤٢٠–عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظ وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمْ الشُّهُبُ فَرَجَعَتْ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ فَقَالُوا مَا لَكُمْ؟ فَقَالُوا حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ قَالُوا مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلَّا شَيْءٌ حَدَث فَاضرِبُوا مَشَارِقَ الْأَرْض وَمَغَارِبَهَا فَانْظُرُوا مَا هَذا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ فَانْصَرَفَ أُولَئِكَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى

النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِنَخْلَةَ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظ وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْفَجْرِ فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ فَقَالُوا هَذَا وَاللَّهِ الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ فَهُنَالِكَ حِينَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ وَقَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنْ الْجِنِّ وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ. (الحديث ٧٧٣ ـ طرفه في: ٤٩٢١) [٣٦٧]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ دەستەیێ لەیارانیدا لەمەککەوە دەرچوون بۆ بازاڕی (عوکاظ-کەشوێنی کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵانی عەرەب بوو لەوکاتەدا) هەتا سوود لەوبۆنەیە وەربگرێ‌و، عەرەبەکان بانگ بکا بۆسەر ئایینی ئیسلام، ئەمە لەوکاتەدا بوو کەشەیاطین ڕێگەی ئەوەیان لێ گیرابوو کەبەئاسمانا سەرکەون بۆهەواڵ‌و دەنگ‌و باس، هەرشەیتانێ هەوڵی ئەوەی بدایە بڵێسەی ئاگرو برووسکەو چەخماخە بەرەنگاری دەبوو، جاکاتێ شەیتانەکان بەنائومێدی دەگەڕانەوە هۆزەکەیان پێیان دەگوتن: ئەوە چیتانە؟

دەیانگوت: دەنگوباس‌و هەواڵی ئاسمانمان لێ قەدەغەکراوەو کەدەچین بۆهەواڵ هێنان بۆئاسمان دەدرێینەبەر شووڵەئاگرو برووسکە. جاشەیتان دەڵێ: دیارە شتێ رووی داوە لەجیهانا، بۆیە ڕێگەی ئاسمانتان لێ گیراوە، دەسا دەی کون‌و قوژبنی سەرزەوی، چ لەڕۆژهەڵات‌و چ لەڕۆژئاوا، بگەڕێن‌و بزانن چی رووی داوە، کەبووە بەهۆی ئەم ئاگربارانە. جائەوانیش بەهەرچوارلادا بۆئەم مەبەستە دەردەچن‌و دەکەونە جم‌و جووڵ‌و سووسەکردن، تائەوانەی کەڕووەو مەککە هاتن لەبەطنونەخلە تووشی پێغەمبەر دەبن، خەریك دەبێ بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ هاوڕێکانی دەکا، وەگوێ لەقورئانخوێندنەکەی

(٣٦٧) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: الجهر بالقراءة في الصبح والقراءة على الجن رقم: ٤٤٩.

دەگرن، جادەڵێن: ئەم قورئانەیە کەبووە بەهۆی ئەوەی کەناهێڵێ ئێمە وەك جارانمان بەئاسماندا سەربکەوین‌و هەواڵ بگرین، ئەوسا دەگەڕێنەوە بۆلای گەلەکەیان‌و دەڵێن: (یاقومنا إنا سمعنا قرآناً عجبا یهدی إلی الرشد فآمنابه ولن نشرك بربنا أحداً) واتە: ئەی گەلی ئێمە! ئێمە قورئانێکمان بیستووە،جێگەی سەرسوڕمانە، ئەوەندە جوان‌و دلگیرە، ڕێگەی هەقناسی نیشانی کۆمەڵی ئادەمیزادو بەرەی پەری دەدا، ئێمەیش باوەڕمان پێ کردو چووینەسەر ئەو ئایینی یەکتاپەرستی یە کەئەم قورئانە بانگەوازی بۆدەکا، لەبەرئەوە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەش‌و هاوڕێ بۆ خودای پەروەردگارمان. جاخودای گەورە ئەمەی ناردەخوارەوە بۆسەر پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ): (قل أوحي أليَّ انه استمع نفر من الجن: واتە: ئەی ڕەهبەری خۆشەویست! تۆبفەرموو: لەلایەنی خوداوە سرووش‌و وەحیم بۆهاتووە کەکۆمەڵێ لەبەرەی جنۆکە گوێیان لێ ڕاگرتووم لەکاتی قورئانخوێندندا) تاتەواوی داستانەکەوا لەسوورەتی جین دا، کەقسەو گوفتوگۆی جنۆکەکان بەدەق بەنیگا بۆ پێغەمبەر هاتبوو. (ت/٧/٢٢٣/١ـ ت = تاج بەکوردی بەرگی حەوتەم، لاپەڕە (٢٢٣) فەرموودەی ژمارە یەك، کەبوخاری‌و تەرمەزی گێڕاویانەتەوە = تاج-٤ ز-٥٥ ژ-٤١٨٩ چ-٤).

٤٢١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (قَرَأَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا أُمِرَ وَسَكَتَ فِيمَا أُمِرَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللّٰهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ). (الحديث ٧٧٤) [٣٦٨]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ) بەئاشکراو بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند لەونوێژانەدا کەخودا

---

(٣٦٨) قال الشيخ العينى: (وهذا الحديث من افراد البخارى). (ج/٦/٣٨) وسكت الدكتور مصطفى ديب البغا عن تخريج مسلم له، لاحظ خاتمة فتح البارى لأبواب صفة الصلاة (ج/٢/٤٠٩/٨٧٥). حيث لم يتطرق إلى موافقته له في هذا الاثر الموقوف ـ المترجم.

بۆخـۆی فـەرمانی پـێ کردبـوو کەبـەدەنگی بـەرز قورئانیـان تیـابخوێنێ، وەك نوێژی شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانی، وە هەروەها بەنهێنی بـەبێ دەنـگ قورئـانی دەخوێنـد لەونوێژانـە دا کـەخودای گـەورە بۆخـۆی فـەرمانی پـێ کردبـوو کەبەئاسپایی‌و بـەدەنگی نـزم قورئانیـان تیـادا بخـوێنێ، وەك نوێـژی نیوەڕۆو عەصر، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەبێ فەرمانی پەروەردگاری چۆنێتی کردنـی هیچ پەرستنێ بڕیارنادا، خودای گەورەیش ئاگای لەهەموو شتێ هەیـە، ئەگـەر مـەیلی لەسـەربوایە هـەموو کاروبـارێکی نوێـژی بەدرێـژی لـەناو ئایەتـەکانی قورئان دا روون دەکردەوە، کە ئەوەی نەکردووە لەبەر لەبیرچوون نییـە، وەك خۆی لەم ئایەتـەدا بـە پێغەمبـەری خۆشەویستی خـۆی دەفـەرموێ: (وماکـان ربــك نــسياً) مەریــەم-١٩/١٤- واتــە: ئــەی موحەممــەد، ئــەی پێغەمبــەری خۆشەویست! خودای تۆ قەت فەرامۆشکار نـەبووەو هـەرگیزاو هـەرگیز هیچـی لەبیرناچـێ). بــەڵام کەنــەیکردووە لەبــەر ئەوەیــە کەئــەم روونکردنــەوەو وردەکاری یانەی سپاردووە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جالەسەر ئەم بنیاتەیە کەخودا لەقورئانی پیرۆزدا فەرمانمان پێ دەکا بەپەیڕەوی جوانی پێغەمبـەرو دەفەرموێ: (لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة).

٤٢٢- عنِ ابن مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) ( أنه جاء رجل فقـال: قـرأت المفـصل الليلة في ركعة، فقال: هذا كهذا الشعر،لقد عرفتُ النَّظائِرَ الَّتِـي كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرُنُ بَيْنَهُنَّ فذكر عشرين سورة من المُفَـصَّلِ، سُـورَتَيْنِ فِـي كُلِّ رَكْعَةٍ). (الحديث ٧٧٥ ـ طرفاه في: ٤٩٩٦، ٥٠٤٣) [٣٦٩]

پیـاوێ هاتـە خزمـەتی ئیبنومەسـعود (ڕەزای خودای لێ بێ) عـەرزی کـرد: ئـەم شـەو لەیـەك رکاتـا هـەموو ئـەو سـوورەتانەی قورئـانم خوێنـد، کـەپێیان دەگـوترێ

---

(٣٦٩) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: ترتيل القراءة واجتناب الهذ، رقم: ٨٢٢=١٩٠٦.

موفەصصەل، کەلەسوورەتی قافەوەن هەتا کۆتایی قورئان؟ ئەویش فەرمووی: کەی قورئانخوێندن وادەبێ؟ دیارە وەك هەڵبەست بخوێنیتەوە ئاوا بەپەلە پەل سەپاندووتن بەسەریەکا، ئەو سوورەتانەی کەلەوێنەی یەکترن لەئاهەنگو واتادا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو دوو جووتی دەکردن و لەیەك رکاتا دەیانی خوێند ئاگام لێیانە، بیست سوورەتی لەئەلموفەصصەل باس کرد، کەبۆ هەر ڕکاتێ دوو سوورەت).

٤٢٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَقْرَأُ فِي الظهْرِ فِي الْأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ وَيُطوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مَا لَا يُطوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الثانِيَةِ وَهَكَذا فِي الْعَصْرِ وَهَكَذا فِي الصُّبْحِ). (الحديث ٧٧٦ طرفه في: ٧٥٩).[٣٧٠]

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو لەڕکاتی یەکەمو لەڕکاتی دوەمی نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتێکی تری دەخوێند، ئەو سوورەتەی کەلەڕکاتی یەکەما لەپاش فاتیحاوە دەیخوێند، درێژتر بوو لەوسوورەتەی کەلەرکاتی دوەما لەپاش فاتیحاوە دەیخوێند، جار جارەیش دەنگی ئەوەندە بەرز دەکردەوە کەئایەتەکەمان دەبیست، لەنوێژی عەسریشا هەروای دەکرد، لەڕکاتی یەکەمی بەیانیش دا، لەپاش فاتیحا سوورەتی درێژتری دەخوێند لەسوورەتی پاش فاتیحای رکاتی دوەم. (ت/١/٢٦٥/٢ ز-٧٨ ژ-٥٠٢ = ش/د/ ن).

٤٢٤-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ). (الحديث ٧٨٠ ـ طرفه في: ٦٢٠٢)[٣٧١]

---

(٣٧٠) أخرجه مسلم في الصلاة (عينى/١٤٧/٢١/٦) لاحظ خاتمة فتح البارى لأبواب صفة الصلاة ـ المترجم=١٠١٢.

(٣٧١) أخرجه مسلم في الصلاة باب: التسميع والتحميد والتأمين، رقم: ٤١٠ = ٩١٤.

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ پێشنوێژ لەپاش خوێندنی فاتیحا بەدەنگی بەرز دەڵێن ئامین، ئێوەیش بڵێن ئامین چونکە فریشتە لەم کاتەدا دەڵێن ئامین، هەرکەسێکیش بۆی ڕێ بکەوێ، لەگەڵ ئامین کردنی فریشتەکان دا ئامین بکا، خودای گەورە لەگوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ). (ت/١/٢٦٢/١ ز-٦ ژ-٤٩٧ ج-٤ =ش/د/ ت/ ن).

٤٢٥-عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ رَاكِعٌ فَرَكَعَ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَى الصَّفِّ فَذكَرَ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلَا تَعُدْ). (الحديث ٧٨٣).[٣٧٢]

ئەبوبەکرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ مزگەوت بۆ جەماعەت، کەگەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد، لەناو چەمینەوە (روکووع) دا بوو، منیش بەرلەوەی بگەیەمە ناو ڕیزەکە بەڕێوە چەمیمەوەو روکووعم بردو لەسەر ئەوشێوەیە ڕۆیشتم هەتا خۆم گەیاندە ڕیزەکە، دوایی لەپاش تەواوبوونی نوێژەکە، ئەمەم عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) خودا شێرەترت بکا لەسەر کردنی خێر، بەڵام جارێ تر وا مەکەرەوە، هەتا نەگەیتە ریز روکووع مەبە.

٤٢٦- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّى مَعَ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِالْبَصْرَةِ فَقَالَ ذكَّرَنَا هَذا الرَّجُلُ صَلَاةً كُنَّا نُصَلِّيهَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذكَرَ أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَفَعَ وَكُلَّمَا وَضَعَ). (الحديث ٧٨٤ ـ طرفاه في: ٧٨٦، ٨٢٦)[٣٧٣]

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبەصرە لەپشت ئیمامی عەلی یەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) نوێژی بەجەماعەت کرد، لەپاش لێبوونەوە عیمران فەرمووی::

---

(٣٧٢) من افراد البخاری (فتح الباری/٢/٤٠٩/٨٧٥) المترجم.

(٣٧٣) اخرجه مسلم في الصلاة، باب: اثبات التكبير في كل خفض ورفع في الصلاة رقم: ٣٩٢ = ٨٦٥.

ئەم پیاوە ـ واتە/ پێشەوا عەلی ـ چۆنێتی ئەو نوێژەی کەلەپشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیەوە بەجەماعەت دەمان کرد، ئەو چۆنیەتییەی یاد خستینەوە، ئەوجا باسی ئەوەی کرد کەهەمووجارێ کەهەڵ دەسایەوە یا دادەنەویەوە ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، بەڵام کاتێ لەچەمینەوە هەڵدەسایەوە (سمع الله) ی دەکرد.

٤٢٧-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنْ الرَّكْعَةِ ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). (الحديث ٧٨٩ طرفه في: ٧٨٥).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کەهەڵ دەستا بۆ نوێژ، ڕووەو ڕووگەی پیرۆز ڕادەوەستاو، ئەڵلاهوئەکبەری نوێژدابەستنی دەکرد، کەدەچووش بۆ چەمینەوە ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، کاتێ لەچەمینەوەیش پشتی هەڵ دەبڕی دەیەفەرموو: (سمع الله لمن حمده: هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا، خودا سوپاسەکەی قەبووڵ دەکا)، ئینجا بەوەستانەوە دەیفەرموو: (ربنا ولك الحمد: ئەی پەروەردگارمان! سوپاس بۆتۆ لەسەرئەوە کەسوپاس و داوامان گیرا دەکەی).

٤٢٨-عَنْ مُصْعَبَ بْنَ سَعْدِ بن أَبِي وَقاص (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، فَطَبَّقْتُ بَيْنَ كَفَّيَّ ثُمَّ وَضَعْتُهُمَا بَيْنَ فَخِذَيَّ فَنَهَانِي أَبِي وَقَالَ كُنَّا نَفْعَلُهُ فَنُهِينَا عَنْهُ وَأُمِرْنَا أَنْ نَضَعَ أَيْدِينَا عَلَى الرُّكَبِ). (الحديث ٧٩٠).[374]

موصعەبی کوڕی سەعدی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەتەنیشتی باوکمەوە نوێژم دەکرد، لەکاتی چەمینەوەدا هەردوو لەپمم

(٣٧٤) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: الندب إلى وضع الأيدى، رقم: ٥٣٥.

نووسان بەیەکەوەو دامنان لەنێوانی هەردوو رانمدا، کەلەنوێژەکە بوومەوە باوکم فەرمووی: وامەکە، جاران ئێمە ئاوامان دەکرد بەڵام لەپاشتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێ کردین لەکردنی ئەوە، ومفەرمانی پێ کردین کەدەست بگرین بەئەژنۆمانەوە لەناو چەمینەوەدا).

٤٢٩- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسُجُودُهُ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ وَإِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ مَا خَلَا الْقِيَامَ وَالْقُعُودَ قَرِيبًا مِنْ السَّوَاءِ). (الحديث ٧٩٢- طرفاه في: ٨٠١، ٨٢٠).[٣٧٥]

بەراء (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ماوەی چەمینەوەو کوڕنووش‌و پشت راست کردنەوە لەچەمینەوەو دانیشتنی نێوانی دوو کوڕنووشەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەیەکترەوە نزیك بوون. بەڵام راوەستان بۆ قورئانخوێندن‌و دانیشتن بۆ تەحیات لەوان درێژتربوون، وەك ئەوان ماوەکەیان کورت نەبوو). (ت/١/٢٨٠/١ ز-٨٧ ژ-٥٤٣ = ش/د/ت/ ن).

## روونکردنەوە:

یەکێ لەپیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیەیە کەچوارەم کەسە لەم رشتەیەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی لەیلای ئەنصاری کووفی یە، پیاوێکی زۆر سەلارو سەنگین بوو، قوتابیەکانی زۆر بەچاوی رێزەوە تەماشایان دەکرد، عەبدولەلیکی کوڕی عومەیر دەفەرموێ: جارێ لەکۆڕی عەبدوڕەحماندا، چەند کەسێ لەهاوڕێیانی پێغەمبەر دانیشتبوون، ئەوانیش وەك خەڵکەکەی تر گوێ یان لەفەرموودەی دەگرت‌و دڵیان دابوویە، لەهەشتاوسێ ی کۆچیدا لەڕوباری بەصرەدا خنکا. رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ.

---

(٣٧٥) أخرجه مسلم في الصلاة باب: اعتدال أركان الصلاة وتخفيفها في تمام، رقم: ٤٧١=١٠٥٧.

٤٣٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ). (الحديث ٧٩٤ ـ أطرافه في: ٨١٧، ٤٢٩٣، ٤٩٦٧، ٤٩٦٨)(٣٧٦)

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو لەکورنووش‌و چەمینەوەدا دەیفەرموو: ( سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم اغفر لي): خودایە! تۆ خودایەکی پاك‌و بێ نەنگیت، ئەی پەروەردگارم! لەسایەی خۆتەوەیە کەمن تەسبیح‌و سوپاس‌و ستایشی تۆدەکەم، ئەی خودایە لێم خۆش بە). (ت/١/٢٧٢/ ٤ ز-٨٣ ژ-٥٢٠ = ش/د/ ن).

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا. کەفەرموودەی ژمارە: ٨١٧ یە لەفەتحولباریدا، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو چەمینەوەو کوورنووشیدا بەزۆری دەیفەرموو: (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اللهم اغفرلي) مەبەستی لەمە ئەوەبوو ئەو فەرمانەی خودا جێ بەجێ بکا، کەخودا لەم ئایەتەدا داوای ئەوەی لێ دەکا، کە دەفەرموێ: (فسبح بحمد ربك واستغفر انه كان تواباً) نەصر ٣/١١٠ - (ت/٧/٢٦٧/١ ز-٨٨ ژ-٤٢٣٢ تاج-٤ = ش).

٤٣١ -عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا قَالَ الْإِمَامُ سَمْعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَ فَقُلوا: اللهُ رَبَّنا لَكَ الحَمدُ فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ). (الحديث ٧٩٦ ـ طرفه في: ٣٢٢٨)(٣٧٧)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتی پێشنوێژ گوتی (سمع الله لمن حمدة) ئێوەیش بڵێن: (أللهم ربنا ولك الحمد) چونکە فریشتەکانیش وەك ئێوە لەم کاتەدا وادەڵێن، دەی هەرکەسێ بۆی ڕێ

(٣٧٦) أخرجه مسلم في الصلاة باب: مايقال في الركوع والسجود، رقم: ٤٨٤=١٠٨٥.

(٣٧٧) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: التسميع والتحميد والتأمين، رقم: ٤٠٩=٩١٢.

بکەوێ لەگەڵ ئەوانا ئەم وشەپیرۆزەیە بڵێ خودا لەگوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ). (ت/١/٢٧٤/٣ ز-٨٤ ژ-٥٢٥ = ش/د/ ت/ ن).

**ڕوونکردنەوە:**

هەرکەسێ سوورەتی فاتیحا بخوێنێ، لەنوێژدا یالەکاتی ترا، سوننەتە ئامین بکا، سوننەتە بۆ خەڵکی تریش ئامین بکەن، چ لەناونوێژدابن، چ لەناو نوێژدا نەبن بەڵام بۆکەسێ لەناو نوێژدابێ ڕاجیایی تیادایە، هەندێ لەزاناکان دەفەرموون هەر لەگەڵ پێشنوێژی خۆیدا سوننەتەو بەس. لەسەر ئەم بنیاتە (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) یش ئاوایە.

٤٣٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (لَأُقَرِّبَنَّ صَلَاةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ مِنْ صَلَاةِ الظهْرِ وَصَلَاةِ الْعِشَاءِ وَصَلَاةِ الصُّبْحِ بَعْدَ مَا يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ). (الحديث ٧٩٧- أطرافه في: ٨٠٤، ١٠٠٦، ٢٩٣٢، ٣٣٨٦، ٤٥٦٠، ٤٥٩٨، ٦٢٠٠، ٦٣٩٣، ٦٩٤٠).[٣٧٨]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا کەبەرنوێژیتان بۆدەکەم نزیکی دەکەمەوە لەچۆنێتی ی نوێژکردنی پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری ئەبوهورەیرە وابوو لەدوا ڕکاتی نوێژەکانی نیوەڕۆو خەوتنان‌و بەیانی دا لەپاش گوتەی (سمع الله لمن حمده) وە، قونووتی دەخوێندو نزای چاکەی بۆ موسوڵمانەکان دەکردو نەفرەت‌و لەعنەتی لەبێ بڕواکان دەکرد. (ت/١/٢٨٧/٣ ز-٩٢ ژ-٥٦١).

٤٣٣-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ الْقُنُوتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْفَجْرِ). (الحديث ٧٩٨ طرفه في: ١٠٠٤).[٣٧٩]

---

(٣٧٨) أخرجه مسلم في الصلاة (عمدة القارى/٦/٧٢/١٨٥) المترجم=١٥٤٢ شيحا.

(٣٧٩) أخرجه مسلم من حديث البراء نحو حديث أنس هذا (فتح البارى/٢/٥٦٨/١٠٠٤) المترجم.

ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەسـەرەتاوە لەنوێـژی شـێوانو لەنوێـژی بەیانی دا قونووت هەبوو. (ت/١/٢٨٧/١ ز-٩٢ ژ-٥٥٩ = ش/ د/ت/ ن).

٤٣٤- عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرَّكْعَةِ قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ مَنْ الْمُتَكَلِّمُ قَالَ أَنَا قَالَ رَأَيْتُ بِضعَةً وَثَلَاثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلُ). (الحديث ٧٩٩).[٣٨٠]

ریفاعەی کوڕی رافیعی ئەل-زورەقی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژمان بەکۆمەڵی دەکرد، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کەلەچەمینەوە سەری هەڵبڕی فەرمووی: (سمع الله لمن حمده: هەرکەسێ سوپاسی خودابکا، بەنیازی پاداشی باش، خودا سوپاسو نیازەکەی قەبووڵ دەکا، پیاوێکیش لەپشتیەوە بوو گوتی: ( ربنا ولك الحمد حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه: خودایە! سوپاسێکی پاکی پیرۆز بۆتۆ لەسەرئەوە کەسوپاسو نیازمان گیرا دەکەی!) جاکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژەکەی لێ بۆوە، فەرمووی: (ئەوەکێ بوو ئەوقسە جوانەی کرد؟ پیاوەکە گوتی: من بووم. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (چاوم لێ بوو زیاتر لەسیی فریشتە پەلاماریان داو قۆستیانەوە، هەریەکە لەوان پەلەی بوو کەخۆی لەپێشا بینووسێتەوە!). (ت/١/٢٧٣/١ ز-٨٤ ژ-٥٢٣ = ش/ د/ ن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە ئەم زاتانەن: عەبدوڵڵای کوڕی مەسلەمە، مالیکی کوڕی ئەنەس، نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای ئەل - موجمیر، عەلی کوڕی

---

(٣٨٠) وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٣٣٥/٧٩٩) المترجم.

یەحیای کوڕی خەللادی ئەل - زورەقی، یەحیای کوڕی خەللاد، ریفاعەی کوڕی رافیعی ئەل - زورەقی.

ئەم چەند سەرنجە لەم رشتەیەدا رەچاو دەکرێن، کەلەزانستی فەرموودەدا بایەخی خۆیان هەیە، بۆ پیادەکردنی ئەم جۆرە زانستو زاراوانە لەزمانی کوردیدا، بەمەبەستی دەوڵەمەند کردنی لەهەموو بوارێکا دەیان نووسین، بەپشتی خودا ئەم جۆرە هەنگاوە بۆئەم بابەتە دەبن بەسەرمەشقو سەرچاوە:

١- یەحیای کوڕی خەللاد برازای ریفاعەی کوڕی رافیعە، کاتێ لەدایك دەبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی پیرۆزی فریشکی شیرین دەکا، کەواتە دادەنرێ بەسەحابە، بەڵام لەهاوڕێ منالەکانە.

٢- پیاوانی ئەم رشتەیە هەموویان مەدینەیین.

٣- لەم ڕشتەیەدا گێڕانەوەی گەورەتر لەپچووکترەوە هەیە، کەلەزاراوەی فەرموودەدا پێ ی دەگوترێ (ریوایەتی ئەکابیر لەئەصاغیرەوە). چونکە نوعەیم بەتەمەن لەعەلی گەورەترەو لەوەرگرتنی فەرموودەدا لەو لەپێشترە.

٤- لەم ڕشتەیەدا، بەپێ ی گێڕانەوە، سێ کەسی لەتابیعین تیادایە، کەنوعەیمو عەلیو یەحیان، گەرچی وەکی تر یەحیا بەهاوڕێ حلێبە.

٥- لەڕوویەکی ترەوە، گێڕانەوەی هاوڕێ لەهاوڕێیەکی ترەوەی تیادا، چونکە یەحیایش بەرپێناسەی هاوڕێی پێغەمبەر دەکەوێ.

٦- ئەم فەرموودەیە موسلیمو ئەبوداوودو نەسائیو طەبەرانیش گێڕاویانەتەوە، بەڵام مەرج نییە کەئەوانیش بەهەمان رشتەی پێشوو گێڕابیانەتەوە، هەروەها لەفظەکانیشیان جیایە، هەتا لەژمارەی فریشتەکانیشا جیاوازی هەیە، لەگێڕانەوەی موسلیم دا کەلەئەنەسەوەیە،

دەفــەرموێ: (چــاوم لێ بــوو دوازدە فریــشتە پــەلاماریان داو قۆســتیانەوە) لەگێڕانــەوەی طــەبەرانیــدا، کەلەئەبوئەییوبەوەیــە دەفــەرموێ: (ســیازدە فریشتە).

٧- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە ویردی ناونوێژ بیسراو (مەئثور) یش نەبێ دەبێ، بەڵام بیسراوبێ زۆر باشترە.

٨- ڕیفاعــەی کــوڕی رافیــع ئەنــصاری یــە، خــەزرەجی یــە، خــۆیو بــاوکیو دووبرای، کەناویان خەللادو مالیك بــووە، ئامادەی پــەیمانی عەقەبــە بــوون، ئوبەیی کوڕی سەلوول باوکی دایکێتی، لەخزمــەت حەزرەتــدا ئامــادەی گشت مەڵبەنــدو شــەڕگاکان بــووە، بیــستو چــوار فــەرموودەی لەپــەڕاوە بایەخــدارەکانی ســوننەتدا تۆمــارکراون، ســێ فــەرموودەی لەصــەحیحی بوخاریدا هەیــە، لەلایــەنگیرانی عــەلی بوو، لەگــەڵ پێشەوا عــەلی دا ئامادەی جــەنگی جەمــەلو صــەفین بــووە، لەســەردەمی مەعاوییــەدا لەچلو یــەك یالەچلو دوودا فەوتی کردووە. رەزای خودایان لێ بێ.

٤٣٥ -عَنْ أَنَس (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنهُ كانَ يَنْعَتُ لَنَا صَلَاةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ يُصَلِّي وَإِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ قَامَ حَتَّى نَقُولَ قَدْ نَـسِيَ). (الحـديث ٨٠٠ ـ طرفه في: ٨٢١)[٣٨١]

ئەنــەس (رەزای خوای لێ بێ) گــەڵێ جــار چــۆنێتی ی نوێــژی پێغەمبــەری روون دەکردەوە. ثابیت فەرمووی: جاکاتێ کەنوێژی دەکرد، کەسەری لەچەمینەوە هەڵ دەبڕی ئەوەنــدە بــەپێوە رادەوەســتا، تەنانــەت زەینمــان بۆئــەوە دەچوو: کەلەبیری چووە دابنەوێ بۆ کڕنووش.

---

(٣٨١) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: اعتدال أركان الصلاة وتخفيفها في تمام لست أدرى ما المقصود بقول الشيخ العينى: وهذا الحديث تفردبه البخارى (ج/٦/٧٦/١٨٨) لاحظ خاتمة أبواب صفة الصلاة في فتح البارى. المترجم.

## راڤەو شیکردنەوە:

ئـەم فەرموودەیـە گێڕانەوەیـەکی تـری فـەرموودەی ژمـارە چوارسـەدو سیی‌ونۆیە، کەلـەدواوەدێ، لێـرە شوعبە بـەکورتی لـەثابیتـەوە لەئەنەسـەوە دەیگێڕێتەوە، لەوێ حەممادی کوڕی زەید لەپابیتـەوە لەئەنەسەوە بەدرێـژیی دەیگێڕێتـەوە. دەقـی گێڕانـەوەی ژمـارە (٤٣٩) لـە موسـلیم دا، لەگـەڵ جیاوازییەکی زۆرکەم لەبێژەکەیدا، لەباسی (اعتدال ارکان الـصلاة وتخفیفهـا في تمـام) دا هەیـە. کەچـی عەللامـەی عـەینی لەعومـدەتول قاریئـدا دەفـەرموێ: (وهـذا الحـدیث تفـرد بـه البخـاري ـ ج/٦/ ١٨٨/٧٦) واتـە: ئـەم فەرموودەیـە لەتاکەکانی بوخارییە، واتە: موسلیم نەیگێڕاوەتەوە. بەڵام شێخی عەسقەلانی لـە (خاتیمـەی ئـەبوابو صـیفەتی صـەلات) دا، ئامـاژە بـەوەدەکا کەلەموسـلیما هەیە.

٤٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْـدُ يَـدْعُو لِرِجَـالٍ فَيُسَمِّيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَيَقُولُ اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وَعَيَّـاشَ بْـنَ أَبِي رَبِيعَةَ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الْمُـؤْمِنِينَ اللَّهُـمَّ اشْـدُدْ وَطْأَتَـكَ عَلَـى مُـضَرَ وَاجْعَلْهَـا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ وَأَهْلُ الْمَشْرِقِ يَوْمَئِذ مِنْ مُضَرَ مُخَالِفُونَ لَـهُ). (الحـديث ٨٠٤ طرفه في: ٧٩٩).[382]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو کەسەری لەچەمینەوە بەرزدەکردەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمـن حمـده ربنـا ولـك الحمـد) وەنزای دەکرد بۆ چـەندپیاوێ لەموسوڵمانان کـەگیرۆدەبوو بـوون بەدەسـتی بـێ بڕواکانـەوە، وەبـەناوی خۆیـان لـەناو نوێژەکـەدا نـاوی دەهێنـان و دەیفـەرموو: ( خودایـە! وەلیـدی کـوڕی وەلیـدو

(٣٨٢) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب القنوت... رقم: ٦٧٥=١٥٣٨.

سەلەمەی کوڕی هیشام و عەییاشی کوڕی ئەبورەبیعەو هەموو موسوڵمانە لازەبوونەکان، لەدەستی دیلی ی بێبڕواکان رزگار بکە. خودایە! لەهۆزی موضەر هەڵپێچەو تەنگیان پێ هەڵچنەو لایان لێ ببڕەرەوەو تووشی قاتوقڕی یەکی وایان بکە، وەك حەوت ساڵە گرانییەکەی سەردەمی یووسف).

ئەو سەردەمەیش ـ خەڵکی خۆرهەلآت کەلەهۆزی موضەر بوون (لەدژی پێغەمبەربوون). (ت/١/٤/٢٨٨ = ز-٩١ ژ-٥٦٢ = ت/٦/ ٨٣/ ٢٢)

٤٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّاسَ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ هَلْ تُمَارُونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ قَالُوا لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَهَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ قَالُوا لَا قَالَ فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْ فَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الشَّمْسَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الْقَمَرَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الطَوَاغِيتَ وَتَبْقَى هَذِهِ الْأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا فَيَأْتِيهِمْ اللَّهُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ هَذا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا فَإِذا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ فَيَأْتِيهِمْ اللَّهُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا فَيَدْعُوهُمْ فَيُضرَبُ الصِّرَاط بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَجُوزُ مِنْ الرُّسُلِ بِأُمَّتِهِ وَلَا يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذ أَحَدٌ إِلَّا الرُّسُلُ وَكَلَامُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ وَفِي جَهَنَّمَ كَلَالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ قَالُوا نَعَمْ قَالَ فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلَّا اللَّهُ تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو حَتَّى إِذا أَرَادَ اللَّهُ رَحْمَةَ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ أَمَرَ اللَّهُ الْمَلَائِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَيُخْرِجُونَهُمْ وَيَعْرِفُونَهُمْ بِآثَارِ السُّجُودِ وَحَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ فَكُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُهُ النَّارُ إِلَّا أَثَرَ السُّجُودِ فَيَخْرُجُونَ مِنْ النَّارِ قَدْ امْتَحَشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ مِنْ الْقَضاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ وَيَبْقَى رَجُلٌ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَهُوَ آخِرُ أَهْلِ النَّارِ دُخُولًا الْجَنَّةَ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ قِبَلَ النَّارِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ

اصْرِفْ وَجْهِي عَنْ النَّارِ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا فَيَقُولُ هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فُعِلَ ذلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَ ذلِكَ؟ فَيَقُولُ لَا وَعِزَّتِكَ فَيُعْطِي اللّٰهَ مَا يَشَاءُ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ فَيَصْرِفُ اللّٰهُ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ فَإِذا أَقْبَلَ بِهِ عَلَى الْجَنَّةِ رَأَى بَهْجَتَهَا سَكَتَ مَا شَاءَ اللّٰهُ أَنْ يَسْكُتَ ثُمَّ قَالَ يَا رَبِّ قَدِّمْنِي عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ اللّٰهُ لَهُ أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعُهُودَ وَالْمِيثَاقَ أَنْ لَا تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذي كُنْتَ سَأَلْتَ؟ فَيَقُولُ يَا رَبِّ لَا أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ فَيَقُولُ فَمَا عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيتَ ذلِكَ أَنْ لَا تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ لَا وَعِزَّتِكَ لَا أَسْأَلُ غَيْرَ ذلِكَ فَيُعْطِي رَبَّهُ مَا شَاءَ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذا بَلَغَ بَابَهَا فَرَأَى زَهْرَتَهَا وَمَا فِيهَا مِنْ النَّضرَةِ وَالسُّرُورِ فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللّٰهُ أَنْ يَسْكُتَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ فَيَقُولُ اللّٰهُ وَيْحَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعُهُودَ وَالْمِيثَاقَ أَنْ لَا تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذي أُعْطِيتَ؟ فَيَقُولُ يَا رَبِّ لَا تَجْعَلْنِي أَشْقَى خَلْقِكَ فَيَضحَكُ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْهُ ثُمَّ يَأْذَنُ لَهُ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ تَمَنَّ فَيَتَمَنَّى حَتَّى إِذا انْقَطَعَ أُمْنِيَّتُهُ قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ كَذا وَكَذا أَقْبَلَ يُذَكِّرُهُ رَبُّهُ حَتَّى إِذا انْتَهَتْ بِهِ الْأَمَانِيُّ قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى لَكَ ذلِكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ لِأَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ قَالَ اللّٰهُ لَكَ ذلِكَ وَعَشَرَةُ أَمْثالِهِ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ لَمْ أَحْفَظ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَّا قَوْلَهُ لَكَ ذلِكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ إِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ ذلِكَ لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثالِهِ. (الحديث ٨٠٦ ـ طرفاه في: ٦٥٧٣، ٧٤٣٧) [٣٨٣]

دیسان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یاران عەرزی حەزرەتیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایالەڕۆژی قیامەتا خودای خۆمان بەچاوی سەردەبینین؟! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (شەوی چواردەی مانگ کەسایەقەی سامال بێو یەك پەڵەهەور بەئاسمانەوە نەبێ، لەدیتنی مانگ بەئاسمانەوە هیچ گومانتان بۆپەیدا دەبێ؟). گوتیان: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا!

---

(٣٨٣) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب القنوت... رقم: ٦٧٥.

فـەرمووی: ( ئـەی بـەڕۆژی نیوەڕۆ، کـەخۆر هـەور بـەری نـەگرتنی، لـەدیتنی خۆردا گومانتان بۆپەیدا دەبێ؟) عەرزیان کرد: نەخەیر.

حـەزرەت (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: ( دەئـاوا بـەبێ شـەك‌و گومـان بەئاسـانی خودای خۆتان بەچاوی سەردەبینن. لەڕۆژی قیامەتا سەرجەم مەردوم حەشـر دەکـرێن، بەفـەرمانی خـودا بانگـەواز دەکـرێ: هەرکەسـێ چـی پەرسـتووە لـەجیهانا، بائێـستا شـوێنی ئەوشـتە بکـەوێ. ئـیتر هەیانـە خۆرپەرسـت بـووە لـەورۆژەدا شـوێنی خۆردەکـەوێ، وەهەیانـە مـانگی پەرسـتووەو شـوێنی مـانگ دەکەوێ، وەهەیانە شوێن گومڕاکەرە سەرکەشەکان دەکەون، لەشـەیتان‌و بـت‌و کولـەنانی‌و جادووبـازو ئەمانـە، چـونکە لـەجیهانا ئەوانـەیان پەرستووە. ئـەم نەتەوەی ئیسلامە لەوێ دەمێننەوە وەچاوەڕوانی پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ناپاکەکانیشیان هەر لەناودایە، جاخودای گەورە لەسەر شێوەیێ کەنەیناسنەوە دێ بۆلایـان‌و دەفـەرموێ: مـن خـودای ئێـوەم. ئـەوانیش دەڵـێن: ئێمـە ئەمـە شـوێنمانە لـەم جێگەیـە نـاجوڵێین هـەتا خـودای خۆمـان دێ بۆلامـان لەسـەر ئەوشـێوەیەی کـەڕون‌و ئاشکرایە لـەلامان‌و پێغەمبـەران پێیـان ڕاگەیانـدووین، ئێمـە کـاتێ پـەروەردگارمان هـات دەیناسـین. ئەوسـا خـوای باڵادەسـت‌و خـاوەن شکۆ، تەشریف دێنێ بۆلایان‌و دەفەرموێ: من خودای ئێوەم: ئـەوانیش دەڵێن: بەڵێ ڕاستە تۆخودای ئێمەی، ئەوجا خودا بانگەوازیان لێ دەکا، لەپاشا پـردی سـیرات کەلــەموو بــاریکترو لەشمــشێر تیــژترە، بەســەر پــشتی دۆزەخ دا رادەکێشرێ، وەمن یەکـەم کـەس دەبم لـە پێغەمبـەران کەئۆمـەتم لـەو پـردەوە دەپەڕێنمەوە.

وەلـەو ڕۆژەدا لەبـەر سـام‌و تـرس، جگـە لـە پێغەمبـەران، کـەس زات ناکـا کەقسە بکـا، فەرمایـشتی پێغەمبـەرانیش لـەو رۆژەدا برێتـی یـە لـەوە خـۆش خـۆش دەفـەرموون: ئـەی خودایـە! بـەبێ وەی، ئـەی خودایـە سـەلامەتیان بفەرموو.

لەدۆزەخا جۆرە قولاپێ هەیە، وەك دڕكە كەڵوێ وایە، خۆدڕكە كەڵوێتان بەچاوی خۆتان دیوە؟) گوتیان: بەڵێ دیومانە. فەرمووی: ( دەلەسەرشێوەی دڕكە كەڵەوێ یە، بەڵام بەس خودا خۆی ئەندازەی گەورەییەكەی دەزانێ، جاكاتێ خەڵكەكە دەیانەوێ بەسەرپردی سیراطا بپەڕنەوەو بڕۆن بۆ بەهەشت ئەو قولاپانە لەم بەرو ئەوبەری پردی صیراطەوە پەلاماریان دەدەنو بەهۆی كاری بەدیانەوە دەیان فڕێنن بۆناو دۆزەخ، جاهەیانە بەهۆی كردەوەی نالەباریانەوە بەفەتارەت دەچن، هەیشیانە لەبەر كردەوەی بەدی خۆی قولاپەكان ئەنجن ئەنجنیان دەكەن، لەپاشا ڕزگاریان دەبێ، هەتا كاتێ خودا خواست دەكا كەڕەحم بەو بڕوادارانە بكا، كەهێشتا لەدۆزەخ دا ماونو دۆزەخین، فەرمان بەفریشتەكان دەكا: كەهەركەسێ خواپەرست بووبێ لەدۆزەخ دەری بهێنن، ئەوانیش لەدۆزەخ دەریان دەهێننو بەشوێنەواری كوڕنووش باوەڕدارەكان لەناو ئاگردا دەناسنەوەو دەریان دەهێنن، چونكە خوادی گەورە شوێنەواری كوڕنووشی لەئاگر قەدەغەكردووە، ئاگری دۆزەخ تەوێڵی موسوڵمان ناسووتێنێ، ئیتر لەدۆزەخ دێنە دەرەوە. كاتێ دێنەدەرەوە بوون بەسووتەمەرۆ، جائاوی ژیانیان پیا دەكەن، ئیتر وەك تۆمەی ناو لیوەی لافاو سەوز دەبنەوەو دەبنەوە بەمرۆڤێكی ئاسایی.

ئەوجا خودا لەدادگایی نێوانی بەندەكانی لێ دەبێتەوە، پیاوێكیان لەنێوانی بەهەشتو دۆزەخا دەمێنێ، دواترین كەسە كەدەچێتە ناو بەهەشت، دۆزەخ بەرەو رووی دەبێ، جادەڵێ: ئەی خودایە! بەڕەحمەتی خۆت رووم دووربخەرەوە لەهەناسەی ئەم ئاگرە، بەڕاستی شەراكەی پڕوكاندوومیو تینی بڵێسەكەی سووتاندوومی، خودایش دەفەرموێ: رەنگە ئەگەر ئەم كارەت بۆبكرێ داوای شتی تربكەی؟! دەڵێ: نا، بەگەورەیی تۆ داوای شتی ترناكەم، ئیتر چەندەی كەخودا مەیلی هەبێ، بەڵێنو پەیمان دەدا بەخودا كەئەگەر ئەوداخوازییەی جێ بەجێ بكا، داوای هیچی تری لێ ناكا، ئەوجا خودا رووی

لەئاگرەکە دوور دەخاتەوە، جاکاتێ رووەدەکاتە بەهەشتو گەشیو ناسکیو نازدارییەکەی دەبینێ، ئەوەندەی حەزی خودای لەسەربێ بێدەنگ دەبێ، لەپاشتر دەست دەکا بەپاڕانەوەو دەڵێ: خوایەگیان! بمبەرەپێشەوە بۆ بەردەرگای بەهەشت؟ خوداش دەفەرموێ: ئەی تۆ بەڵێنو پەیمانت بەمن نەدا، کەلەوەزیاتر داوای هیچی تر نەکەی؟ بەندەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئومێد دەکەم کەنەبم بەبەدبەخترین دروستکراوانی تۆ کەلەدۆزەخ دەرچوون، خودایش پێ ی دەفەرموێ: خۆلەمەزیاتر، ئەگەر پێت بدرێ، داوای شتی ترناکەی؟ دەڵێ: نەخەیر بەگەورەیی تۆ داوای شتی ترناکەم جگە لەم داوایە، ئیتر ئەوەندەی حەزی خودای لەسەربێ دیسان بەڵێنو پەیمان دەدا بەخودا کەداوای زیاترنەکا، ئەوجا دەیباتە پێشەوە بۆبەردەم دەرگای بەهەشت، جاهەر لەگەڵ دەگاتە بەردەرگای بەهەشتو چاوی بەوناز و نیعمەتو گشت بەهرەو خۆشیو ناسكو نازدارییەی دەکەوێ، کەوالەناویدا، سەرسام دەبێو ئەوەندەی حەزی خودای لەسەربێ بێ دەنگ دەبێ، ئەوجا دەڵێ: ئەی خودایە! بمبەرەناو بەهەشتەوە!.

خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ دەفەرموێ: ئەی هاوار لەدەست بێ پەیمانی ی تۆ ئەی ئادەمیزاد! چەندەبێ پەیمانیت! خۆتۆلای خۆت ئەو هەمکە بەڵێنو پەیمانەت بەمن دا کەئیتر داوای زیاتر نەکەی کەچی جارلەگەڵ جارابێ بەڵێنتر دەردەچێت؟! دەڵێ: ئەی پەروەردگارم مەمکە بەبەدترینی دروستکراوانی خۆت، جاخودای گەورە لەکاری ئەم بەندەیەی خۆی پێکەنینی دێو لێ ی رازی دەبێو ئەوجا رێگەی دەدا دەچێتەناو بەهەشتو پێ ی دەفەرموێ: ئەی بەندەی من ئاواتت چییە داوای بکە، هەتا پێتی بدەمو ئاواتت گشتی بهێنمەدی، ئەویش خۆزگەیەکی زۆر دەخوازێو داوای هاتنەدی گەلێ ئاوات دەکا، هەتا هەرچی دەوێ داوای دەکاو ئاواتی تری نامێنێ، ئەوسا خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ خۆی شتی بیردەخاتەوەو پێ ی دەفەرموێ:

لەم چەشنەو لەوجۆرەی تریش داوابکە، ئەوانەی کەخۆی لەبیری نەمابوو، خودا بیری دەخاتەوە، تاکۆتایی ئەوپەڕی خۆزگەو ئاواتی دێو ئیتر ئاواتی تری نامێنێ کەداوای بکا، ئەوجا خودا پێی دەفەرموێ: ئەمەو ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا بۆتۆ).

ئەبوسەعیدی خودری بەئەبوهورەیرەی فەرموو: ( پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: خودا پێ ی دەفەرموێ: ئەمەو دە ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا بۆتۆ!).

ئەبوهورەیرە رەزای خودا لەئەوو لەئەبوسەعیدبێ - فەرمووی: ئەوەی کەلەفەرمایشتی پێغەمبەر خۆی لەبەرم کردووە ئاوایە: ( ئەمەو ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا بۆتۆبێ).

ئبوسەعید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی من لە حەزرەتم بیست کەخودا پێ ی دەفەرموێ: ( ئەمەو دە ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا بۆتۆبێ ئەی بەندەی من!) .

## راڤەو شیکردنەوە:

لەودنیایش سوێند دەمێنێ، تاقیکردنەوە دەمێنێ، پاڕانەوە لەخودای گەورە سوودی هەیە، درۆدەمێنێ، خودای گەورە بەچاوی سەر دەبینرێ، بەلام بەبێ دیاریکردنی جێو تەحەییوزو شتی وا. مەبەست لەپێکەنینی خودا پێویستی واتایەتی (واتە: لازمی مەعنایەتی) کەبرێتییە لەپێخۆشبوونو لێڕازیبوون، پردی سیرات راستە، هەمووکەسێ بەسەریدا تێدەپەڕێ، بەلام تاوانبار لێ ی بەردەبێتەوە بۆناو دۆزەخ!

٤٣٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ عَلَى الْجَبْهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ). (الحديث ٨١٢)[٣٨٤]

---

(٣٨٤) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: أعضاء السجود والنهي عن كف الشعر والثوب..... رقم: ٤٩٠=١٠٩٧، ١٠٩٨.

ئیبنوعەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە فەرمانی پێم کردووە کەلەسەرئەم حەوت ئێسکە گوڕنووش ببەم لەسەر تەوێڵو هەردوو بەری دەستو هەردوو ئەژنۆو لەسەرنووکی هەردووپێ) بەدەستیشی حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) ئاماژەی کرد بۆ ئەوەکەلووتیش بۆمەبەستی کوڕنووش لەسەربردن، بەشێکە لەتەوێڵ وەفەرموویشی: ( هەروا فەرمانم پێ کراوە کەجلو بەرگیش کۆنەکەینەوە، وەك هەڵکردنی چاکی کەواو بەستنی فەقیانەو شتی وا، وەقژیش خڕهەڵنەدەین).

٤٣٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (إِنِّي لَا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِنَا قَالَ ثابتٌ راوى الحديث كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ يَصْنَعُ شَيْئًا لَمْ أَرَكُمْ تَصْنَعُونَهُ كَانَ إِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ قَامَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ). (الحديث: ٨٢١ طرفه في: ٨٠٠).[٣٨٥]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دڵنیا بن لەوە کەمن کەمتەرخەمی ناکەم لەوەدا، کەبۆخۆم چۆن پێغەمبەرم دیوەکەنوێژی کرد بۆمان، منیش ئاوا نوێژتان بۆبکەم. ثابیت کەڕاوی ئەم فەرموودەیەیە لەئەنەسەوە دەفەرموێ: جاران ئەنەس شتێکی دەکرد، نابینم کەئێوە بیکەن، ئەنەس لەناو نوێژدا کەسەری لەچەمینەوە هەڵدەبڕی، ئەوەندە بەپێوە رادەوەستاو نزاو ویردی دەخوێند تەنانەت زەینمان بۆئەوە دەچوو: کەلەبیری چووە دابنەوێ بۆ کوڕنووش، لەنێوانی هەردوو کوڕنوشەکانیش دا هەروەها). ا(ف ـ ٤٣٥).

٤٤٠- (بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٣١٤ (اعتدلوا في السجود..). (ر ـ ٣١٤).

---

(٣٨٥) أخرجه مسلم في الصلاة، باب: اعتدال اركان الصلاة وتخفيفها في تمام، رقم: ٤٧٢=١٠٦١، ١٠٦٠.

٤٤١-عَنْ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِث اللَّيْثِيُّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فَإِذا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ لَمْ يَنْهَض حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا). (الحديث ٨٢٣).[٣٨٦]

ماليكی كوڕی حووەيريثی-ئەل-لەيثی- (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی، كاتێ لەڕكاتی يەكەمو لەڕكاتی سێیەم، هەڵ دەسايەوە، كەڕكاتەتاكەكانی نوێژن، يەكسەر هەڵنەدەستايەوە، بەڵكوو كەمێ دادەنيشت، ئەوسا هەڵ دەسايەوە بۆڕكاتی نوێ).(ت/١/١/٢٨١ ز-٨٨ ژ-٥٤٦ + ز-٨٧ ف-١، ٢، ٣).

٤٤٢-عَنْ أَبُو سَعِيدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ صَلَّى: فَجَهَرَ بِالتَّكْبِيرِ حِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ السُّجُودِ وَحِينَ سَجَدَ وَحِينَ رَفَعَ وَحِينَ قَامَ مِنْ الرَّكْعَتَيْنِ وَقَالَ هَكَذا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٨٢٥)[٣٨٧]

ئەبوسەعيدی خودری لەمەدينە بەرنوێژی كرد بۆ موسوڵمانان، كاتێ سەری لەكوورنوشی يەكەم هەڵبڕیو كاتێ لەپاش تەحياتی يەكەم هەڵسايەوە، لەهەموو ئەم كاتانەدا بەدەنگی بەرزئەڵلاهوئەكبەری دەكرد، وەفەرمووی: پێغەمبەرم بەچاوی خۆم ديوە لەسەر ئەم شێوەيە نوێژی دەكرد).

٤٤٣-عَنْ عبدالله بن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) إنه كان يرى عبدالله بن عمر (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (يَتَرَبَّعُ فِي الصَّلَاةِ إذا جَلَسَ فَفَعَلْتُهُ وَأَنَا يَوْمَئِذ حَدِيث السِّنِّ فَنَهَانِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) وَقَالَ إِنَّمَا سُنَّةُ الصَّلَاةِ أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ الْيُمْنَى وَتَثنِيَ الْيُسْرَى فَقُلْتُ إِنَّكَ تَفعَلُ ذلِكَ؟ فَقَالَ إِنَّ رِجْلَيَّ لَا تَحْمِلَانِي). (الحديث ٨٢٧).[٣٨٨]

---

(٣٨٦) لاحظ خاتمة أبواب صفة الصلاة في فتح البارى ج/٢/٤٠٩/٨٧٥ المترجم.

(٣٨٧) وهذا الحديث تفرد به البخارى عن أصحاب الكتب ( عينى/٦/١٠٠/٢١١) المترجم.

(٣٨٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح البارى/٢/٤٠٩/٨٧٥) المترجم.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، لەتەحیاتا چوارمشقی دادەنیشت، منیش ئەوکاتە منداڵکار بووم، لەدانیشتنی تەحیاتا وەك ئەو چوارمشقی دادەنیشتم باوکم ڕێگەی ئەوەی نەدام و فەرمووی: وامەکە، چونکە سوننەتە ئاوادابنیشیت بۆ تەحیات: پێی ڕاستت هەڵنێیت و پێی چەپت ڕاخەیت. منیش عەرزیم کرد: خۆتۆ خۆت چوارمشقی دادەنیشیت لەتەحیاتا، ئەی ئەوەبۆ؟ فەرمووی: ئاخر من قاچم هەڵم ناگرێ).

٤٤٤-عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (أَنَا كُنْتُ أَحْفَظُكُمْ لِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَيْتُهُ إِذا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذاءَ مَنْكِبَيْهِ وَإِذا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ ثمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ فَإِذا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ فَإِذا سَجَدَ وَضعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلَا قَابِضِهِمَا وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ فَإِذا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى وَإِذا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ). (الحديث ٨٢٨).[٣٨٩]

ئەبوحومەیدی ئەل- ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) بەچەن کەسێ لەیارانی پێغەمبەری فەرموو: من لەهەمووتان باشتر ئاگام لێیەتی کەنوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو: سەرنجم دەدا کەئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، هەردوو دەستی لەئاستی هەردووشانی هەڵدەبڕی، کەروکووعیشی دەبرد هەردوو دەستی لەهەردوو ئەژنۆکانی خۆی گیردەکرد، وەڕێك پشتی خۆی دەچەماندەوە، پشت و ملی خۆی ڕێك لەیەك ئاست بەبێ کووڕی ڕادەگرت، کەسەریشی لەچەمینەوە هەڵدەبڕی، ڕێك هەڵەستایەوە قنج ڕادەوەستایەوە، تایەك یەك بڕبڕاگەکانی پشتی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، کەکوڕنووشیشی

(٣٨٩) قال في التاج الجامع الاصول: (رواه الخمسة إلا مسلما) ج/١/ ١٨٩ المترجم.

دەبرد هەردوو لەپی دەستی دادەنا، لەسەر زەوییەکەو، بەڵام باسکی خۆیی ڕانەدەخست لەسەر زەوییەکەوە، کەمێ باسکەکانی لەکوورِنوشا بەرز دەگرت، وەنەیشی دەنووساندن بەلاتەنیشتی خۆیەوە، بەڵکوو هەردووباڵی خۆیی بلاّودەکردەوە، وەسینگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دادەناو، نووکی پەنجەکانی قاچی ڕوویان دەکردە رووگە (قیبلە) لەتەحیاتی یەکەمیشا لەسەرقاچی چەپی دادەنیشتو نووکەکەی دەردەکرد، وەپێ ی ڕاستیشی هەڵ دەناو لەسەرلا ڕانی خۆی دادەنیشت. (ب/د/ت/ن/ ـ تاج/ ۱/ ۲/۲۷۱ ز-۸۳ ژ-۵۱۸).

ئەبوجومەیدی ئەل- ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) سەحابی یەکی ناوداره ناوی عەبدورەحمانی کوری سەعدە، ئەنصاری یە، خەڵکی مەدینەیە، ئامادەی ئوحودو مەڵبەندوشەرِگاکانی دوای ئوحود بووە، لەپیاوان (ریجال) ی صەحیحەینە، لەکۆتایی جێنشینی مەعاوییەدا فەوتی کردووە. (رەزای خودای لێ بێ).

٤٤٥-عَنْ عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ بُحَيْنَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (وَهُوَ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ وَهُوَ حَلِيفٌ لِبَنِي عَبْدِ مَنَافٍ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ الظهْرَ فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ لَمْ يَجْلِسْ فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ حَتَّى إِذا قَضى الصَّلَاةَ وَانْتَظرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ ثمَّ سَلَّمَ). (الحديث ٨٢٩- أطرافه في: ٨٣٠، ١٢٢٤، ١٢٢٥، ١٢٣٠، ٦٦٧٠).[٣٩٠]

عەبدوڵلای کوری مالیك (رەزای خوای لێ بێ) کەدایکی ناوی بوحەینەیە، کەلەهۆزی ئەزدی شەنووئەیە، کەهاوپەیمانی نەوەی عەبدومەنافە، کەیەکێکە لەهاورِێ یانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەرِۆی بۆکردین، لەرِکاتی دوەمیدا یەکسەر هەڵسایەوەو، تەحیاتی یەکەمی نەخوێند، نوێژکەرەکانیش لەگەڵیدا هەڵسانەوە، جاکاتێ نوێژەکەی

(٣٩٠) أخرجه مسلم في السهو في الصلاة والسجود له (شرح صحيح مسلم/٥/٥٨) المترجم.

تەواو کرد، مەردوم چاوەڕوانی ئەوە بوون کەسڵاو بداتەوە، لەوکاتەدا بەدانیشتنەوە ئەڵڵاهوئەکبەری کردو لەپێش سڵاودانەوەدا دوو کوڕنووشی برد، لەجیاتی ئەو تەحیاتەی کەلەیادی چوو بوو، ئەوجا سڵاوی دایەوە. خەڵکەکەیش لەگەڵ ئەودا ئەم دوو کوڕنووشەیان برد. (ت/١/٣٢٥/٤ ز-١٠٩ ژ-٦٣٧ = ش/د/ت/ن).

٤٤٦-عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بنْ مَسْعود (رَضي اللهُ عَنهُ) قالَ: (كُنَّا إذا صَلَّيْنا خَلْفَ النَّبِيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْنَا السَّلَامُ على الله، السلام عَلَى جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ السَّلَامُ عَلَى فُلَانٍ وَفُلَانٍ فَالْتَفتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ إِنَّ اللّٰهَ هُوَ السَّلَامُ فَإذا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: (التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ)، فَإِنَّكُمْ إذا قُلْتُمُوهَا أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ لِلّٰهِ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْض أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). (الحديث ٨٣١ أطرافه في: ٨٣٥، ١٢٠٢، ٦٢٣٠، ٦٢٦٥، ٦٣٢٨,٧٣٨١).[٣٩١]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش دا کەلەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکۆمەڵ نوێژمان دەکرد، لەپێش دانانی تەحیاتا، دەمانگوت: سڵاو لەخودا، سڵاو لەجوبرائیل، سڵاو لەمیکائیل، سڵاو لەم، سڵاو لەو، تا ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی دایەوە لێمان‌و فەرمووی: (التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ ... تاد) واتە: هەرچی هۆی قەدرو ڕێزە چ بەگوفتار چ بەکردار، وەهەرچی سەرچاوەی پاکی‌و خاوێنییە ئەمانە هەموویان لەڕاستیدا هەرشایستەن بۆ خودای مەزن، درووود لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا لەگەڵ ڕەحمەت‌و بەرەکەتی خودا، درووود لەسەرئێمەیش‌و لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خودا، شایەتی دەدەم کەهەر خودا خودایە، خودای تر نییە،

---

(٣٩١) أخرجه مسلم في الصلاة، باب التشهد في الصلاة، ٤٠٢=٨٩٥.

وەشـايەتى دەدەم كەموحەممـەد بەنـدەو پێغەمبـەرى خودايـە ئـيتر سـلاوو دروودەكەتان بەرهەموو بەندەيـەكى باشى خـودا دەكـەوێ، خـۆى ئەوبەندەيـە لەسـەرزەوى بـێ، وەخـۆى لـەئاسمان بـێ، ئـەو سلاوەى ئێـوە كەلەسـەر ئـەم شـــێوەيەبێ دەيگرێتـــەوە. (ت/١/٢٥٢/ ١٢ ز-٧٢ ژ-٤٨٠ ش/د/ت/ ن) بڕوانـــە فەرموودەى ژمارە (٤٤٩).

٤٤٧ – عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلَاةِ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِـكَ مِـنْ عَذابِ الْقَبْرِ وَأَعُوذ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَـا وَفِتْنَةِ الْمَمَاتِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِكَ مِنْ الْمَأْثمِ وَالْمَغْرَمِ) فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ مَا أَكْثَـرَ مَـا تَـسْتَعِيذ مِنْ الْمَغْرَمِ فَقَالَ إِنَّ الرَّجُلَ إِذا غَرِمَ حَدَّث فَكَذبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ). (الحـديث ٨٣٢ ـ أطرافه في: ٨٣٣، ٢٣٩٧، ٦٣٧٥، ٦٣٧٦، ٦٣٧٧، ٧١٢٩)[٣٩٢]

عائيـشەى هاوسـەرى پێغەمبـەر دروودى خـوا لـە پێغەمبـەرو ڕەزاى خـودا لەهاوسـەرە پاكيزەكـانى ـ فـەرمووى: دەسـتوورى پێغەمبـەر وابـوو، لەنوێـژدا، لەكۆتايى تەحياتدا، لەپێش سلاودانەوەدا، دەيفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِكَ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ وَأَعُوذ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَفِتْنَةِ الْمَمَاتِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِكَ مِنْ الْمَـأْثمِ وَالْمَغْـرَمِ): خودايـە! پـەنا دەگـرم بـەتۆ لەسزاى گۆڕ، پەنادەگرم بەتۆ لـەئاژاوەو ئاشووبى جەجاڵەكوێرەى جادووگـەر، پـەنادەگرم بـەتۆ لـەئاژاوەى ژيـانو مـردن، خودايـە! پـەنادەگرم لـەتاوانبارىو لەبارى نالەبارى ژێربارى قـەرزارى). يـەكێ عـەرزى كـرد: قوربـان! بۆئەوەنـدە دادتە لەدەست بارى ژێـر قـەرزاريى؟ فـەرمووى: ( چـونكە پيـاو كـەبوو بـەژێر قەرزو قۆڵەوە تووشى درۆو دەلەسە دەبـێ، ئـەوجا بـەڵێن دەداو بەڵێنەكەيـشى بۆناچێتە سەر).

---

(٣٩٢) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: مايستاعذ منه في الصلاة، رقم: ٥٨٧، ٥٨٩=١٣٢٧.

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەوبەهرانەی لێی وەردەگیرێن:

١- سزای گۆڕ راستەو هەقە بەپێی ئەم فەرموودەیە، کەواتە: گوێ بەقسەی موعتەزیلەو هاوڕاکانیان نادرێ، کەنەبوو (نەفی) ی دەکەن.

٢- بەلگەیە لەسەر چەسپانی جەجال، کەزوو یادرەنگ هەلّدەسێ.

٣- نیشانەی ئەوەیە کەقەرزاری هۆی شوورەیی هەردوو جیهانە.

٤- پرسیارکەرەکە، بەپێی گێڕانەوەی نەسائی عائیشە خۆی بووە.

٥- لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ کەپەناگرتن بەپەنای خودا لەشتی خراپ سوننەتە، بەلّکوو گەلێ جار پەناگرتن لەشتی رەوایش، وەك قەرزو سوالّ، کەسەردەکێشن بۆشتی خراپ، هەرسوننەتە. هەرچیش سوننەت بێ قازانجی ئایینیو جیهانی هەیە (ت/١/٢٩٠ ز-٩٣ ژ-٥٦٥ = ش/د).

٤٤٨ -عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي قَالَ قُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ). (الحديث ٨٣٤- طرفاه في: ٦٣٢٦، ٧٣٨٨)[٣٩٣]

ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) قوربان! نزایەکم فێربکە، کەلەنوێژەکەما بیکەم. فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ) (بلێ: اللهم إنی ظلمت نفسی ظلماً کثیراً، ولایغفرالذنوب إلا انت، فاغفر لی مغفرة من عندك وارحمنی إنك أنت الغفور الرحیم: خوایە! من زۆرو ستەمێکی گەلێ زۆرم لەخۆم کردووە، جگە لەتۆکەسی تر رادەی ئەوەی نییە کەلەگوناه خۆش بێ، بەلوتفو کەرەمی خۆت لێم خۆش بەو، میهرەبانیم لەگەلّ بنوێنە،

---

(٣٩٣) أخرجه مسلم في الدعوات (عینی/٦/١١٨/٢١٩) المترجم = ٦٨٠٩.

بەڕاستی ئەی خودایە! تۆ تاوانبەخش‌و میهرەبانیت) (ت/٢/٢٩١/١ ز-٩٣ ژ-٥٦٦ = ش/ت/ ن).

٤٤٩- عَنْ عَبْدالله بن مسعود (رَضي اللهُ عَنهُ) قال: كنا إذا كنا مع النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في الصلاة: قلنا السلام على الله... (انظر: ٤٤٦).

لەگێڕانـەوەی ئێـرەدا لەئاخرەکەیـەوە دەفـەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): ( ئنجـا بەئامرزووی خۆی بپاڕێتەوەو حەزی لەچی بێ لەخودا داوای بکا).

## راڤەو شیکردنەوە:

لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ پاداشی نزای باش‌و بەخشینی پاداشی خێـرو قورئانخوێندن بەزیندوو یابەمردوو دروستەو پێیان دەگا.

٤٥٠-عَنْ أُمَّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ إذا سَلَّمَ قَـامَ النِّـسَاءُ حِـينَ يَقْـضي تَـسْلِيمَهُ وَمَكَـث يَـسِيرًا قَبْـلَ أَنْ يَقُـومَ). (الحديث ٨٣٧- طرفاه في: ٨٤٩، ٨٥٠، ٨٦٦، ٨٧٠، ٨٧٥).[٣٩٤]

ئوممو‌سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: پێغـەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەسـتووری وابـوو کەسڵاوی نوێـژی دەدایـەوە، کـەمێ لەشوێنی خـۆی دا دەمایـەوە، هـەتا ژنـان پـێش پیـاوان بـڕۆن، ئـیتر ژنـان لـەپاش سڵاودانەوەی پێغەمبەر هەڵدەستان‌و دەڕۆیشتن.

## راڤەو شیکردنەوە:

ئـەم فەرموودەیـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەم چەندشـتە: سـڵاودانەوەی نوێـژ چەسـپاوە، چـوونی ژن بـۆ جەماعـەت بـۆ مزگـەوت ڕەوایـە، واباشـە لـەپاش سڵاودانەوەی پێشنوێژ، لەپێش پیاوانا هەڵسن بڕۆن، هەتارێ لەئاژاوە بگیرێ.

---

(٣٩٤) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح الباری/٢/٢/٤٠٩/٨٧٥) المترجم.

٤٥١- عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ). (الحديث ٨٣٨) (انظر: ٢٦٢) (٣٩٥)

عیتبانی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە کەنوێژمان بەجەماعەت دەکرد، ئەوکاتە سڵاوی نوێژمان دەدایەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوی دەدایەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

عیتبانی کوڕی مالیك ئەنصاری یە، خەزرەجی یە، فەرموودەی لەصەحیحەین دا هەیە، پێشنوێژی هۆزەکەی بوو، کوێربوو، بەدری بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایی لەنێوانی ئەوو عومەری کوڕی خەطابدا بەست، لەسەردەمی جێنشینی مەعاوییەدا لەپاش تەمەنێکی درێژ فەوتی کرد.

٤٥٢-عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قالَ: (أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنْ الْمَكْتُوبَةِ كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ كُنْتُ أَعْلَمُ إِذا انْصَرَفُوا بِذلِكَ إِذا سَمِعْتُهُ). (الحديث ٨٤١ ـ طرفه في: ٨٤٢). (٣٩٦)

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژکەرەکان کەلەجەماعەتی نوێژە فەرزەکان دەبوونەوە، دەنگیان لەویردی پاش نوێژە فەرزەکان هەڵدەبڕی، من بەو دەنگ هەڵبڕینە دەمزانی کەوا لەنوێژبوونەتەوە!).

---

(٣٩٥) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: الذكر بعد الصلاة، وبيان صفته، رقم/ ٥٩٥: ٥٨٣=راجع الأرقام: ١٣١٦، ١٣١٧، ١٣١٨.

(٣٩٦) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: الذكر بعد الصلاة، رقم: ٥٨٣ = ١٣١٦، ١٣١٨.

٤٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ الْفُقَرَاءُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا ذهَبَ أَهْلُ الدُّثورِ مِنَ الْأَمْوَالِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَا وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَلَهُمْ فَضلٌ مِنْ أَمْوَالٍ يَحُجُّونَ بِهَا وَيَعْتَمِرُونَ وَيُجَاهِدُونَ وَيَتَصَدَّقُونَ قَالَ أَلَا أُحَدِّثُكُمْ إِنْ أَخَذتُمْ به أَدْرَكْتُمْ مَنْ سَبَقَكُمْ وَلَمْ يُدْرِكْكُمْ أَحَدٌ بَعْدَكُمْ وَكُنْتُمْ خَيْرَ مَنْ أَنْتُمْ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِ إِلَّا مَنْ عَمِلَ مِثْلَهُ تُسَبِّحُونَ وَتَحْمَدُونَ وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلَاةٍ ثلَاثا وَثلَاثِينَ قال الراوى فَاخْتَلَفْنَا بَيْنَنَا فَقَالَ بَعْضنَا نُسَبِّحُ ثلَاثا وَثلَاثِينَ وَنَحْمَدُ ثلَاثا وَثلَاثِينَ وَنُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثلَاثِينَ فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ تَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ حَتَّى يَكُونَ مِنْهُنَّ كُلِّهِنَّ ثلَاثا وَثلَاثِينَ). (الحديث ٨٤٣ ـ طرفه في: ٦٣٢٩).(٣٩٧)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەژاران هاتن بۆخزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی پایەی بەرزو نازو نیعمەتو پایەی گەورە هەیە، هەمووی داراو دەوڵەمەندەکان، دەیبەن بۆخۆیان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چۆن؟ عەرزیان کرد: چونکە ئەوان وەکوو ئێمە نوێژدەکەنو، وەك ئێمە ڕۆژوو دەگرنو، سەرەڕای ئەوەیش ماڵیان هەیە، خێرو خێراتی لێ دەکەنو، حەجو عەمرەی پێ دەکەنو پێی دەچن بۆغەزاو هەموو جۆرە چاکەیەکی تری بۆڕەزای خودا پێ دەکەن، بەلام ئێمە لەبەرئەوەی کەماڵمان نییە ئەم جۆرە خێرانەمان بۆناکرێ. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ( دەی باکارێکتان پێ بلێم، ئەگەر جێ بەجێ ی بکەن، ئەوانەی پێ دەگرنەوە کەپێشتان کەوتوون، وەکەسیش لەپاش ئێوە بەو پایەیە ناگا، وەئێوە دەبن بەباشترینی چینی دەوروبەری خۆتانو کەس ناگا بەم پایە گەورەیەی ئێوە مەگەر کەسێ وەك ئێوە ئەو کارەبکا؟!) گوتیان: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (لەپاش هەموو

---

(٣٩٧) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة،باب:استحباب الذكربعد الصلاة، وبيان صفته، رقم:٥٩٥=١٣٤٦،١٣٤٧.

نوێژێ سیی‌و سێ جار (سبحان الله)و سیی‌و سێ جار (الحمدلله)و سیی‌و سێ جار (الله اكبر) بكەن).

راوی دەفەرموێ: لەناو خۆمانا بووین بەدووبەرە، هەندێكمان دەیان گوت: سیی‌و سێ (سبحان الله) سیی‌و سێ (الحمدلله) دەكەین‌و سیی‌و چوار (الله أكبر) بكەین، من چوومەوە بۆ خزمەتی‌و لەم بارەیەوە لێیم پرسی، فەرمووی: سیی‌و سێ جار دەڵێیت: ( سبحان اللهو الحمدللهو الله أكبر). (ت/١/٣١٨/٥ ز-١٠٨ ژ-٦٢٨ = ش/د/ت).

٤٥٤- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنّ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ). (الحديث ٨٤٤ ـ أطرافه في: ١٤٧٧، ٢٤٠٨، ٥٩٧٥، ٦٣٣٠، ٦٤٧٣، ٦٦١٥، ٧٢٩٢).[٣٩٨]

وەرِادی نۆكەری موغیرەی كوری شوعبە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: موغیرە نامەی نووسی بۆموعاوییە لەسەرداوای خۆی، لەوكاتەدا كەموعاوییە فەرمانرِەوای موسوڵمانان بوو، بۆی نووسی: جاران كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژ دەبۆوەو سلاوی دەدایەوە ئەم ویردەی دەخوێندەوە دەیەفەرموو: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ): واتە: تەنها خواخوایەو بەس، خوایەكی تاك‌و تەنیایە، بێ هاوەڵە، هیچ هاوبەشی نییە، موڵك‌و دارایی‌و دەسەلات هەمووی لەراستی دا بۆئەوە، سوپاس‌و ستایش هەربۆئەوە، توانای هەمووشتێكی هەیە، پەروەردگارم! ئەوەی تۆبیدەی

(٣٩٨) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: استحباب الذكر بعد الصلاة وبيان صفته، رقم: ٥٩٣ = ١٣٣٦.

بەکەس نابڕێ، ئەوەی تۆنەیدەی بەکەس نادرێ، دارایی داراو دەستداریی دەستدار لەلای تۆهیچ دادێکیان نادا). (ت/١/٣١٧/٣ ز-١٠٨ ژ-٦٢٦ = ش/د/ ن).

٤٥٥- عَنْ سَمْرة بنْ جندب (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (كانَ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذا صلى صلاة أقبل علينا بوجهه). (الحديث ٨٤٥ ـ أطرافه في: ١١٤٣، ١٣٨٦، ٢٠٨٥، ٢٧٩١، ٣٢٣٦، ٣٣٥٤، ٤٦٧٤، ٦٠٩٦، ٧٠٤٧)[٣٩٩]

سەموورەی کوڕی جەندوب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبەرنوێژیی بۆدەکردین و لەنوێژ دەبۆوە، لەپاش سڵاودانەوە پشتی دەکردە رووگەو رووی دەکردە ئێمە. (ت/١/٦/٨ = تاج-٤ ز-٢ ژ-٤٢٤٤ ج-٤ = ش/ت/د).

٤٥٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ قَالَ صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ هَلْ تَدْرُونَ مَاذا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ وَأَمَّا مَنْ قَالَ بِنَوْءِ كَذا وَكَذا فَذلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ). (الحديث ٨٤٦ ـ أطرافه في: ١٠٣٨، ٤١٤٧، ٧٥٠٣)[٤٠٠]

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحودەیبییە بووین، شەو باران باریبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆکردین، کەسڵاوی دایەوە رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئەرێ دەزانن کە پەروەردگارتان چی دەفەرموێ؟) گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باش دەزانن، فەرمووی: دەفەرموێ: ئەم بەیانی یە بەهۆی بارینی ئەم بارانەوە بەندەکانم بوون بەدوو تاقم، تاقمێکیان باوەڕیان بەمن بوو،

---

(٣٩٩) أخرجه مسلم في الرؤيا (العينى/٦/١٣٦/٢٢٨) المترجم = ٥٨٩٦.

(٤٠٠) أخرجه مسلم في الايمان، باب: بيان كفر من قال مطرنا بالنوم، رقم: ٧١ = ١٣٣٦=٢٢٨ شيحا.

وەتاقمێکیان باوەڕیان بەمن نەبوو، ئەوەی بڵێ لەسایەی خوداو ڕەحمەتی خوداوە ئەم بارانەمان بۆباریوە، ئەوە باوەڕی تەواوی بەمن هەیەو باوەڕی بەبورج و ئەستێرەو شتی وانییە، بەڵام ئەوکەسەی بڵێ: لەفیسارە بورجا بارانمان بۆ باریوە، ئەوە باوەڕی بەمن نییە، بەڵکوو باوەڕی بەبورج و ئەستێران هەیە). (رياض الصالحين/١٢٥٨/٤ ز-٣٢٤ ژ-١/١٧٣١).

**ڕوونکردنەوە:**

لەم سەردەمەی ئێمەدا ئامێرو پێوەری زۆر پێشکەوتوو پەیدابوون، کەبەهۆی بەکارهێنانیەوە، پێشبینی چۆنێتی ی کەش و هەوابەباشی دەکرێ، بگرە بەوجۆرە پێوەرانە دەتوانرێ کاتی بارینی بەفرو باران لەپێش بارینیاندابەچەند ڕۆژێ، دیاری بکرێ. هەندێ ئامێری ترهەن دەتوانن جۆری کۆرپەڵە لەناو سکی دایکیدا دیاری بکەن کەئایا کچە یا کوڕە. ئەمانە ئێستا حەقائیقی زانستین، حاشا هەڵ نەگرن. لێرەدا ئێمە دەپرسین: ئایا ئەم جۆرە زانستانە بەپێچەوانەی ئەم جۆرە فەرموودانەن یانا، وەئایا ئەمانە لەعیلمی غەیبن کەخودا نەبێ کەس نایزانێ؟! یالەو جۆرە زانستەن کەبەهۆی ئاسایی دەزانرێن؟! لەوەڵاما دەڵێین: ئەمڕۆ بەزانست چەسپاوە کەئەو لاف و گەزافەی کە لەکۆندا حیسابگەرو ئەستێرە شوناسەکان لێیان دەدا، سەبارەت بەکەش و هەواو ڕۆڵی بورج و ئەستێرەو شتی وای ترلەبارینی باران داو، هەروا لاف و گەزافی عیلمی غەیب و قیرائەتی موستەقبەل و پێشبینی کردنی ڕووداو لەئاییندەداو نیسبەتی ئەم جۆرەشتانە لەهەندێ شتی خەیاڵی، ئەمڕۆ دەرکەوتووە کەئەم جۆرە لاف و گەزافە هەمووی درۆیەو چاوو ڕاوەو قسەی نەفام و گێلەپیاوە، لەڕاستیدا مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە ئەوەیە: کەموسوڵمان بڕوای بەپڕو پووچ نەبێ، لەهەمان کاتا هەق بزانێ کەهەموو شتێ بەدەست خودا خۆیەتی، بارینی باران بەدەست خودایە، بەدەست

ئەستێرەو بورج نییە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، موسوڵمان دەبێ ئەم دوو ڕاستەقینەیێ بەباشی بزانێ:

**یەکەم**: کاروباری جیهان بەزۆری هۆیەکی لەبەرچاوی هەیە، گەڵێ جار ئەو هۆیە ئاشکرایە، لەبەرئەوە هەموو کەس دەیزانێ، وەك نەخۆشی دەبێ بەهۆی مردن، یاوەك ئاگردەبێ بەهۆی سووتاندن، گەڵێ جاریش ئەوهۆیە پەنهانە، دۆزینەوەی زەحمەتە، پێویستی بە هەوڵو تێکۆشانو هۆکاری دۆزینەوە هەیە، زۆرشت لەم بابەتی دووهەمە لەکۆندا هۆکەی نەدەزاندرا، بەڵام ئێستا ئەوهۆیانە دۆزراونەتەوە، وەك مەددو جەزری دەریا، کەهۆکەی هێزی کێشەندەی مانگە.

**دووهەم**: جیهانی نهێنی (عالەمی غەیب) برێتی یە لەوشتانە کەهەرخودا خۆی دەیانزانێ، وەبەهیچ جۆرێ کەس ناتوانێ پەی یان پێ ببا، چونکە برێتین لەوشتانەی کەوان لەودیو پەردەی سورشتەوە، بەهۆی هۆی ماددی یەوە هەستیان پێ ناکرێ، هۆشو هەستو هۆ لەئاستیان کۆڵن، واتە: هەرچی بەهۆی ئاسایی سروشتی بزانرێ ئەوە نهێنی (غەیب) نییە، ئەم جۆرەیش وەك: دەنگوباسی ناوگۆڕو باسی ژیانی دوایی‌و زیندوبوونەوەو چۆنێتی حەشرو باسی فریشتەودۆزەخو بەرزەخو بەهەشتو پەریو زۆرشتی تر. کەواتە: هەرشتێ بەهۆی ئاسایی سروشتی، زوو یادرەنگ بزانرێ، ئەوە پەیوەندی بەعیلمی غەیبەوە نییە، چونکە کورتو پوخت: زانستی نهێنی ئەوەیە کەهۆی سروشتی (ماددی) نەبێ. بڕوانە: ژمارە (٥٢٨) لەم کتێبەدا - (وەرگێڕ).

٤٥٧- عَنْ عُقْبَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ الْعَصْرَ فَسَلَّمَ ثُمَّ قَامَ مُسْرِعًا فَتَخَطى رِقَابَ النَّاسِ إِلَى بَعْض حُجَرِ نِسَائِهِ فَفَزِعَ النَّاسُ مِنْ سُرْعَتِهِ فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَرَأَى أَنَّهُمْ عَجِبُوا مِنْ سُرْعَتِهِ فَقَالَ

ذَكَرْتُ شَيْئًا مِنْ تِبْرٍ عِنْدَنَا فَكَرِهْتُ أَنْ يَحْبِسَنِي فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ). (الحديث ٨٥١ - أطرافه في: ١٢٢١، ١٤٣٠، ٦٢٧٥) [٤٠١]

عوقبه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ، لەمەدینە، لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژی عەصرمان بەکۆمەڵی کرد، کەسلاوی دایەوە بەپەلە هەڵساو بەسەر سەری خەڵکەکەدا هەنگاوی ناو، چوو بۆماڵی یەکێ لەهاوسەرەکانی، لەپاشا کەهاتەوە تەماشای رووی خەڵکەکەی کرد، روانی خەڵکەکە سەیری دێ لەم پەلەکردنەی. جا فەرمووی: ( ئەوە بۆیە وام کرد چونکە لەناو نوێژەکەدا بیرم کەوتەوە کەشووشێ زێرمان لەلاهەیە، جاحەزم نەکرد کەلەماڵی منا شەوی بەسەردابێ‌و سبەینێ لەدەشتی مەحشەردا بەندم بکا، لەبەرئەوە لەماڵەوە پێم گوتن کەدابەشی بکەن بەسەر هەژاران دا).

٤٥٨-عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بنْ مَسْعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) (لَا يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطانِ شَيْئًا مِنْ صَلَاتِهِ يَرَى أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لَا يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَثِيرًا يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ). (الحديث ٨٥٢) [٤٠٢]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەستان کارێکی وامەکەن کەبەشی شەیتان بکەوێتە نوێژەکەتانەوە، بەهۆی ئەوەوە کەوابزانێ دەبێ هەرلەلای راستەوە لەنوێژدەرچێ، چونکە من بەچاوی خۆم دیومە کەزۆرجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای چەپیەوە لەنوێژ دەرچووەو جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتووە. (ت/ا. ش/د).

٤٥٩-عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ يُرِيدُ الثومَ فَلَا يَغْشَانَا فِي مَسَاجِدِنَاقال: الراوي:

---

(٤٠١) من أفراد البخاري (فتح الباري/٢/٤٠٩/٨٧٥) المترجم.

(٤٠٢) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب جواز الانصراف من الصلاة...، رقم: ٧٠٧ = ١٦٣٦.

قلت لجابر: ما يعني به؟ قالَ: مَا أُرَاهُ يَعْنِي إِلَّا نِيئَهُ وقيلَ: إِلَّا نَتْنَهُ). (الحديث ٨٥٤ - أطرافه في: ٨٥٥، ٥٤٥٢، ٧٣٥٩) [٤٠٣]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەم گیایەی خوارد (واتە: لەسیر) باتوخنی مزگەوتەکانمان نەکەوێ، تابۆنەکەی دەڕوا) فەرموودەگێڕەوە (ڕاوی) دەفەرموێ: عەرزی جابیرم کرد: مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم نەیی کردنە لەخواردنی سیر چی یە؟ فەرمووی: وادەزانم مەبەستی ئەوەیە کەبەکاڵی خواردی، تابۆنەکەی دەڕوا هاموشۆی مزگەوت نەکا). ئەمە گێڕانەوەی ئەبوعاصیمە، لەئیبنوجورەیجەوە، لەغەطاوە، لەجابیرەوە، بەڵام گێڕانەوەی موخلیدی کوڕی یەزید، لەئیبنوجورەیجەوە لەباتی (إلاّ نَيِّئَهُ) ئاوایە: (إلاّ نتنهُ) واتە: مەبەستی بۆنە ناخۆشەکەیەتی. (تاج/١/٣٦٢/٢٠ ز-١١٨ ژ-٧٢٥ =ش/د/ت/ن).

٤٦٠-عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ أَكَلَ ثومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا أَوْ قَالَ فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنْ الْبُقُولِ فَقَالَ قَرِّبُوهَا إِلَى بَعْض أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا قَالَ كُلْ فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لَا تُنَاجِي وفي رِوايَة: أُتِيَ بِبَدْرٍ يَعْنِي طَبَقًا فِيهِ خَضِرَاتٌ ). (الحديث ٨٥٥ طرفه في: ٨٥٤). [٤٠٤]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ سیر، یاپیازی خوارد با کەنارگیربێ لەئێمە) یافەرمووی: ( بادوور بگرێ لەمزگەوتمانو لەماڵی خۆی دابنیشێو لەوێ نوێژی خۆی بکات).

---

(٤٠٣) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: نهى من اكل ثوماً... رقم: ٥٦٤=١٢٤٨.

(٤٠٤) اخرجه مسلم في الصلاة (العينى/٦/١٤٧/٢٣٦) المترجم.

جارێکیش تەبەقێکیان بۆی هێنا، هەندێ سەوزەواتی لەسەربوو، کەبۆنی سەوزەکە چوو بەسەریدا، پرسیاری کرد: ئەمەچی یە؟ عەرزیان کرد: ئەو سەوزەواتەیە. فەرمووی: ( من ئەوە ناخۆم، داینێن بۆئەم پیاوە) پیاوەکەیش (کەیەکێك بوو لەیارانی پێغەمبەر) حەزی نەکرد کەبیخوات چونکە پێغەمبەر لێی نەخوارد. جاپێ ی فەرموو: ( تۆ بیخۆ، خۆئەمە حەرام نییە، من بۆیە نایخۆم چونکە گوفتوگۆ لەگەڵ فریشتە دەکەم، خۆتۆ گوفتوگۆ لەگەڵ فریشتە ناکەی، ئیتر بۆناخۆی).

٤٦١–عَنْ ابنْ عباس (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أن النبيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرّ عَلَى قَبْرٍ مَنْبُوذ فَأَمَّهُمْ وَصَلّوْاعليه). (الحديث ٨٥٧ ـ أطرافه في: ١٢٤٧، ١٣١٩، ١٣٢١، ١٣٢٢، ١٣٢٦، ١٣٣٦، ١٣٤٠)[٤٠٥]

ئیبنو عەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆڕێکی تەنیاوە ڕەت بوو، کەلەپەڕەوە بوو، جا هاوڕێکانی لەپشت خۆیەوە ریزکردو بەجەماعەت نوێژی مردووی پێیان کرد لەسەر گۆڕەکە.

٤٦٢– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ). (الحديث ٨٥٨ ـ أطرافه في: ٨٧٩، ٨٨٠، ٨٩٥، ٢٦٦٥)*.

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( خۆشۆردنی رۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی رەسیدە). (تاج/ ١/٤١٩/٤ ز-١٤٣ ژ-٨٣٦ = ش/د/ ن).

---

(٤٠٥) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: الطيب والسواك يوم الجمعة رقم: ٨٤٢ = ١٩٥٧.

★ مسلم: ١٩٥٤.

**راڤەو شیکردنەوە:**

وشەی (پێویست: واجب) لەم فەرمووده پیرۆزەدا، مەبەستی واجبی بەرابەر سوننەت نییە. بەڵکوو مەبەست لێ ی جەخت کردنە لەسەرئەوە کەخۆشۆردنی رۆژی هەینی کارێکی زۆر گرنگی دامەزراوە.

٤٦٣– عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ لَهُ رَجُلٌ: شَهِدْتَ الْخُرُوجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ نَعَمْ وَلَوْلَا مَكَانِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ يَعْنِي مِنْ صِغَرِهِ أَتَى الْعَلَمَ الَّذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ ثُمَّ خَطَبَ ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ فَجَعَلَتْ الْمَرْأَةُ تُهْوِي بِيَدِهَا إِلَى حَلْقِهَا تُلْقِي فِي ثَوْبِ بِلَالٍ ثُمَّ أَتَى هُوَ وَبِلَالٌ الْبَيْتَ. (الحديث ٨٦٣ ـ أطرافه في: ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٨، ٩٧٩ ـ المترجم)[٤٠٦]

پیاوێ عەرزی ئیبنوعەباسی کرد: ئایا لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی دەرچوون بووی، کەلەڕۆژی جەژنەکانا دەردەچوون بۆنوێژگاکە، کەلەسارا بوو؟ فەرمووی: بەڵێ: فریای ئەوە کەوتووم، گەرچی من ئەوکاتە مناڵکاربووم، بەڵام لەبەرئەوە کەخزمی نزیکی پێغەمبەر بووم ئامادەی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە دەبووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی جەژن دا، بۆ نوێژی جەژن لەمەدینە چووە دەرەوە، رۆیشت تاگەیشتە لای نیشانەکەی کەوا خانووەکەی کەپیری کوڕی صەلتی لێ یە، لەوێدا نوێژی جەژنی بۆ موسوڵمانان کرد، ئەوجا وتارێکی دا، لەپاشا تەشریفی برد بۆناو کۆمەڵەی ژنان کەئامادەی نوێژی جەژن بوو بوون، پەندو ئامۆژگارییەکی شیرینی کردن، وەفەرمانی پێ کردن کەخێر بکەن، ئیتر ژنەکان دڵیان گەرم بوو، دەستیان کرد بەخێرکردن. ژنی وایان هەبوو گوارەکەی گوێی خۆی دادەکەندو دەیکرد بەخێر، هی وایان هەبوو، گەردانەکەی لەملی دادەکەندو دەیکرد

(٤٠٦) أخرجه مسلم في الجنائز باب: الصلاة على القبر رقم/ ٩٥٤ = ٢٣٠٩.

بەخێر، هی وایان هەبوو ئەموستیلەکەی دەستی دەکرد بەخێر، بیلالیش جلەکەی خۆی راخستبوو، ژنەکان خێرەکانی خۆیانیان هەڵ دەدایە سەرجلەکەی بیلال. ئەوجا پێغەمبەرو بیلال بەیەکەوە گەڕانەوە بۆماڵەوە).

٤٦٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا اسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ بِاللَّيْلِ إِلَى الْمَسْجِدِ فَأْذَنُوا لَهُنَّ). (الحديث ٨٦٥- أطرافه في: ٨٧٣، ٨٩٩، ٩٠٠، ٥٢٣٨)

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ژنەکانتان بەشەو داوایان لێ کردن، کەڕێگەیان پێ بدەن کەبچن بۆ مزگەوت، ڕێگەیان پێ بدەن).

## روونکردنەوەیێ:

مامۆستای عەسقەلانی لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: ( باسەکانی نامەی چۆنێتی نوێژ لەسەرەتاوە هەتا ئێرە، سەدو هەشتا فەرموودەی بەرزەوە بووی لەخۆی گرتووە، سیو هەشتیان بێ ڕشتەن، واتە: موعەللەقن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: مەوصوولن، بەڕشتەی پەیوەست لەشێخی بوخاری یەوە بەرزکراونەتەوە هەتا سەر پێغەمبەر، یاهەتا سەر دواهەمین کەس لەڕشتەکەدا، بەبێ پچڕانو لەیەك تەرازان، ئەم فەرموودانە سەدو پێنجیان دووبارەن، هەیانە هەر لەم باسە خۆیدا دووبارە کراونەتەوە، هەیانە لەباسەکانی پێشتردا دووبارە کراونەتەوە. فەرموودەبێ ڕشتەکان بێجگە لەسیانیان هەموویان دووبارەن، حەفتا فەرموودەی پەیوەستیشیان دووبارەن، کەواتە: (٣٥+ ٧٠= ١٠٥ کۆی فەرموودە دووبارەکان، ١٨٠-١٠٥=٧٥ کۆی پوختەی ئەم باسە دەکاتە حەفتاو پێنج فەرموودە، شەستو سێیان لەتەجریدەکەدا هەیە لەژمارە: ٤٠٢. هەتا ژمارە: ٤٦٤ هەموویان پەسەندی پێشەوا موسلیمیشن بێجگە لەم سیازدەیەیان:

١- فەرموودەی (٧٣٩) لەفەتح دا، لەتەجریدەکەدا نییە، چوونکە دووبارەیە.

٢- فـەرموودەی ژمـارە (٧٥٠): (مابـال أقـوام یرفعـون...) لەتەجریدەکـەدا ژمارەکەی (٤٠٨)ە (تەماشای پەڕوایزی فەرموودەی ژمارە (٤٠٨) بفەرموو، چونکە ئەم فەرموودەیە لەموسلیم دا هەیە. وەرگێڕ.

٣- فەرموودەی ژمارە (٧٥١): (التفات في الصلاة...) لەتەجریدەکەدا ژمارەی: (٤٠٩) یە.

٤- ژمارە (٧٦٤) لەتەجریدەکەدا (٤١٥).

٥- ژمارە (٧٧٤ مکرر) لەتەجریدەکەدا نییە.

٦- فەرموودەی ژمارە (٧٨٣) لەتەجریدەکەدا (٤٢٥)ە.

٧- فەرموودەی ژمارە (٧٨٩) لەتەجریدەکەدا (٤٢٧).

٨- فەرموودەی ژمارە (٧٩٩) لەتەجریدەکەدا (٤٣٤).

٩- فەرموودەی ژمارە (٨٢٥) لەتەجریدەکەدا (٤٤٢)

١٠- فەرموودەی ژمارە (٨٢٧) لەتەجریدەکەدا (٤٤٣).

١١- فەرموودەی ژمارە (٨٣٧) لەتەجریدەکەدا (٤٥٠).

١٢- فەرموودەی ژمارە (٨٤٨) لەتەجریدەکەدا نیە.

١٣- فەرموودەی ژمارە (٨٥١) لەتەجریدەکەدا (٤٥٧).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ١٧- نامەی هەینی (كتاب الجمعة)

## نوێژی هەینی فەرزە

٤٦٥- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) انه سمع رسول (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول: (نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا ثُمَّ وَهَذَا يَوْمُهُمْ الَّذي فُرِض عَلَيْهِمْ فَاخْتَلَفُوا فِيهِ فَهَدَانَا اللَّهُ فالنَّاس لَنَا فِيهِ تَبَعٌ: فَالْيَهُودُ غَدًا وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ). (الحديث: ٨٧٦ في فتح الباري ).[٤٠٧]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خودام ژنەوت دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (ئێمەی گەلی ئیسلام ،هەرچەند لەهاتن بۆجیهان کەوتوینەتە دواوە، بەلاَم لەقیامەتدا لەپایەو پلەو، لەمەڵبەندەکانا لەپێشی پێشەوەین،یەکەم گەلین کەحەشر دەکرێین،کەمەحکەمەدەکرێین، کەدەچینە بەهەشت، ئەوەندە هەیە کەئەوان لەپێش ئێمەوە نامەی خودایی یان بۆهاتووە، وەئێمە لەپاش ئەوانەوە نامەی خوداییمان بۆهاتووە، لەپاش ئەمیش ئەمە ئەورۆژەیانە کەخودا داینابوو لەسەریان، کەلەم ڕۆژی هەینی یەدا بەجوانی پەرستشی خودا بکەن، کەچی ئەوان لێیان گۆڕاو، سەرو ڕۆژی تریان لەحەفتەدا بۆ خۆیان هەڵبژارد، بەلاَم لەسایەی خودای گەورەوە ئێمە ڕێمان پێی بردو دۆزیمانەوەو ڕێزو قەدری ئەم ڕۆژە پیرۆزە دەگرینو کردومانە بەجەژن، خەڵکەکەی تریش وان لەدوای ئێمەوە: ئەوەتا سبەینێ کەشەمەیە، ڕۆژی جولەکەیەو، دووسبەینێش کە یەك شەمەیە ڕۆژی گاورانە).

---

(٤٠٧) اخرجه مسلم في الجمعة، باب: هداية هذه الامة ليوم الجمعة، رقم: ٨٥٥ =١٩٧٥، ١٩٧٧، ١٩٧٨.

## خۆبۆنخۆش كردن بۆ هەینی

٤٦٦- عن أَبِي سَعِيدٍ الخدري (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ وَأَنْ يَسْتَنَّ وَأَنْ يَمَسَّ طِيبًا إِنْ وَجَدَ)(الحديث: ٨٨٠ في فتح البارى).[٤٠٨]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: شایەتی دەدەم كە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: (خۆشۆردن (غوسڵ) ی ڕۆژی هەینی پێویست (واجب)ە، لەسەر هەموو مووسوڵمانێكی رەسیدە هەروا سیواك كردنیش پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێكی رەسیدە، لەڕۆژی هەینی دا، هەروەها خۆبۆنخۆش كردنیش، بەلاَم بە مەرجێ بۆنی خۆشی دەست كەوێ)

## باسی گەورەیی هەینی (فَضلُ الجُمُعَةِ)

٤٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً فَإِذا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضرَتْ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذكْرَ) (الحديث رقم:٨٨١ في فتح البارى شرح صحيح البخارى للمسقلانى- عليه الرحمة والرضوان).[٤٠٩]

ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕۆژی هەینی هەر موسڵمانێ خۆی بشۆرێ (لەچەشنی خۆشۆردنی لەش پیسی

---

(٤٠٨) اخرجه مسلم في الجمعة، باب: الطيب والسواك يوم الجمعة، رقم: ٨٤٦ = ١٩٥٧.

(٤٠٩) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: وجوب غسل الجمعة على كل بالغ من الرجال، وباب: الطيب والسواك يوم الجمعة، رقم: ٨٥٠=١٩٦١.

دەرکردن) ئەوجا لەکاتژێری یەکەما بڕوا بۆنوێژی هەینیو، لە مزگەوت چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکا، یاخود لەوێ خۆی خەریك بکات بەتاعەتو زیکرو یادی خوداوە، وەك قورئان خوێندنو سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تاکاتی ووتارو نوێژەکەدێ،ئەوەی ئەمە بکات وەك ووشترێك بکا بەخێروایە، وەئەوەی لە کاژێری دووەما بچێ وەك ڕەشە ووڵاخێ بکا بەخێروایە، وە ئەوەی لەکاژێری سێیەمدا بچێ وەك بەرانێکی شاخ داربکا بەخێروایە، وەئەوەی لەکاتژێری چوارەمدا بچێ وەك مریشکێ بکا بەخێر وایە،وەئەوەی لەکاژێری پێنجەمدا بچێ وەك هێلکەیەك بکات بەخێروایە، کاتێك کە پێشنوێژیش دەرچوو، کەبچێ بۆسەر مینبەر، بۆووتاری هەینی خوێندنەوە، ئیتر فریشتەکانیش دەچن گوێ لەووتارو خوتبە کەدەگرنو ئەوەی کەلەوەو دوا دێ، ناوی لەدەفتەری ئەواندا نانوسرێ، مەبەست ئەودەفتەرەیانە کەتایبەتە بۆنوسینی ئەوکەسانە کەلەیەکێ لەم پێنج کاژێرانەدا دێن بۆجومعە).

## ڕۆندان لەسەرو ڕیش

٤٦٨- عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ فَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الْإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى) (الحديث: ٨٨٣- طرفه في: ٩١٠ ).[٤١٠]

سەلمانی فارسی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: (ئەوپیاوەی لەڕۆژی هەینی دا، خۆی بشۆرێو،تابۆی دەکرێ خۆی پاكو خاوێن ڕابگرێو، سەروڕیشی خۆی

(٤١٠) من افراد البخاری (انظرفتح الباری ٤٩٦/٢-خاتمة (المترجم )

شانەبکاو، لەڕۆنی فڕی ڕۆنیـان لیّ بـدا، یالـەو بۆنەخۆشـەیکە لەماڵەوەهەیانـە خۆی بۆنخۆش بکا، ئینجا لەماڵ دەرچیّ و بچیّ بۆ مزگەوت و لـەویّ نـەبیّ بـە ئـەرك وزەحمـەت بـۆ کـەس و، خـۆی نەترنجێنێتـە نێـوانی دوو کەسـەوە و، سـەخڵە تیـان بکـا، ئـەوجا ئەوەنـدەی کـە خـودای گـەورە لـە چارەی نووسـیوە نوێژی سوننەت بکا، وە کاتیّ کە پێشنوێژ دەست دەکا بـە فەرمایشت و ووتـار خوێندنەوە، ئەو بیّ دەنگ بیّ وگویّ بگریّ لە قسەکانی ، ئەو پیاوەی لە ڕۆژی هەینیدا ئەمانە بکا ، بیّ گومان کە خودا خۆش دەبیّ لە گوناهی نێوان هەینی پێشووی و ئەم هەینییەی).

**ڕوون کردنەوە :**

ئـەبوو عەبـدوڵڵا سـەلمانی فارسـی ، یەکێکـە لـە هاوڕیّ نـاوداره نازدارەکـانی پێغەمبەر (ڕەزای خوای لـیّ بیّ)، خەڵکی رامە هورمـوزه لـە ولاّتـی ئەسـپەهان، تەمەنی زۆرزۆر درێژ بووه، تەنانەت زۆر لـە مێژوونوسـەکان دەڵێن (٢٥٠-٣٥٠) سـاڵ ژیـاوە . مرۆڤێکـی هەسـت ناسـکی سروشـت پـاك بـووه ، بەسروشـتپاکیی خۆی بێزی لە ئایینە پووچەکانی پێش ئیسلام کردۆتەوه، وێڵ بووه لە شـوێن ئایینێکی ڕاست و دروستی ڕێکی سروشتی پاکی ، تا لە سەرەنجاما بە خزمـەت حەزرەت دەگا ، وە ئەشقی ئیسلام دەبیّ. کاتیّ دەنگ وباسی هـاتنی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بیّ) دەبیستیّ ، دیّ بـۆ خزمـەتی ، بـەلاّم لـە ڕیّ دیـل دەکـریّ و، لـە مەدینە دەفرۆشریّ ودەکریّ بە کۆیلە. لە سایەی ئیسلامەوە ئازاد دەبـیّ ، لـە غەزای خەندەقا بەشداری کـردووه، ئـەو ئەنـدازیاری هەڵکەنـدنی خەندەقەکـە بـوو، بـەدەوری شـاری مەدینـەدا ، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـیّ) زۆری خـۆش دەویست، دەیفەرموو: (سَلْمانُ مِنَّا اهْلَ البَيْتِ) هـەروا پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بیّ) دەفـەرمویّ : (بەهەشـت ئارەزوومەنـدی دیـداری ئـەم سـیّ کەسـەیە: عـەلی و عەممار و سەلمان).

ئامادەی غەزای خەندەق و هەموو غەزاكانی پاش خەندەق بووە، هەروا بەشداریی لە ئازاد كردنی وولاتی عێراقدا كردووە، بۆماوەیێ بووە بە سەرەكشاری مەدائین، كە ئێستا ناودارە بە سەلمانی پاك، لەنزیك بەغداوەیە، تاقی كیسرا وا لەوێ.

سەلمان پیاوێكی زانای بەهرەمەندی خێرخوای خاوەن زوهدی لە خواترسی سۆفیلكەی چلەكێش (موتەقەششیف) بوو، مووچە و بەراتەكەی پێنج هەزار درەم بوو، كە وەری دەگرت یەك سەر دەیكرد بەخێر، بە دەستی خۆی لە پەلكە خورما و شتی تری وا چنراوی دەچنی و بەوە دەژیا، دیاری و دەسەنە وخێر و یارمەتی لە كەس وەرنەدەگرت، بە ڕەنجی شانی خۆی دەژیا، وەك حەزرەتی داوود (سەلامی خوای لێ بێ) سەلمان خانوی نەبوو، زوربەی كات لەبن سێبەری دیوارو درەختا دادەنیشت، هەتاپیاوێ قایلی كرد كەكولبەیەكی وای بۆدروست بكا، كەلە باوبۆران‌و خۆرەتاو بیپارێزێ، بەلام بە مەرجێ ئەوەندە تەنگە بەرو تەسك‌و تروسك بێ ئەگەر لەناوی دا ڕابوەستێ سەری بدا لەبنمیچەكەی، ئەگەر قاچ درێژبكا، قاچی بدرێ لەدیوارەكەی! ئەویش ڕازی بوو.

سەلمان گوێی بەجێ و بەرگی كەشخە نەدەدا، عابایەكی هەبوو لایەكی دەكردە بەری‌و، ئەولایەكەی تری لەژێریا دادەخست! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتێ پەیمانی برایەتی (موئاخات) ی بەست لەناو موسوڵمانانیدا، سەلمان‌و ئەبودەردای كرد بە برای ئاینی یەكتری. گەلێ لەهاوڕێیانی پێغەمبەرو لەچینی دووهەمی موسوڵمانان، واتە: لەسەحابەو تابعین، زانست‌و سوننەت‌و شەریعەتیان لەسەلمانەوە وەرگرتووە، لەهاوڕێیان وەك ئەم زاتانە: ئیمامی ئەنەسی كوڕی مالیك‌و كەعبی كوڕی عوجرەو ئیبنو عەبباس و ئەبوسەعیدی خودری‌و ئیبنو عومەرو ئەبول توفەیل، لەپەیڕەوانیش (تابعین: شوێن كەوتوان) وەك ئەم زاتانە: ئەبوعوسمانی ئەل‌نەهدی‌و تاریق ئیبنو شیهاب‌و سەعیدی كوڕی وەهاب.

سەلمان (ڕەزای خوای لێ بێ) گەرچی زۆر زۆر تەمەن درێژ بوو، وەژیانێکی زۆرزبرو پڕلە زوهدو چلە کێشیو کەمخۆریو شەونخونی هەبوو، بەلام لەسایەی خوداوە تابڵێی چالاكو لەش سوكو بەتوانا بووە، بەبەلگەی ئەوە کەلەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەلمان بەشداری لەغەزاو شەڕو شۆڕو کوشتاردا وەك جاران دەکرد، چوستو چالاکی ڕۆژانەی هەربەردەوام بووە، تەنانەت توانای ژنو مێردیشی مابوو، ژنێکی لەهۆزی کیندە هێنا، بۆیە زەهەبی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێشا وا حالی بوم کە هەموو فەرمایشتەکان ئەوە دەگەیەنن کەتەمەنی سەلمان لەدووسەدووپەنجا سالْ تێپەڕیوە، راجیایی تەنیا لەوە داهەیە: کە ئایا تەمەنی لەوە تێپەڕ بووە یان نا؟ ). ئەوجا دەفەرموێ: (بەلام لەپاش دا لەمە پەشیمان بوومەوە، وەبۆم دەرکەوت کەتەمەنی سەلمان لەهەشتا سالْ زیاتر نەبووە!).

بەلام شێخی عەسقەلانی (رەحمەتی خوای لێ بێ) لەئیصابەدا دەفەرموێ: (زەهەبی سەرچاوەی ئەم بۆ چونەی خۆی ڕون نەکردۆتەوە، وادەزانم لەوەی وەرگرتووە کەسەلمان لەپاش مەرگی پێغەمبەریش بەشی خۆی چالاکی جەستەیی‌ماوە،ئەوەتا بەشداریی لەفوتوحاتی پاش مەرگی پێغەمبەردا کردووە، وە ژنێکیشی لەهۆزی کیندە هێناوە، کەشتی وانیشانەی بەردەوامی چالاکی ئاسایی کاتی پێش پیری یە) تا ئەوێ کەدەفەرموێ: (.. شتی وا بۆ سەلمان، لە خەواریقی عاداتە، واتە: لەو ڕوداوە بەرچاوانەیە، کەسنووری ئاسایی وێنەی خۆیان دەبەزێننو لەیاسا ئاسایی شکێنەکانن). هیچ مانیع و ڕێگرێك نییە لەراستیو دروستی ی ئەوە، ئەوەتا ئەبو شەیخ لەتەبەقاتی ئەسپا نی یاندا دەفەرموێ: (زانین دۆستەکان دەفەرمون: بەبێ گومان کەسەلمان دووسەدوپەنجا سالْ ژیاوە، ئەگەر سێسەدو پەنجا سالْ نەژیابێ).

بەندەش کەوەرگێڕی ئەم نامەیەم دەڵێم :

بەبۆچونی بەندە هەربابەتێ پەیوەندی بەئاینەوە هەبێ، بەڵگەی ئەقڵی زۆر رۆڵ نابینێ، قسە قسەی بەڵگەی ئەقڵییە، مەگەر بەئاشکرا عەقڵ ئەو قسەیە بەهەڵەیەکی پەتی دابنێ دەنا ئەگەر ئێمە تەنیا بەپێوەری ژیری رووت، بەتایبەتی بەپێی بیرو باوەڕی داسەپاوی بەناو زانستیو عەقڵانی ئەمڕۆ، بڕیاربدەین، دەبێ زوربەی سیرەتو ژیان نامەی پێغەمبەرانو یارانیانو پیاو چاکان رەت بکەینەوە.

دەقی قورئانو دەقی سونەتی ڕاستو دروستو دەقی نامەی پیرۆزی یەهودو نەصارا، کەئێستاش ئەو دەقانە هەموو، بەرێكو پێكیو بەدروستی ماون،بەڵگەی ڕۆشنن لەسەرڕودانی زۆر شتی نائاساییو خاریقی عادەت لەژیانی پێغەمبەرانو یارانیانداو، هەروا لەژیانی پیاو چاکاندا.

لەقورئانوتەورات دا دەفەرموێ: نووح دەوری هەزار ساڵ ژیاوە، لەقورئاندا دەفەرموێ: ئەصحابو الكهف دەوری سێ سەدساڵ لەئەشکەوتەکەدا خەویان لێ کەوت، زوربەی زانایان دەفەرموون: خدری زیندە هەتا ئێستاش هەرماوەونەمردوە!

تەنانەت لەم چەرخەی ئێمەش دا تەمەن درێژی واهەیە لەسەدو پەنجا ساڵ تێپەڕیوە.

### هەڵوێستێکی مەردانە:

کاك دوکتۆر موحەممەد شەریف گێڕایەوە، گوتی: (گەرمەی جەنگی کەنداو بوو، فەرەنسا پشتگیرییەکی تەواوی عێراقی دەکرد، مێشێل عەفلەق خۆی لەپاریس بوو، لەوکاتەدا منو وەزیری ئەوقاف لەگەڵ وەفدێکی دەوڵەتێکی ئیسلامی دا، چووین بۆ سەردانی مەرقەدی ئیمامی ئەعظەم (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەبەغدا، مەلای مزگەوتی ئیمامی ئەعظەم میش پێشوازی لێ کردینو لەگەڵماناهاتو دەرگاکەی بۆکردینەوە. کەچوینە ژوو رەوە،

لەشوێنێكی دیاری بەرچاودا، بەخەتێكی گەورە ئەم حەدیسە هەڵواسرا بوو: (لوكان الايمانُ عند الثريا لناله رجالٌ من بلادِ فارِسَ).

گوتی: ئاغای وەزیر كەچاوی بەمە كەوت چاوی پەڕییە تەوقی سەری، لەمەلای مزگەوتەكە تووڕە بوو، گوتی: ئەمە چییە لێرەدا هەڵواسراوە، زووكەن لایدەن، لایدەن!

گوتی: ئیمامی مزگەوتەكەش زۆر لەسەر خۆ گوتی: جەنابی وەزیر، ئەوە (بلادی فارس) نیی، بەڵكوو (بلاد بارس)ە.

گوتی: وەزیر ئەمری دەركرد: مەلاكە نەقڵ بكرێو عوقوبەتیش بدرێ.

جاسەلمان لەپاش تەمەنێكی درێژی پیرۆز، لەمەدائن لە دوادوایی جێنشینی عوسماندا، لەساڵی سیو پێنجی كۆچی دا گیانی سپارد، گۆڕی پیرۆزی هەتا ئێستایش زیارەتگایە وا لەسەلمان پاك. ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەسەلمان و لەهەموو هاوڕێ یانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپاس بۆ خودا من بەش بەحاڵی خۆم دێنی گۆڕەكەیم كردوە.

٤٦٩– عن ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أنه قيل له: ذَكَرُوا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اغْتَسِلُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْسِلُوا رُءُوسَكُمْ وَإِنْ لَمْ تَكُونُوا جُنُبًا وَأَصِيبُوا مِنْ الطيبِ) قال ابن عباس: أما الغَلُ فنعم، وأمّا الطيب فلا أدرى (الحديث: ٨٨٤–طرفه في: ٨٨٥). [٤١١]

طاووس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: عەرزی ئیبنو عەباسم كرد: واباس دەكەن كەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ڕۆژی هەینی سەرو لەشی خۆتان تەواو بشۆرن، بالەشیشتان پیس نەبێ، وەخۆشتان بۆن خۆش بكەن، ئیبنو

(٤١١) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: الطيب والسواك يوم الجمعة، رقم: ٨٤٨ = ١٩٥٧، ١٩٦١.

عەباسیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: بۆ خۆشۆردن بەڵێ وای فەرمووە، بەلاّم بۆ خۆبۆن خۆش کردن نازانم کەوای فەرمووە یانا.

(باش ترین بەرگی، بۆچوون بۆ نوێژی هەینی لەبەردەکا)

٤٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَر رضى الله عنهما) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذا قَدِمُوا عَلَيْكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ) ثمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا حُلَلٌ فَأَعْطى عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مِنْهَا حُلَّةً فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطارِدٍ مَا قُلْتَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا) لِتَلْبَسَهَا فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَخًا لَهُ بِمَكَّةَ مُشْرِكًا) (الحديث: ٨٨٦-اطرافه في: ٩٤٨، ٢١٠٤، ٢٦١٢، ٢٦١٩، ٣٠٥٤، ٥٨٤١، ٥٩٨١، ٦٠٨١ ).[٤١٢]

عەبدوڵلاّی کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: جارێ عومەری کوڕی خەطاب قاتێکی ئاوریشمی پەتی لەبەر دەرگای مزگەوتا دەبینێ، عەرزی حەزرەت دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا خۆزگا ئەم دەستە جلەت دەکڕی، بۆ ڕۆژی هەینی لەبەرت دەکرد، هەروەها کاتێ وەفدێ دێن بۆ خزمەتت لەبەری بکە.

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم جۆرە جلە لەبەر ئەوەی کەئاوریشمی پەتییە ئەو پیاوانە لەبەری دەکەن کەبەشیان بەنازو نیعمەتی ئەوجیهانەوەنەبێ). لەپاشا چەند دەستێ لەوجۆرە بەرگە ئاوریشمینە هێنران بۆپێغەمبەر (ڕەحمەتی خوای ل بێ) پێغەمبەرئەو قاتانەی دابەش کرد بەسەر هاوڕێیانی

---

(٤١٢) اخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: تحريم استعمال إناء الذ هب والفضة...، رقم: ٢٠٦٨ . راجع ٥٣٥٦ وما بعده.

دا، دەستێکی لێیان نارد بۆ عومەر. عومەر عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژە کەعەطاریدی بازرگان قاتێکی لەم جۆرەی لەبەر دەمی مزگەوتدا دانا بوو، من عەرزم کردی ئەم قاتە بکڕەو بۆڕۆژانی هەینیو بۆ پێشوازی وەفد لەبەری بکە، تۆ فەرمووت شتی وا پیاوێ لەبەری دەکا کەبەشی بەخۆشی ئەو جیهانەوە نەبێ، کەچی ئێستا تۆخۆت لەهەمان جۆرە قات، قاتێکت بۆم ناردووە، بفەرموو ئەمەم تێ بگەیەنە!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆمن ئێستا ئەم قاتەم بۆ ئەوە بۆت نەناردووە کەخۆت لەبەری بکەی، دەتوانی بەشێوەیەکی تر سوودی لێ وەربگری). ئیتر عومەریش ئەو دەستەجلەی دابەبرایەکی هاوبەشپەیداکەری خۆی، کەهێشتا موسوڵمان نەبوو بوو، هەر لە مەککە نیشتەجێ بوو.

## سیواك کردنی ڕۆژی هەینی

٤٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:( لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ). (الحديث: ٨٨٧-طرفه في: ٧٢٤٠).[٤١٣]

لەئەبوو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەبادا ئەرك بخەمە سەرشانی گەلی ئیسلامم، دەنابۆ کردنی گشت نوێژێ فەرمانم پێ دەکردن کەسیواك بکەن).

٤٧٢-عن أَنَسٌ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -(أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ).(الحديث: ٨٨٨).[٤١٤]

---

(٤١٣) أخرجه مسلم في الطهارة، باب: السواك، رقم: ٢٥٢ = راجع رقم: ١٩٥٧ ومابعده.

(٤١٤) الظاهر انه من افراد البخارى. لاحظ(العينى/١٣/١٨٢/٦) و(فتح البارى/٢/٤٩٦-خاتمة)-المترجم).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: (خۆتان دەزانن کەسەبارەت بەسیواك زۆرم لەگەڵ داگوتن، کەواتە هەقوایە کەبەگوێم بکەن!).

## لەنوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی دا چی سوننەتە بخوێندرێت

٤٧٣-عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ، فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ: ( الم تَنْزِيلُ) السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ ). (الحديث: ٨٩١-طرفه في: ١٠٦٨).(٤١٥)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەمیشە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەرکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا، لەپاش خوێندنی سورەتی فاتیحا، سورەتی ئەلیف لام میمی سەجدەی بەتەوای دەخوێند، وەلەرکاتی دوەمیدا، لەپاش فاتیحە، سورەتی (هل أتى على الانسان حين من الدهر)ی دەخوێند.

## باسی کردنی هەینی لەگوندو شاردا

٤٧٤-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما) سَمِعْت -رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقُولُ:(كُلُّكُمْ رَاعٍ، وكلكم مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ،فَالْإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ راعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ،وَالْمَرْأَةُ راعيةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا ومَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا وَالْخَادِمُ راعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ و مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ). قَال: وَحْسِبتُ أن قدقَالَ: (وَالرَّجُلُ راعٍ فِي مَالِ أَبِيهِ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ). (الحديث: ٨٩٣- أطرفه في: ٢٤٠٩،٢٥٥٤،٢٥٥٨،٢٧٥١،٥١٨٨،٥٢٠٠،٧١٣٨):(٤١٦).

---

(٤١٥) اخرجه مسلم في الجمعة، باب: مايقرا في يوم الجمعة، رقم: ٨٨٠ = ٢٠٢٥ شيحا.

(٤١٦) اخرجه مسلم في المغازى (العينى/٦/١٩٠/١٨)- المترجم = ٤٧٠١.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەرم بیست (دروودی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (ئاگاداربن کەئێوە هەموتان، هەرکەسە بەپێی بەر پرسیاریی خۆی چاودێرن وەك شوانی دیار ران، پێشەوا کەسەرۆکی نەتەوەی ئیسلامە-شوانی ئەوکۆمەڵە خەڵکەیە، کەبووە بەسەرۆکیان، لەلای خودا بەرپرسیارە لەئەرکی پێشەوایی، سەبارەت بەو گەلی ئیسلامە، کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا، هەروا هەموو پیاوێ (لەناو ماڵومناڵی خۆیدا) چاودێرەو شوانیانە، دەبێ وەك شوانی باش چاودێریی بەرژەوەندی ماڵو مناڵی خۆی بکا، چونکە لەلای خودا بەرپرسیارە لەوە، هەروەها هەموو ژنێ (لەناو ماڵی مێردیدا) چاودێرەو،لەلای خودای گەورە بەرپرسیارە لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ئەوانەی کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا،هەروەها نۆکەریش چاودێرە بەدیار سامانی ئاغاکەیەوە، وەلەلای خودای گەورە بەرپرسیارە لەوەی کەوا لەژێرچاودێریی ئەودا). ئیبنوعومەر فەرمووی: وادەزانم کەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (هەروەها پیاو چاودێرە لەناو سامانی باوکی دا، وەلەلای خودا بەر پرسیارە لە چاودێرکراوی خۆی، تێکرا ئێوەی گەلی ئیسلام، هەموتان، هەرکەسەی بەپێ ی پایەو پلەی خۆی، چاودێرنو پاسەوانن، وەهەمویشتان، هەر کەسە بەپێ ی پایەی خۆی لەناو گەلی ئیسلام دا، بەرپرسیارن لەرەچاو کردنی بەرژەوەندی ئەوەی کەوا لەژێر چاودێریتان دا). (تاج-٣ ز-١٠٦ ژ-٢٤٣١ چ-٤).

## ئەگەرکەسێ نەچێ بۆ نوێژی هەینی ئایا خۆشۆردنی لەسەرە وەك ژنو مناڵ

٤٧٥ –عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنه) قَال:قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّم)–(نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ ، فَهَذا الْيَوْمُ الَّذي اخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانَا اللّٰهُ، فَغَدًا لِلْيَهُودِ، وَبَعْدَ غَدٍ

لِلنَّصَارَى) فَسَكَتَ، ثُمَّ قَالَ: (حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ، يَوْماً، يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ ).(الحديث ٨٩٦ و٨٩٧،الحديث ٨٩٧طرفاه في :٨٩٨، ٣٤٨٧)(٤١٧)

**بڕوانه: فەرموودەی ژمارە (٤٦٥) كە لە پێشەوە رابورد.**

**لێرەدا لە دواوە ئەم پترى (زيادە) یەی هەیە:**

**ئەوجا حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) خامۆش بوو، لەپاشا فەرمووى : كەواتە مافی خودای گەورەیە لە سەر هەموو موسوڵمانێ، كە هەموو حەفتەیێ، جارێ سەر ولەش ولارى خۆى پاك بشۆرێ).**

## لە ماوەی چەندەوە دەبێ بچن بۆ نوێژی هەینی ..

٤٧٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ:كَانَ النَّاسُ يَنْتَابُونَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ مَنَازِلِهِمْ وَالْعَوَالِي،فَيَأْتُونَ فِي الْغُبَارِ يُصِيبُهُمُ الْغُبَارُ وَالْعَرَقُ، فَيَخْرُجُ مِنْهُمُ الْعَرَقُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنْسَانٌ مِنْهُمْ وَهُوَ عِنْدِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:(لَوْ أَنَّكُمْ تَطَهَّرْتُمْ لِيَوْمِكُمْ هَذا). (الحديث: ٩٠٢)(٤١٨)

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر(دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرموی: خەڵكێكی زۆر بەسەرە لەگوندو جێگەو دێهاتەكانی دەوروبەری مەدینەوە، دەهاتن بۆ نوێژی هەینی، بەتایبەتی لەوگوندانەوە دەهاتن كە پێیان دەگوترا عەوالی، كەدەوری دوومیل تا شەش میل لە مەدینەوە دوور بوون، لەلای ڕۆژ هەڵاتیەوە، كەدەهاتن رێگەكە خۆڵەپەتانی بوو، بەناوتەپوتۆزا دەهاتن، هەم تۆزاوی دەبونو هەم ئارەقیان دەكرد، بەهەر حاڵ بەهۆی بۆنی ئەرەقو شتیواوە، كێشەیان بۆ هاونشین دروست دەكرد، جارێ پێغەمبەر(دروودى خوداى لەسەر بێ) لەماڵی**

---

**(٤١٧) أخرجه مسلم في الجمعة، باب:الطيب والسواك يوم الجمعة،برقم:٨٤٩ = ١٩٦٠.**

**(٤١٨) اخرجه مسلم في الجمعة، باب: وجوب غسل الجمعة على كل بالغ من الرجال ،برقم:٨٤٧ = ١٩٥٥ شيحا.**

من بوو، خۆم لەخزمەتیدا بووم، مرۆڤێ لەمانە، یاچەند کسێ لەمانە هاتن بۆ خزمەتی، لەسەر ئەم حاڵە، جاپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:(خۆزگە لەم رۆژەدا، کەدەهاتن بۆ نوێژی جومعە،خۆتان بشۆردایەو، بەپێ ی توانا خۆتان پاكو خاوێن رابگرتایە).

## کاتی کردنی نوێژی هەینی ..

٤٧٦- (مكرّر) قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَانَ النَّاسُ مَهَنَةَ أَنْفُسِهِمْ وَكَانُوا إِذَا رَاحُوا إِلَى الْجُمُعَةِ، رَاحُوا فِي هَيْئَتِهِمْ، فَقِيلَ لَهُمْ: (لَوْ اغْتَسَلْتُمْ). (الحديث: ٩٠٣-طرفة في : ٢٠٧١).

دیسان عائشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران موسوڵمانان خۆیان خزمەتی خۆیانیان دەکرد،زوربەیان خۆیان نۆکەری خۆیان بوون، رەنجبەرو خزمەتکاریان نەبوو، جاکە لەسەرەتای تاقی ئێوارەدا دەچوون بۆ نوێژی هەینی، لەسەر کارو فەرمانەکانیانەوە دەرۆیشتن بۆ مزگەوت، هەربەو شێوەیەو بەجلو بەرگی ئیشو پیشەکانیانەوە ئامادەی نوێژەکە دەبوون. بۆیە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (ئەگەر خۆتان پاك بشۆردایە زۆر شتی چاك بوو!).

٤٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ. (الحديث: ٩٠٤).[٤١٩]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوکاتە نوێژی جومعەی دادەبەست، کەخۆر بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کە دەق دەکاتە سەرەتای کاتی نوێژی نیوەڕۆ.

---

(٤١٩) لم يواقه مسلم على تخريجه. انظر(فتح٢/٤٩٦-٩٤١-خاتمة) -(المترجم)

## لەقرچەی گەرمادا، کاتی نوێژی هەینی کەیە ؟

٤٧٨- وعنه (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: كان النبي(درروودی خودای لەسەر بێ) إذا اشتد البرد بكر بالصلاة، وإذا اشتد الحر أبرد بالصلاة، يعني الجمعة. (الحديث: ٩٠٦ في فتح الباری شرح صحيح البخاري).[٤٢٠]

**دیسان ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) وا بوولەتەشقی سەرمای زەستاندا نوێژی هەینی زوو بەزو لەسەرەتای کاتدا دەکرد، بەلاّم کاتێ گەرما دەهات، بەفێنکی نوێژی هەینی دەکرد، تاماوەیێ دواى دەخست لە قرچەی گەرمای نوێژی نیوەڕۆدا نەیدەکرد.**

## باسی ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی ..تاد

٤٧٩-عن ابی عَبْسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: وهوَ ذاهِبُ إِلَى الْجُمُعَةِ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (درروودی خودای لەسەر بێ) يَقُولُ : (مَنْ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ). (الحديث: ٩٠٧-طرفه في: ٢٨١١).[٤٢١]

**ئەبو عەبس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەچوو بۆ جومعە بەدەم ڕێوە فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو : (ئەو کەسەی بۆڕەزای خوا ، قاچەکانی تۆزی ڕێگەی لێ بنیشێ ، وەك ئەوە بچێ بۆ نوێژی هەینیو لەڕێ تەپو تۆز لەپێی یا لەخۆی بنیشێ، یا لەکاتی چوون بۆ غەزادا قاچەکانی خۆڵاوی بن، ئەوکەسەی ئەمە حاڵی بێ خودا لە ئاگری دۆزەخ حەرامی دەکا).**

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

**ئەبو عەبس (ڕەزای خوای لێ بێ) ناوی عەبدورەحمانی کوڕی جەبرە، ئەنصارییە، ئەوسیێ یە، یەکێکە لەمەزنانی هاوڕێیانی پێغەمبەر، یەکێ بوو لەوانەی**

---

(٤٢٠) لم يوافقه مسلم على تخريجه(المصدر السابق)-المترجم.

(٤٢١) قال في فتح الباری: لم يوافقه على تخريجه مسلم(انظر فتح/٢/٤٩٦/٩٤١-خاتمة) -المترجم.

کەکەعبی کوڕی ئەشرەفیان بەدۆزەخ شاد کرد، کەبەشیعر زەمی پێغەمبەری دەکردو دڵی خەڵکی لێ سارد دەکردەوە،لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی غەزای بەدرۆ گشت غەزاکانی تری بووە، لەگەڵ ئەبو بوردەدا کاتێ موسوڵمان بوون، دەستیان کرد بە شکاندنی بتەکانی هۆزی بەنی حاریسە. کاتێ ئەبو عەبسە کوێر بوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) گۆچانێکی پێ داو، پێی فەرموو: (ئەمە بکە بە چراوگ بۆ خۆت) ئیتر لەبەر دەمیەوە تاماوەیەکی باش ڕوناکی دەکردەوە بۆی. لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمەدینە، لەساڵی سیو چواردا گیانی پاکی سپارد، لەگۆڕستانی جەننەتول بەقیع بە خاك سپێردرا، ئیمامی عوسمان نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، ئەم زاتانە دابەزینە ناوگۆڕەکەی: ئەبو بوردەو قەتادەی کوڕی نوعمان و محەمەدی کوڕی مەسلەمەو سەلەمەی کوڕی سەلامە، ڕەزای خودا لەهەمویان بێ.

تەنها ئەم فەرمودەیەی هەیە لەبوخاریدا کەواین لەخزمەتیدا. یەکێ بوو لەوژمارە کەمەی کە لەپێش هاتنی ئیسلامدا بە عەرەبی دەینووسی.

## دروست نیە کەسێك کەسێکی تر هەڵبسێنێو خۆی لە جێگەکەی دابنیشێ

٤٨٠– عن ابْنَ عُمَرَ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْ يُقِيمَ الرَّجُلُ أَخَاهُ مِنْ مَقْعَدِهِ وَيَجْلِسَ فِيهِ. قُلْتُ لِنَافِعٍ الْجُمُعَةَ قَالَ الْجُمُعَةَ وَغَيْرَهَا. (الحديث: ٩١١–طرفاه في: ٦٢٧٠،٦٢٦٩).[٤٢٢]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەو گیری دەکرد لەوە: کەپیاوێ، لەکۆڕی دانیشتندا، برای ئاینی خۆی لەجێکەی خۆی هەڵبستێنێو، ئەوجا خۆی لەوێدا دابنیشێ.

---

(٤٢٢) هذا الحديث أخرجه مسلم (رَضي اللهُ عنهُ) في الاستئنان عن يحيى بن حبيب(عينى/٢٠٩/٦-٣٤المرتجم).

ئیبنو جورەیج (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: عەرزی نافیعم کرد: ئایا ئەم نەهی لێ کردنەلەم کارە هەربۆ ڕۆژی جومعە وایە؟ نافیع فەرمووی: نەخێر بۆ ڕۆژی هەینیو بۆ ڕۆژەکانی تریش هەروایە.

## بانگی ڕۆژی هەینی

٤٨١- عَنْ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النِّدَاءُ يَوْمَ الْجُمُعَة، أَوَّلُهُ إذا جَلَسَ الْإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَر، عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا، فَلَمَّا كَانَ عُثمَانُ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَكَثرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثالِث عَلَى الزَّوْرَاءِ . (الحديث:٩١٢-أطرافه في:٩١٣,٩١٥,٩١٦).[٤٢٣]

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: جاران لەسەر دەمی پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی ئەبوبکرو عومەریش دا (ڕەزای خوایان لێ بێ) سەرەتای بانگ، لەڕۆژی هەینی دا، ئەو کاتەبوو کەپێش نوێژ لەسەر مینبەردا دادەنیشت، بەڵام کاتێ کەعوسمان بوو بەجێنشین خەڵك زۆر بوونو شاری مەدینە قەرەباڵغ بوو، عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) بانگی سێیەمی لەسەر زەوراء زیاد کرد (ب/د/ت/ن-تاج/١/٤٢٢ ز-١٤٦ ژ-٨٤٣).

## یەك بانگبێژ بانگ دەفەرموێ

٤٨٢- وعنه (رَضي اللهُ عَنْهُ) لَمْ يَكُنْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُؤَذِّنٌ غَيْرَ وَاحِدٍ، وَكَانَ التَّأْذِينُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حِينَ يَجْلِسُ الْإِمَامُ, يَعْنِي عَلَى الْمِنْبَر. (الحديث: ٩١٣).

دیسان ئەو فەرموی: عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێ) لەڕۆژی هەینی دا، بانگی سێهەمی داهێنا، ئەوکاتەی کە خەڵکی مەدینە زۆر بوون، چونکە پێغەمبەر

---

(٤٢٣) ٤٨١، ٤٨٢- لم يخرجهما مسلم-(فتح/٢/٤٩٦-خاتمة) المترجم.

خۆی(درودی خودای لەسەر بێ) یەك بانگ بێژی هەبووئەویش ئەوکاتە بانگی دەفەرموو کە پێغەمبەر (کەبەرنوێژ خوێنی ئەوکاتەبوو) دادەنیشت لەسەر دوانگە.

## پێشنوێژ لەسەر دوانگە، کەگوێی لەبانگ بوو وەلامی دەسەنێتەوە

٤٨٣– عن معاوية بن أبي سفيان (رَضِي اللهُ عَنهُما) انه جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوم الجمعة فلَمَّا أَذنَ الْمُؤَذنُ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ قَالَ مُعَاوِيَةُ (رَضي اللهُ عَنهُ) اللَّهُ أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ وَأَنَا فقَالَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ وَأَنَا فَلَمَّا أَنْ قَضى التَّأْذينَ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى هَذا الْمَجْلِسِ حِينَ أَذنَ الْمُؤَذنُ يَقُولُ مَا سَمِعْتُمْ مِنِّي مِنْ مَقَالَتِي. (الحديث: ٩١٤).[٤٢٤]

موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) ڕۆژی هەینی لەسەر دوانگە دانیشت، کاتێ بانگوێژ دەستی کرد بەبانگ گوتن و فەرموی: (الله اکبر، الله اکبر) موعاوییەش فەرمووی: (الله اکبر، الله اکبر) بەلام کاتێ بانگ بێژ فەرمووی: (أشهد أن لا إله إلا الله) موعاوییە فەرمووی: منیش هەروا وەك تۆ ئەم شایەتیە دەدەم، وەکاتێ بانگ بێژ فەرمووی: (أشهد أن محمدا رسول الله) موعاوییە دیسان فەرموویەوە: منیش هەروا وەك تۆ ئەم شایەتی بەحەقە دەدەم. جاکاتێ بانگ دەرەکە بانگەکەی تەواو کرد، مووعاویە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی نوێژ خوێنی نە! ئەم وەلام سەندنەوەی بانگە کە ئێستا ئێوەلەسەر ئەم شێوەیە لەدەمی منتان بیست، بۆ خۆم لەسەر ئەم جێگەیە لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە، کەلەو دەمەدا بانگ دەر بانگی دەفەرموو، ئەویش ئاوای دەفەرموو.

---

(٤٢٤) لاحظ (فتح/٢/٤٩٦-خاتمة)- المترجم؟.

## واپەسەندە وتار لەسەر دوانگە بدرا

٤٨٤- عَنْ سَهْلِ بن سعدِ السَّاعدي (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رِجَالًا أَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَقَدْ امْتَرَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِمَّ عُودُهُ فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْرِفُ مِمَّا هُوَ وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَوَّلَ يَوْمٍ وُضِعَ وَأَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى فُلَانَةَ امْرَأَةٍ مِنْ الْأَنْصَارِ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ مُرِي غُلَامَكِ النَّجَّارَ أَنْ يَعْمَلَ لِي أَعْوَادًا أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذا كَلَّمْتُ النَّاسَ فَأَمَرَتْهُ فَعَمِلَهَا مِنْ طَرْفَاءِ الْغَابَةِ ثُمَّ جَاءَ بِهَا فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ هَا هُنَا ثُمَّ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى عَلَيْهَا وَكَبَّرَ وَهُوَ عَلَيْهَا ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا ثُمَّ نَزَلَ الْقَهْقَرَى فَسَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ ثُمَّ عَادَ فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذا لِتَأْتَمُّوا وَلِتَعَلَّمُوا صَلَاتِي. (الحديث: ٩١٧). (٤٢٥)

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خوای لێ بێ) چەند پیاوێ چوون بۆخزمەتی، لەسەر ئەوە کەمینبەرەکەی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەچی دارێ بووە، بوو بوو بە مشتو مڕیان، ئەویش پێی فەرموون: بەخوا من بەباشی دەزانم کەمینبەرەکە لەچی بوو،وە یەکەم ڕۆژ کە داندرا بەچاوی خۆم تەماشایم کرد، هەروا یەکەم ڕۆژیش کەپێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) سەرکەوتە سەری بەچاوی خۆم چاوم لێ ی بوو، داستانی دروست کردنەکەی ئاوا بوو: ژنێکی ئە نصاری هەبوو، نۆکەرێکی دارتاشی هەبوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆلای ئەوژنەو پێ ی فەرموو: (بلێ بەنۆکەرەکەت کە چەند تەختە دارێکم بۆ دروست بکا، لەسەریان دادەنیشم، کاتێ وتار دەدەم بۆ مەردومەکە). ژنەکەش فەرمانی بەنۆکەرەکەی کرد، ئەویش لەدارگەزی جەنگەڵەکە(ئەل-غابە) مینبەرەکەی دروست کرد، ئەوجا ژنەکە هەواڵی بۆ پێغەمبەر(دروودی خودای

(٤٢٥) سبق برقم (٢٤١).

لەسەر بێ) نارد، کەوا دوانگە کە دروست کراوە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموودوانگەکەیان دانا بۆی، ئالەوێدا کەلێ یەتی، بەچاوی خۆم لەوەدوا پێغەمەرم لەسەر ئەو مینبەرە دی، نوێژی لەسەری کرد، ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژدابەستنی کردو قورئانی خوێندو رکوعی برد، لەم حالأنەدا لەسەر تەوقە سەری مینبەرەکە بوو، لەسەر دوا پلەی، کەخۆی سێ پلیکانە بوو،ئەوسا کەلەچەمینەوە هەڵسایەوە،روی لە قیبلە وەرنەگێرا، پشتاو پشت لەمینبەرەکە دابەزی لەسەر زەویەکە لەتەنیشت پلیکانەی خواری خوارەوە کورنوشی برد،ئەوجا سەرکەوتەوە سەر مینبەرەکە، جاکاتێ لەنوێژەکە لێ بۆوە رووی کردە نوێژ کەرەکان و پێ ی فەرموون: (ئەی موسوڵمانەکان! بۆیە ئەم نوێژەم ئاوا کرد هەتا هەموتان بەباشی چاوتان لەجموجوڵی من بێ لەناو نوێژدا، کەچی دەکەم و چۆن دەیکەم، هەتا ئێوەش لە کاتی نوێژکردن دا چاولەمن بکەن و من بکەن بەسەر مەشق و یاسای نوێژ کردن لە خۆمەوە فێر ببن). (بڕوانە ژمارە: ٢٤١).

٤٨٥-عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ جِذْعٌ يَقُومُ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا وُضِعَ لَهُ الْمِنبَرُ سَمِعْنَا لِلْجِذْعِ مِثْلَ أَصْوَاتِ الْعِشَارِ، حَتَّى نَزَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْه. (الحديث٩١٨).[٤٢٦]

جابری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەربانی مزگەوتەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چەند کۆڵەکەیەکی دار خورما دروست کرا بوو، لەپێش داپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) کەوتاری دەخوێندەوە لەپاڵ یەکێ لەو کۆڵەکە دارخورمایانەدا رادەوەستاو شانی پێوە دەدا، بەڵام لەپاش دا کاتێ دوانگەکە دروست کراو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی ڕۆیشتە سەری بۆ وتار خوێندنەوە، وەئەو کۆڵەکەیەی بەجێ هێشت، گوێمان لێ بوو ئەو بنکە

(٤٢٦) لم يوافقه مسلم على تخريجه- المترجم.

دارخورمایــه وەك وشــترێ لەســەر گــوان بــێ، یــا وەك وشــترێ تــازە زابــێو لەبەچـکەکەی دابرابـێ، ئــاوا بــەدوای پێغەمبــەردا دەیکوروکـان، وەك منـاڵێ لـەدایکی بـەجێ مابـێ دەسـتی کـرد بـەگریان هـەتا پێغەمبـەر(درووەی خوەای لەسەر بێ) لەمینبەرەکـە دابـەزیو چـوو بـۆلایو دەسـتی کـردە ملیوئاشـتی کـردەوەو ژیربۆوە.

## وتار دەبێ بەپێوە بێ

٤٨٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَخطبُ قَائِمًا، ثمَّ يَقْعُدُ, ثمَّ يَقُومُ، كَمَا تَفعَلُونَ الْـآنَ. (الحـديث: ٩٢٠-طرفـه في: ٩٢٨).[٤٢٧]

عەبدوڵلای کوڕی عومـەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: جاران پێغەمبـەر(درووەی خوەای لەسەر بێ) بــەپێوە لەنوێــژی هــەینی دا لــەپێش نوێــژی هــەینی دا، دوو وتــاری ئــاینی دەخوێندەوە، ڕێك وەك ئـەوەی ئێـستا ئێوە دەیکـەن، لەپێشدا وتـاری یەکـەمی دەدا بـەپێوە، ئەوجادادەنیـشت، وچـانێکی کـەمی دەگـرت بەقـەد ئەنـدازەی خوێنـدنی سورەتی (قل هو الله) ئەوجا هەڵ دەسایەوە بەپێوە وتاری دووهەمی دەخوێندەوە.

## واباشە لەوتارا لەپاش ستایش، وتار خوێن بڵێ! أما بعد

٤٨٧- عن عَمْرُو بْن تَغْلِبَ (رَضي اللهُ عَنـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِمَال، أَوْ بِسَبْيٍ فقَسَمَه، فَأَعْطى رِجَالًا وَتَرَكَ رِجَالًا، فَبَلَغَهُ أَنَّ الَّـذينَ تَـرَكَ عَتَبُوا، فَحَمِدَ اللَّهَ ثمَّ أَثنَى عَلَيْه، ثمَّ قَالَ: (أَمَّا بَعْدُ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأُعْطي، الرَّجُـلَ وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ الَّذي أُعْطي وَلَكِـنْ أُعْطـي أَقْوَامًـا لِمَـا أَرَى فِـي

---

(٤٢٧) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: دكرا الخطبتين قبل الصلاة وما فيهما من الحلسة، رقم: ٨٦١ = ١٩٩١.

قُلُوبِهِمْ مِنْ الْجَزَعِ وَالْهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَامًا إِلَى مَا جَعَلَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنْ الْغِنَى وَالْخَيْرِ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ). فَوَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُمْرَ النَّعَمِ. (الحديث: ٩٢٣-طرفاه في: ٣١٤٥,٧٥٣٥). [٤٢٨]

عەمری کوڕی تەغلیب (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: جارێ بڕێ سامان، یاکۆمەڵێ ژن و خێزانی تالانیان هێنا بۆپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بیٚ) ئەویش دابەشی کرد، خۆی چۆنی بەبەرژەوەند زانی ئاوا، جابەشی بازێکی لیٚ داو، بەشی بازێکی تری لیٚ نەدا، دوایی خەبەر دەگاتەوە بەپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بیٚ) کەوا ئەوانەی کەبەشی پێیان نەداوە گلەیی دەکەن. ئەویش بەم بۆنەیەوە وتارێکی فەرموو: لەسەرەتاوە سوپاسی خوای گەورەی کرد وستایشێکی جوانی ئەوی کردو، ئەوجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بیٚ): (لەپاش ئەم سوپاس و ستایشە عەرزم ئەمەیە: دەی سوێندم بەخودا گەلیٚ جار وادەبیٚ کەمن شت بەش دەکەم لەنێوان ئێوەدا، لەو شتە بەشی هەندیٚ کەس دەدەم و بەشی هەندیٚ کەسی تری لیٚ نادەم، بەڵام لەدڵیشەوە ئەو پیاوەیانم خۆشتر دەویٚ کەبەشیم نەداوە، دەی دەزانن ئەوە بۆ وادەکەم؟ چونکە هەندیٚ کەس دەیان بینم هەرهەڵپە دەکەن و چاوبرسین و چاو چنۆکن، بۆیە منیش بەشیان دەدەم، هەتا دڵیان ڕابگرم و بیان کەم بەدۆستی ئیسلام، لەهەمان کاتا بەشی هەندیٚ کەسی ترنادەم چونکە پشت ئەستورم لەوەی کەئەوانەی بەشیانم نەداوە بەرچاوتێرن و خێر خوان، ئیتر لەسەر ئەم بنیاتە دەیان سپێرم بەو خودایەی کەئاوا بەرچاوتێرو دڵ پڕلەخێر دروستی کردوون. یەکێك لەم خودا پێداوانەی کەمن دڵنیام لەدڵفراوانی یان عەمری کوڕی تەغلیبە !).

جاهەمو جارێ عەمر دەیفەرموو: دەی سوێندم بەخودای گەورە ئەم وشە مەدحەی پێغەمبەر، کەسەبارەت بەمن فەرمووی، بە هەموو ڕانە وشترە

---

(٤٢٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٤٩٦-خاتمة) وقال العيني إنه من أفراد البخاري(عيني/٦/٢٢٤/٤٦)- المترجم.

سورەکانی عەرەبی نادەم، کەرەنگیان دەڵێی رەنگی بزنەمەرمزە، کە نایابترین سامانی عەرەبانن.

## راڤەو شیکردنەوە:

عەمری کوڕی تەغلیب یەکێکە لەهاوڕێ ناسراوە نازدارە ناودارەکانی پێغەمبەر، چەند فەرمودەیەك لەپێغەمبەرەوەدەگێڕێتەوە، لەصەحیحا یەك راوی هەیە کەحەسەنی بەصریە، بەلام لەفەرمودەی تردا، کەنەگەیشتبێتە رادەو پلەی صەحیح راوییەکی تریشی هەیە، کەلەتابیعینەو ناوی حەکەمی کوری ئەعرەجە. لەبوخاریدا تەنیا دوو فەرموودەی هەیە.

لێرەدا ئەم خالانە روون دەکەینەوە، بەئومێدی رچەشکاندن بۆ پیادەکردنی ئەم جۆرە زانستە لەناو زمانی شیرینی کوردیدا:

١- **بەوێنە:** ئەبو عەبدللا ئیمامی حاکم دەفەرمووێ: یەکێ لەمەرجەکانی بوخاریو مسلم ئەوەیە: ئەو سەحابەیەی کەفەرموودەکە دەگێڕێتەوە، دەبێ دوو ڕاوی بڕوا پێکراوی هەبێ، چونکە مەرجی ڕاوی ئەوەیە کەمەجهول-واتە: نەناس- نەبێ، ئەوەیش بەوە دێتەدی کەدووشایەتی دادپەروەر بیناسن و ریوایەتی لێوە بکەن، هەتا رەفعی جەهالەتی لێ بێ، وەهەمان شت مەرجە بۆئەو دووتابیعی یانەی کەریوایەت لەصەحابەکەوەدەکەن، هەریەك لەوانیش دەبێ دوو راوی بڕواپێکراویان هەبێ، هەروا هەمان شت مەرجە بۆهەموو چینەکانی تر.

ئەوجا پێشەوا حاکم دەفەرموێ: کەچی چەند فەرموودەیێ لە صەحیحی بوخاریو، لەصەحیحی مسلیم دا هەیە، کەیەکێکیان ئەم فەرموودەیەی عەمری کوڕی تەغلیبە، ئەم مەرجەیان تیادا نەهاتۆتەدی. شێخی عەسقەلانی لە موقەدیمەی فەتحولباری دا دەفەرمووێ: (ئەم مەرجەی حاکم باسی کردووە گەرچی سەبارەت بەهەندێ سەحابە کەبوخاری ریوایەتی

لێیانــەوەکردوە. هەڵوەشـاوەو رەچـاو نـاکرێ بـەڵام لەچـینەکانی تـری پـاش سـەحابەکاندا، لەگشت فەرموودەیـەکی ئەصڵدا، ئـەم مەرجە بەباشـی رەچاو کـراوە، لەڕاسـتیدا لەپـەڕاووی بوخـاری پـیرۆزدا لەسـەرا سـەری کتێبەکـەدا، تاقەیەك فەرموودەی سەرچاوە(أصل) نییە، کەلەگێرانـەوەی کەسـێبێ کەیـەك راوی هەبێ).

**٢- مەرجی بوخاری ئەمەیە:** (فەرمودەیێ دەردەهێنـێ کە بـە کۆڕا (اتفـاق) راگوێز کـەرەکانی، هـەموویان بـڕوا پێکـراوبن، هـەتا دەگاتـە سـەر هاوڕێیـەکی نـاودار، لـەهاوڕێیانی پێغەمبـەر، بـەبێ ناتـەبایی و لەیـەك جیـاوازی لـەنێوانی گێڕدراوەکانی (مرویـاتی) هەریـەکێ لـەگێڕەرەوە متمانـە داره چەسـپێنەرەکان دا،لەهـەمان کاتـدا دەبـێ ڕشـتەکەی لەسـەرەتاوە هـەتا کۆتـایی پەیوەسـت بـێو پچڕپچڕ نەبێ، جانەگـەر هاوڕێکـە، واتـە: سـەحابیەکە، دوو گێـڕەوەی هـەبوو، یازیـاتر، ئـەوە زۆر باشــە، دەنـا ئەگـەر یـەك گێـڕەرەوە (راوی) ی هــەبوو، بـەڕێکوپێکی بەشـێوەیەکی ڕاسـت فەرمودەکـە دەچـووە سـەر ئـەو هـاوڕێ یـە ئەوەیش هەر بەس دەکا).

**٣- بەشێوەیەکی گـشتی،** بـەکوردی پـەتی، کورتو پوخـت، فـەرموودەکانی صەحیحی بوخاری، هەموویان ئاڵتونی تێزابن، لەسەنگی مەحەك دراون، بۆیە سـەر جـەم جێگـەی قـەبوڵی نەتـەوەی ئیسلامن، کـەس ڕەخنـەی لێیـان نیـە مەگەرناحەزی دەغەز لەدڵ، یانەفامی گێژو وێژ.

٤٨٨- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَامَ عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَتَشَهَّدَ وَأَثنَى عَلَى اللّٰهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثمَّ قَالَ: (أَمَّـا بَعْـدُ). (الحـديث: ٩٢٥-أطرافه في: ٧١٩٧، ٧١٧٤، ٦٩٧٩، ٦٦٣٦، ٢٥٩٧، ١١٥٠). [٤٢٩]

---

(٤٢٩) أخرجه مسلم في المغازی(عينی/٦/٢٣٦/٤٨)- المترجم.

ئەبو حومەیدی ئەل- ساعیدی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتی خەوتنان لەپاش نوێژ، هەڵسایە سەرپێ،وتارێکی خوێندەوە، لەسەرەتاوە شایەتمانی هێنا، فەرمووی: (أشهد أن لاإلة إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) ئەوجا سوپاس و ستایشێ شایستەی پەروەردگار بێت کردی، لەپاشا فەرمووی: (لەپاش ئەمە).

٤٨٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَال: صَعِدَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -الْمِنْبَرَ وَكَانَ آخِرَ مَجْلِسٍ جَلَسَهُ، مُتَعَطفًا مِلْحَفَةً عَلَى مَنْكِبَيْهِ، قَدْ عَصَبَ رَأْسَهُ بِعِصَابَةٍ دَسِمَةٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثمَّ قَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ إِلَيَّ). فَثابُوا إِلَيْهِ، ثمَّ قَالَ: (أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ هَذا الْحَيَّ مِنْ الْأَنْصَارِ يَقِلُّونَ وَيَكْثرُ النَّاسُ، فَمَنْ وَلِيَ شَيْئًا مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَطاعَ أَنْ يَضرَّ فِيهِ أَحَدًا، أَو ينفعَ فِيهِ أَحَداً، فَلْيَقْبَلْ مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَيَتَجَاوَزْ عَنْ مُسِيِّهِمْ). (الحديث: ٩٢٧-طرفاه: ٣٦٢٨،٣٨٠٠).[٤٣٠]

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ هاتەدەرێ، تەشریفی ڕۆیشت بۆ مزگەوت، پاڵتۆیەکی پێچابوو بەخۆیەوە، دابووی بەسەر هەردوو شانیدا، سەرپێچێکی ڕەشیشی پێچابوو بەسەریەوە، ڕۆیشت تا تەشریفی چوو لەسەر دوانگەکەی مزگەوت دانیشت و سوپاس و ستایشی خوایکردو ئەوجا فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! لەمنەوە نزیك ببنەوە) ئەوانیش لەدەوری کۆ بوونەوە، ئەو جافەرمووی:(لەپاش سوپاس و ستایشی خودا، ئەی مەسوڵمانیینە! بزانن تادێ خەڵکی تر زۆر دەبن، بەڵام بەرەبەرە ئەم کۆمەڵەی یاریدەدەرانە، کەناودارن بەئەنصار کەم دەبنەوە، چونکە لەسایەی خواوە لەهەر چوار لاوە هەر خەڵکەو دێ و ئیسلام دەبێ، بەڵام یاریدەدەران چینێکی تایبەتین، بریتین لەو

(٤٣٠) لم یوافقه مسلم علی تخریجه (فتح/٢/٤٩٦- خاتمة) -المترجم.

خەڵکی مەدینەیە، کەکاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) لەمەکەوە کۆچی کردبۆ ناویان، پشتی پێغەمبەریان گرت‌و بوون بەپێشمەرگەو پارێزەری، چاکە یەکێکیان لێ مردکەسێکی تر نایەتە جێگەی، تاوای لێ دێ ڕۆژێ دێ، یاریدەدەران لەچاو خەڵکی تردا، وەك خوێ ناو چێشتیان لێ دێ.

جابا ئامۆژگاری بێ لێتان ئەم چاکەیەی ئەوانتان لەبیر بێ، جاهەرکاتێ کەسێ لەئێوە بوو بەسەرەوکاری کارێ، لەکارو باری گەلی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) وەدەسەڵاتی ئەوەی هەبوو، کەزیان بەکەسێ بگەیەنێ، یاسوودێکی هەبێ بۆ کەسێ، ئەوە با چاکەی چاکیان وەربگرێ‌و چاوپۆشی لەخراپیان بکا).

## نوێژی دیاری مزگەوت لەکاتی وتارا

٤٩٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخطبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: (أَصَلَّيتَ يا فلان؟) قَالَ: لا، قَالَ: (قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ). (الحديث: ٩٣٠-طرفاه في: ١١٦٦، ٩٣١).[٤٣١]

جابری کوڕی عەبدڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی هەینی بۆ مەردومەکە دەخوێندەوە، لەوکاتەدا پیاوێ هاتە ژورەوە ناوی (سولەیك) بوو پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی سولەیك! ئایا نوێژی دیاری مزگەوتت کرد، کەهاتیتە ژوورەوە؟) سولەیك فەرمووی: (نەء) پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەهەڵسە دوو ركات نوێژی سووکەڵە بکە) ئەویش هەڵسا دوو ركات نوێژی کرد.

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

پێشەوا عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم شوێنەدا، بەدورو درێژی لەم بابەتە دەدوێ، وەپتر لەپازدە بەڵگەو بۆچونی ئەو زانایانە پووچ دەکاتەوە، کەدەڵێتن:

---

(٤٣١) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: التحية والامام يخطب رقم:٨٧٥ = ٢٠١٥ شيحا.

هاتوو (داخل) لەكاتی خوتبەی نوێژی هەینی دا دروست نییە كەنوێژی دیاری مزگەوت بكا. پاڵفتەی فەرمایشتەكەی شێخی عەسقەلانی لەفەتح دا ئەمەیە: (ئەم داستانەی سولەیك (رەزای خوای لێ بێ) كەبەچەندین شێوەی جۆراو جۆر، لەلایەن فەرموودە زانە گەورەكانەوە كێڕدراوەتەوە، دروستترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە كەلەم كاتەدا بۆ هاتو دوو ركات نوێژی سڵاوی مزگەوت سوننەتە. لێرەدا بەیادی ئەو هەمكە شاپیاوە مەزنانەوە، لە پێشینانە باشەكانمان، كەئەم هەموو شاكارە جوان جوانانەیان لەپاش خۆیان بە دیاریو یادگار بۆ نەتەوەی ئیسلام بەجێ هێشتووە، بەتایبەت لەبابەتی تەفسیرو سونەتو فیقهدا، لێرەدا بەو پەڕی پەرۆشەوە ئەمەتان عەرز دەكەم.

داخەكەم ئێستا لەوڵاتی ئێمەدا، دوو بەڵای گەورەی دڵتەزێن پەیدابوون، كەبە بیرەوەری من ئەمە نەبوو، ئەهلی دینو ئایین دۆستان، لەدێرین داهەموو یەك دڵویەك دەنگ بوون، بەڵام ئێستا چینی دێرین بەسەرۆكایەتی مەلاكان و چینی نوێ دووبەرەكییەكی گەورەیان دروست كردووە، لەبەر هێرش بردنە سەریەك نایان پەرژێتە سەردوژمنە راستەقینەكانی ئیسلام.

**یەكەم**: مەلای نەزانی نارۆشنبیری گوێلە مشتی پارتە عیلمانییەكان پەیدا بوون، لەباتی موتاڵای توحفەی ئیبنوحەجەرو وەضوحی مەلائەبووبەكری موصەنیف، موراجەعەی(كتابنا وكتابكم)ی بەرپێوە بەری ئەوقاف دەكەن، مەلا باشەكان كەنار خراون، مەگەر چۆنها دەنارێگەی چالاكی ئاینییان نادرێ، بەراستی ئەم مەلا مۆدێرنانە، لەهەموو شتێ دەچن لەمەلا نەبێ.

**دووەم**: كەسانی تریش پەیدا بوون، ئەوانیش نیمچە مۆدێرنێكن هەموو خزمەتەكەیان بۆ ئیسلام، بەناشارەزایی خۆیان، دوو بەرەكیەكی فیقهی یان بەرپا كردووە، دڵی رەشە خەڵك لەرێبازی زانا گەورەكان سارد دەكەنەوە، لەبەر كۆبونەوەو كارو باری حیزبایەتی خۆیان، نایان پەرژێتە سەر جومعەو

جەماعەتو دەوری قورئانو شەونوێژو زیکرو ویردو صەڵاوات، بەهەر حاڵ لەخوا داوا دەکەین کەبەرەحمەتی بێ سنوری خۆی فریای نەتەوەی ئیسلام بکەوێ. ئامین. (١٦-٧-٢٠٠٩).

## داوای باران لەوتاری نوێژی هەینی دا

٤٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَابَتْ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فَبَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا وَضَعَهَا حَتَّى ثَارَ السَّحَابُ أَمْثَالَ الْجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ وَمِنْ الْغَدِ وَبَعْدَ الْغَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ حَتَّى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى.

وَقَامَ ذَلِكَ الْأَعْرَابِيُّ، أَوْ قَالَ غَيْرُهُ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تَهَدَّمَ الْبِنَاءُ وَغَرِقَ الْمَالُ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ (اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا) فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنْ السَّحَابِ إِلَّا انْفَرَجَتْ، وَصَارَتْ الْمَدِينَةُ مِثْلَ الْجَوْبَةِ، وَسَالَ الْوَادِي قَنَاةُ شَهْرًا، وَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَّا حَدَّثَ بِالْجَوْدِ. (الحديث: ٩٣٣). [٤٣٢]

پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی(دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکی مەدینە توشی قاتو قری بوون، ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) خەریك بوو وتاری دەدا، لەوکاتەدا پیاوێ لەعەرەبە سارانشینەکان هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاژەڵو ماڵات قڕبوون، ماڵو منداڵ برسی بوون، لەبەر بێ بارانی، دەی بفەرموو لەخوا بپاڕێرەوە کەبارانمان بۆ ببارێنێ. پێغەمبەریش(دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرز کردەوەو

(٤٣٢) أخرجه مسلم في صلاة الاستسقاء، باب: الدعاء في الاستسقاء،رقم:٨٩٧

فەرمووی:(ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەوکەسە کەگیانی من والەدەسیا، ئاسمان وەك مینا ساف بوو، یەك پەڵە هەوری پێوەنەبوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دانەنەواند، هەتا لەبەرەکەتی دوعاکەیەوە بایێ هەڵی کردو پارچە هەوری وەك کێوی پێك هێنا، بەرە بەرە هەورەکە یەکی گرتو توند بوو، ئیتر باران وەك پلووسك دایکردو ئاسمان دەتگوت کوندەی پڕلە ئاوی سەرەو ژێرەوە کراوە، ئیتر پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوانگەکەی نەهاتە خوارەوە، هەتا دای کردە باران، سەربانی مزگەوتەکە دڵۆپەی کرد، باراناوەکە دڵۆپ دڵۆپ بەسەر ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەردا دەهاتە خوارەوە، ئیتر ئەو حەفتەیە سەراسەر هەتا ڕۆژی هەینی دوایی، بارانمان بۆ باری.

جالە هەینی دوایی دا هەرئەو پیاوەی هەینی پیشوو- یاپیاوێکی تر لەکاتی وتاری هەینی دا هات بەپێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا راوەستاو- عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خانوو رووخاو ڕێگەوبان بڕاو ماڵو سامانو ماڵات لەلافاوا خنکا، ئەوەندە بارانی زۆر باری،بفەرموو لەخودا بپاڕێرەوە کە ئیتر ئەم بارانە بگرێتەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەردە خەنەیێ گرتیو هەردوو دەستەکانی بەرزەوە کردو فەرمووی: (اللهم حوالينا لاعلينا: خودایە! بەدەورو بەرمانا ببیارێنە، نەوەك بەسەر سەرمانا) ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر سەرنجم دەدا پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی پیرۆزی بۆ هەرلایێ ئاماژەی دەکرد، هەورەکە لەوێ دەرەوییەوە، سەرەنجام هەورەکە لەسەر ئاستی شاری مەدینە رەوییەوەو وەك بازنە، وەك کڵاو ڕۆژنەی لێ هات. شیوی قەناتیش، کەیەکێکە لەشیوە کانی شاری مەدینە، یەك مانگی رەبەق لافاوی نەوەستایەوە، لەهەر لایەکی وڵاتیشەوە کەسێ دەهات بۆمەدینە هەواڵو باسی ئەو بارانە زۆرەی دەگێڕایەوە.

## راڤەو شیکردنەوە:

بڕوانە تاج کوردی بەرگی یەك، (ل-٤٧٧ ز-١٧٥ ژ-٩٤٢) هەروەها تاج کوردی، بەرگی چوار لاپەرە(٣٦١). دەبینی ئەم تەرجەمەیە لەکۆی گێڕانەوەکان وەرگیراون.

٤٩٢- عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ). (الحديث: ٩٣٤).[٤٣٣]

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژی هەینی لەوکاتەدا کەپێشنوێژ وتار دەخوێنێتەوە، ئەگەر بەهاونشینی خۆت لەریزی نوێژەکەدا بڵێیت: وس، بێدەنگ بە،ئەوە خۆشت وەك ئەو قسەی بێجادەکەی، کەشتی واپاداشتی نوێژەکە پووچ دەکاتەوە. (تاج/١/٤٣٤/١٠ ز-١٤٩ ژ-٨٨٦).

## راڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کەلەکاتی وتاری نوێژی هەینی دا هەموو جۆرە قسەیێ نەهی لێ کراوە، تەنانەت بۆت نییەکە بەهاونشینەکەت بڵێی: قسە مەکەو گوێ لەوتارەکە بگرە،بەلاّم ئەگەر لەوکاتەدا قسەی کرد بەئاماژە حاڵی بکە کەکاتی قسە کردن نییە.

٤٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ: (فِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ تَعَالَى شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاه)وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا. (الحديث: ٩٣٥-طرفاه في: ٥٢٩٤،٦٤٠٠ ).[٤٣٤]

---

(٤٣٣) أخرجه مسلم في الجمعة،باب:الانصات يوم الجمعة في الخطبة، رقم:٨٥١ = ١٩٦٢.

(٤٣٤) أخرجه مسلم في الجمعة باب: في الساعة التى في يوم الجمعة، رقم: ٨٥٢، ١٩٦٦.

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ڕۆژی هەینی دەکرد، فەرمووی: (کاژێرێکی واتیادایە، هەربەندەیەکی موسوڵمان بۆی ڕێبکەوێ لەوکاتەدا ڕاوەستا بێ نوێژبکا، یاخود بەکوڵو بەدڵ لەخودابپاڕێتەوە، ئیتر لەوکاتەدا داوای هەرشتێکی ڕەوا، لەخێری دینو دنیا لەخودا بکا، خودای گەورە بێ دڵی ناکاو ئەوشتەی پێ دەبەخشێ! ).

فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی پیشانی داین، کەئەو ماوەیە گەلێ کەمە. (تاج/١/٤٣٨/٢ ز-١٥٠ ژ-٨٧٦ = ش/ت/ن).

٤٩٤- عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِاللّٰه (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِذ أَقْبَلَتْ عِيرٌ تَحْمِلُ طعَامًا، فَالْتَفَتُوا إِلَيْهَا حَتَّى مَا بَقِيَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَّا اثنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (وَإِذا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا). (الحديث: ذورقم: ٩٣٦في فتح البارى بشرح صحيح البخارى، أطرافه في: ٢٠٥٨،٢٠٦٤،٤٨٩٩).[٤٣٥]

جابیری کوڕی عەبدڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی هەینی دا، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، خەریکبوو وتاری هەینی دەخوێندەوە، لەوکاتەدا لەشامەوە کاروانێ هات دەهۆڵو زوڕنا لەپێشیەوە بوو، هەتا مەردوم بزانن کەوا کاروانەکە گەیشتەجێ، ئیتر خەڵکەکە وتارەکەیان بەجێ هێشتو لەمزگەوت دەرچونو دەرپەڕین بۆلای کاروانەکە، بۆشت کڕین، تەنها دوازدە کەس لەخزمەتی پێغەمبەردا مانەوە. جاخودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (وَإِذا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا).جومعە١١/٥٢- واتە: ئەوانەی لەدەوری تۆبوون، کاتێ چاویان بە بازرگانی و مامەڵەو سەوداو ئەو کارە بێهوودەیەکەوت، کەبریتی بوو لەودەهۆڵو زوڕنایە، کەلەکاتی واداو لەزۆر کاتی تریش ئادەمیزاد خەریك دەکاو، لەبەندەیی کردنی ساخ بۆ خودای

---

(٤٣٥) اخرجه مسلم في الجمعة، باب: قوله تعالى: (وإذا رأوا..)رقم:٨٦٣ = ١٩٩٤.

مەزن، دوری دەخاتەوە، ئەوانە لەم کاتەدا دەوری تۆیان چۆڵ کردو بلاوەیان لێ کردو چوون بۆلای ئەو بەزمو رەزمە. (ت/٧/١٩٧/ف/د).

٤٩٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلّي قَبْلَ الظهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ لَا يُصَلّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلّي رَكْعَتَيْنِ. (الحديث: ٩٣٧-أطرفه في: ١١٧٢، ١١٦٥، ١١٨٠).[٤٣٦]

**ئیبنوو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(دروودی خودای لەسەر بێ) **دەستوری وابوودوورکات نوێژی سوننەتی لەپێش نوێژی نیوەڕۆوە دەکرد، وەدوورکات لەپاشیەوە، وەدوو ڕکات لەپاش نوێژی شێوانەوە، پێغەمبەر ئەم دوورکاتەی پاش شێوانی لەماڵەوە دەکرد، وەدوو ڕکات لەپاش نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر**(درودی خودای لەسەر بێ) **ئەم دوو ڕکاتەیشی لەمالاوە دەکرد، وە لەپاش نوێژی هەینی نوێژی سونەتی نەدەکرد، تادەگەرایەوە بۆماڵەوەی، لەوێ لەماڵەوە دوورکات نوێژی سونەتی پاش هەینی دەکرد.**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پایانێ

**مامۆستا عەسقەلانی** (رەزای خوای لێ بێ) **لەپایان (خاتمە) ی ئەم نامەیەدا، ئاماژە بۆئەم زانیاریانە دەکا:-**

**یەکەم: (نامەی هەینی حەفتاو نۆ فەرموودەی بەرزەوە کراو(مەرفووع)ی تیادایە، چلو شەشیان پەیوەست(مەوصوول)ن، پازدەیان فەرموودەی بڕشتە(موعەللەق)و موتەبەعاتن، سیو شەشیان دووبارەن، هەیانە لەم**

---

*(٤٣٦) اخرجه مسلم (عينى /٦/٢٤٩/٦٠)-المترجم.*

نامەیەدا دووبارە کراوەتەوە، هەیانە لەنامەکانی پێشیەوە. پوختەکەیان دەکاتە: ٧٩-٣٦=٤٣ فەرموودەی بەرز کراو،کەهەر چل‌وسێکەیان فەرموودەی پەیوەستن، مورسەل‌و موعەللەقیان تیادانییە.

پێشەوامسلم (ڕەزای خوای لێ بێ) وەك پێشەوا بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودانەی هەموو گێراوەتەوە، بێجکە لەم چەند فەرموودەیە:-

١- فەرموودەی ژمارە:(٤٦٨ تەجرید=٨٨٣ فەتحول باری) فەرموودەکەی سەلمان، سەبارەت بەخۆشۆردن‌وموو چەورکردن‌و خۆبۆن خۆش کردن،لەڕۆژی هەینی دا.

٢- ژمارە:(٩٠٠فەتح) لەتەجریدەکەدا لەم شوێنەدا نییە، فەرموودەکەی ئەنەس‌سەبارەت بەبابەتی ڕۆیشتنی ژنان بۆمزگەوت.

٣- ژمارە:(٤٧٧=٩٠٤ف) فەرمودەکەی ئەنەس سەبارەت بەکاتی کردنی نوێژی هەینی، ئەو کاتەی کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا سەرەتای کاتی نوێژی هەینی یە.

٤- ژمارە: (٩٠٥فەتح) لەتەجریدەکەدا لەم باسەدا نەنووسراوە .

٥- ژمارە:(٤٧٨ت=٩٠٦فە).. لەتەشقی سەرمای زستانا نوێژی هەینی زوو بەزوو دەکرد.

٦- ژمارە: (٤٧٩ت=٩٠٧فە) فەرموودەکەی ئەبوو عەبس هەرکەسێ لەڕێگەی خودادا قاچەکانی تۆزی ڕێگەی لێ بنیشێ.

٧- ژمارە:(٤٨١ت=٩١٢ف) فەرموودەکەی سائیب..سەبارەت بەسەرەتای بانگ لەسەر دەمی پیێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیدا.

٨- ژمارە:(٤٨٥ت=٩١٨فە) فەرمودەکەی جابر سەبارەت بەگریانی کۆڵەکە.

٩- ژمارە:(٤٨٧ت=٩٢٣فە) فەرموودەکەی عەمری کوڕی تەغلیب .

١٠- ژماره:(٤٨٩ت=٩٢٧فه) فەرموودەکەی ئیبنو عەباس سەبارەت بەئامۆژگاری خێر، دەربارەی یاریدەدەران..

١١- ژماره:(٩٣٨فەتح) لەتەجریدەکەدا نییە لەبارەی ئەو ژنەوە کەلەپاش نوێژی هەینی سڵقاوی دەرخواردی هاوڕێیان دەدا.

**دووەم:** چوارده بیستراو(ئەسەر)ی صەحابەو تابیعینی وا تیادا. کەواتە: سەرجەمی فەرموودەکانی ئەم نامەیە دەکاتە: ٧٩+١٤=٩٣ .

**تێبینی:** ١- لەم پوختەیە، کەچل وسێ فەرموودەن، سێو یەکیان لەتەجریدەکەدا هەن، لەژماره: (٤٦٥هەتا٤٩٥).واتە: ٤٩٥-٤٦٤=٣١ فەرموودە، چونکە دانەری تەجریدەکە لەسەرەتاکەیەوە دەفەرمووێ:

(..لەم تەجریدەدا رشتەی فەرموودەکانم کرتاندوە، وە فەرموودە دووبارەکان، زوربەی کات لەشوێنی یەکەمیان دا دەنوسم و بەس، لەجێگەکانی دواتردا ئەگەرپتری یەك هەبێ ئەوپترە دەنوسم، دەنا، نا، وەتەنیا ئەوفەرموودانەیش لەم تەجریدەدا دەنوسم کەرشتەدارو پەیوەست بن،واتە: موسنەد و موتتەصل بن، هەرشتێ کەپچراو، یابێ رشتەبێ باسی ناکەم، واتە: مقگووع و موعەللەقەکانی صەحیحی بوخاری لەتەجریدا نییە. هەروا لەم تەجریدەدا ئەو ئەسەرو بیستراوان و هەوالانە تۆمار ناکەم، کەپەیوەندیان هەربەهاوڕێیانی پێغەمبەرەوە هەیە، یابەچینەکانی دوای ئەوانەوە هەیە، وەکەم یازۆر پەیوەندیان بەسونەت یابەپێغەمبەرەوە نییە..).

ئەمەش لە دواوە کورتەیەکی پوختی ئەم سێو یەك فەرموودەی تەجریدەکەیە کەدوور یانزیك پەیوەندیان بەهەینییەوە هەیە: (ڕۆژی هەینی لەحەفتەدا گەورەترین ڕۆژە، واباشە لەم ڕۆژەدا موسوڵمان خۆی خەریك بکابە پەرستشەوە،نوێژەکەی لەسەر پیاوان بەچەند مەرجێ پێویست و فەرزە، خۆبۆن خۆش کردن و خۆشۆردن و سەروریش ڕۆن کردن بۆی سوننەتن،

هەروەها سیواك كردن، سوننەتە مرۆڤ زوو بڕوات بۆنوێژی هەینی بۆمزگەت، وەلەوێ خەریكی نوێژو قورئان خوێندنو صەڵاواتو یادی خودا بێ، هەتا وتار خوێن دەست دەكا بەوتارخوێندنەوە، ئەوكاتە بەدڵو بەكوڵ گوێ لەوتارەكە بگرێو وازلەشتی تر بهێنێ).

كاتێ دەچێ بۆمزگەوت لەماڵەوە دەستنوێژ بگرێو جلێكی پاكی ڕێكو پێك بپۆشێو، كەگەیشتە ناو مزگەوت هەنگاو بەسەر سەری خەڵكا نەنێو نەبێ بەئازار بۆكەس، وەك ئەوە بەزۆر خۆی بترنجێنێتە نێوانی دووكەسەوە، یاكەسی تر هەڵبستێنێو خۆی لەجێگەكەی ئەو دابنیشێ.

سوننەتە كەگەیشتەناو مزگەوت دووركات نوێژی سڵاوی مزگەوت بكا،تەنانەت ئەگەر پێشنوێژیش دەستی كردبوو بەوتار، ئەویەكسەر بەبێ دواخستن نوێژی دیاری مزگەوت بكا.

سوننەتە نوێژەكەی لەسەرەتای كاتی نوێژی نیوە ڕۆوە بكرێ، سوننەتە وتارەكە وتاری رۆژبێ، بەپێ ی پێویستو بەرژەوەندی ئەو دەمەی كۆمەڵی موسوڵمانان بێ.

٣- لەهەندێ شوێن خوێنەر وارەچاو دەكا كەئەو فەرموودەیە پەیوەندی بەباتی بەردەستەوە نییە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆهۆیەكی هونەری كەلەصەحیحی بوخاریدا رەچاو كراوە، بەڵام لەبەر كورتەكاری لەتەجریدەكەدا ئەوسەر باسەكرتاوە. بۆ نموونە فەرمودەی(٤٨٧) چی پەیوەندیەكی بەهەینی یەوە هەیە؟ جا كە دەگەڕێیتەوە بۆسەر صەحیحی بوخاری دەبینی، ئەم فەرموودەیە بوخاری بەو بۆنەیەوە هێناویەتی،كەلەسەرەتای وتارەوە لەپاش سوپاسو ستایشی خوای گەورە،سوننەتە وتارخوێن بڵێ: (أما بعد).

(وەرگێر)

بسم الله الرحمن الرحيم

## ١٨-باسەكانى نوێژى ترس (أبواب صلاة الخوف)

٤٩٦- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: (غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا الْعَدُوَّ فَصَافَفْنَا لَهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي لَنَا، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ تُصَلِّي وَأَقْبَلَتْ طَائِفَةٌ عَلَى الْعَدُوِّ، وَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَنْ مَعَهُ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا مَكَانَ الطَائِفَةِ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ فَجَاءُوا، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهِمْ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ). (الحديث: ٩٤٢ أطرافه في: ٩٤٣،٤١٣٢،٤١٣٣،٤٥٣٥).[٤٣٧]

وعنهُ- في روايةٍ- قَالَ: عَن النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (وإن كانُوا أكثرَ مِن ذلك فيصَلُوا قِيَاماً وَرُكبَاناً). (الحديث: ٩٤٣).

عەبدڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا(درودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجدرۆشتین بۆغەزا، ڕۆیسشتین تابەرەنگاری دوژمن بووینەوە،کەروبەرویان بووینەوە،ڕیزمان بەست بۆیان، جاپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) هەستا لەسەرئەم شێوەیە لەوغەزایەدا کەغەزای زاتوریقاع بوو، نوێژی ترسی بۆکردین: موسوڵمانەکان بوون بەدووتاقم: تاقمەیەکیان لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەر بێ) نوێژیان دابەست، ئەو تاقمەکەی تریشیان بەچەکەوە بەرامبەری دوژمن راوەستان، ئێشکی ئەوانیان دەگرت،جاپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) ركاتێكی بەوتاقمەیە تەواوكرد، كەلەسەرەتاوە لەگەڵیدا نوێژیان دابەست، بەم رەنگە لەگەڵ پێغەمبەردا فاتیحایان خوێندو چەمینەوەی ركاتی یەكەمیان تەواو كردو دوو كوڕنوشیان برد، ئەوجا لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەر بێ) راست بوونەوە، پێغەمبەر(درودی

---

(٤٣٧) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب صلاة الخوف رقم: ٨٣٩ = ١٩٤١.

خودای لەسەر بێ) دەستی کردبەخوێندنی قورئانی ناونوێژو، ئەوانیش هەڵسانەوەو بەبێ ئەوەی کەسلاو بدەنەوە ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەوتاقمەکەی ترکەهەتا ئەودەمە ئێشکیان دەگرت،وەلەشوێنی ئەوان بوون بەپاسەوانی سوپاکە، ئنجا دەستەکەی ترهاتنو لەپشت پێغەمبەرەوە ریزبوونو نوێژیان لەپشت پێغەمبەرەوە دابەستو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ڕکاتێکی بەوانیش تەواو کرد،بەم رەنگە ئەوانیش فاتیحەو سوورەتیان خوێندو لەگەڵ پێغەمبەردا چەمینەوەیان ئەنجام داو دووکورنوشیان لەگەڵی دا بردو،شیتر پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشت بۆ تەحیات خوێندن و تەحیاتی خوێند و سلاوی دایەوە، ئەوجا هەریەکێ لەو دوو تاقمەیە هەڵسانەوەو، هەرکەسەی سەرو ڕکاتی تری بەتەنیا بۆخۆی کردو سلاوی دایەوە.

لەگێرانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر دوژمن لەمە زۆرتر بوون ترسیش زۆرتر دەبێ، جالەکاتی وادا چۆن چۆنی دەستی دا بۆتان نوێژە کانتان بکەن، بەپیادەیی بوو، بەسواری بوو،بەهەر شێوەیێ بۆتان دەست دەدا نوێژی خۆتان بکەن).

(بڕوانە تاج/کوردی/٤٤٢/١ هەتا ٤٤٦ . ز-١٥٢ ژ-٨٨٤ هەتا ٨٨٨. فیقهی ئاسان بەرگی/١لاپەرە٢٥٢. تاج/ك/٤٦/٦ فەرموودەی ژمارە: ٥٤).

## ڕوون کردنەوە:

١-مەبەست لەنوێژی ترس نوێژێکی تایبەتی نییە، کەلەکاتی ترس دافەرزبێ، یاسوننەت بێ، مەبەست کردنی پێنج نوێژە فەرزەکەیە، کەلەکاتی شەڕو شۆڕدا لەسەریەکێ لەوچەند شێوەیەی کەلەسونەتدا تۆمار کراون بکرێن. ئیبنو حەزم دەفەرمووێ: (لەگێڕانەوەی ساغ دا چواردە شێوەی نوێژی

ترس تۆمار کراون، کەپێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) لەغەزاکانیدا کردوویانی) هەندێکی تر دەفەرموون: (حەڤدە شێوە چەسپاوە).

٢-ئەم نوێژەی کەلەم غەزایەدا لەسەر ئەم شێوەیە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) بەجەماعەت کردی بۆهاوڕێیانی هەندێ فەرموویانە: نوێژی عەصر بووە، هەندێکی ترفەرموویانە: نوێژی نیوەڕۆ بووە.

٣-نوێژی ترس ئەگەربەکۆمەڵی بکرێ، بەسێ کەس کەمتر ناکرێ.

٤٩٧- عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَنَا لَمَّا رَجَعَ مِنْ الْأَحْزَابِ (لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ). فَأَدْرَكَ بَعْضَهُمْ الْعَصْرُ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذَلِكَ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ (الحديث:٩٤٦- أطرافه في:٤١١٩).[٤٣٨]

دیسان ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەقا، کەپێشی دەگوترێ: غەزای ئەحزاب،ناموسوڵمانەکان بەنائومێدی گەرانەوەو پێغەمبەرو موسوڵمانەکانیش سەنگەرەکانیان چۆڵ کردو بەسەر بەرزی گەرانەوە بۆماڵەوە، پێغەمبەر بەیارانی خۆی فەرموو: (خۆ دیتان ئەم جوولەکە نامەردانەی هۆزی نەوەی قورەیزە چی نامەردییەکیان لەگەڵ کردین‌و چۆن لەم کاتە ناسکەدا دەستیان خستە ناودەستی دوژمنی سەروماڵ‌و ئاینی ئێمەوەو پەیمانی نێوانی ئێمەوخۆیان شکاند، کەواتە: کەس نوێژی عەصرنەکا هەتا نەچینە ناو بەنی قورەیظە ونەدەین بەسەریاندا).

کەدەکەونە ڕێ بەرەوبەنی قورەیظە، دەستەیێ لەیاران لەڕێ نوێژی عەصریان لێ دەبێ، دەبن بەدوو دەستەوە، لایەکیان دەڵێن: ئێمە نوێژ ناکەین تانەچینە ئەوێ، لاکەی تردەڵێن: ئێمە نوێژی خۆمان دەکەین، چونکە

(٤٣٨) أخرجه مسلم في الجهادوالسير، باب:المبادرة بالغزو..رقم:١٧٧٠.

مەبەستی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) لەو قسەیە ئەمە نەبوو، کەلەرێ نوێژ نەکەین تانەگەینە ئەوێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو کەدەستو بردکەینو زوو بڕۆین بۆسەریان، جاکاتێ کەئەمەیان عەرزی پێغەمبەر کردسەرزەنشتی کەسیانی نەکرد(تاج/٨/٢٢١-ش).

## پایانێ

عەسقەلانی دەفەرموێ: باسەکانی نوێژی ترس شەش فەرموودەی بەرزە وە بووی پەیوەستی واتیادا، دوانیان لەپێشەوە دووبارە بوونەتەوە، پوختەکەیان چوار فەرموودەیە، پێشەوا موسلیمیش گێراوی یانەتەوە، تەنیا فەرمودەکەی ئیبو عەباس نەبێ، کەلەتەجریدەکەدا نییە، لەفەتح دا ژمارەکەی: ٩٤٤. هەروا دەفەرمووێ: شەش بیستراون (ئەثەر)ی صەحابەو تابیعینی واتیادا، لەتەجریدەکەدا دوانیان هاتووە، کەژمارە: ٤٩٧،٤٩٦.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ١٩-نامەی هەردوو جەژنەکان (كتاب العيدين)

## باسی یاری کردن لەجەژندا بەقەڵغانو نێزە

٤٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ، تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، وَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي، وَقَالَ: مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ عَلَيْهِ السَّلَام فَقَالَ: (دَعْهُمَا) فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا. (الحديث: ٩٤٩-أطرافه في: ٩٥٢،٩٨٧،٢٩٠٧،٣٥٣٠، ٣٩٣١).[٤٣٩]

---

(٤٣٩) اخرجه مسلم في العيدين، باب: الرخصه في اللعب الذى لآمعصية فيه، رقم: ٨٩٢ - ٢٠٥٨.

**عائیشه** (ڕهزای خوای لێ بێ) **فهرمووی: دووکهنیزهکم لهلابوون، گۆرانیان دهگوت، بهسهر ههرای ڕۆژهکهی بوعاسدا، سروودیان دهگوت، کهکوشتارێکی زۆر لهوڕۆژهدا لهپێش هاتنی ئیسلام دا، لهنێوانی ئهوسو خهزرهج دا، ڕووی دابوو، لهو کاتهدا پێغهمبهر**(دروودی خودای لهسهر بێ) **هاته ژورهوه، تهشریفی چوولهسهر نوێنهکهی خۆی پاڵکهوتو ڕووی لهئێمه وهرچهرخان، پاش کهمێ ئهبوبهکری باوکیشم تهشریفی هات، چاوی بهحاڵهکه کهوت، لهپێشا لهمنی خوڕیو پیاما ههڵشاخا، ئهوجا فهرمووی: (بالۆرهی شهیتانو لهخزمهت پێغهمبهری خوادا؟ شتی واچۆن دهکهن؟).**

**پێغهمبهریش** (دروودی خودای لهسهر بێ) **ڕووی‌کرده ئهبووبهکرو فهرمووی: (ئهی ئهبووبهکر! وازیان لێ بێنه، باسرودهکهیان بڵێن، چونکه ئهمڕۆ جهژنی موسوڵمانانه). (تاج/١/٤٥٨/١+٢ ز-١٦٣ ژ-٩١٥).**

**عائیشه فهرمووی: جاکاتێ ئهبووبهکر ئاگای لهئێمه نهما، بهئاماژه تێم گهیاندن کهبڕۆن، کهنیشکهکانیش ڕۆیشتن.**

## ڕۆژی جهژنی ڕهمهزان، شتێ بخوا، ئهوسا بڕوا بۆنوێژی جهژن

٤٩٩– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَغْدُو يَوْمَ الْفِطرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ. وفي رِوَايَةٍ عَنهُ: وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا (الحديث:٩٥٣).[٤٤٠]

**ئهنهس** (ڕهزای خوای لێ بێ) **فهرمووی: دهستوری پێغهمبهر**(دروودی خودای لهسهر بێ) **لهڕۆژی جهژنی ڕهمهزاندا وابوو: ههتاچهن دهنکێ خورمای تاکی نهخواردایه نهدهچوو بۆ نوێژی جهژن. (تاج/١/٤٥٢/٤ ز-١٥٩ ژ-٩٠٠).**

---

(٤٤٠) لم يوافقه مسلم على تخريجه(عينى/٦/٢٧٤/٥. فتح البارى/ ٢ص٥٥٣-خاتمة) –المترجم.

## سوننەتی هەردوو جەژن بۆ موسوڵمانان

٥٠٠- عَنْ الْبَرَاء (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطب، فَقَالَ:(إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ مِنْ يَوْمِنَا هَذا أَنْ نُصَلِّيَ، ثمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا). (الحديث: ٩٥١-أطرافه في:٩٥٥، ٩٦٥، ٩٦٨، ٩٧٦، ٩٨٣، ٥٥٤٥، ٥٥٥٦، ٥٥٥٧، ٥٥٦٠، ٥٥٦٣، ٦٦٧٣).[٤٤١]

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) وتاری دەفەرموو، دەیفەرموو: (یەکەم پەرستشی ئێمە-لەم ڕۆژەماندا-ئەوەیە کەلەپێش دا نوێژی جەژن بکەین، ئەحجا بگەڕێینەوەو قوربانی سەربڕین، جاهەر موسوڵمانێ ئاوا بکا، لەپێش دا نوێژی جەژن بکاو ئەوجابگەڕێتەوە قوربانی سەربڕێ، ئەوە یاساو سوننەتی ئێمەی پێکاوە). (ت/٤/٣٩/٧).

## باسی شت خواردن لەڕۆژی جەژنی قورباندا

٥٠١- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ خَطَبَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْأَضحَى بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: (مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَإِنَّهُ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَا نُسُكَ لَهُ). فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ، خَالُ الْبَرَاءِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنِّي نَسَكْتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، وَأَحْبَبْتُ أَنْ تَكُونَ شَاتِي أَوَّلَ مَا يُذبَحُ فِي بَيْتِي، فَذبَحْتُ شَاتِي وَتَغَدَّيْتُ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الصَّلَاةَ، قَالَ: (شَاتُكَ شَاةُ لَحْم). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنَّ عِنْدَنَا عَنَاقًا لَنَا جَذعَةً، هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ أَفَتَجْزِي عَنِّي؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ). (الحديث:٩٥٥).[٤٤٢]

---

(٤٤١) أخرجه مسلم في الذبائح (عينى/٦/٢٧٢/٣) -المترجم.

(٤٤٢) وافقه مسلم على تخريجه. أنظر صحيح مسلم بشرح النووى ج/١٣ ص ١١٢ وما بعدها: (فتح/٢/٥٥٣-خاتمة)-المترجم.

بەرائی کوڕی عازب (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی جەژنی قورباندا لەپاش کردنی نوێژی جەژن پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی فەرموو: تیایدا فەرمووی: (کەسێ وەك ئێمە ئەم نوێژە بکا،ئەوجا وەك ئێمە قوربانی بکا، ئەوە یاسای قوربانی کردنی پێکاوە، بەڵام کەسێ لەپێش نوێژی جەژندا قوربانی سەربڕێ،ئەوە بری قوربانی ناکەوێ، چونکە لەپێش نوێژەوە بووە! ).

ئەبو بوردەی خاڵم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! دەسا من قوربانییەکەمم لەپێش کردنی نوێژی جەژندا سەربڕی، چونکە وامزانی کەئەمڕۆ جەژنەو ڕۆژی شت خواردن‌و شت خواردنەومیە، وەپێم خۆش بوو کەیەکەم شت کەلەماڵەکەما سەربڕێ ئەو قوربانییەبێ، لەبەر ئەوە ئاژەڵێکی وردەم سەربڕی‌و کردم بەقوربانی، وەپێش ئەوەی کەبێم بۆ نوێژی جەژن قاوەلتی بەیانیم کردووە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەوە بری قوربانی ناکەوێ، دادەنرێ بەکوشتییەکی ئاسایی) خاڵیشم عەرزی کرد: باشە ئەی پێغەمبەری خودا! گێسکە مێیەکمان هەیە، لەباری دڵی من دا لەدووبزنی سەرە باشترە، ئەگەر ئەو گێسکە مێیە بکەم بەقوربانی بری قوربانی دەکەوێ یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ بری قوربانی دەکەوێ، بەڵام بەس بۆتۆ بری دەکەوێ، بۆکەسی تر شتیوا نابێ، کردنی گێسك بەقوربانی تایبەتمەندە بەتۆوە). (ت/٤/٣٩/٧).

## راڤەو شیکردنەوە:

(شات) واتە: مەڕیابزن، واتە: ئاژەڵی وردە، چونکە ئاژەڵ ناوە بۆچوار شت، وەك لەئەحمەدیدا ئاماژە دەکاکە (ئەنعام)-واتە: ئاژەڵ- ناوی بزن‌و مەوڕ و ووشترو گایە.

## چوون بۆ نوێژ گاکە بەبێ دوانگە

٥٠٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِي (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخرُجُ يَوْمَ الْفِطرِ وَالْأَضحَى إِلَى الْمُصَلَّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلَاةُ، ثمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، وَالنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ فَيَعِظُهُمْ وَيُوصِيهِمْ وَيَأْمُرُهُمْ: فَإِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَقْطَعَ بَعْثا قَطعَهُ أَوْ يَأْمُرَ بِشَيْءٍ أَمَرَ بِهِ، ثمَّ يَنْصَرِف.

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلَمْ يَزَلْ النَّاسُ عَلَى ذلِكَ حَتَّى خَرَجْتُ مَعَ مَرْوَان (وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ) فِي أَضحَى أَوْ فِطرٍ فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمُصَلَّى إِذا مِنْبَرٌ بَنَاهُ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ، فَإِذا مَرْوَانُ يُرِيدُ أَنْ يَرْتَقِيَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَجَبَذتُ بِثوْبِهِ، فَجَبَذنِي، فَارْتَفَعَ فَخَطبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقُلْتُ لَهُ: غَيَّرْتُمْ وَاللّٰهِ. فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ قَدْ ذهَبَ مَا تَعْلَمُ، فَقُلْتُ: مَا أَعْلَمُ وَاللّٰهِ خَيْرٌ مِمَّا لَا أَعْلَمُ. فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَجْلِسُونَ لَنَا بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَجَعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ. (الحديث: ٩٥٦).[٤٤٣]

ئەبوسەعیدی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: لەڕۆژی جەژنی رەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانداَ،بۆنوێژی جەژن دەڕۆیشت بۆنوێژگاکە، کەجێگەیێ بوو لەناو شاری مەدینەدا، لەدەرگای مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە هەزار گەزێ دوور بوو، یەکەم شت کەدەستی پێ دەکرد نوێژی جەژن بوو، کەلەنوێژەکە دەبۆوەهەڵ دەستایە سەرپێو رووی دەکردە خەڵکەکە، خەڵکەکەیش هەرکەسەیان لەجێگەی خۆیاندا، لەناو ریزەکەیاندا بەرامبەر پێغەمبەر دادەنیشتن، ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی جەژنی دەخوێند: ئامۆژگاری دەکردن، پەندی دادەدان، راسپێری خێری دەکردن، فەرمانی پێیان دەکرد بەچاکە، نەهی لێ دەکردن لەخراپە، لەسەر دەمی پێغەمبەردا لەنوێژگاکە دوانگە نەبوو.

---

(٤٤٣) أخرجه مسلم في أوائل كتاب صلاة العيدين، رقم: ٨٨٩ = ٢٠٤٩، ٢٠٥٠.

ئـەوجا ئەگـەر بيويـستايە پـەلێ پێشمەرگە بنێـرێ بۆئـەركێكی سـەربازی، جيای دەكردنـەوەو ديـاری دەكـردن، يائەگـەر سـەبارەت بەبابـەتێ فـەرمانێكی هەبوايە دەيفەرموو، لەپاشا لەنوێژگاكەوە دەگەرايەوە بۆ مەدينە.

ئەبو سەعيد فەرمووی: ئيتر موسوڵمانان لەجـەژنانا لەسـەر ئـەم دەستورە بـەردەوام بـوون، هـەتا لـەو سـەردەمەدا كەمـەڕوان فـەرمانڕەوای مەدينـەبوو، لەجـەژنی قوربانـا بـوو يالەجـەژنی ڕەمـەزانا، لەگـەڵ مـەڕوانا دەرچـووين بـۆ نوێـژی جـەژن لەنوێژگاكـە، كەگەيـشتينە نوێژگاكـە تەماشـام كـرد والـەوێ مينبەرێ دروست كراوە، كەسيری كوڕی صەلت دروستی كردبـوو، مـەڕوانيش ويستی يەكسەر لەپێش كردنی نوێـژی جەژنـدا هـەڵ بكوتێتـە سـەری‌و دەست بكا بەوتار خوێندنەوە ! .

منـيش لەبـەر ئـەوەی هـەتا ئەوكاتـە شـتی وام نـەديبوو: كـەوتار لـەپێش نوێژدا بخوێنرێتەوە، جلەكەيم گرت، كەسـەر نەكـەوێ بۆوتـار تانوێژەكەنـەكا، بەڵام خۆی لەدەستم ڕاپسكان‌و سـەركەوتە سـەردوانگەكەو لـەپێش نوێژەكـەدا وتارەكەی خوێندەوە.

منـيش پـێم گـوت: بـەخوا سـونەتی پێغەمبـەرو جێنـشينە باشـەكانی پێغەمبەرتان سەبارەت بەم بابەتە گۆڕيوە، ئەوەتا پاش‌و پێشی تيادا دەكـەن، ئەوەی حەقی پێشخستنە، پاشی دەخـەن، هـەروا بەپێچەوانە يشەوە! ئـەويش گوتی: ئـەی ئـەبو سـەعيد! ئـەوەی تـۆ دەيزانـی بەسـەر چووە؟ منـيش گوتم بـەخوا ئـەوەی كـەمن دەيـزانم سـەبارەت بـەم بابەتـە، كەسونەتی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ لەمـە باشـترە كـەئێوە دەيكـەن، مـن ئاگـام لەشـتی وانييـە، مـەڕوانيش گـوتی: ئـاخر خەڵكەكـە وەك جـاران نـەماون، هەركـە نوێژەكـەيان كـرد دەڕۆن، لـەپاش نوێـژ دانانيـشن كـە گـوێ لـەوتاری ئێمـەبگرن،منـيش وتارەكەم خستە پێش نوێژەكەوە هەتا ناچاربن كەگوێی لێ بگرن.

## راڤەو ڕونكردنەوە:

لەپێڕستەكەی بۆ سوورەتەكانی قورئانی پیرۆزم دانا بوو،كەزوربەی لەبەرگی حەوتەمی تاج داپەخشەوە بووە، ئەم دووشیعرەی لێ كرتابوو، كەجێگەی خۆیەتی بەبۆنەی ئەم فەرمودەیەوە بیان نووسین، جارێ لەبەغدا، لەخزمەتی جەنابی مامۆستا مەلاعەبدولكەریمی بیارەدا بووم، مامۆستا باسی ئەوەیكرد كەئەمڕۆ ئیسلام هەر ناوی ماوە، هەناوی نەماوە. منیش ئەم دووشیعرەم بۆخوێندەوە، زۆری بەلاوە پەسەند بوو:

شورا بەزوخروف رووكەش كراوە
داخم لەناومان بەس ناوی ماوە
زۆرشت لەم دینە لەكار خراوە
وەك گورگان خواردوو قولاخی ماوە

## چوون بۆنوێژی جەژن بەپێ یابەسواری، وتار لەپێش نوێژەكەدایە، بانگو قامەت ناكرێن بۆ نوێژی جەژن

٥٠٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاس وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰه رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ قَالَا: لَمْ يَكُنْ يُؤَذنُ يَوْمَ الْفِطرِ وَلَا يَوْمَ الْأَضحَى (الحديث: ٩٦٠).

عەبدللای كوڕی عەباسو جابری كوڕی عەبدللا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: نەلەڕۆژی جەژنی ڕەمەزاناو نەلەڕۆژی جەژنی قوربانا، بۆنوێژی جەژن بانگ نەدەدرا.

٥٠٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُما) قَالَ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثمَانَ رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ- فَكُلّهُمْ كَانُوا يُصلّونَ قَبْلَ الْخُطبَةِ. (الحديث: ٩٦٢).[٤٤٤]

---

(٤٤٤) أخرجه مسلم (عينى/٦/٢٨١/١٠.فتح/٢/٥٥٣-خاتمة)-المترجم.

**ئیبنو عەباس** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا**(درودی خودای لەسەر بێ) **لەخزمەت ئەبووبەکردو عومەرو عوسماندا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **ئامادەی نوێژی جەژن بووم، هەموویان لەپێش خوتبەوە نوێژی جەژنیان دەکرد .**

## گەورەیی خێری کردەوەی چاکە لەچوار ڕۆژەی جەژنی قوربانا

**٥٠٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاس (رَضي اللهُ عَنهُما) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَا الْعَمَلُ فِي أَيَّامٍ أَفْضلَ مِنْهَا فِي هَذهِ) قَالُوا: وَلَا الْجِهَاد؟ قَالَ: وَلَا الْجِهَادُ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ. (الحديث: ٩٦٩).[٤٤٥]**

**ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هیچ ڕۆژانێ نییە کەوەك ئەم دە ڕۆژەی یەکەمی مانگی قوربانە کردەوەی باشیان تیا خۆشەویستو پەسەند بێ، لەلای خودای گەورە). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا خەباتو تێکۆشانیش لەڕێگەی خودادا هاوتای کردەوەی باشی ناو ئەم دەڕۆژانە ناکات؟ فەرموی: (بەڵێ هەتا خەباتو غەزایش لەڕێگەی خودادا، لەڕۆژەکانی تری ساڵدا، خێرو پاداشتی کردەوەی چاکی ئەم دەڕۆژەی نییە، مەگەر کەسێ کەبەسەروماڵەوە بڕوات بۆ غەزا، وەهیچیان نەهێنێتە دواوە). (ت/٢/١٣٣/١ = ز-٦٤ ژ-١٤٣٥).**

**٥٠٦-عن أنسٍ (رَضي اللهُ عَنهُ) أنه سُئِلَ عَنِ التَّلبِيَةِ: كيف كُنتم تَضعُونَ مَعَ النَّبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قال: (كانَ يُلَبِي المُلَبِّي لايُنكَرُ عَلَيهِ، وَيُكَبِّرُ المكبِّرُ فلاَ يُنكَرُ عَلَيه). (الحديث: ٩٧٠ طرفه في: ١٦٥٩).[٤٤٦]**

**موحەمەدی کوڕی ئەبو بەکری ئەل-سەقەفی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکا بووین، خەریك بووین لەميناوە دەچوین بۆ**

---

(٤٤٥) مكرر. لم يوافقه مسلم على تخريجه وهكذا جميع ماجاء بعده. (فتح/٢/٥٥٣-خاتمة)-المترجم.

(٤٤٦) أخرجه مسلم في الحج، باب التلبية والتكبير، رقم: (١٢٨٥).

عەرەفات، عەرزیم کرد: کاتێ کەئێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بوون لەم ڕۆژانی مینایەدا چۆنتان دەکرد؟ فەرمووی: هەبوو تەلبییەی دەکردو کەس لێی نەدەگرت، هەیشبوو (الله اکبر)ی دەکردو کەس لێی نەدەگرت.

## قوربانی کردن لەڕۆژی جەژندا

٥٠٧- عَن ابنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنهُما): (أَنَ النَّبِيَّ (دروودی خودای لەسەر بێ) كانَ يَنْحَرُ أَوْ يَذبَحُ بِالْمُصَلَّى). (الحديث: ٩٨٢) أطرافه في: ١٧١٠ ، ١٧١١ ، ٥٥٥١ ، ٥٥٥٢).[٤٤٧]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی جەژنی قوربانندا، لەپاش کردنی نوێژی جەژن، هەرلەنوێژگاکە، قوربانی، سەردەبڕی، چ وشتربوایێ، وە چ ئاژەڵی تر.

## ڕێکۆڕکێ لەکاتی گەرانەوە لەنوێژی جەژن

٥٠٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا قَالَ:كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطرِيقَ. (الحديث: ٩٨٦).

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: لەڕۆژی جەژندا، دەستوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا بوو: کە دەردەچوو بۆ نوێژگاکە بۆ نوێژی جەژن، لەڕێگەیەکەوە دەڕۆی، کەدەیش گەرایەوە، لەڕێگەیەکی ترەوە دەگەرایەوە (ت/١/٤٥١/٢ ز-١٥٩ ژ-٨٩٩).

## کەسێ نوێژی جەژنی چوو دوورکات نوێژ دەکا

٥٠٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنها) أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ، فِي أَيَّامِ مِنًى، تُدَفِّفَانِ وَتَضرِبَانِ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

---

(٤٤٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه وهكذا جميع ماجاء بعده (فتح/٢/٥٥٣-خاتمه)- المترجم.

مُتَغَشّ بِثَوْبِهِ، فَانْتَهَرَهُمَا أَبُو بَكْرٍ، فَكَشَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ: (دَعْهُمَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ أَيَّامُ مِنًى). (الحديث: ٩٨٧).[٤٤٨]

بڕوانە ژمارە: ٤٩٨. وَقَالَت: عَائِشَةُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتُرُنِي، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الْحَبَشَةِ، وَهُمْ يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُمْ عُمَر، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (دَعْهُمْ، أَمْنًا بَنِي أَرْفِدَةَ).

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کات ڕۆژی جەژن بوو، حەبەشیەکان بە قەڵخان و نێزە یاری یان دەکرد، جایاخۆم داوام لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، یاخود خۆی فەرمووی: حەزدەکەی تەماشا بکەی؟ منیش گوتم: بەڵێ، جامنی لەپشتی خۆیەوە وەستان و چەناگەم نایە سەرشانیو ڕوومەتم نابەڕوومەتیەوە، ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاری خۆتان بن، ئیتر منیش دەستم کرد بەتەماشا کردن تاخۆم تاقەتم نەما، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: (ئیتر بەسە) گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: دەبڕۆ. لەگێرانەوەیەکا: جارێکیان ڕۆژی جەژن بوو، حەبەشییەکان هاتن بۆ مزگەوت دەستیان کرد بەنێزە بازی، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردم و سەرم لەسەرشانی داناودەستم کرد بەتەماشاکردنی یاریەکەیان تاخۆم وازم هێنا لەتەماشا کردنیان(تاج/١/٤٦٠-ش/ن) بڕوانە ژمارە:٤٩٨، ٩١٥.

## پایانێ

شێخی عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (نامەی هەردوو جەژنەکان چل‌وپێنج فەرموودەی بەرزەوەبووی واتیادا، چواریان بێ ڕشتەن، واتە:

(٤٤٨) اخرجه مسلم في الصلاة (عينى ٦/٢٦٧/٢) –المترجم.

موعەللەقن، ئەوانی تریان هەموو پەیوەستن،واتە: مەوصوولن، بیستو شەشیان لەپێشەوە دووبارە بوونەتەوە، جایالەم باسەدا دووبارە بوونەتەوە، یالەپێشتر، پوختەکەیان دەکاتە: (٤٥-٢٦=١٩) فەرموودەی بەرزەوەکراو.

پێشەوا مسلم (رەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرمووداںەی هەموو گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم چەند فەرمودەیە:

١- فەرمودەی ژمارە: (٤٩٩ تەجرید =٩٥٣ فەتح).

٢- فەرمودەی ژمارە: (٩٦٦ فەتح) لەتەجریدەکەدا نییە، چونکە پەیوەندی بەداستانێکەوە هەیە کەلەنێوانی ئیبنو عومەرو حەجاج دا رووی داوە،

٣- ژمارە: (٥٠٥ تەجرید= ٩٦٩فەتح).

٤- ژمارە: (٥٠٧ تەجرید= ٩٨٢ فەتح).

٥- ژمارە: (٥٠٨ تەجرید= ٩٨٦ فەتح).

٦- ئەوەی کەبوخاری، لەسەرەتای بابی (إذا فاتهُ العيد يصلي ركعتين)دا دەفەرمووێ: لِقوم النبى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (هذا عيدُنا أهلَ الاسلام). ئەگەر مەبەست لەم تەعلیقە ئەو حەدیسەبێ کەعقبەی کوڕی عامیر گێڕاویەتەوە، کەلە(السنن) دا گێڕدراوەتەوە، ئەوە ئەمە لەموسلیم دا نییە، وەژمارەی فەرموودەبێ رشتەکانیش لەچوارەوە دەبن بەپێنج.

بیستو سێ بیستراو(ئەسەر)ی صەحابەو تابیعینیشی واتیادا، هەموویان بێرشتن، تەنیا ژمارە: (٥٠٤ تەجرید=٩٦٢ فەتح)نەبێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٢٠-نامەی نوێژی وەتر (كتابُ الوتر)

## باسەكانی وەتر

٥١٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (دروودی خودای لەسەر بێ) (صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذا خَشِيَ أَحَدُكُمْ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى). (الحديث: ٩٩٠).[٤٤٩]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەپێغەمبەری پرسی: شەو نوێژچۆنە؟ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەونوێژ دووركاتە، كەترسی هەڵهاتنی بەیانت هەبوو، تاقەیەك ركات بكە، ئەوەدەبی بەوەتری ئەونوێژانەی كەكردووتن). (ت/١/٤٩٧،٣١٢ ز-١٨ ژ-٩٧٩ = ش/د/ت/ن).

٥١١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَة، كَانَتْ تِلْكَ صَلَاتَه، تَعْنِي بِاللَّيْلِ فَيَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً، قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ ثُمَّ يَضطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِنُ لِلصَّلَاةِ. (الحديث: ٩٩٤).[٤٥٠]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەونوێژی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بریتی بوو لەیازدە ركات، مەپرسە لەجوانیو درێژی یان، تەنانەت لەناو كڕنوش دا ئەوەندە دەمایەوە وسەری هەڵ نەدەبەڕی و نزای دەخوێند ،كەیەكێ لەئێوەپەنجائایەت بخوێنێ ، كاتێ بەیانی دەدا دووڕكات نوێژی سونەتی پێشنوژی بەیانی دەكرد، ئەوجالەسەر لای ڕاستی ڕادەكشا ،چاوەڕوانی ئەوەی

---

(٤٤٩) وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٥٧٠-خاتمة ، عينى /٧/٢/٣٢)المترجم = ١٧٤٥، ١٧٤٦.

(٤٥٠) وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٥٧٠-خاتمة، عينى/٧/٨/٣٩)- المترجم.

دەكرد، كەی بانگدەر بێ بەدوایدا، كەتەشریفی بچێ بۆ مزگەوت، بەرنوێژی نوێژی بەیانیان بۆ بكات، جاكاتێ بانگدەر بەدوایدا، بەبێ درەنگ، دەچوو نوێژەكەی بۆ دەكردن. (بڕوانە ت/١ /٣٠٤هەتا/٣٠٧ ز-١٠١ هەتا ١٠٦).

## باسی كاتەكانی كردنی وەتر

٥١٢- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ. (الحديث: ٩٩٦).[٤٥١]

مەسسروق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی عایشەم كرد پێغەمبەر(درוودی خودای لەسەر بێ) نوێژی وەتری كەی دەكرد؟ فەرمووی: لە پاش نوێژی خەوتنان، لە هەموو كاتێكی شەودا وەتری دەكرد، هەندێ جار لەسەرەتای شەوەوە دەیكرد، هەندێ جار لە ناوەڕاستی شەودادەیكرد، وەهەندێ جاریش لە دواداوای شەودا دەیكرد، بەلاَم لە پێش مردنیدا هەربەرەبەیان وەتری دەكرد(ت/١/٣١١/٤ ز-١٠٥ ژ-٦١٣ = ش/د/ت/ن).

## با وەتر بكابە دواترین نوێژی شەوی

٥١٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا. (الحديث: ٩٩٨).[٤٥٢]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: (وەتربكەن بەدواترین نوژی شەوتان!). (ت/١/٣١١/٣-ش/د/ت).

---

(٤٥١) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها باب: صلاة الليل: رقم: ٧٤٥ = ١٧٣٣.

(٤٥٢) أحرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها باب:صلاة الليل مثنى مثنى رقم: ٧٤٩ = ١٧٥٢.

## وەتر كردن بەسواری وڵاخ

٥١٤- وَعنهُ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: إنَّ رَسول الله(دروودی خودای لێ‌ بێت) كَانَ يُوتِرُ عَلَى البَعِيرِ. (الحديث: ٩٩٩-أطرافه في:١١٠٥،١٠٩٨،١٠٩٦،١٠٩٥،١٠٠٠). [٤٥٣]

ديسان ئيبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەردا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی سوننەتو نوێژی وەتری بەسواری وشترو وڵاخ دەكرد. (بڕوانە باسی پەنجاو چوار تاج/١).

## خوێندنی قونووت لەبەرو دوای روكووع

٥١٥-عَن أنس (رَضي اللّٰهُ عَنْهُ) أنهُ سُئِل: أَقَنَتَ النبي(درودی خودای لەسەر بێت) في الصُبحِ؟ قَالَ: نَعم. فَقِيلَ لَهُ: أوقَنَتَ قَبلَ الرُكُوعِ؟ قَالَ: بعَدَ الركوعِ يَسيراً. (الحديث: ١٠٠١- أطرافُه في: ١٠٠٢، ٢٨١٤، ٢٨٠١، ١٠٠٣، ١٣٠٠، ٣٠٦٤، ٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٥، ٤٠٩٤، ٤٠٩٢، ٤٠٩١، ٤٠٩٠، ٧٣٤١، ٦٣٩٤، ٤٠٩٦). [٤٥٤]

پرسيار كرا لەئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) ئايا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی بەيانيدا قونووتی دەخوێند؟ فەرمووی: بەڵێ. عەرزی كرا: ئايا لەپێش ركوعدا قونوتی دەخوێند؟ فەرمووی: لەپاش ركووع بۆماوەی چەن ڕۆژێ (ت/١/٢٨٧).

٥١٥/ب- عَن عَاصِمٍ قَالَ سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ الْقُنُوتِ فَقَالَ: قَدْ كَانَ الْقُنُوتُ قُلْتُ. قَبْلَ الرُّكُوعِ أَوْ بَعْدَهُ؟ قَالَ قَبْلَهُ. قَالَ: فَإِنَّ فُلَانًا أَخْبَرَنِي عَنْكَ أَنَّكَ قُلْتَ: بَعْدَ الرُّكُوعِ؟ فَقَالَ: كَذبَ إِنَّمَا قَنَتَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ

---

(٤٥٣) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها باب: جوازصلاة النافلة على الدَّابَةِ رقم:٧٠٠ = ١٦٠٩-١٦١٣.

(٤٥٤) أخرجه مسلم في المساجدومواضع الصلاة، باب: استحباب القنوت في جميع الصلاة رقم:٦٧٧=١٥٤٤.

الرُّكُوعِ شَهْرًا، أُرَاهُ كَانَ بَعَث قَوْمًا يُقَالُ لَهُمْ الْقُرَّاءُ زُهَاءَ سَبْعِينَ رَجُلًا إِلَى قَوْمٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ دُونَ أُولَئِكَ وَكَانَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَهْدٌ، فَقَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا يَدْعُو عَلَيْهِمْ. ب(الحديث: ١٠٠٢).(٤٥٥)

عاصيم فەرمووی :لەبارەی قنووتەوە، بۆخۆم پرسيارم لە ئەنەسی كوڕی ماليك كرد، فەرمووی: قنووت لەسەردەمی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) هەبوو، گوتم: لەپێش چەمينەوەدا يالەپاش چەمينەوە دا، فەرمووی: لەپێش چەمينەوەوە. عەرزيم كرد: خۆفيسارەكەس دەڵێ: تۆ فەرمووتە لەپاش چەمينەوەوە؟ فەرمووی: درۆ دەكا شتە كە بەهەڵە تێگە يشتوە.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وادەزانم: جارێ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) كۆمەڵێكی نارد بۆناوهۆزێ لەهاوبەش پەيداكەران، لەسەر داوای خۆيان،كەيارمەتی يان بدەن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەفتا پياوی قورئان خوێنی بەكۆمەكی بۆيان نارد، كەئەوساش لەكاتی ژيانی خۆياندا پێيان دەگوتن قورئان خوێنەكان و ناويان بەقورئان خوێنەكان دەركردبوو، ئەمانە كاريان ئەوە بوو بەڕۆژ دارو چيلكەيان دەكردو بەكۆڵ كۆيان دەكردەوەو، بەشەو هەر شەونوێژيان دەكرد، جاپێكەوە دەكەونە رێو دەڕۆن تادەگەنەبيری مەعونە، لەوێ پەيمانەكەی پێغەمبەر دەشكێنن و بەنامەردانە هەر حەفتايان دەكوژن، تەنيا يەك پياويان نەبێ.

ئيتر كاتێ ئەم هەواڵە دڵتەزێنە گەيشتەوە بەپێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) تاماوەی مانگێ لەنوێژی بەيانيدا، لەپاش ڕاست بوونەوە لەچەمينەوە، نزای قونووتی دەخوێندو نەفرين و دوعای شەڕی لەم خێڵە عەرەبانە دەكرد:

---

(٤٥٥) ٥١٥/ج، ٥١٥/ج، ٥١٥/د- وافقه مسلم على تخريجها انظر فتح البارى/٢ص٥٧٠ خاتمة – المترجم = ١٥٤٠.

لەخێڵی بەنی ریعلو خێڵی بەنی زەکوانو خێڵی بەنی عوصەییە.(بڕوانە تاج بەرگی هەشتەم، لاپەرە/ ٢٥٤ ز-١٠٢ ژ-٤٦٤٤ فەرمووەدەی ژمارە یەك ).

٥١٥/ج- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَنَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا يَدْعُو عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ. (الحديث: ١٠٠٣).

لەگێڕانەوەیەکی تردا، دیسان لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) تاماوەی مانگێکی تەواو، قونوتی خوێند، نزای شەڕی لەخێڵی بەرەبابی ریعلو خێڵی بەرەبابی زەکوان دەکرد.

٥١٥/د- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ الْقُنُوتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْفَجْرِ. (الحديث: ١٠٠٤).

دیسان لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر جار لەنوێژی شێوانو نوێژی بەیانیاندا قونووتی دەخوێند.

## ڕاڤەو ڕوون کردنەوە:

بیژەی (قُنوت) کە ووشەیەکی عەرەبییە بە دە مەبەست زیاتر هاتووە، بە مەعنا:

١- دوعا و نزا.
٢- ملکەچی و خشووع
٣- پەرستی و عیبادەت.
٤- تاعەت و فەرمانداری.
٥- جێبەجێ کردنی فەرمانداری.
٦- پێڵێنان لە بەندایەتی خودا.
٧- خامۆشی و بێدەنگی.
٨- نوێژ.
٩- وەستان لە ناو نوێژدا.
١٠- بەر دەوامی لەسەر فەرمانداریی.

# پــايانىٚ

عەسقەلانى (رەزاى خواى لىٚ بىٚ) دەفـەرمویٚ: (باسـەكانى وەتـر پازده فـەرموودەی بـەرزی لەخۆ گرتووه، تەنيا يەكێكيان بىٚ ڕشتەيه، واتـا: موعەللەقـه، هەشت فـەرموودەيان دووبـارەن جـا يالـەخۆيانا دووبـاره كراونەتـەوه يـا لەپێـشتر، پوختەكـەيان حـەوت فەرموودەيـه پێشەوا موسـلميش وەك پێـشەوا بوخـاری ئـەم فەرموودانـەی هـەموو گێڕاوەتەوه سىٚ بيستراو (اثر)ی پەيوەستيشى لەخۆ گرتووه).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٢١- نوێژه بارانه (صلاة الاستسقاء)

٥١٦-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ (رَضيَ اللَّـهُ عَـنْهُم) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ- يَسْتَـسْقِي، وَحَـوَّلَ رِدَاءَهُ. (الحـديث: ١٠٠٥- اطرافـــــه في ١٠١١، ١٠١٢، ١٠٢٣، ١٠٢٤، ١٠٢٥، ١٠٢٦، ١٠٢٧، ١٠٢٨، ٦٣٣٤).[(٤٥٦)]

عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ خَـرَجَ إِلَـى الْمُـصَلَّى فَاسْتَسْقَى فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَقَلَبَ رِدَاءَهُ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ.(الحديث: ١٠١٢).

پوختەی ئەم دووگێرانەوەيه ئەمەيه:

عەببادی كوڕی تەميم لەمامەيەوه كەعەبدڵلای كوڕی زەيـده (رەزای خودايان لىٚ بىٚ) فەرمووی: ئەو ڕۆژه كەپێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بىٚ) دەرچوو بۆنوێژگاكـه، بۆنوێـژه بارانـه، بۆخـۆم ديـتم: لـەكاتى وتـار خوێندنەوەكەيـدا، كەدەسـتى كـرد بـەنزا كردن، پشتى كرده خەڵكەكەو، ڕووی كـرده ڕووگـەو، دەسـتى كـرد بەپارانـەوەو نـزا كردن، لەپاشا پۆشاكەكەی هەڵسوراند، واتـه: ڕاستو چەپى كـرد، ئـەوجا دوو ڕكات نوێژی نوێژه بارانەی بەجەماعـەت بـۆ كـردين، قوورئـانى بـەدەنگى بەرز لەناويا خوێند(تاج/١/٣/٤٧٣ ز-١٧٣ ژ-٩٣٧ = ش/د/ت/ن).

---

(٤٥٦) اخرجه مسلم في أول كتاب صلاة استسقاء، رقم: ٨٩٤ = ٢٠٦٧.

٥١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَام، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْمُسْتَضعَفِينَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطأَتَكَ عَلَى مُضر، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ). وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ). (الحديث: ١٠٠٦).

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی بەیانیدا، لەڕکاتی دووەمدا، لەپاش (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمد)ەوە، کەسەری لەچەمینەوە بەرز دەکردەوە، دەیفەرموو: (خودایە! عەییاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەو سەلەمەی کوڕی هیشامو، وەلیدی کوڕی وەلیدو هەموو موسوڵمانە لازە بوونەکان ڕزگار بکە، لەدەستی دیلی بێ بڕواکان. خودایە! لەهۆزی موضەر هەڵپێچی و تەنگیان پێ هەڵچنیو، لایان لێ بڕیتەوە، تووشی قاتو قڕییەکی وایان بکەی، وەك حەوت ساڵەگرانیەکەی سەردەمی یووسف پیغەمبەر، خودایە! نەفرەت بکە لەهۆزی لەحیانو، لەهۆزی ریعلو لەهۆزی زەکوان و لەهۆزی عوصەییە، کەلەخوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوون).

وەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەشی فەرموو: (هۆزی غیفار خوا چاوپۆشییان لێ بکا، هۆزی ئەسلەمیش خوا سەلامەتیان بکا). (ت/١/٢٨٨/٤- ش/د+ت/٥/٢٤٠/٢ ز-٦٧ ژ-٣٥٤٤).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

لەم فەرمووودەیەوە ڕوون دەبێتەوە، کەنزا لە ناوی نزا بۆکراو، وەردەگیرێ، چونکە غیفار بەمەعنا چاولێ پۆشینو لێخۆش بوونە، ئەسلەمیش بەمەعنا سەلامەتیو بێ وەیی یە. نموونەی ئەمە لەکوردیدا ئاوەیا: (سەربەست! یاخوا سەربەست بی! نەورۆز! یاخوا هەموو ڕۆژێکت هەرنەورۆزبێ، جێژنی! یاخوا هەر لەجەژنابی).

٥١٨- عَن عَبْدِاللّٰه بن مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا رَأَى مِنْ النَّاسِ إِدْبَارًا قَالَ: (اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ) فَأَخَذتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ، حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ وَالْجِيَفَ وَيَنْظرَ أَحَدُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى الدُّخَانَ مِنْ الْجُوعِ.

فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ تَأْمُرُ بِطاعَةِ اللّٰهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللّٰهَ لَهُمْ، قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ- إِلَى قَوْلِهِ إِنَّكُمْ-عَائِدُون. يَوْمَ نَبْطشُ الْبَطشَةَ الْكُبْرَى)

إِنَّا مُنْتَقِمُونَ فَالْبَطشَةُ يَوْمَ بَدْرٍ، وَقَدْ مَضتْ الدُّخَانُ، وَالْبَطشَةُ، وَاللِّزَامُ، وَآيَةُ الرُّوم. (الحديث: ١٠٠٧-أطرفه في: ٤٨٢١، ٤٨٢٠، ٤٨٠٩، ٤٧٧٤، ٤٧٦٧، ٤٦٩٣، ١٠٢٠، ٤٨٢٥، ٤٨٢٤، ٤٨٢٣، ٤٨٢٢).[٤٥٧]

عەبدوڵلاى كوڕى مسعود (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر(درودی خوداى لەسەر بێ) كاتێ ڕوانى كەخەڵكى مەككە ملنادەن و درەنگ ئیسلام دەبن نزاى شەڕى لێ كردن‌و فەرمووى: (خودایە! تۆڵەجیاتى من چارى ئەم لەخودا یاخییانە بكە، بەحەوت ساڵ قاتو قڕى یاریدەم بدە بەسەریانا، كەوەك حەوت ساڵە گرانى یەكەى كاتى یووسف پێغەمبەروابن!).

ئیتر تووشى قاتو قڕییەكى وەهابون هەرمەپرسە، قڕى خستە هەموو شتێكیان، تەنانەت لەبرسانا كەوڵ‌و پێستەو مردارو كەلاكى گەنیویان دەخوارد. وەلەبەر بێ هێزى‌و برسێتى، مرۆڤ چاوى ڕێشكەو پێشكەى دەكرد، بەرەنگێكى واكە تەماشاى ئاسمانى دەكرد، لەبرسانا ئاسمان لەبەر چاوى تەم‌و دووكەڵى دەكرد.

هەتا ئەبوو سوفیان هاتە لاى پێغەمبەر (درودی خوداى لەسەر بێ) گووتى: ئەى موحەممەد! خۆتۆ لاى خۆى فەرمان بەفەرمانبەریى خودا دەكەى‌و، هەروا

(٤٥٧) أخرجه مسلم في التوبة (عينى/٧/٢٧/٥٠)-المترجم.

بەخزم دۆستی،کەچی بەپێچەوانەوە وابەهۆی نزای شەڕی تۆوە، زۆر کەس لەهۆزی تۆ وا لەبرسانا فەوتاون، دەی ئەمەت لەچیو ئەوەت لەچی،کەواتە تازووە بۆیان بپاڕێرەوە کەخودا بارانیان بۆ ببارێنێ.

جاخودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (فَارتَقِب يَومَ تأتِي السَّماءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ) هەتا (عَائِدُون يَومَ نبطشُ البَطشةَ الكبرى).

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەست لە (البَطشةَ الكبرى) لەم ئایەتەدا، کەخودا هەڕەشەی پێدەکات، ئەو هەڵمەتە گەورەیە بوو، کەلەڕۆژی غەزای بەدردا ڕووی دا، کەخودا زەبرو زەنگێکی وای نواندو، گورزێکی جەرگبڕی وای وەشاند لەبێبڕوایان، پێی تەمێ خوار بوون. دیارە کە ئەل-بطشە و هەڵمەتە گەورەکەیش،وەك مەسەلەی دوخانو تەمو دووکەڵەکەو مەسەلەی (اللزام) کەلەم ئایەتەدا ئامازەی بۆ کراوە، کە دەفەرمووێ: (فَسَوفَ يَكُونُ لِزَاماً) (الفرقان: ٧٧) هەروا داستانی شەڕی ڕومو فوورس، ئەمانە کەلەچەند ئایەتێکا ئامازەیان بۆ کراوە، هەموویان لەمەوپێش ڕوویان داوە. (تاج/٦/٢٤٨/٤).

## لەکاتی ڕەشە ساڵ و بێ بارانیدا مەردوم داوای پاڕانەوە لەپێشنوێژ بۆ باران دەکەن

٥١٩- عَنْ عُمَرُ بْنُ حَمْزَةَ (رحمه الله) حَدَّثنَا سَالِمٌ عَنْ أَبِيه قَالَ: رُبَّمَا ذكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ، وَأَنَا أَنْظرُ إِلَى وَجْهِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَسْتَسْقِي، فَمَا يَنْزِلُ حَتَّى يَجِيشَ كُلُّ مِيزَابٍ، وَهُوَ قَوْلُ أَبِي طَالِبٍ (الحديث:١٠٠٩).[458]

وابيض يستسقى الغمام بوجهه
ثمال اليتامى عصمة للارامل

(٤٥٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه: (فتح/٢/٦١٠-خاتمة)- المترجم.

عەبدللای کوری عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) دەیفەرموو: زۆر جاران کەتەماشای پێغەمبەرم دەکرد، بەتایبەتی لەوکاتانەدا کەداوای بارانی لەخودا دەکردو، لەکاتی بێبارانی دا بۆ باران لەخودا دەپاڕایەوە، کەهێشتا لەمینبەرەکە دانەدەبەزی، هەتا دایدە کردە بارانو هەموو پلووسکەکان دەخرۆشانو چۆڕاوگە هەڵ دەستا عەبدوللای کوڕی عومەردەیفەرموو: زۆر جاران کەتەماشای ئەم حاڵەم دەکرد، ئەم شیعرەی ئەبوطالبی مامەی پێغەمبەرم یاددەکەوتەوە، کەپێشبینیی ئەم حاڵەی کردووە بۆ پێغەمبەرو، لەستایشی پێغەمبەردا فەرموویەتی:

بەڕوخساری نازداری سپیکاری داوا دەکەن باران

پەناو پشتە بۆمناڵی بێ بابو بێوەکان

٥٢٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطاب رَضيَ اللّهُ عَنْهُ كَانَ إذا قَحَطوا استَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطلِبِ فَقَالَ اللّٰهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا قَالَ فَيُسْقَوْنَ. (الحديث: ١٠١٠-طرفه في: ٣٧١). [(٤٥٩)]

ئیمامی ئەنەس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرمووێ: جاران کەتوشی بێ بارانی دەبوون، عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) بەخاتری عەباسی کوڕی عەبدول موتەلیب لەخودا دەپارایەوە بۆ بارانو دەیگووت: خودایە! ئێمە لەمەو پێش لەکاتی پێویستی باراندا، کاتێ کەپێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیاندا بوو، ئەوزاتەمان دەکرد بەدەستگیرو تکاکار لەلای تۆ، وەبەخاتری ئەولەتۆ دەپاراینەوە، تۆیش خاتری ئەوت دەگرتو، دەهاتیت بەهاوارمانەوەو بارانت بۆ دەبارانین، ئێستایش بیکە بەخاتری عەباسی مامەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بارانمان بۆ بڕەخسێنە! فەرمووی: ئیتر بارانیان بۆدەباری. (تاج/١/٤٨٢/١ ز-١٧٨ ژ-٩٤٩ چ-٤).

---

(٤٥٩) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٦١٠-خاتمة) — المترجم.

## كردنی نوێژه بارانه لەمزگەوتێکا جومعەو جەماعەتی تیا بکرێ

٥٢١-عَن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَذكُرُ أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ بَابٍ كَانَ وِجَاهَ الْبيتِ وَرَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمًا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، هَلَكَت الْمَوَاشِي، وَانْقَطَعَت السُّبُلُ، فَادْعُ اللّٰهَ يُغِثنَا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَيْهِ فَقَالَ:(اللّٰهُمَّ اسْقِنَا، اللّٰهُمَّ اسْقِنَا، اللّٰهُمَّ اسْقِنَا). قَالَ أَنَسُ: وَلَا وَاللّٰهِ، مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ، وَلَا قَزَعَةً، وَلَا شَيْئًا، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلَا دَارٍ. قَالَ: فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطت السَّمَاءُ انْتَشَرَتْ ثُمَّ أَمْطرَتْ. قَالَ: وَاللّٰهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سِتًّا. ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذلِكَ الْبَابِ فِي الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ، وَرَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِمًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، هَلَكَتْ الْأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَت السُّبُلُ، فَادْعُ اللّٰهَ يُمْسِكْهَا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَيْه، ثمَّ قَالَ: (اللّٰهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، اللّٰهُمَّ عَلَى الْآكَامِ وَالْجِبَالِ وَالْآجَامِ وَالظرَابِ وَالْأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَر). قَالَ فَانْقَطَعَتْ، وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْس. (الحديث: ١٠١٣).[٤٦٠]

ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لەژمارە (٤٩١)دا بەتەواوی رابورد، لەم دووژمارەیەدا ئەم چەند خاڵە رەچاو دەکرێ:

١- سوننەتە لەپێش دەست پی کردن بەنزاو پارانەوە هەردوو دەست بەرزەوە بکرێ، هەروا لەکاتی پارانەوەیش دا.

٢- سەلع کێوێکی ناسراوە لەمەدینە. پارانەوەی کۆتای فەرموودەکەیش واتای وایە: (ئەی خودایە! بەدەورو بەرمانا بیبارێنە، نەوەك بەسەرمانا، خودایە! بەسەر دەشتایی‌و سەر کێوویاڵو ناوشیوو دۆڵو لەوەڕگاکانا بیبارێنە)

(٤٦٠) راجع رقم (٤٩١)- المترجم.

٣- آكام: یاڵو گردو تەپۆڵكە، جبال: چیاوكێو، آجام: قەڵا، دارستانی چڕوپڕ، ظراب: شاخو یاڵی درێژكوولەی نزم ، أودیة: شیوو دۆڵو لاپاڵ، منابت الشجر: لەوەڕگا).

٤- لەكۆتایی گێرانەوەی ئێرەدا نووسراوە: فەرمووی: ئیتر لەپاش پاڕانەوەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) بارانەكە لەسەر مەدینە خۆشی كردەوە، لەپاش تەواوبوونی نوێژی هەینی كەلەمزگەوت دەرچووین و گەڕاینەوە خۆرەتاو بوو. وەك لەعومرەتولقاریو فەتحو شەرحەكان وەردەگیرێت:

ئەم خاڵانە لەم فەرموودەیەدا ڕەچاو دەكرێن:

لەناو ووتاری هەینی دا قسەكردن بەپێی پێویست دروستە، ووتارەكە لەسەر پێ دەدرێ، سێجار نزا دووبارە بكرێتەوە، داوای نزای باش لەپیاو باشانو خواناسان دەكرێ، نزاكردن بۆلابرنی زیان دژی تەوەكولو پشت بەخوابەستن نییە. هەردوو دەست لەنزاو پاڕانەوەدا هەڵ دەبڕڕێن، ووتاری هەینی كاتێكی لەبارە بۆنزای خێر، موعجزەیەكی گەورەی تیادایە بۆ پێغەمبەر.

٥- لەدوای ئەم گێرانەوە ئەمەش بەبێ ژمارە نووسراوە:

وَعَنهُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): فَرفَعَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَيهِ، ثُمَّ قَالَ: (اللَّهمَّ أغثنَا، اللَّهمَّ أغثنَا، اللَّهمَّ أغثنَا).

دیسان ئەنەس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی هەڵبڕیو ئەوسا فەرمووی: (خودایە! بارانمان فریاخە، خودایە! بارانمان فریاخە، خودایە! بارانمان فریاخە).

## قورئان خوێندن لەنوێژە بارانەدا بەدەنگی بەرزە

٥٢٢–حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ عَنْ الزُّهْرِيِّ عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، قَالَ: فَحَوَّلَ إِلَى

النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَاستَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو، ثمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثـمَّ صَـلَّى لَنَـا رَكْعَتَيْنِ، جَهَـرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَة. (الحديث: ١٠٢٤) بروانة ذمارة: (٥١٦).

٥٢٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَـالَ: كَـانَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَـاض إِبْطَيْهِ. (الحديث: ١٠٣١- طرفاه في: ٣٥٦٥،٦٣٤١).[٤٦١]

ئەنـەس (ڕەزای خودایان لـێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەهیچ نزایەکیدا دەستی تەواو بەرز نـەدەکردەوە، لەنزای داوای کردنی باراندا نـەبێ، بەڵام لەکاتی داواکردنی باراندا ئەوەنـدە دەستی هەڵ دەبڕی سـپێدەی هـەردوو بنباخەڵی دەردەکەوت. (ت/١/٤٧٣/٤ ز-١٧٤ ژ-٩٤١).

## گووتەی کاتی بارینی باران

٥٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَـانَ إِذا رَأَى الْمَطرَ قَالَ: اللَّهُمَّ (صَيِّبًا نَافِعًا). (الحديث: ١٠٣٢).[٤٦٢]

عائیـشە (ڕەزای خـوای لـێ بێ) فـەرموی: پێغەمبــەر (درروودی خـودای لەسـەر بێ) کـەبارانی دەدی دەیفـەرموو: (ئـەی خودایـە! بیگێـڕی بـەبارانێکی لێزمـەی بـەخوڕی بەسـود: اللهم اجعله صيبا نافعا).

## کاتێ با هەڵ دەکا

٥٢٥- عَن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُـولُ: كَانَـتْ الـرِّيحُ الـشَّدِيدَةُ إِذا هَبَّتْ، عُرِفَ ذلِكَ فِي وَجْهِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم. (الحديث: ١٠٣٤).[٤٦٣]

---

(٤٦١) أخرجـه مـسلم في صلاة الاستـسقاء، بـاب: رفـع اليـدين بالـدعاء في الاستـسقاء، رقـم: ٨٩٥=٢٠٧١.

(٤٦٢) لم يوافقه مسلم على تخريجه، وإن كان اصله فيه (فتح/٢/٦١٠- خاتمة)- المترجم.

ئەنـەس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفـەرموو: جـاران کـەبای سـەخت هـەڵی دەکـرد، بەهۆی ئەوەوە نیشانەی ترسان لەڕوخساری نازداری پێغەمبەر دیاربوو، ترسی ئەوەی هەبوو کەسزابێ، هاتبێ بۆسەر نەتەوەی ئیسلام.

## فەرموودەکەی (نصرت بالصبا)

٥٢٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (نُـصِرْتُ بِالـصَّبَا، وَأُهْلِكَـتْ عَـادٌ بِالـدَّبُور). (الحـديث: ١٠٣٥-اطرافـه في: ٣٣٤٣،٣٢٠٥،٤١٠٥).[٤٦٤]

ئیبنـو عـەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفـەرمووێ: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرمووێ: (خـودای گـەورە بـەهۆی بـای صـەباوە لەغـەزای خەنـدەق دا سەرکەوتنی بەمن بەخشی، وەهۆزی عادیشی بەبای ڕەشەبا فەوتان).

## باسی بوومە لەرزەو ئایات

٥٢٧- عَنْ ابْنِ عُمَر (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُما) عن النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا وَفِي يَمَنِنَا). قَالَ: قَالُوا وَفِي نَجْدِنَا؟ قَالَ قَالَ (اللَّهُمَّ بَـارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا وَفِي يَمَنِنَا) قَالَ: قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا؟ قَالَ: قَالَ (هُنَاكَ الزَّلَازِلُ وَالْفِـتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ). (الحديث: ١٠٣٧- طرفه في: ٧٠٩٤).[٤٦٥]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خودایـە! پیـتو فەڕبرژێنـە بەسـەر وڵاتـی شـاممانو وڵاتـی یەمـەنمان دا) یـارانیش عـەرزیان کـرد: وەپیـتو فـەڕ برژێنـێ بەسـەروڵاتی نەجدیشماندا؟

---

(٤٦٣) لم يوافقه مسلم على تخريجه (انظر فتح/٢/٦١٠- خاتمة)- المترجم.

(٤٦٤) اخرجه مسلم في صلاة الاستسقاء، باب: في ريح الصَبا وَالدبور، رقم: ٩٠٠ = ٢٠٨٤.

(٤٦٥) الظاهر أنّ هذا الحديث من افراد البخاري- المترجم.

فەرموویەوە: (خودایە! پیتو فەڕ بڕژێنە بەسەر وڵاتی شامماناو بەسەر وڵاتی یەمەنمانا) یارانیش عەرزیان کردەوە: وەبیڕژێنیٚ بەسەر وڵاتی نەجیدشماندا؟ فەرمووی: (لەوێوە بوومەلەرزەو ئاژاوەو فەرتەنەبەرپا دەبیٚ، وەهەر لەوێشەوە شەیتان شاخ قیت دەکاتەوە).

## خوا نەبیٚ کەس نازانیٚ باران کەی دەباریٚ

٥٢٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مِفْتَاحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللّٰهُ: لَا يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي غَدٍ، وَلَا يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي الْأَرْحَامِ، وَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَاذا تَكْسِبُ غَدًا، وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْض تَمُوتُ، وَمَا يَدْرِي أَحَدٌ مَتَى يَجِيءُ الْمَطرُ). (الحديث: ١٠٣٩-اطرافه في: ٧٣٧٩،٤٧٧٨،٤٦٩٧،٤٦٢٧).[٤٦٦]

ئینو عومەر (ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (کلیلی نهێنی (غەیب) ئەم پێنج شتەن، خوا نەبیٚ کەسی تر نایانزانیٚ، کەس نازانیٚ سبەینیٚ چی دەبیٚ، وەکەس نازانیٚ کەچی وا لەناو منالْدانەکان دا ئەوەی واتیا ئایا نێرە، مێیە، چییە و چی نییە، هیچ کەسیٚ نازانیٚ سبەینیٚ چی دەکا و چی ئیشێکی دەبیٚ وەچی دەست دەکەویٚ وەکەس نازانیٚ کەی و لەکوی دەمریٚ، وەکەس نازانیٚ کەکەی باران دەباریٚ). (تاج/٧/٨٣).

### ڕوون کردنەوە:

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەگەر کەسیٚ بلیٚ: نهێنی زۆرن هەر ئەم پێنجەنین؟ یابلیٚ: ئەی ئەوەنییە کە ئێستا بەهۆی سۆنەر و شتی تری واوە دەزانریٚ کەسك کوڕە یاکچە؟ یابلیٚ: بەهۆی هۆکارەکانی کەش شوناسیەوە دەزانریٚ کەکەی باران دەباریٚ؟

---

(٤٦٦) لاحظ خاتمة فتح الباری/٢/٦١٠-المترجم.

لەوەلاما دەڵێین: راستەکە ژمارەی نهێنی زۆر زۆرە، بەلاّم ناوهێنانی ئەم پێنجە بەتایبەتی، لەبەر چەندهۆیەکە،وەك ئەوەلەسەر دەمی پێغەمبەردا زۆر کەس، لەحیسا بگەرو جادووگەرو ئەمانە، لافی زانینیئەم جۆرە شتانەیان لێداوە، یابەتایبەتی لەم پێنج شتە پرسیاریان لەپێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) کردوە.

دووەم دەڵێین: غەیب چەند جۆرێکی هەیە، عیلمیشی هەروەها،جۆرێ لەنهێنی بێجگە لەیەزدانی پاك کەسی ترنایزانێ،جۆرێ لەنهینی خودا خۆی دەیزانێ، ئەگەر خواستی لەسەری بێ کەسانی تریش دەیزانێ وەك فریشتەو پێغەمبەرو پیاو چاکان، گەلێ جار ئەگەر خودا خواستی لەسەر ئەوەبێ کەرێزی پیاوچاکێ بگرێ، فریشتەیێ لەنهێنی یەك ئاگادار دەکا، ئەو فریشتەیە بەفەرمانی خودا هەواڵی ئەو نهێنی یە دەدا بەپیاو چاکێ، تاببێ بەکەرامەت بۆخۆیو بەموعجیزە بۆپێغەمبەرەکەی!

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆئەم جۆرە کە دەفەرموێ: (عَالِمُ الغَيبِ فَلاَ يُظهِرُ عَلَى غَيبه أحَداً إلاّ مِن ارتَضى مِنرسولٍ) جین/٢٦-٢٧- واتە: هەر خودا خۆی و بەس ئەو جۆرە نهێنییە تایبەتی یانە دەزانێ، کەسی تریان لێ ئاگادارناکا، کەسێ نەبێ کەخۆی رەزای لەسەر بێ، وەك پێغەمبەرێ، یافریشتەیێ).ئەم ئایەتەی تریش هەروا: (يَختص بِرَحمَتِهِ مَن يَشَاءُ).

یائەگەر خودای گەورە خواستی لەسەر بێ ئەونهێنی یە بەهۆی هۆکارێکەوە دەزانرێ، وەك ئەو نهێنی (غەیب) یانە کەنیشانەو کەرەستە بۆزانینی ببێ، وەکو ئامێری سۆنەر بۆتەماشاکردنی منداڵدانی ئافرەت، وەکو دەزگای کەش ناسی بۆپێشبینی کردنی هەورو هەلاّو باران.

ئەمەلەلایێ لەلایەکی تریشەوە عیلمو زانین زاتی کەسپی یانی هەیە، زانستی خودا زاتییە کەسبی نییەو زانستی دروست کراو هەمووی کەسبییە، بەم ئیعتیبارەش غەیب بەس خودا دەیزانێ.

لەراستیدا ئەم پێنج شتەی لەم فەرموودەیەدا باس کراون، بۆهەموو کەسێ سەرچاوەی غەیبن، واتە: بەشێوەیەکی گشتی، ئەگەر تاك و تەرا لێرەو لەوێ، خودای گەورە جارجار بەدەگمەن کەسێ، لەهەندێکی زۆر کەم لەبابەتێ لەم بابەتانە، لەبەرحیکمەتێ ئاگادار بکا، بەوە هیچ لەیاسا گشتیەکە ناگۆڕێ. دەنا رەورەوەی ژیان دەگۆڕا، وەك ئەم یاسایە لەم پەندەدا زۆر بەجوانی داڕێژراوە، کەدەفەرمووێ:

ئەگەر دەمزانی چ ڕۆژ دەمردم

خانەی ئاوەدان وێران دەکردم

(بێداری) وەلی کێیە؟

داخەکەم رەشە خەڵك و دەروێش و سۆفیە ساویلکەکان بەپێچەوانەوە لەحاڵەکە حاڵی دەبن، لەوان وایە وەلی هیچ کارو ئیشێکی تری نییە تەنیا کەرامەت نواندن نەبێت، لەبەر ئەوە ئەوەندە زۆر چیرۆکی دەستەڵبەستیان بەناوی کەرامەتەوە بۆشێخەکانیان هەڵ بەستووە حەیای ئەوانیشیان بردووە!

هەر کۆلکە شێخێ بگری لەم کوردوستانەی خۆماندا، کەخەریکی کاری شێخێتی بێ، خۆی بەموسوڵمانێکی ئاسایی دڵسۆزی موسوڵمانان دەزانێ، هەر چی لاف و گەزاف بێ نییەتی، بەڵام زۆربەی سۆفی و دەروێشەکانیان بەهەزاران کەرامەت و بەیت و باڵورەو ناوو نازناوی گەورەگەورەیان دەدەنە پاڵ، شێخ بەخۆی دەڵێ: خادم الفقراء، ئەوان پێ ی دەڵێن: سوڵتانی ئەولیا، شێخی بەڕوو بەحر، شاکەریم و شارەحیم!

بەندە بەخزمەت گەلێ لەشێخانی تەریقەتی ئەم سەردەمی خۆمە گەیشتووم، بەووردی سەرنجی حاڵیانم داوە، زوربەیان بەڕاستی خێرخواو خانەدان و خاوەن ئیمان و خاوەن دیوەخان بوون، گەرچی کەمە کەمەکەموکوڕیشیان بووبێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی سەرمەشقی جووان بوون بۆڕەوشتی جوان و خزمەتی ئاین!

کەواتە ئەم جۆرە بابەتە بەقسەی خەڵکی ناپسپۆڕنابێ، بەڵکوو دەبێ گوێ بۆ قسەی کتێب شل بکرێ، گوێ لەمەلای دانای زانا بگیرێ، لەهەمان کاتدا خۆخەریك کردن بەم شتەلاوەکی یانەوە کارێکی فرەباش نییە، هەندێ لایەنی ئایینی مۆدیرن پەیدا بوون، هەمووخزمەتەکەیان بۆ ئیسلام ئەوەیە: جنێو بەشێخو مەلاو دەروێشو سۆفی بدەن، هەتائیمامی غەزالی قوڕبەسەریشیان کردووە بەنۆکەی ئیمپیرالیزم! بەئیمامی نەوەوی دەفەرموون: موشریك، دەڵێن: کەسێ قەصیدەی بووردییە بخوێنێتەوە فرە خوایە واتە: مشرکە، نوێژ لەپشتیەوە دروست نییە، لەراستیدا ئەوەی کەئەمڕۆناویان ناوە سەلەفیەت، زۆر زۆر دوورە لەسەلەفیەت، چونکە مەرجی ئەم سەلەفیەتەی ئەمانە ئەمەیە: فتکردنی سەرجەمی زانایانی ئیسلام، جگەلەیەك دوو مونشەقق نەبێ، ئەمانەش دەق وەك شیعەکان رقیان لە هەموو زانایانی سەلەفە، چەند سەرلێشێواوێکی تری وەك خۆیان نەبێ، شیعەیش هەموو سەحابەکان بەمونافق دادەنێن، هەشت نۆ کەسیان نەبێ!

بەندەئەم پێشنیارە دەکەم ئومێد دەکەم کەخودای گەورەو داناو زانا پیتو فەڕی تێ بخاو بیخاتە بەر چاوی کەسانی دڵسۆزی ئەم ئیسلامە و ئەم گەلی کوردە:

١- برەوی تەواو بەمەزهەب بدرێ، لەهەموو قۆناغەکانی خوێندندا، چ ئایینی، چ نائاینی، جەخت لەسەر پابەند بوون بەم چوار مەزهەبەبکرێ، بۆنمونە: لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی دا لە کوردوستانی خۆماندا ئەم مەفهومە بخرێتە مێشکی قوتابیەوە: (ئێمە موسوڵمانین، خودای تاكو تەنیاو پاك و پیرۆز دەپەرستین، (موحەمەد) پێغەمبەرمانە، ئیسلام ئاینمانە، لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعین، رێزمان بۆ هەموو سەر مەزهەبەکانی تر هەیە، لەسەر بیروباوەڕێ عەقیدەی ئەشعەرین).

٢- پەڕاوە ناودارەکانی فیقەو عەقائید بکرێنەوە بەسەرچاوەی فەتواو پرسیارو وەڵام، وەبەپێی توانا بایەخو برەویان پی بدریٚ، وەزوو زووسەر لەنویٚ چاپ بکرێنەوەو پەخش بکرێنەوە، یاتەرجەمە بکرێن، یاکتێبی نویٚ ی بەنرخی مەزهەبی دابنریٚ، وەئەوەی کەچاپ نەکراوە چاپ بکریٚ، وەزۆر بەوردی بەوانە ببێژرێنەوە.

٣- وە ئەوەندەی دەکریٚ کەنارە گیری بکریٚ، لەقیل و قال و لەراجیایی زۆرو لەتەزەمموتی مەزهەبیو لەتەجەممودو توندرەوی.

٤- کورتوپوخت ئەمە بکەین بەدورشمی نەگۆڕمان: (خۆرەو شێرپەنجەی ئیسلام بیٚ مەزهەبییە). لەبەرئەوە دەبیٚ بەهیچ شێوەیٚ ریٚ بەلامەزهەبی نەدریٚ.

## پایانیٚ

مامۆستای عەسقەلانی (رەزای خوای لیٚ بیٚ) ئاماژە دەکا: کەباسەکانی نوێژە بارانە،لەصەحیحی بوخاریدا (رەزای خوای لیٚ بیٚ) چل فەرموودەی بەرز کراویان تیادایە،نۆیان بیٚ ڕشتەن، واتە: تەعلیقن،ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: مەوصوولن، واتە: بەریز پیاوانی ڕشتەکەیان، لەبوخاریەوە هەتا سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ناوهێنراون. بیستو حەوتیان لەم باسەدا، یالەپێشتردا دووبارەن، پوختەکەیان دەکاتە سیازدە.

پێشەوا موسلیمش (رەزای خوای لی بیٚ) هەمویانی گێراوەتەوە بێجگەلەمانەیان:

١- فەرموودەی ژمارە (٥١٩ت=١٠٠٩ف).

٢- (٥٢٠=١٠١٠ف).

٣- (فەرموودەی (١٠٢٢ف) لەتەجریدەکەدا لەم شوێنەدا نییە).

٤- (٥٢٢ت=١٠٢٤ف) بڕوانە: (ژمارە-٥٢٢و ٥١٦). بەڵام بناغە (ئەصڵ)ی ئەم فەرموودەیە لەموسایمیشدا هەیە.س

٥- (٥٢٤ت=١٠٣٢ف) بەڵام بناغەکەیی واتیادا.

٦- (٥٢٥ت ١٠٣٤ف).

٧- (١٠٣٦ف) لەتەجریدەکەدا لەم شوێنەدا نییە.

دوو بیستراو (ئەسەر)ی صەحابەو غەیری صەحابەی واتیادا.

**تێبینی:**

ئەم ساڵ (١٩٩٩ز) ساڵێکی بێ باران بوو، لەهەموو ناوچەی خۆر هەڵاتی ناوەڕاستا، لەکوردستانی خۆماندا باران زۆر کەم بوو، کفری‌و کەلارو زوربەی پارێزگای کەرکوك دەغڵ‌و دان بەرەڵاکرا، ئێستا کە کۆتایی مانگی پێنجە بەرایی بێ ئاوی سەری هەڵ داوە، لەوەڕکەم بووە، ئەو دەغڵ‌و دانەی کەنەفەوتاوە، خەڵك زۆرتر بەداس دەیدرونەوە، نەك بەمەکینە، لەبەر کورتی‌و کایەکەی، هەروەها لەم ساڵەدا کارەساتی ترسناك ڕووی دا وەك بوومە لەرزە کە دەوری شەش مانگ، ناو بەناو لەشاری سلێمانی و دەورو بەری دا، ڕۆژی وا دەبوو شەش حەوت جار ڕووی دەدا، هەیان بوو دەگەیشتە شەش پلەی ڕێختەر، بەڵام سوپاس بۆ خوداکەزیانێکی ئەو تۆی نەبوو، ماوەیەکیشە دەنگی نییە، هەروا سکچوون‌و کولێرەیش کەمە کەمە رووی دا.

هەروالەم ساڵەدا لەبەر بێ ئاوی لەبەنداوەکانا کارەبا زۆر کەمە، شەوو ڕۆژی چوار سەعات کارەبامان هەیە. وەك سەردەمی بەرد، بەشەو چرای نەوت هەڵ دەکەین. ئەمڕۆکەش خۆربەتەواوی گیرا، لەناو شاری سلێمانیدا ماوەی یەك دوو دەقیقە ئەستێرە دەرکەوت، دەوری سەعات‌و نیوێکی خایاند، ئێمە لەگەرەکی خۆمان نوێژی خۆرگیرانمان کرد. مەلا نەبوو من بەرنوێژیەکەم کرد بۆخەڵکی گەرەك، خوا قەبووڵی کا.

وەرگێڕ

نوری فارس حەمەخان

١٩٩٩/٨/١١

# ٢٢) نامەی خۆر گیران و مانگ گیران - كتاب الكسوف

## نوێژی خۆر گیران

٥٢٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضي اللهُ عَنهُ) قَال: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَانْكَسَفَتْ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجُرُّ رِدَاءهُ حَتَّى دَخَلَ الْمَسْجِدَ،فَدَخَلْنَا فَصلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ حَتَّى انْجَلَت الشَّمْسُ، فَقَالَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، فَإِذا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصلُّوا وَادْعُوا، حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ). (الحديث: ١٠٤٠ طرفاه في: ١٠٥٧، ٣٢٠٤).[٤٦٧]

وَفي روايَةٍ عَنهُ قَالَ: (وَلكنَّ اللهَ تعالىَ يُخَوِفُ بِهِمَا عِبَادَهُ).

ئەبو بەكرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوكاتەدا خۆرگیرا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسابەپەلە چووبۆ مزگەوت، لەپەلەپەلیدا لەشپۆشەكەیی بەكێش دەكرد، ئێمەش لەخزمەتیدا چووین، جالەناو مزگەوتەكەدا دوو ركات نوێژی خۆر گیرانی بۆكردین، تاخۆرەكە بەربوو، ئەوجا وتارێكی دا بۆمەردوومەكەو سوپاس و ستایشی خوای كردو فەرمووی: ( لەراستیدا ئەم خۆرو مانگە دوونیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەكانی خودا، نەلەبەر مردنی كەس و نەلەبەر ژیانی كەس ناگیرێن، كاتێ دەبینن كەواخۆر گیراوە، یامانگ گیراوە نوێژ بكەن و لەخودا بپاڕێنەوەو نزا بكەن، تاخۆرەكە یامانگەكە بەردەبێ و خەمەكەتان دەڕەوێتەوە). (تاج/١/٤٦٢ = ز-١٦٦ ژ-٩٢٠).

لەگێڕانەوەیەكا لەئەبو بەكرەوە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (بەڵام خودای گەورە بەهۆی ئەم دوو دیاردەیەوە، بەندەكانی خۆی ووریا دەكاتەوە، هەتا لەقاروسەرپێچی لەفەرمانی بترسن).

---

(٤٦٧) من أفراد البخارى (عينى/٧/٦٢/٧٩) و(فتح/٢/٦٢٠- خاتمة)- المترجم.

٥٣٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَة (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَسَفَت الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ مَاتَ إبْرَاهِيمُ فَقَالَ النَّاسُ كَسَفَت الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِه، فَإذا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّه). (الحديث: ١٠٤٣- طرفاه في: ١٠٦٠، ٦١٩٩).[٤٦٨]

موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ڕۆژەی کەئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر مرد (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر و ئیبراهیمی کوڕی بێ) ئەو ڕۆژە خۆرگیرا، خەڵك گوتیان: ئەوە لەبەر مردنی ئیبراهیم خۆرگیراوە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆرو مانگ دوونیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، نەلەبەر مردنی کەس و نەلەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، کاتێ دیتان کەوا ڕۆژیامانگ گیراوە ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو نوێژ بکەن). (تاج/١/٤٦١/١ = ز-١٦٤ ژ-٩١٨).

## باسی خێر کردن لەخۆر گیراندا

٥٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتْ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِالنَّاسِ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثمَّ رَكَعَ فَأَطالَ الرُّكُوعَ، ثمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ فَأَطالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ سَجَدَ فَأَطالَ السُّجُودَ، ثمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثانِيَةِ مِثلَ مَا فَعَلَ فِي الْأُولَى، ثمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ انْجَلَتْ الشَّمْسُ، فَخَطبَ النَّاسَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثنى عَلَيْهِ، ثمَّ قَالَ: (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإذا رَأَيْتُمْ ذلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ، وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا). ثمَّ قَالَ: (يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنْ اللَّهِ أَنْ يَزْنِيَ

---

(٤٦٨) اخرجه مسلم في الكسوف، باب: ذكرالنداء بصلاة الكسوف.. رقم: ٩١٥ = ٢١٠٠.

عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا) (الحدي: ١٠٤٤– اطرافه في: ١٢١٢، ١٠٦٦، ١٠٦٥، ١٠٦٤، ١٠٥٨، ١٠٥٦، ١٠٥٠، ١٠٤٧، ١٠٤٦، ٣١٦٦، ٥٢٢١، ٤٦٢٤، ٣٢٠٣).[٤٦٩]

**عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژ گیرا، جاپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا چوو بۆمزگەوتو لەوێ نوێژی خۆرگیرانی لەسەر ئەم شێوەیە، بۆموسوڵمانەکان کرد، ماوەیەکی دووردرێژ لەناونوێژەکەدا بەراوەستانەوە هەرقورئانی دەخوێند، ئینجا چەمییەوەو روکووعی بردو، درێژەی دابە چەمینەوەکەیشی، ئینجا لەچەمینەوە هەڵسایەوەو گەلێ قورئانی تری بەڕاوەستانەوە خوێند، بەلاَم لەهینی ڕاوەستانی یەکەمی کەمتر، ئەوجا دووبارە ڕکوعێکی دوورو درێژی تریشی بردەوە، بەلاَم لەڕکوعی یەکەمی کورتتر، ئینجا دوو کوڕنوشی دوورو درێژی برد،لەچەشنی دوو چەمینەوەکەی، یەکەم وەك یەکەمو دووەم وەك دووەم، واتە: لەدرێژیوکورتیدا، ئینجا هەرچی لەرکاتی یەکەمدا کرد، لەدووەمیش دا ئەوەی کردەوە، ئەوجا لەنوێژ بۆوەو خۆریش بەر بووبوو.**

**ئینجا ووتارێکی دا بۆمەردومەکەو، سوپاسو ستایشی پەروەردگاری کردو لەپاشا فەرمووی: (ئەم خۆرو مانگە دوونیشانەی گەورەن لەنیشانەگەورەکانی خودا، نەلەبەر مردنی کەسێونەلەبەر ژیانی کەسێ ناگیرێن، جاهەر کاتێ شتێ واتان بینی ئەوا لەخودا بپارێنەوەو ئەڵلاهو ئەکبەر بکەنو نوێژبکەنو خێرو بەخشینەوە بکەن).**

---

(٤٦٩) اخرجه مسلم في الكسوف،باب: ذكرالنداء بصلاة الكسوف: الصلاة جامعة، رقم: ٩١٥=٢٠٨٦-٢٠٨٨.

لەپاشا فەرمووی (ئەی نەوەی موحەمەد! ئەی گەلی ئیسلام! سوێندم بەخودا، کەس وەکی خودائاوا دەمار نایگرێ، کاتێ کەبەندەیێ لەبەندەکانی شەرواڵپیسی بکا، یاکەنیزێ لەکەنیزەکەکانی داوێن پیسی بکا، ئەی گەلی موحەمەد! بەو خودایە ئەوەی کەمن دەیزانم ئەگەر ئێوە بتان زانیایە زۆر کەم پێدەکەنین‌و زۆر ئەگریان).(تاج/١/٤٦٣/٢،فیقهی ئاسان/١/٢٤١=ز-١٦٦اژ-٩٢١).

## بانگەوازی نوێژی خۆرگیران

٥٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (نُودِيَ إِنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ). (الحديث: ١٠٤٥- طرفه في: ١٠٥١).[470]

عەبدڵلای کوڕی عەمر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) کەخۆر گیرا، بانگەواز هەڵ درا: (إنَّ الصّلاةَ جامعةٌ: وانوێژی خۆرگیران دەکرێ بەجەماعەت، زووکەن لەدەستی مەدەن!).(=تاج-١ز-١٦٥اژ-٩١٩).

## پەنا بەخوا گرتن لەسزای گۆڕ لەخۆرگیرانا

٥٣٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): أَنَّ يَهُودِيَّةً جَاءَتْ تَسْأَلُهَا، فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ. فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُعَذبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ ذلِكَ). (الحديث: ١٠٤٩-أطرافه في: ١٠٥٥، ١٣٧٢، ٦٣٦٦).[471]

---

(٤٧٠) اخرجه مسلم في الكسوف، باب: ذكرالنداء بصلاة الكسوف: الصلاة جامعة، رقم: ٩١٠=٢١٠٠.

(٤٧١) اخرجه مسلم في الكسوف، باب: ذكر عذاب القبر في صلاة الكسوف، رقم: ٩٠٣ = ٢٠٨٦-٢٠٨٨.

ثمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ذاتَ غَدَاةٍ مَرْكَبًا، فَكَسَفَتْ الشَّمْسُ، فَرَجَعَ ضحًى، فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ الْحُجَرِ، ثمَّ قَامَ فَصَلَّى وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا ثمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ سُجُودًا طوِيلًا، ثمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ ثمَّ قَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رفع فَسَجَدَ وَهُوَ دُونَ السُّجُودِ الْأَوَّلِ ثمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ ثمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَتَعَوَّذوا مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ). (الحديث: ١٠٥٠).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: جارێ ژنێکی جوولەکە هات بۆلام، داوای دەسەنەی لێ کردمو پێی گوتم: خوا پەنات بدات لەسزای ناو گۆڕ، جابۆدڵنیایی، لەم بارەیەوە پرسیارم لەپێغەمبەر کرد: ئایا ئەو خەڵکەکەدەمرن لەناو گۆڕەکانیاندا لەسەر تاوانی ژیانی جیهان سزادەدرێن! ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، پەنا دەگرم بەخودا لەسزای ناوگۆڕ).

جالەوەودوا سەرلەبەیانیەك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهۆی مردنی ئیبراهیمی کوڕیەوە،بەسواری کەژاوەیەك لەماڵ دەرچوو، قەدەری ئیلاهیو چارەنووسی خوایی وابوو کە خۆرگیرا، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی چێشتەنگاو گەڕایەوە، بەناو ماڵی هاوسەرەکانی دا ڕەت بوو، تاڕۆیشتە ناومزگەوت، ئەوجالەوێ لەشوێنەکەی خۆیدا راوەستاو نوێژی خۆر گیرانی دابەست. وە موسوڵمانانیش لە پشتیەوە، بەجەماعەت نوێژی خۆرگیرانیان دابەست. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەما، قورئانێکی زۆر دوور و درێژی خوێند، ئەوجا چەمینەوەی یەکەمی رکاتی یەکەمی برد، وەلەناویدا یادێکی زۆری خوای گەورەی کرد، ئەوجا سەری

لەچـەمینەوە هـەڵبڕی، دیـسان قورئـانێکی زۆری دوورو درێـژی لەڕاوەسـتانی دووهـەمی ڕکـاتی یەکـەما خوێنـد، بـەڵام لـە قورئـان خوێنـدنی ڕاوەسـتانی یەکەمی ڕکاتی یەکەم کەمتر، ئـەوجا چـەمینەوەی دووەمـی ئـەنجام دا، دیـسان لـەناو ئـەم چـەمینەوە یەشـدا کەچـەمینەوەی دووەمـی ڕکـاتی یەکـەم بـوو، تەسـبیحاتێکیی زۆری خوێنـد، بـەڵام لەتەسـبیحاتی ناوچـەمینەوەی یەکـەمی ڕکاتی یەکەم کەمتر، ئەوجا سەری هەڵبڕی‌و پشتی ڕاسـت کـردەوەو فـەرمووی: (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد... ) ئینجا دوو کڕنووشی دوورو درێژی بـرد، ئـیتر ڕکـاتی یەکـەم تـەواو ئـەوجا ڕکـاتی دووەمیـشی لەسـەر هـەمان شـێوە تــەواوکرد، ئــەوجا لەنوێــژ بــۆوە، لــەپاش تــەواو بــوونی نوێــژ،وتــارێکی بۆخەڵکەکـەدا، ئـەوەی کەحـەزی خـودای لەسـەر بـوو لـەم ووتـارەدا فـەرمووی: (بەشـێکی ئـەم ووتـارە لەفـەرموودەی ژمـارە ٥٣١ دا رابـورد- وەرگێـڕ) لەپاشـدا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی پـێ‌کردن کەپـەنابگرن بـەخودا لەسـزای ناوگۆڕ، لەژیانی بەرزەخا.

## کردنی نوێژی خۆر گیران بەکۆمەڵی

٥٣٤- عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنهُمـا) قَـالَ: انْخَـسَفَتِ الـشَّمْسُ عَلَـى عَهْـدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَقَامَ: قِيَامًا طَوِيلًا، نَحْوًا مِنْ قِرَاءَةِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًـا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُـمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهُـوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْـأَوَّلِ ثُـمَّ رَكَـعَ رُكُوعًـا طَوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتْ الشَّمْسُ، فَقَـالَ: صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لَا يَخْـسِفَانِ لِمَـوْتِ

أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذا رَأَيْتُمْ ذلِكَ فَاذكُرُوا اللَّهَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ، ثمَّ رَأَيْنَاكَ كَعْكَعْتَ؟ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ عُنْقودًا، وَلَوْ أَصَبْتُهُ لَأَكَلْتُم مِنْهُ مَا بَقِيَتْ الدُّنْيَا، وَأُرِيتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ مَنْظرًا كَالْيَوْمِ قط أَفْظعَ، وَرَأَيْتُ أَكْثرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). قَالُوا: بِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (بِكُفْرِهِنّ) قِيلَ: يَكفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: (يَكفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَط. (ر: ٢٧) (الحديث: ١٠٥٢).[٤٧٢]

ئینو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) خۆرگیرا، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خۆرگیرانی کرد، وەلەنوێژەکەدا گەلێ ڕاوەستاو ماوەیەکی دوورو درێژ لەناونوێژەکەدا بەڕاوەستانەوە هەرقورئانی دەخوێند، بگرە لەڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەمدا بەقەد سورەتی بە قەرەی خوێند... ئیتر هەموو فەرموودەکەی گێڕایەوە (وەك لەژمارە: ٥٣٣دا رابورد) تائەوێ کەئیبنو عەباس دەڵێ:جاپێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، کەدەبن بەبەڵگەو نیشانە لەسەر بوونی خوداو یەکتایی خودا، نەلەبەر مردنی کەس‌و نەلەبەر ژیانی کەس ناگیرێن! بەڵام هەرکاتێ شتێکی ئاوەهاتان دی ئەوا زیکرو یادی خودا بکەن. یاران (ڕەزای خودایان لێ بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم شوێنە پیرۆزەتا، چاومان لێت بوو دەستت برد بۆشتێ کەبیهێنیت، کەچی هەڵ سڵەمیتەوەو وەك کەسێ لەشتێ بترسێ‌وابوو، ئیتر کشایتەدواوە!؟ فەرمووی: (درووودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە لەو کاتەدا بەهەشتم دی، وەدەستم برد بۆهێشویێ ترێ لەمیوەکەی هەتا بیهێنم بۆتان، بەڵام بۆم نەکرایەوە، ئەگەر

(٤٧٢) اخرجه مسلم في الكسوف، باب: ماعرض على النبى (درودی خودای لەسەر بێ) في صلاة الكسوف، رقم: ٩٠٧ = ٢٠٩٠، ٢١٠٦.

بۆم بكرايەتەوە تاجيهان دەما هەرلێتان دەخواردو تەواو نەدەبوو، چونكە میوەی بەهەشت كەدەنكێكی لێ دەكەیتەوە دەنكێكی تر لەلایەنی خوداوە دێتەوە جێگەی! هەروەها ئاگری دۆزەخیشم دی! هەرگیزاو هەرگیز دیمەنی وادزێوو بێ رەزام نەدیوە، سەرنجم دا زوربەی خەڵكەكەی ناوی، ژنان بوو). عەرزیان كرد: ئەوە لەبەرچی؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (چونكە ناسوپاسی دەكەن‌و لەبەر ئەوە كەناسوپاس‌و ناشوكرن) گوتیان: ئایا ناسوپاسی‌و ناشوكری خودا دەكەن؟ فەرمووی: نەء، مەبەست ئەوەنییە، بەلاّم ناسوپاسی‌و ناشوكریی هاوسەرو هاوڕێ دەكەن‌و، پێنەزانن و چاكەیان لەبەر چاونییە،گریمان بەدرێژایی ساڵ چاكەوپیاوەتی لەگەڵ ژندابكەی، بەلاّم ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان شتێكی لێ دیت كەبەدڵی نەبێ، دەڵێ: ئەوەتی من هەم خێرم لەتۆ نەدیوە! ). (ت/١/٤٦٨/١-ش/ن = ز-١٧١١ ژ-٩٣٢).

## بەندە ئازاد كردن لەخۆر گیرانا

٥٣٥- عَنْ هِشَامٍ عَنْ فَاطِمَةَ عَنْ أَسْمَاءَ بنت أبي بكر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: لَقَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ). (الحديث: ١٠٥٤).[٤٧٣]

ئەسمائی كچی ئەبوبەكر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: (لەخۆر گیرانەكەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی كرد بەبەندە ئازاد كردن، تاخودا دەروی رەحمەتیان لێ بكاتەوە).

## باسی یادی خودا لەخۆر گیرانا

٥٣٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَال: خَسَفَت الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَزِعًا، يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ، فَأَتَى الْمَسْجِدَ، فَصَلَّى بِأَطْوَلِ قِيَامٍ

(٤٧٣) من افرادالبخاری: (فتح/٦٢٠/٢- خاتمة)- المترجم.

وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ رَأَيْتُهُ قَط يَفْعَلُهُ، وَقَالَ: (هَذِهِ الْآيَاتُ الَّتِي يُرْسِلُ اللَّهُ لَا تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِها عِبَادَهُ، فَإِذا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ). (الحديث: ١٠٥٩).[٤٧٤]

ئەبوو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی خۆرگیرانەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاپەڕی و شڵەژاو مەترسی ئەوەی هەبوو کەئەوە بەرایی نیشانەکانی هاتنی قیامەت بێ، ڕۆیشت بۆمزگەوت و لەوێ نوێژێکی خۆر گیرانی دوورو درێژی بەکۆمەڵی بۆ کردین،قەد نەمدیوه کەئاوا لەنوێژدا، قورئانی وا دورو درێژ لەراوەستانا بخوێنێ، یائاوا چەمینەوەو کوڕنووش درێژ بکاتەوە. وتارێکی دا، فەرمووی: (ئەم نیشانەو دیاردانەی کە خودا دەیان نێرێ و پیشانی ئەوخەڵکەیان دەدا، وەك خۆر گیران و مانگ گیران و بومەلەرزەو گەردەلوول و ئەمانە، خودا بۆئەوەی دەنێرێ کەبەندەکانی خۆی هۆشیاربکاتەوەو بەوانە بیان ترسێنێ و هەڕەشەیان لێ بکا، ئەگینا ئەم جۆرە نیشانە، نەلەبەر مردنی کەس و نەلەبەر ژیانی کەس روو نادات، جاکاتێ دیتان شتێ لەمانە رووی دا، ئەوا پەلاماری یادی خودا بدەن و، نوێژ بکەن و خێرو خێرات بکەن، چونکە خودا بەهۆی کردنی ئەم جۆرە خواپەرستیانەوە دەرووی رەحمەت لەبەندەکانی خۆی دەکاتەوەو، لەدەردو بەڵاو ناخۆشی ڕزگاریان دەکا).

## لەنوێژی خۆرگیران و مانگ گیرانا بەدەنگی بەرز قورئان دەخوێنرێ

٥٣٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَت: جَهَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةِ الْخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ فَإِذا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَتِهِ كَبَّرَ فَرَكَعَ، وَإِذا رَفَعَ مِنَ الرَّكْعَةِ

---

(٤٧٤) اخرجه مسلم في الكسوف، باب: ذكرالنداء بصلاة الكسوف: الصلاة جامعة رقم: ٩١٢ = ٢٠٨٩، ٢١٠٠.

قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد) ثُمَّ يُعَاوِدُ الْقِرَاءَةَ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ، أَرْبَع رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ. (الحديث: ١٠٦٥).(٤٧٥)

**عائیشه** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەنوێژی خۆرو مانگ گیراندا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فاتحەو سوورەتەکەی پاشی بەدەنگی بەرز دەخوێندو لەسەر ئەم شێوەیە دەیکردن: کاتێ لەفاتیحەو قورئان خوێندنی پاش فاتیحە دەبۆوە ئەڵلاهو ئەکبەری دەکردو دەچوو بۆچەمینەوە، کاتێکیش سەری لەچەمینەوە هەڵ دەبڕی دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) لەهەریەکێ لەهەردوو ڕکاتەکەدا دوو چەمینەوەو دوو کوڕنیشی دەبرد، کەدەکاتە چوار ڕاوەستان‌و چوارئیعتیدال‌و چوارچەمینەوەو چوار کوڕنوش.**

## ڕوونکردنەوە:

**ئەم چەندین خاڵانەلەم بابەتەدا ڕەچاو دەکرێن:**

**١- مەبەست لەئایات (نیشانەو عەلامات) چییە؟ مەبەست لەئایات لەم شوێنەو لەوێنەی ئەم شوێنەدا ئەو دیاردە سروشتی‌و نیشانە ئاسمانیانەن، کەناوبەناو لەناکاودا ڕوو دەدەن، وەك: خۆرومانگ گیران‌و بوومەلەرزەو بورکان‌و گەردەلول‌و زریان‌و بای سەخت‌و لافاوی گەورەو هەورە تریشقەو برووسکەو ئەستێرە کشان‌و شتی تری سامناکی ترسناك، یاوەك قەومانی کارەساتی ناخۆش، وەك مردنی زانای ئاینی گەورەو مردنی پادشای دادپەروەری ئیسلام پەروەر، هەروادیل کردنی ئەم زاتانە لەلایەن دوژمنەوە.**

**٢- لەم کاتانەدا چی بکرێ باشە؟ لەم کاتەنەدا بەشێوەیەکی گشتی خێرو یادی خوداو نوێژو تەوبەو پاڕانەوەو داوای لێ خۆش بوون لەخودا بکرێ، لەگەڵ ڕەچاو کردنی خاڵی سێیەم لەم ڕوونکردنەوەیە.**

---

(٤٧٥) اخرجه مسلم في الكسوف مختصرا (عينى/٧/٩١/١٠١، فتح/٢/٦٢٠- خاتمة)- المترجم.

٣- لەهەمان كاتا هەریەك لەم دیاردەو نیشانانە، لەكاتی ڕوودانیانا كردار یاگوتارێكی تایبەتی سوونەتە، یاهەردووكیان، یاچەند كردارو یاچەند گوتارێ، بۆنمونە: لەكاتی خۆرو مانگ گیراندا ئەو شتانە سونەتن كەلەم باسەدا بەدرێژی باس كراون، لەكاتی گەردەلوول‌و بای سەختدا نزای تایبەتی خۆی هەیە، لەكاتی هەورەتریشقەدا سوونەتەسێ جا بڵێ: (سُبحانَ من يُسبحُ الرعدُ بحمدهِ وَالملائِكة من خيفتهِ) لەكاتی كشانی ئەستێرەدا واباشە سەرنجی نەداو بڵێ: (ماشاءَ الله لاقُوَة إلا بالله) لەكاتی فەوتی گەورە پیاوانی ئیسلاما كڕنوش بردن بۆخودا، بەدەستی بەدەستنوێژەوە بەرەو رووگەیە، یەك كوڕنووش سوننەتە، لەكاتی بوومەلەرزەدا تەوبەو نزاو پاڕانەوەو پەناگرتن بەخودا لەشەڕی ئەم دیاردەیە سوننەتە. (بڕوانە تاج/١/٤٧٨،٤٧١،الاژكار للنووی ص١٦٢-١٦٤).

٤-لەكۆمەڵێ فەرموودەو (ئەسەر) بیستراوی دروستەوە دەردەكەوێ كەگوناه هۆی ڕوودانی دەردو بەڵایە. جارێ لەسەر دەمی پێشەوا عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێ) بوومەلەرزەیێ ڕوویدا، فەرمووی: (ئەی خەڵكی مەدینە! چ زووبێشەرعیتان بەرپاكرد، بەخودا ئەگەر ئەمجارە رووبداتەوە لەناوئێوەدا دانانیشم).

## پایانێ

باسەكانی نامەی خۆرو مانگ گیران- لەسەر فەرمایشتی مامۆستای عەسقەلانی- چل فەرموودەی تیادایە، نیوەیان پەیوەستن واتە: موصولن، ئەو نیوەی تریشیان بێ ڕشتن، واتە: معلقن، سی‌و دویان لەم باسە خۆیدا یالەپێشەوە دووبارە بوونەتەوە، پێشەوا موسلیمیش (ڕەزای خوای لێ بێ) هەموویانی گێراوەتەوە، بێجگە لەمانەیان:

١- (٥٢٩ ت= ١٠٤٠ ف).

٢-(٥٣٥ت= ١٠٥٤ ف).

پێنج بیستراوی صەحابەو تابیعیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٢٣) نامەی کوڕنووشی قورئانخوێندن (كتاب سجود القرآن)

٥٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَرَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّجْمَ بِمَكَّةَ فَسَجَدَ فِيهَا وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ غَيْرَ شَيْخٍ، أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى، أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ، وَقَالَ يَكْفِينِي هَذا، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذلِكَ قُتِلَ كَافِرًا). (الحديث: ١٠٦٧- اطرافه في: ٤٨٦٣،٣٩٧٢،٣٨٥٣،١٠٧٠).[٤٧٦]

عەبدڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەککە، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سورەتی(والنجم)ی خوێندو کوڕنوشی تیادا برد، ئەوا نەیش کەلەوێ بوون لەگەڵیا کوڕنووشیان برد، تەنیا پیرەمێردێ نەبێ، کەگوێلێ چەو، یالاگوێلێ خۆڵی هەلگرت و بەرزی کردەوە بۆتەوێلیو گوتی: پێویست بەکوڕنووش ناکائەمەم بەسە، لەوەدوا ئەوپیرەمێردەم دی بەکافری کوژرا. (تاج/١/٣٣٢/٨ ز-١١٠ ژ-٦٥٢ = ش/د/ت/ن).

عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: (لەتۆڵەی ئەوەدا کەکوڕنوشی نەبرد بەبێبڕوایی کوژرا، وادیارە ئەوانەی کەلەوڕۆژەدا بەم بۆنەیەوە تەوفیق دران بۆکڕنوش بردن، خودای گەورە ئاخر خێری بەنسیبی هەموویان کردووە، بەپیرۆزی ئەو کڕنوشە، لەئەنجاهەموویان موسوڵمان بوون).

(٤٧٦) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: سجود التلاوة رقم: ٥٧٦ = ١٢٩٧.

٥٣٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: (ص) لَيْسَ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ وَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ فِيهَا. (الحديث:١٠٦٩- طرفه في: ٣٤٢٢).[477]

ئیبنو عەباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئایەتەکەی سوورەتی (ص) لەئایەتە دامەزراوەکانی سەجدەی تیلاوەت نییە، لەگەڵ ئەمەیشا کەوا دەڵێم، من بەچاوی خۆم دیومە کەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنوشی تیادا دەبردو دەیفەرموو: (ئەمە بۆداود سەجدەی تەوبەبوو، واتە: کوڕنوشی تەوبەو ژێوان، بەڵام بۆئیمە دووسەجدەی شوکرە، واتە: کوڕنوشی سوپاس).

ئایەتەکەش ئەمەیە: (وَظن داودُ أنما فتناهُ فاستغفر ربهُ وخَرَّ راكعاً وأنابَ) (٢٤/٣٨). (بڕوانە تاج/١/٣٣١).

٥٤٠- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (سَجَدَ بِالنَّجْمِ، وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ، وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ). (الحديث: ١٠٧١-طرفه في: ٤٨٦٢).[478]

ئیبنو عباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوای ئایەتەکەی کوڕنوشی سوورەتی (والنجم)ەوە، کوڕنوشی برد، موسوڵمانەکانو هاوبەشپەیداکەرەکانو جنۆکەو ئادەمیزاد، ئەوەی لەوێ بوو هەموویان کوڕنوشیان بردلەگەڵیا، تەنانەت قاو داکەوت کەخەڵکی مەککە سەرجەم موسوڵمان بوون!).

٥٤١- عَنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَزَعَمَ أَنَّهُ قَرَأَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَالنَّجْمِ) فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا. (الحديث: ١٠٧٢- طرفه في: ١٠٧٣).[479]

---

(٤٧٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٦٥٢- خاتمة)- المترجم.

(٤٧٨) لم يوافقه مسلم في تخريجه (فتح/٢/٦٥٢- خاتمة)- المترجم.

زەیدی کوڕی سابت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: سورەتی (والنجم)م دەورکردەوە بۆپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنوشی تیادانەبرد. (تاج/١/٣٣٤ = ز-١١١ ژ-٦٥٨ = ش/د/ت/ن).

٥٤٢- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رحمه الله) قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَرَأَ (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) فَسَجَدَ بِهَا. فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَلَمْ أَرَكَ تَسْجُدُ؟ قَالَ: لَوْ لَمْ أَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ لَمْ أَسْجُدْ. (الحديث: ١٠٧٤).(٤٨٠)

ئەبوو سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوهورەیرەم دی سوورەتی (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ)ی خوێندو کوڕنوشی قورئانخوێندنی تیادا خوێند، پێم گوت: ئەوە ئەم کوڕنووشە چی بوو؟ فەرمووی: (ئەگەر بەچاوی خۆم پێغەمبەرم نەدیبایە کەلەناو ئەم سورەتەداکوڕنووش ببا کوڕنووشم نەدەبرد). (ت/١/٣٣٣-١٠-ش/د/ن).

٥٤٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ فِيهَا، السَّجْدَةُ فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَوْضِعَ جَبْهَتِهِ. (الحديث: ١٠٧٥- طرفاه في: ١٠٧٩، ١٠٧٦)*.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەئەو سورەتانەی بۆدەخوێندین کەکوڕنوشیان تیادایە، خۆی کوڕنوشی دەبردو ئێمەش کوڕنوشمان لەگەڵیدا دەبرد، تەنانەت لەبەر زۆری عەشاماتەکە هەندێکمان جێگەی دەست نەدەکەوت هەتا لەکاتی کوڕنوشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ. (ت/١/٣٣٠/٢ ز-١١٠ ژ-٦٤٦ = ش/د).

---

(٤٧٩) اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة،باب: سجودالتلاوة، رقم: ٥٧٧ = ١٢٩٧، ١٢٩٨.

(٤٨٠) اخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٧/١٠٥/١٠٩)- المترجم = ١٢٠٤-١٢٠٦.

* مسلم. مساجد. ١٢٩٥، ١٢٩٦.

## پایانێ

ماموّستا عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: باسەكانی نامەی كوڕنووشی قورئانخوێندن پازدە فەرموودەی تیادایە، دوانیان بێ ڕشتن (موعەللەقن) نۆ فەرموودەیان دووبارەن، پوختەكەیان شەش فەرموودەن، موسلیمیش (ڕەزای خوای لێ بێ) هەموویانی گێراوەتەوە جگەلەمانە:-

١-(٥٣٩ت=١٠٦٩ف).

٢-(٥٤٠ت=١٠٧١ف).

٣-(١٠٧٧ف.بڕوانە تاج/٢/٣٣٥/١).

حەوت بیستراو (ئەسەر)ی صەحابەو كەسانی تریشی واتیا، بەلاّم بیستراوەكان لەتەجریدەكەدا نین.

**تێبینی:**

زەیدی كوڕی سابیتی ئەنصاری لەصەحیحی بوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، خەزرەجییە، زەید نووسەری سرووش بوو،لەسەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەر بوو، بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی جوولەكە فێربوو بەپازدە ڕۆژ، كەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاغەزی دەنووسی بۆیان زەیدبۆی دەنوسین، كەكاغەزیشیان دەهات زەید دەیخوێندەوە بۆپێغەمبەر(بڕ: تاج/١/٣٣١/٥ = تاج-٤ ز-٩٤ ژ-٣٦٨٤ ج-٤).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٢٤) باسەكانی كورت كردنەوەی نوێژ (أبواب تقصير الصلاة)

٥٤٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ. (الحديث: ١٠٨٠- طرفاه في:٤٢٩٩،٤٢٩٨).[٤٨١]

---

(٤٨١) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٦٨٧-خاتمة)- المترجم.

ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازاد کردنی شاری مەککە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نۆزدە شەو لەمەککە مایەوە، لەوماوەیەدا نوێژی کورت دەکردەوە. واتە: نوێژە چوارینە کانی دەکرد بەدوورکات. (ت/١/٤٤٧/٣ = ز-١٥٥ ژ-٨٩١).

٥٤٥-عَن أَنَس (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ. قُلْتُ: أَقَمْتُمْ بِمَكَّةَ شَيْئًا؟ قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْرًا. (الحديث: ١٠٨١-طرفه في: ٤٢٩٧).[٤٨٢]

یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق فەرمووی: ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵ ئاوایی دا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەوە چووین بۆ مەککە، ئیتر هەر دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژە چوار ڕکاتی یەکانی دەکرد هەتا گەراینەوە بۆمەدینە، گوتم بەئەنەس: لەمەککە هیچ مانەوە؟ فەرمووی: دەشەو لەوێ ماینەوە. (ت/١/٤٤٧/٢ ز-١٥٥ ژ-٨٩٠ = ش/د/ت/ن).

٥٤٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا. (الحديث: ١٠٨٢-طرفه في: ١٦٥٥).[٤٨٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵ ئاواییدا، لەمینا، لەڕۆژەکانی جەژنی قوربانـدا، لەگەڵ پێغەمبەرخۆیو لەگەڵ ئەبووبەکرو عومەردا، لەکاتی جێنشینی خۆیاندا، نوێژە چوار ڕکاتە کانمان بەدوو ڕکات دەکرد، واتە: کورتمان دەکردنەوە لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکاتمان دەکرد، کەئەم کردارە لەزاراوی شەرعی پیرۆزداپێی دەوترێ (قصر الصلاة الرباعیە).

---

(٤٨٢) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة المسافرين..رقم: ٦٩٣ = ١٥٨٤.

(٤٨٣) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب:قصر الصلاة بمِنى، رقم: ٦٩٤ =١٥٨٨.

وەهەروەها لەگەڵ عوسمانیشدا لەسەرەتای فەرمانڕەواییەکەیدا بەهەمان چەشن دەمان کرد، بەڵام عوسمان لە دوایی دا چوار ڕکاتی تەواوی دەکردو لەمینا نوێژی کورت نەدەکردەوە. (تاج/١/٤٤٨/٤ ز-١٥٥ ژ-٨٩٢ = ش/ن).

٥٤٧- عَن حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آمَنَ مَنْ كَانَ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ. (الحديث:١٠٨٣-طرفه في: ١٦٥٦).[٤٨٤]

حاریسەی کوڕی وەهب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەمووی: لەحەجی ماڵ ئاوایی دا، لەڕۆژەکانی مینادا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژە چوار ڕکاتییەکانی کورت دەکردەوەو بەدووڕکات بۆی دەکردین، لەوکاتەشدا دنیا زۆر هێمن و ئەمین بوو، ئەوەی بڵێی ترس لەدوژمن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیبوو، کەواتە: کورت کردنەوەی نوێژ پەیوەندی بەترسەوە نییە، وەك گەلێ لەزاناکان وادەفەرموون. (بڕوانە: حاریسة بن وهب/الاستیعاب/ابن عبدالبر).

حاریسەری کوڕی وەهب خوزاعییە، برای دایکی عوبەیدیللای کوڕی ئیمامی عومەرە، لەصەحیحەین داچوار فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە (ڕەزای خوای لێ بێ).

٥٤٨- عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: صَلَّى بِنَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِمِنًى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فَقِيلَ ذَلِكَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَاسْتَرْجَعَ، ثمَّ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، فَلَيْتَ حَظي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَانِ مُتَقَبَّلَتَانِ. (الحديث: ١٠٨٤-طرفه في: ١٦٥٧).[٤٨٥]

---

(٤٨٤) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة المسافرين..رقم: ٦٩٣=١٥٩٦.

(٤٨٥) احرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: قصر الصلاة عينى، رقم: ٦٩٥=١٥٩٤.

کاتێ قسەیان بۆئیبنو مەسعود کرد: کەئیمامی عوسمان لەکاتی حەجا، لەڕۆژانی ڕەجمی شەیتانا لەمینا نوێژە چوارینەکان کورت ناکاتەوە، بەڵکو بەچوار ڕکاتی تەواو بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆو عەسرو خەوتنان بۆموسوڵمانان دەکا، ئەمەی پێناخۆش بوو، چونکە شتی وا بەپێچەوانەی باشترەوەیە، بۆیە فەرمووی: (إنالِلهِ وَإنا إليهِ راجِعُونَ). واتە: شتی واکارەساتە، ئینجا فەرمووی: (لەم ڕۆژانەدا لەمینالەگەڵ پێغەمبەردا لەسەر دەمی خۆیداو،لەگەڵ ئەبوبەکردا لەسەردەمی جێنشینی خۆیداو، لەگەڵ عومەردا لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، هەریەکێ لەم نوێژە چوار ڕکاتیەمان بەدوو ڕکات دەکرد، خۆزگەم لەم چوار ڕکاتەی کەئێستا لەسەردەمی جێ نشینی عوسماندا دەیانکەم دوانیان گیرا دەبوو، ئیتر بەسم بوو!).

٥٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قال النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ). (الحديث: ١٠٨٨).[(٤٨٦)]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوژنەی باوەڕی تەواوی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کەبەبێ کەسێکی خۆیی بچێ بۆسەفەرێ، کەڕۆژەڕێ بێ، یازیاتر دووربێ).

## لەسەفەردا نوێژی شێوان کورت ناکرێتەوە

٥٥٠- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضيَ اللَّهُ عَنهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ يُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ فَيُصَلِّيهَا ثلَاثا، ثمَّ يُسَلِّمُ، ثمَّ قَلَّمَا يَلْبَث حَتَّى يُقِيمَ الْعِشَاءَ فَيُصَلِّيهَا رَكْعَتَيْنِ، ثمَّ يُسَلِّمُ، وَلَا يُسَبِّحُ بَعْدَ الْعِشَاءِ، حَتَّى يَقُومَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ. (الحديث: ١٠٩٢).[(٤٨٧)]

---

(٤٨٦) اخرجها مسلم في الحج، باب:سفرالمرأة مع محرم إلى حج وغيره، رقم: ١٣٣٩.

(٤٨٧) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: جواز الجمع بين الصلاتين في السفر وفي الحج، باب الإفاضة من عرفات إلى الموزدلفة، رقم: ٧٠٣ = ١٦٢٥.

ئیبنـو عەمـەر (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: لەسـەفەردا سـەرنجی پێغەمبـەرم دەدا، ئەگـەر پەلـەی ڕۆشـتنی بوایـە، نوێـژی شـێوانی دوادەخست، لەپاشا سێ رکاتی تەواوی نوێژی شێوانی دەکردو سڵاوی دەدایـەوە، ئـیتر بـەبێ دواخستن نوێژی خەوتنانی دادەبەستو بەدوورکات دەیکردو سڵاوی دەدایەوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـەفەردا لـەپاش نوێـژی خەوتنانـەوە نوێـژی سوونەتی نـەدەکرد، هەتا نیوەشەو هەڵ دەسا بۆشەونوێژ! .

## باسی کردنی نوێژی سوننەت بەسواری وڵاخ باڕووشی لەڕووگەنەبێ

٥٥١- عَن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُـصَلِّي التَّطوُّعَ وَهُوَ رَاكِبٌ فِي غَيْرِ الْقِبْلَةِ. (الحديث: ١٠٩٤).[٤٨٨]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری وڵاخ نوێژی سوونەتی دەکرد، جاری وادەبوو ڕووشـی لەڕووگـە نـەبوو (تاج/١/٢١٤/١ ز-٥٤ ژ-٣٩٣ = ش/د/ت/ن).

## کردنی نوێژی سوننەت بەسواریی گوێدرێژ

٥٥٢- عَن أَنَسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) صلَّى عَلَى حِمَارٍ وَوَجْهُـهُ عَـنْ يَـسَارِ الْقِبْلَـةِ؟ فَقِيلَ له: تُصَلِّي لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ فَقَالَ: لَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَعَلَهُ لَمْ أَفْعَلْهُ. (الحديث: ١١٠٠).[٤٨٩]

ئەنەسی کوڕی شیرین (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئیمـامی ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بێ) کەلەشـام گەڕایـەوە چـووین بەپیریـەوە بۆپێـشوازی، لـە شـوێنێ بەخزمـەتی

---

(٤٨٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٢/٦٨٧-خاتمة)- المترجم.

(٤٨٩) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: جواز صلاةالنافلة على الدابـة في السفر: ٧٠٢ = ١٦١٨.

گەیشتین پێی دەڵێن عەینی تەمر، تەماشایم کردبەسواری گوێدرێژێ نووێـژی سوونەت دەکا، ڕووی لـەلای چـەپی قیبلەوەیـە، ئالەملایـەوە، منیش عـەرزیم کرد: دەبینم نوێژی سونەتت کرد، کەچی ڕووت لەڕوووگـە نـەبوو؟ فـەرمووی: (ئەگـەر بۆخـۆم پێغەمبـەرم بەچاوی خـۆم نەدیبایـە، کەلەسـەر ئـەم شێوەیە نوێژی سونەتی دەکرد، ئەمەم نەدەکرد! ).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:** ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ:

١- کرداری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك، گوتاری، بەبێ سێودوو، دەبێ بەبەڵگـە بۆوەرگرتنی بڕیار، واتە: کرداری ڕێك وەك گوتاری سەرچاوەی بڕیارە.

٢- نوێژی سوننەت، گەرچی نوێژخوێن ڕووشی لەڕووگە نـەبێ، بەسواریی وڵاخو خۆشرۆو ماشێنو فڕۆكو شەمەندەفەرو پاپۆڕو مووشەكو بـاڵۆن، لەسـەفەردا دروستە.

٣- نوێژخوێن لەسەر جێگەیێ نوێژ بخوێنـێ،کەپیـسی تیابـێ، نوێژەکـە دروستە، بەمـەرجێ پیـسیەکە لێی نەکـەوێ، چونکە وڵاخ کـە پێغەمبـەر خـۆی نوێـژی بەسـواریی پـشتی کـردووە،لەپیـسی بەدەرنییـە، هـەر هـیچ نـەبێ دەروازەکـانی لەشی پیسیان پێوە هەیە.

**شت شت یاد دەخاتەوە:**

لەیادمـە سـاڵێ شـێخ موحەمـەدی قـەرەداغی خـەتیبی مزگـەوتی گـەورەی سلێمانی (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ)، بۆنـەقڵی وتـارو نوێـژی هـەینی، سـەری میکرۆفونەکەی، بەدەرزیەکی سنجاق دابوو لەقەراخی یەخەی جبەکەی.

جاهەندێ لۆکەبەسـەر،ئەمـەیان کـرد بەمەهانـەیێ لـەدژی خـەتیب، گوایـە: ئەومیکرۆفۆنـە بەسـراوە بەوایەرێکـەوە، کەئـەو سـەرەکەی بەسـراوە بەچـەن دارتەلێکەوە، کەخواە ناخواە پیسی وا لەبن یـەکێ لەودارتەلانـەدا، شـتی وایـش نوێژ پووچ دەکاتەوە!

دەوروبەری ساڵی ١٩٥٥بوو، عێراق سەرجەم لەئێستا زیاتر، وەك مەنجەڵی سەر ئاگر دەكوڵا، لەمزگەوتی بنتەبەق مەلا مستەفای زەڵمی، ئیجازەی مەلایەتی دا بەیەكێ لەفەقێ مەلا باشەكانی خۆی، ئەوسا باوبوو، بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێكی قەشەنگ دەگێڕرا، خەڵكی گەڕەك و گشت مەلاو فەقێو پیاوما قووڵانی شارو قازیو فەرمانبەرانی میری بانگ دەكران،كۆمەڵێ وتاری جۆراو جۆر دەخوێندرانەوە، شەكراو دەخورایەوە، ئیجازە نامەیەكی پیرۆز دەخوێندرایەوە، ئەوجا قازی، یامەلا باشێ، یاگەورە پیاوێ، مێزەرو جبەی لەبەر فەقێ ئیجازەپێ دراوەكە دەكرد، ئیتر فەقێكە دەبوو بەمەلاو كۆتایی بەژیانی فەقێیەتی دەهێنا.

هەندێ كەسیش وەك كەڵەشێری ناوەخت خۆی تێ هەڵ دەقورتاند، ئەم جۆرە كۆبوونەوەی بەهەل دەزانی، بۆپڕوپاگەندەبۆدەستەو بەستەی خۆی، هەڵ ئەسا بەقاچاخی ووتارێكی دەدا!

جاكاك موحەمەدی مامۆستا مەلا عبدولكەریم ومن یەكێك بووین لەم لاكوتانە! قسەكانی من گەرچی كاڵو كرچ بوون، بەڵام چونكە بەیان حاڵی رووداوێكی تاڵی رەقو زەقو ناحەقبوون، هەتا ئێستایش لەناومەلاو فەقێكانا سەدای هەرماوە، پاڵفتەكەیان ئەمە بوو:

(... بەناوی هەموو فەقێكانی ناوچەكەوە، بێزاری لەحاڵی شڕی خۆمان دەردەبڕین، لەبەر ئەوە داوا لەكاربەدەستان دەكەین، كەقوتابخانەی ئایینیمان بۆبكەنەوە، هەتا كەی ئێمەی واریسانی پێغەمبەران، وەك سواڵكەرو شوانو گاوان، ئێوارانماڵەو ماڵ نان بچنینەوە بەرێزان! ئێوە هەموتان بەتەلو وایەركارەباتان ڕاكێشاوە بۆناو ماڵەكانتان، ئێمە بەڕۆژی نیوەڕۆ، بەئاوێنە شەوقی هەتاو رادەكێشین بۆناوحوجرەكانمان، چونكە نەكارەبایان تیادایە، نەڕۆشنایی، بەشەویش لەبەر ڕووناكی چرای كۆڵان دەخوێنین! گوتیشم:

ئەوەبۆ (مەجلیس عیلمی) شەرمێ لەخودا ناکەن، لەکاتی تاقیکردنەوەی تەعیندا، بەس سەیری دیاریو دەسەنەو واسیتەو جلو بەرگو کورەمەلایی دەکەن، گوێ بەزانستو مەلایەتی نادەن، مزگەوتەکانیان پڕکردوە لەمەلای نەزان، باری وشترێ لۆکەیان لەسەر ناوە، بەلآم بەقەد حوشترێ عیلمی یان پێ نییە... سەرە واوی وەحە لەورگیانا نییە.. خەلکە بۆ خوا بەشایەت بن رۆژ رۆژی زانستو شەهادەیە، باوی بارە لۆکە بەسەرچوو..!)

کاکەحەمەش لەبارەی زەمێکی خەستی چڕو پڕی بەنداوی دوکانو دەربەندیخانەوە شانی پیا کرد.. گوایە:

(... ئەم بەنداوانە بۆ ئەوە دروست دەکرێن، کەببن بەبنکەی سەربازی ژێر دەریایی ئەتۆمی! ئەمەریکای جیهانخۆر دەیەوێ ولآتەکەمان بکا بە پێگەی ئەتۆمی لەدژی یەکێتی سۆڤێت، کەباوکی گەلانە، پاسەوانی ئاشتی یە، .. دەی ئێمە چۆن رازی دەبین، کەلەخاکی ئێمەوە هێرش ببرێتە سەر رزگارکەری مرۆڤایەتی، بڕووخێ سەددی دوکانو دەربەندیخان! بمرێ ئەمەریکا، بژی .. و..! ). ئەمە پوختەی وتارەکەی حەمە بوو . مامۆستا مەلا مستەفای سەفوەت هەبوو ، مەلایەکی زیرەکی رۆشنبیر بوو ، ووتار بێژێکی جوان بوو ، بەلآم بەقەد عەققاد رقی لە کۆمەنیست بوو ، کۆمەلێ مەلای تریش هەبوون، بەقەد دەروێشێ ئاگایان لە رۆژ نەبوو، لەم جۆرە کۆڕانەدا چاویان لەبڕیاری مەلای سەفوەت بوو، کوێرانە دوای دەکەوتن، جا سەفوەت لەم قسانەی (حەمەی مەلا) تووڕە بوو، بەمەلا مستەفای زەلمی گوت: ( مەلا مستەفا! ئەمە ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی فەقێ یە، یا مینبەری وتاری ئێستگەی مۆسکۆیە..) ئەوجا گوتی:

(خەلکە! بۆ خواتان پێ دەلێم: ئەم بیرو باوەڕە پیسە بەنگو تلیاکی گەلانە، یەکەم کۆماری نەتەوایەتی کورد لەمەهاباد، رزگارکەری مرۆڤایەتی، باوکی گەلانی جیهان بەچەند تەنەکەیەك نەوت فرۆشتی، بەچاوی خۆتان دەبینن

کەئـەم شـین‌و شـەپۆڕو گـا قوڕەیـان لەبەرچاوی ڕەشـی گـەلان نییـە، بـەڵکوو بـۆ هەریـسەی نەوتـە، لەڕاسـتیدا دانیـشتن لـەکۆڕی وادا، بـا لـەناو مزگەوتیـشا بـێ، کەحەقیقـەتی تیـا ئـاوەژوو دەکـرێ تاوانـە.. ئەمـە مزگەوتـە یـا خەلییـەو شانەی کۆمەنیـسته..! ) یـا شـتێ لـەم بابەتـەی گـوت، مـەلا عبداللـەی بێـژوەیی هـەبوو سـۆفی شـێخی بیـاره بـوو، لـە خزمـەت ماموٚسـتا مـەلا عبدلکـەریمی بیـارەدا دانیـشتبوو، تاباسـی بیـارەی بـۆ بکـا، کەگوێی لـەم کـەینو بەینـە بـوو، بەحەمـەی فەرموو: ئەم سەگبابە کێیە ئادەی بەشەق بیکەنە دەرەوە!

ئـەوجا سـەفوەت کۆڕەکـەی بـەجێ هێشت، کۆمەڵەکەیـشی یەکـسەر بـەدەم جنێـو دانـەوە کۆڕەکـەیان چـۆڵ کـرد، هـەیان بـوو دەیگـوت: مـچە زەڵمـی تـۆ لەمەت چی؟! تۆ لەم ملەقووتیەت چی؟!

ئەو ڕۆژگارە لەئێستامان خراپتر، مەردوم چەواشە کرابوون، شاری سلێمانی دەتگـوت گڕکانـە، جـەماوەر بـەدەنگی دەهـۆڵی دوور بەتـەواوی تـەفرە درابـوو، هەتا گەڕەکەکانی ناوی نامۆیان لێ نرابوو، وەك: کۆریـا، مۆسـکۆ، فیتنـام.. تـاد، داخەکەم ئێستایش هەندێ کورد بەناوی کوردی ددانیـان ئـاڵ دەبێتـەوە، ئاشـق بـەناوی بیـانین، وەك: حـەماس‌و دێـر یاسـین،ئـەو هەمکـە گونـدو شارۆچـکە پیرۆزانـەی کوردسـتان، کەقەلاچـۆکران، هیـچیان شـایانی ئـەوەنین، کەبنکـەو مەڵبەندەکانی ئەوانیان بەناوە ناو ببرێ!

وەکـی تـریش کۆمـەڵێ مـەلای تـری نیـشتمانپەروەر هـەبوو، زوربـەیان لەژێرەوە پارتی‌و شتی تـری وابوون، بەدزییەوە بـەخۆیان دەگوت: عولەمای ئەحرار، زۆربەی فەقێ کانی ئەو سـەردەمە تـەفرەدراوی ئـەم گورووپـە بـوون، چونکە بەخـەیاڵ وەك خـەوی خۆش مـژدەیان دەدا کەبـەزوویی لەسـەر دەسـتی ئیـشتراکییەتدا (بەهەشـت دێتـەوە بۆسـەر زەوی..) لەهوتافکێـشاندا دەیانفـەرموو: (.. سۆسیالیـستی ڕێڕەومانـە، ئـەبو زەڕ پێـشڕەومانە !!) بـە ئەبووذەڕی غەفارییان دەگوت: ابوالاشتراکیە!

من خۆم یەکێ بووم لە بە تەڵەبوانی ئەم تاقمەیە،بەڵگەیشم ئەم شتانەیە:بەشداریم دەکردلە (دەنگی فەقێ)دا،ڕۆژنامەم بە قاچاخی دەخوێندەوە ،لەچاخانەی حەمەڕەق بە بەرگی فەقێیەتییەوە بە سەری ڕووت دادەنیشتم ،دەچووم بۆ سینەما،گوێم لە ڕادیۆ دەگرت،!! هاموشۆی باخی گشتیم دەکرد، هاوبەشی موسابەقەو پێشبڕکێو وەرزشم دەکرد، قژە سەرم درێژ دەکرد، دەی ئەگەر ئەمە حورییەتو سەربەستی نەبێ دەبێ سەربەستی چی تربێ؟!

ماموٚستا مەلا سەی غەفوور هەبوو،مەلای مزگەوتی سەی حەسەن بوو، مرۆڤێکی زاناودانا بوو، لەسەرگورووپی زانایانی سەربەست حلێب دەکرا، لەم کاتەدا بەوردی سەرنجی ئەم فلیمەی دەدا، جاکاتێ سەفوەت وپیرەکەی کوڕەکەیان بەجێ هێشت، بە دەنگێکی بەرزی کاریگەر،کە هەموو لایێ گوێیان لێ بێ، بە سەفوەت ودەستەکەی گوت: (وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ!).

ئیترکوڕەکە بوو بەکوڕی (بژیو بمرێو بڕوخێ!) من کاتێ گەڕامەوە چووم بۆ خزمەتی ماموٚستا مەلا ئەسعەدی مەحوی (رەحمەتی خوای لێ بێت)، گوێم لێ بوو حاجی عەلی خەلیفە بەپەرۆشەوە دەنگوباسەکەی بنتەبەقی بۆ دەگێڕایەوە، دەیگوت: (.. قوربان! دەردەگاکە کەوتۆتە ناو مەلاکانیشەوە، هەیانە مۆسکۆ بەقیبلەگا دەزانێ، فەقێ سیسەڵەکەی لای تۆیش لەوانە.. ڕەنگ بێ ئێستا گیرابێ، ئای خۆ ئەوەتە هاتەوە..) ماموٚستایش فەرمووی: فەقێ نووری چایەکە گەرمە چایێ بۆ خۆت تێکە..).

قەت مەبەستم لەم قسانە تانە نییە، لەمردوو یا لەزیندوو، خوا یاربێ من لەشتی واوە دوورم، مەبەستم خزمەتە، کەبیکەم تا هەل لە دەستە، چونکە لەزۆر رۆشنبیران دەبیستمەوە، کەئەم جۆرە یادگارانە زۆر بەسوودن، بەتایبەت لەم جۆرە بابەتانە کەوەك ئاوێنەی ئەو کاتەیە وان.

جا هەر لەم بابەتەیە ئەم چەند یادگارانە:

مامۆستا شێخ ئەمجەد زەهاویو شێخ صەوواف هاتن، شەو لەنادی مووەزەفین بوون، منو مەلا کەریمی گوڵپیو چەند فەقێیەکی تر، دێنیمان کردن، سکاڵای حاڵی خۆمان لەلاکردن، داوای یارمەتیمان لێ کردن بۆ کردنەوەی فێرگەی ئایینی، ئامادەیی خۆمان دەربڕی بۆ بەشداری کردن لەغەزای جەزائیردا.

جارێ لەسەردەمی عومەر عەلی دا[٤٩٠] وا دەزانم مەلیك، یا پیاوێکی گەورە هات، ئەرزەو حاڵمان دا پێ ی، بۆ کردنەوەی قوتابخانەی ئایینی، لەسەرا کۆیان کردینەوە، لەئەنجاما من لەگەڵ بارچاوەشێکا لەسەر مەسەلەکە دەممان تێك گیرا، منیان گرت: فەقێ غەفووری کانی سپی کەیی و فەقێ رەئووف شانەخسەییو فەقێ کەریمی سێتەلانی چوون بۆ خزمەتی قازی شێخ محەممەدی خاڵ، گوتیان: قوربان! فەقێ نوری لەسەر مەدرەسە گیراوە، کردوویانە بە شیوعی لەسەر قسەی حەق، قازی تەشریفی هات، هەر لەیادمە بەموعاون سەرای فەرموو: (ئەمانە ئەهلی عیلمن، سبەینێ دێنە جێگەی ئێمە، بەچاوی سووك تەماشایان مەکەن..) ئیتر بەریان دام.

ئای دنیا! ئێستا لەم مێژووەدا (١٩٩٩) فەقێ نوری، بەرهەمی ئەو کۆششەی دەدووریتەوە، لەپەیمانگەی ئیسلامی کوردستان وانەبێژە، دەرس بەفەقێ دەڵێتەوە، خوایە! هەموو ئاواتێکمان ئاوا بهێنیتەدیو پیتو فەڕ بخەیتە ئەم فێرگە ئیسلامییانە. ئامین. خوایە! بەرەحمەتی خۆت نموونەی ئەزهەری شەریف لەم کوردستانەدا زۆربکەی. ئامین.

وەرگێڕ/ نوری فارس حەمەخان - ١٩٩٩/٥/٣٠

---

(٤٩٠) وەك دەزانین پیرۆز خانی دایکی خولە پیزە بانگ کرا بۆشایەتی دان لەسەر عومەر عەلی، بۆ مەحکەمەی شەعب لەبەغدا، تەلەفیزیۆن قسەکانی میمی پیرۆزی نەقڵ کرد، هەر لەیادمە کەوەك ژنێکی کوردی ئازای گوساغ بەعومەر عەلی گوت؛ دەك ماڵ و مناڵت بە قاورمە بێ وەك جەرگی منت دا بەتەنوورەوە، جالەپاش ڕۆژگارێ نزاکەی میم پیرۆز گیرابوو، خۆم بەچاوی خۆم لە مزگەوتی ئیبراهیم بەگ، لەکەر کووك تەرمی عومەر عەلی و ژنەکەی و دوو منالیم بینی، لەڕێگەی بەغا وەرگەڕابوون، بوو بوون بەقاورمە. ڕاستە کە دوعای مەزلوم رەت نابێتەوە (وەرگێڕ).

## نەكردنی نوێژە سوننەتەكانی پاش و پێش فەرزەكان

٥٥٣- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) فَقَالَ: (صَحِبْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ أَرَهُ يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ وَقَالَ اللّٰهُ جَلَّ ذِكْرُهُ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللّٰـهِ إِسْوَةٌ حَسَنَةٌ) (الحديث: ١١٠١)(٤٩١).

ئیبنوعومـەر (رەزای خوایان لێ بێ) دەفـەرموێ: بۆخـۆم زۆر لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووم، نـەیم دیـوە كەلەسـەفەردا نوێـژی سـوننەت بكـا، وەلحـاڵ خـودای یادمەزنیش دەفـەرموێ: (لقد كان لَكم في رسـول الله أسـوة): پێغەمبـەری خـوا سەرمەشقێ جوانە بۆ ئێوە، لەهەموو كارێكتانا پەیڕەوی بكەن).

### راڤەو شیكردنەوە:

بـەپێی ئـەم فەرموودەیـە لەسـەفەردا نوێـژە سـوننەتەكانی پـاش‌و پێـشی فەرزەكان ناكرێن. بەڵام زوربەی زاناكان دەفەرموون: لەسەفەریشا نوێـژخوێن ئارەزووی خۆیەتی، بۆی هەیە هەموو جۆرە سوننەتێ بكا، بۆی هەیە نەیانكا.

## نوێژی سوننەت لەسەفەرا

٥٥٤- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضي اللّٰهُ عَنْـهُ) (أَنَّـهُ رَأَى النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى السُّبْحَةَ بِاللَّيْلِ فِـي الـسَّفَرِ عَلَـى ظَهْـرِ رَاحِلَتِـهِ حَيْـث تَوَجَّهَـتْ بِـهِ). (الحديث: ١١٠٤)(٤٩٢).

عـامیری كـوڕی رەبیعـە (رەزای خـوای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: لەسـەفەردا لەخزمـەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) بووم، دیومە بەشەو شەونوێژی دكـرد، جـارێ دیـم

(٤٩١) اخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٧/١٤٤/١٣٥- المترجم).

(٤٩٢) اخرجه مسلم في الصلاة (عينى/٧/١٣٧/١٢٧- المترجم) = ١٦١٤.

بەسـواری وڵاخەکـەی، بـەدەم ڕێـوە شـەو نوێـژی دەکـرد، وڵاخەکـەی ڕوی لەهەرلایەك بوایە، مەبەستی نەبوو بەمەرجێ بەرەو ئەو جێگە بڕۆشتایە کەمەبەستی بوو (بڕوانە تاج: ٢١٤/ ١/ ٢/ ٣ = ز-٥٤ ژ-٣٩٣).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عـامیری کـوڕی ڕەبیـع (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەموسوڵمانە هەرەپێشینەکان، لەگەڵ ژنەکەیدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، لەپاشا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەدرییە، لەگشت غەزاکانی تری پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) بەشداری کردوە دووفەرمودەی لەصەحیحی بوخاری دا هەیە، لەکاتی ئاژاوەکەی سەردەمی عوسماندا (ڕەزای خوای لێ بێ)، عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) شەوێ هەڵدەستێ بۆ شەونوێژ، لەپاش شەونوێژەکەی دەخەوێتەوە جادێنە خەوی، پـێی دەڵێن: هەڵسە لەخودا بپاڕێرەوە، کەلەم ئاژاوەیە پەنات بدا، هەروەك بەندە باشەکانی خۆی لێ پەناداوە، ئەویش هەڵدەستێتەوەو نوێژدەکاو نزادەکا، جالەپاشا نەخۆش دەکەوێ، ئیتر لەماڵ دەرناچێ تائەو ساتەی تەرمەکەی دەبەن بۆ گۆڕستان. چەند قسەیێ لەساڵی وەفاتی کراوە، ڕەنگ بێ ساڵی سیو حەوتی کۆچی، کۆچی دوایی کردبێ، ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ.

## کۆکردنەوەی نوێژی شێوانو خەوتنان لەسەفەردا

٥٥٥- عَن ابن عَباسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) قال: كان رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يَجمَعُ بَينَ صَلاةِ الظهرِ والعَصرِ إذا كـانَ عَلَى ظهـرِ سَيرٍ، وَيَجْمَـعُ بَـيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ). (الحديث- ١١٠٧)[٤٩٣].

---

(٤٩٣) رواه مسلم (تاج الاصول ج/١ ص٢٦٧) = ١٦١٩ شيخ/شيحا.

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمویش: یاسای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وابو، ئەگەر لەسەفەردا بوایە، نوێژی نیوەرۆ و عەسری پێکەوە کۆدەکردەوە، وەنوێژی شێوان و خەوتنانیشی پێکەوە کۆدەکردەوە (ش/ تاج/ ١/ ٤٤٩ = ز-١٥٦ ژ-٨٩٥).

## کردنی نوێژ لەسەرلا

٥٥٦- عَنْ عِمْرانَ بْن حُصَيْنٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: كَانَتْ بِى بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ النبيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الصَّلاةِ، فَقالَ: (صَلِّ قائِماً، فَإِنْ لَمْ تَستَطِعْ فَقاعِداً، فَإِن لَم تَستَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ). (الحديث: ١١١٧).

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مایەسیریم بوو، لەپێغەمبەرم پرسی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر مرۆڤی ساغ بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکا چۆنە؟ فەرموی: ئەوەی بەپێوە نوێژ بکا ئەوە خێرترە، بەلام ئەوەی بەدانیشتنەوە بیکات ئەوە نیوەی پاداشی ڕاوەستاوی بۆهەیە، وەئەوەی بەڕاکشانەوە بیکات ئەوە نیوەی پاداشتی دانیشتوی بۆ هەیە. وەلەبارەی نوێژی نەخۆشیەوە لێم پرسی، فەرمووی: ئەگەر دەتوانی بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر ناتوانی ئەوا بەدانیشتنەوەبیکە، خۆئەگەر بەدانیشتنەوە نەت توانی ئەوا بەرەو قیبلە لەسەرلا نوێژەکەت بکە، چ فەرز بێ چ سونەت، لەکاتی نەخۆشیدا، چونکە مەهانای ڕەوای هەیە بەهۆی دانیشتن یاپاڵکەوتنەوە پاداشی کەم ناکات. (تاج: ١/ ٥٠٦ = ز-١٨٥ ژ-٩٩٥).

## کردنی نوێژهەندێکی بەدانیشتنەوە و هەندێکی بەپێوە

٥٥٧- عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ المُؤْمِنِينَ، (رَضي الله عَنْها) (أَنَّهَا لَمْ تَرَ رسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي صَلَاةَ اللَّيْلِ قَاعِداً قَط حَتَّى أَسَنَّ، فَكَانَ يَقْرأُ قَاعِداً، حَتَّى

إِذا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ، فَقَرَأَ نَحواً مِنْ ثلاثِينَ آيَةً أَوْ أَربَعِينَ آيَةً، ثمَّ رَكَعَ). (الحديث: ١١١٨- أَطرَافُهُ فِي: ١١١٩، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧).

وَعَنْهَا (رَضي اللهُ عَنها) فِي رِوَايَةٍ: (ثمَّ يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثانِيَةِ مِثلَ ذالِكَ فَإِذا قَضى صَلاَتَهُ نَظَرَ: فَإِنْ كُنْتُ يَقْظى تَحَدَّث مَعِي، وَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً اِضطجَعَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ١١١٩).

**عائیشه، دایكی موسوڵمانان (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدانیشتنەوە شەو نوێژبكا، هەتا كاتێ چوو بەساڵا، ئیتر بەدانیشتنەوە قورئانی ناو نوێژی شەونوێژی دەخوێند، هەتا دەیویست كە ڕوكوع ببا، ئەوسا هەڵدەستایە سەرپێ، بەڕاوەستانیشەوە دەوری سی چل ئایەتی تریشی دەخوێند ئەوسا روكوعی دەبرد. لەگێڕانەوەیەكی تردا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: ئیتر لەركاتی دووەمیشا هەمان شتی دەكردەوە، جاكاتێ لەشەو نوێژەكەی دەبۆوە تەماشای دەكرد: ئەگەر من بەخەبەر بومایە ئەواقسەی لەگەڵ دەكردم، ئەگەرمن خەوتوو بومایە ئەوا ئەویش ڕادەكشا (دروودی خودای لەسەر بێ).**

## پایانێ

**شێخی عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: باسەكانی كورت كردنەوەی نوێژ پەنجاو دوو فەرمودەی بەرزەوە كراوی تیادایە، شازدەیان رشتە كرتاون، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن سیو دوویان لەم باسە خۆیدا یالەپێشیەوە دووبارە بونەتەوە پێشەوا موسلم یش (ڕەزای خوای لێ بێ) هەمویانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەمانەیان:**

**١- (٥٥٤ ت = ١٠٨٠ ف).**

**٢- (٥٥١ ت = ١٠٩٤ ف).**

**٣- (١١٠٨ ف. لەتەجریدەكەدا نیە).**

٤- (٥٥٦ ت = ١١١٧ ف).

هەروەها شەش بیستراو (ئەسەر)ی صەحابەو کەسانی تری پاش ئەوانیشی واتیا.

کەواتە کۆی بەرزەوەکراوو بیستراو دەکاتە: (٥٢+٦=٥٨) لەم پەنجاو هەشتە چواردەیان لەتەجریدی بوخاریدا هەیە لەژمارە: (٥٤٤)ەوە هەتا ژمارە: (٥٥٧) چونکە: (٥٥٧- ٥٤٣= ١٤).

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

## ٢٥) باسەکانی شەو نوێژ (أبْوابُ التَّهجُّد)

٥٥٨- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَتهَجَّدُ قَالَ: (اللّٰهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْض وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْد، لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْض وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْض وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْد، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَق، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ اللّٰهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَوْ: لَا إِلَهَ غَيْرُكَ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ). (الحديث: ١١٢٠- أطرافه في: ٦٣١٧، ٧٣٨٥، ٧٤٤٢، ٧٤٩٩)[٤٩٤].

ئیبنو عەباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەلەشەوا هەڵئەسا بۆ شەونوێژ ، لەسەرەتاوە دەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ لَكَ الحَمْدُ) هەتا (... وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِالله). واتە:

---

(٤٩٤) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: الدعاء في صلاة الليل وقيامه، رقم:٧٦٩ = ١٨٠٩ شيحا.

ئـەی خودایـە! سـوپاسو سـتایش هـەر بۆتۆیـە، تـۆ هەتاهەتایـە پایـەداریو مایـەی بـوونو مـانی هەمووشـتێکیو، پـارێزەرو راگـری ئاسمانـەکانو زەویو ئەوەیـشی لـەوانا هەیـە، هەرچی هەیـەو نییـە سـەر رشتەی بـوونو نـەبوونی بەدەسـتی تۆیـە، دیـسان سـوپاسو سـتایش بۆتـۆ، هـەرخۆتی خـاوەن و پادشـای ڕاستەقینەی ئاسمانـەکانو زەویو ئەوەیـشی وا لـەناو ئـەوانا، دیـسان سـوپاسو ستایش بۆتۆ، تۆهەقیو ڕاستو دروستیو، بەڵێنت هەقـەو ڕاسـتەو دروسـتەو، شـادبوونو گەیـشتن بەدیـداری تۆلـەپاش مـردن، حەقـەو ڕاسـتە، فـەرموودەت ڕاستە، بەهەشت ڕاستە، دۆزەخ ڕاستە، پێغەمبـەران حـەقو ڕاسـتن، موحەمـەد (درودی خودای لەسەر بێ) حەقەو ڕاسـتە، قیامەت ڕاستە، ئەی خودایە! خـۆم سـپارد بـەتۆ، باوەڕم هەیە بـەتۆ، پـشتو پـەنام هـەرتۆی، داڵدەم هیناوەتـە بـەرتۆ، بەپـشتی تۆدەچم بەگژناحەزی خۆما، مەحکەمـەو دادی خـۆم دێنمـەلای تـۆو، تۆدەکـەم بەحەکـەم لـەنێوانی خـۆمو نـەیارما، سـاتۆیش بەکـەرەمو گـەورەیی خـۆت لـەگوناهی بـەرو دوام خـۆش بـە، هـەروەها لـەگوناهی نهێنـیو ئاشـکرام، پەروەردگارم! پێشخستنو پاش خستن بەدەسـتی خۆتـە، خـۆدای ڕاسـتو ڕەوان هـەرتۆی، بـزووتنو هێـزو تـەوانایی هـەر بەدەسـتی خـودا خۆیـەتیو بـەس) (تاج/١/٥٠٢ = ز-١٨٤ ژ-٩٨٦ = ش/ت/ن).

## باسی گەورەیی شەونوێژ

٥٥٩- عَنْ ابن عمر (رضى الله عنهُمَا) قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا، فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكُنْتُ غُلَامًا شَابًّا، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ (رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذا لَهَا قَرْنَانِ، وَإِذا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذ بِاللَّهِ مِنْ

النَّار، قَالَ: فَلَقِيَنا مَلَكٌ آخَرُ، فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ).(الحديث رقم:١١٢١ والحديث رقم: ١١٢٢- أطرافه في: ١١٥٧،٣٧٣٩،٣٧٤١،٧٠١٦،٧٠٢٩،٧٠٧١).[٤٩٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لەژیانی پێغەمبەرخۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) پیاو هەبوو خەونی دەدی‌و دەیگێرایەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) منیش بەعەزرەتەوە بووم کەخەونێ ببینم هەتا، بیگێڕمەوەبۆی، لەوسەردەمەدا من هەرزەکار بووم، ژنم نەهێنابوو، لەمزگەوت دەخەوتم، جارێ لەخەومادیم‌وا دووفریشتە وەك بمگرن‌و بمبەن بۆدۆزەخ وابوو،ئاگرەکەیش- وەك بیری هەڵچنراو- لەناوەوە هەڵچنرا بوو، هەروا دووشاخەی هەبوو وەك دوو شاخەی چەرخی سەربیر، کەلە هەردوو تەنیشتی بیرەوە هەن، هەردوو سەری داری چەرخەکەیان دەخرێتە سەر، چەند کەسێکی تیادا بوون ناسیمنەوە، ئیتر دەستم کردبەگوتنی پەنادەگرم بەخودا لەزیانی ئاگر، فەرمووی: جاگەیشتین بەفریشتەیەکی تر، بەمنی فەرموو: ترست نەبی، جائەم خەونەم گێرایەوە بۆحەفصەی خوشکم، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، حەفصەیش دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر فەرمووی: (عەبدڵڵا پیاوی چاکە، بریا- بەشەو- شەونوێژی دەکرد!). (تاج- ز-٢٧ ژ-٣٣٩٨).

سالمی کوری عەبدڵڵای کوڕی عەمەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: (ئیتر لەوەدوا عەبدڵڵای باوکم بەشەو، نەختێك نەبێ، نەدەنوست هەرخەریکی شەو نوێژوشتی وا بوو!).

---

(٤٩٥) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عبدالله بن عمر (رَضِي اللهُ عَنهُما)، رقم: ٢٤٧٩ = ٦٣١٩، ٦٣٢٠.

### راڤەو شیكردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١-ئاوات خواستن بۆ بینینی خەوی باش، كەببێ بەهۆی دڵ ڕوونكردنەوە.

٢-نووستن لەناو مزگەوتدا،بەمەرجێ ڕێ لەپەرستی (عیبادەت) نەگرێ.

٣-فریشتە لەخەوندا دەبینرێن، چونكە پێغەمبەر تەقریری خەونەكەی ئیبنو عومەری كردووە.

٤-زۆر جار بەهۆی خەونەوە خودا بەندەی خۆی هۆشیار دەكاتەوە.

٥-گەورەیی‌و خێری شەونوێژ.

## نەكردنی شەونوێژ لەبەر نەخۆشی

٥٦٠– عَنْ جُنْدَبًا قالَ: اشْتَكَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ. (الحديث:١١٢٤–اطرافه في: ٤٩٨٣،٤٩٥٠،١١٢٥).[٤٩٦]

جوندوبی كوڕی عەبدڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆش بوو،لەبەر ئەوە شەوێ، یادووشەو شەو نوێژی نەكرد.

### راڤەو شیكردنەوە:

جوندوب صەحابەیە، لەسەردەمی پێغەمبەردا مێرد منداڵ بووە.

## هاندانی كەسوكار لەسەر شەونوێژ

٥٦١– عَنْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طالِب (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طرَقَهُ وَفَاطمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ عَلَيْهِ السَّلَام لَيْلَةً، فَقَالَ: (أَلَا تُصَلِّيَان). فَقُلْتُ:

---

(٤٩٦) اخرجه مسلم في صلاة المغازى (عينى/١٧١/٧/١٥٣)- المترجم.

يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللّٰهِ فَإِذا شَاءَ أَنْ يَبْعَثنَا بَعَثنَا، فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْنَا ذلِكَ، وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُولّ، يَضرِبُ فَخِذهُ وَهُوَ يَقُولُ: (وَكَانَ الْإِنْسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا). (الحديث: ١١٢٧- اطرافه في: ٤٧٢٤،٧٣٤٧،٧٤٦٥).[٤٩٧]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا بۆلای منو فاتیمەی کچی، سەیری کرد: ئێمە نوستوین، فەرمووی: (ئەرێ ئەوە بۆشەونوێژ ناکەن، ئادەی هەڵسن بۆ شەونوێژ).

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا (اللّٰهُ يَتَوفى الانفس حين موتِهاَ ..) دەفەرموێ، گیانمان والەدەستی خودا خۆیدا، هەرکاتێ خۆی حەزکا هەڵمان بسێنێ ئەوا هەڵمان دەسێنێ! جاکەوامان گوت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەودوا گەڕایەوەو هیچ وەلامی نەدایەوە، لەپاشا کەدوور کەوتەوە گوێم لێ بوو لەپەرۆشا دەیدا بەڕانی خۆیداو بۆ پەرپەرچی وەڵامەکەی من ئەم ئایەتەی خوێندەوە:(وكانَ إلانسانُ أكثر شيءٍ جدلاً)(١٨-٥٤).

واتە: لەڕاستیدا ئادەمیزاد لەهەموو شتێ زیاتر حەزی لەدەمبازی یە).

٥٦٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (إِنْ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَض عَلَيْهِمْ وَمَا سَبَّحَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبْحَةَ الضحَى قَط وَإِنِّي لَأُسَبِّحُهَا). (الحديث ١١٢٨- طرفه في: ١١٧٧)[٤٩٨]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لەکەس و کارو هاوسەرو هاوڕێکانی) دەفەرموێ: (گەلێ جار وادەبوو کە

(٤٩٧) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وفصرها، باب: ماروى فيمن نام الليل اجمع حتى..، رقم: ٧٧٥=١٨١٥.

(٤٩٨) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب صلاة الضحى.. رقم: ٧١٨=١٦٥٩ شيخ شيحا.

پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام دەبوو لەسەر کارێ، وەحەزیشی لەوەبوو کەبەردەوام بێ لەسەری، هەموو کاتێ لەساتی خۆیدا ئەنجامی بدا، بەلاّم لەگەلّ ئەوەیش دا وازی لەو کارە دەهێنا، لەترسی ئەوەی کەموسولّمانان سەری تێ بکەن‌و بەرە بەرە فەرزببێ لەسەریان. وەبەپێی زانیاری من، من خۆم هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاو بکا، بەلاّم من خۆم نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو دەکەم، چونکە هەوالّم زانیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتی) بڕوانە: (ریاضی صالحین بەرگی /٣/ل/٦٩ فەرموودەی ژمارە/ ١١٤١).

راڤەو شیکردنەوە: وەك ڕێسایەکی گشتی زاناکان دەفەرموون: ( سوننەت دەریایەکی گەورەی فرە بابەتە، کەم کەس پەی بەهەمووی دەبا، بەتایبەتی لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا).

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی راگەیاندنی بەرنامەی ئیسلامی پیرۆز، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودای گەورە، لەبەر حیکمەتێ کەخودا خۆی دەیزانێ، بەپێی کات‌و شوێن‌و بۆنەو بوار، لەکۆڕو دانیشتن و وتارو فەرموودەکانیدا، بەگوتارو بەکردارو بەڕەزا دەربڕین لەسەر شتێ، بەهۆی هۆکاری لەبار بەپێی سەردەمی خۆی، وەك نووسین‌و فێرکردن‌و پێ لەبەرکردن، لەڕێگەی هاوڕێیانی یەوە، بەرنامەی ئیسلامی بەناو گەلی ئیسلام دا پەخش دەکردەوە.

جا بەبێ گومان، زوربەی یاران، کەم تا زۆر، لەم کارە پیرۆزەدا هاوبەشی یان کردووە، بەلاّم کەسیان ئاگایان لەسەرجەمی سوننەت بەتەواوی نەبووە، بگرە زوربەیان لەبابەتێکی تایبەتدا پسپۆڕی یان هەبووە، بەلاّم ئەوەی لەکیس ئەمیان چووە، بەنصیبی ئەوی تریان بووە، جا لەسەر ئەم بنیاتە ئەم چەند یاسایە دامەزراوە:

١- (چەسپاندن پێش دەخرێ لەسەر نەفیكردن) بۆ نموونە: حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) نەفی ئەوە دەكا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاوی كردبێ، بەڵام كەسانی تر لەهاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، ئەوەیان چەسپاندووە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاوی كردووە. دەی لەم بابەتەدا كار بەڕای ئەوانە دەكرێ كەدەڵێن: (نوێژی چێشتەنگاو سوننەتە، چوونكە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) كردوویەتیو فەرمانیشی كردووە بەكردنی).

وەبایستی رای عائیشەیش ئاوا روون دەكرێتەوە:

( بۆیە ئاگای لەم نوێژەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەبووە، چونكە زوربەی كات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی چێشتەنگاودا لەدەرەوەی ماڵەوە بووە، لەناو پیاواندا بووە، لەمزگەوت بووە، لەسەفەر بووە، لەغەزا بووە، چونكە پیاو كەمتر لەكاتی چێشتەنگاودا لەماڵەوە دەبێ، سەرە رای ئەوەیش سوننەت چەند جۆرێكی هەیە، هەندێ سوونەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ دوان كردوویەتی هەر شتێكیش یەك جار بفەرموێ بیكەن، یاخۆی بیكا بەسە بۆ كردنی.

جۆری یەكەم: بەڵگەی زۆرو روون لەئایەتوفەرمووده هەیە لەسەری، وەك: شەونوێژو رۆژوی سوننەت و خێرو صەدەقەكردنو زۆر شتی تری لەم چەشنانە، كە بەزۆری پێغەمبەر كردونی.

جۆری دووەم: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند جارێ لەژیانیدا بۆ تەشریع كردوونیو بەس. وەك نوێژ كردن لەناو ماڵی كەعبەدا.

جۆری سێیەم: خۆی نەیكردووە، بەڵام بەیارانی خۆی فەرمووە بیكەن، وەك: ( بانگدانو قامەت كردنو ئەو جۆرە سوننەتانەی كەبۆ ئوممەتی سوننەت بوون كەبەرابەر بەو بیكەن، لەڕێزو خۆشەویستیو ئەدەبو شەرمو شكۆ

كردن لەخۆی و کەسوکاری) وەك قورئان دەفەرموێ: (يا أيها الذين آمنوا لا ترفعوا أصواتكم فوق صوت النبي) مەبەست لەوە کەدەڵێین: ( پێغەمبەر خۆی بانگ و قامەتی نەداوە) شێوەی هەمیشەیی یە. چونکە لەسەفەردا جارێ بانگی داوە.

٢- ( کار بەکۆی بەڵگەکان دەکرێ، بەمەرجێ کۆبوونەوەیان دەست بدا)

٣- (زیادەی ثیقە مەقبوولە).

تێبینی: پاش ئەوەی کتێب پەیدا بوو زۆر لە زاناکان شارە زایی یان لە زوربەی سونەتدا پەیدا کرد.

## شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)

٥٦٣- عَنْ الْمُغِيرَةَ بنِ شعبة (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (إِنْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيَقُومُ لِيُصَلِّيَ حَتَّى تَرِمُ قَدَمَاهُ أَوْ سَاقَاهُ فَيُقَالُ لَهُ فَيَقُولُ أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا). [٤٩٩] (الحديث: ١١٣٠- طرفاه في: ٤٨٣٦، ٦٤٧١).

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە لەشەونوێژدا بەپێوە ڕاوەستابوو، هەردوو قاچی یا هەردوو لاقی پەنەمابوون! جا یاران (ڕەزای خوایان لێ بێ) عەرزیان کرد: ئەی خۆشەویستی خودا! بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی، خۆ تۆ خودا لەهەموو گوناهێکت خۆش بووە کەواتە بۆ وا لەخۆت دەکەی؟! ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەدیی دەبێ کەمنیش بەندەیەکی ستایشکارو عەبدێکی سوپاسگوزار بم). (ت/ ١/ ٤٩٣/ ٧ = ز-١٨١ ژ-٩٧١).

---

(٤٩٩) أخرجه مسلم في صفات المنافقين واحكامهم، باب: إكثار الأعمال والإجتهاد...، رقم:٢٨١٩ = ٧٠٥٥.

## خەوتنی بەرە بەیان

٥٦٤- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضيَ اللَّـهُ عَنْهُمَـا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهُ أَحَـبُّ الـصَّلَاةِ إِلَـى اللَّـهِ صَـلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْـهِ الـسَّلَام وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَـامُ سُدُسَـهُ وَيَـصُومُ يَوْمًـا وَيُفْطِـرُ يَوْمًـا) (الحـديث ١١٣١ـ أطرافـه في: ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١٩٧٥، ١٩٧٦، ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ٣٤١٩، ٣٤٢٠، ٥٠٥٢، ٥٠٥٢، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧) (٥٠٠)

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ( پەسەند ترین نوێژ لەلای خودا ئەو نوێژەیە کەلەسەر دەستووری داود پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسەر بێ) وە هەروەها ڕۆژوویش، یاسای داود پێغەمبەریش ئاوا بوو: نیوەی شەو دەخەوت، سێ یەکی شەویش شەونوێژی دەکرد، ئەمە دەکاتە پێنج بەش لە شەش بەشی شەو، وە ئەو شەش یەکەکەی تریشی دەخەوتەوە! وڕۆژ نا ڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو) (ت/ ١/ ٤٩٤/ ٩- ش/ د = ز-١٨١ ژ-٩٧٣).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ئەوەیە: کەبەشێوەی گشتی شەونوێژو ڕۆژووی سوننەت لەسەر ئەم شێوەیە بن، هەتا جەستەیش بەشی خۆی بحەسێتەوەو تووشی بێزاری نەبێ، دەنا شەونوێژ ئەگەر لەم ئەندازەیەیش کەمتر یا زیاتر بێ هەر دەبێ. هەندێ لەزانایان کاری باش بەم یاسایە دەکەن: ( کار تا زۆرتر بێ پاداشیشی زۆرترە).

---

(٥٠٠) اخرجه مسلم في الصيام، باب النهي عن صوم الدهر لمن تضر ربه.. رقم: ١١٥٩ = ٢٧٣١.

٥٦٥- عَنْ مَسْرُوق قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) (أَيُّ الْعَمَلِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: الدَّائِمُ، قُلْتُ: مَتَى كَانَ يَقُومُ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُومُ إِذا سَمِعَ الصَّارِخَ) (الحديث: ١١٣٢) [٥٠١]

مەسرووق دەفەرموێ: عەرزی عائیشەم کرد: کام کاری باش لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشەویست بوو؟ فەرمووی: (خۆشەویسترین کردەوەی باش بەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) کردەوەی باشی هەمیشەیی بوو. واتە: باشترین ئاییندارى لەلای خودا ئەوەیە کەخاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری) عەرزیم کرد: ئەی کەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ؟ فەرمووی: ( کاتێ گوێی لەکەڵەشێری نیوە شەو دەبوو دەیخوێند هەڵدەسا بۆ شەونوێژ) (وفي رواية عنها قالت: ما ألفاه السحر عندي إلا نائماً. تعني النبيُّ (دروودی خودای لەسەر بێ).

لەم گێڕانەوەیەدا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ( ئەو شەوانەی کە پێغەمبەر لەنۆرە شەوی خۆما لەلای من دەبوو، لەنیوە شەودا، کەکەڵەشێری نیوە شەو دەیخوێند هەڵ دەسا بۆ شەونوێژو نوێژێکی زۆری جوانی دەکرد، لەپاشا دەخەوتەوە، ئیتر هەتا بەرەبەیان زۆربەی کات دەخەوتەوە).

## باسی ڕاوەستانی دوورو درێژ لەشەونوێژدا

٥٦٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةً فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ قُلْنَا وَمَا هَمَمْتَ؟ قَالَ هَمَمْتُ أَنْ أَقْعُدَ وَأَذرَ النَّبِيَّ ـ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ) (الحديث ١١٣٥) [٥٠٢]

---

(٥٠١) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب صلاة الليل .. رقم: ٧٤١=١٧٢٧.

(٥٠٢) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب تطويل القراءة في صلاة الليل، رقم: ٧٧٣ = ١٨١٢.

ئیبنوو مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ شەونوێژم بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەپێوە ڕاوەستا و بەدوورو درێژی قورئانی خوێند، تەنانەت نیازم بوو ئیشێ خراپ بکەم، عەرزیمان کرد: نیازت بوو چی بکەیت وا بەخراپی دادەنێیت؟ فەرمووی: نیازم بوو دابنیشم‌و پێغەمبەر بەپێوە بێ‌و من بەدانیشتنەوە جەماعەتەکەم تەواو بکەم لەپشتیەوە، دیارە کەشتی وایش تەرکی ئەدەبە).

لەم فەرموودەیە ئەم بەهرانە وەردەگیرێ:

١- درێژی ڕاوەستان سوننەتە، شەونوێژ بەجەماعەت سوننەتە.

٢- پێچەوانەی پێشنوێژ کارێکی خراپە.

٣- ئەدەب لەپێشنوێژ سوننەتە، بەتایبەتی ئەگەر گەورە بێ.

٤- دەرسێ، یا قسەیێ تێ ی نەگەیشتی دووبارەی بکەیتەوەلەماموستا، ماموستایش بەشێنەیی بەبێ تووڕە بوون ڕوونی بکاتەوە بۆیان، چونکە ئەوەتا فەقێ و یارانی ئیبنو مەسعوودو، ئیبنو مەسعوود ئاوایان کردووە.

## شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەن ڕکات بوو

٥٦٧- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَتْ صَلَاةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يَعْنِي بِاللَّيْلِ) (الحديث: ١١٣٨).[٥٠٣]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێ: (شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سیازدە ڕکات بوو).

٥٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ). (الحديث: ١١٤٠)[٥٠٤]

---

(٥٠٣) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين، باب: الدعاء في صلاة الليل، رقم: ٧٦٤ = ١٧٨٨.

(٥٠٤) أخرجه مسلم في الصلاة (عينى/ ١٨٨/٧/ ١٧٠ فتح - ١١٤١) — المترجم = ١٧١٧-١٧١٩.

**لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەوەترو دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانی یەومبەشەو سیازدە رکات نوێژی سوونەتی دەکرد) (ت/١/٤٩٨ ٤ ز-١٨٢ ژ-٩٨١ = ش/ د/ ت/ن).**

**(باسی شەونوێژی پێغەمبەرو ئەوەی لەشەونوێژ هەڵوەشاوەتەوە)**

٥٦٩- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُفْطِرُ مِنْ الشَّهْرِ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لَا يَصُومَ مِنْهُ وَيَصُومُ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لَا يُفْطِرَ مِنْهُ شَيْئًا وَكَانَ لَا تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنْ اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلَّا رَأَيْتَهُ وَلَا نَائِمًا إِلَّا رَأَيْتَهُ) (الحديث: ١١٤١ أطرافه في: ١٩٧٢، ١٩٧٣، ٣٥٦١)[٥٠٥].

**ئیمامی ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەمانگ ئەوەندە لەسەر یەك بەڕۆژوو نەدەبوو، تەنانەت زەینمان بۆ ئەوە دەچوو کەئیتر لەو مانگەدا بەڕۆژوو نابێ، گەلێ جاریش ئەوەندە لەسەر یەك بەڕۆژوو دەبوو، هەتا زەینمان بۆ ئەوەدەچوو کەئیتر ئەو مانگە گشتی بەڕۆژوو دەبێ، هەموو شەوێکیش شەونوێژێکی جوانی دەکرد، بەڵام کاتی تایبەتی نەبوو بۆ شەونوێژ، بەپێ ی بواری گونجاو، لەکوێ ی شەودا دەستی بدایێ بۆی بەشەو شەونوێژەکەیی دەکرد، لەبەرئەوە جاری وا دەبوو دەیتبینی لەسەرەتای شەوەوە نوێژی سوننەت دەکاو خەریکی شەونوێژە، جاری وایش دەبوو لەسەرەتای شەوەوە دەخەوتو لەپاشتر بەشەو شەونوێژەکەی دەکرد، وە هەروەها کاتەکانی تری شەویش هەروا).**

## شەیتان سێ گرێ دەدا لەپشتە سەری کەسێ شەونوێژنەکا

٥٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذا هُوَ نَامَ ثَلَاث عُقَدٍ يَضرِبُ كُلَّ

---

**(٥٠٥) لم يوافقة مسلم على تخريجه (فتح/٣/ ٦٠ ـ خاتمة حديث رقم/ ١١٧١) — المترجم.**

عُقْدَةٍ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طويلٌ فارْقُدْ فَإِنْ اسْتَيْقَظ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ تَوَضأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطا طَيِّبَ النَّفْسِ وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيث النَّفْسِ كَسْلَانَ). (الحديث: ١١٤٢ ـ طرفه في: ٣٢٦٩)[٥٠٦]

ئەبو هورەیره (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( کاتێ کە دەخەون شەیتان سێ گرێ دەدا لەپشتی سەرتانو یەکە یەکە دەست دەماڵێ بەگرێکاناو دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژت لەسەربێ، جا ئەگەر خەوتو لەپاشا خەبەری بۆوەویادی خودای کرد گرێیەکان دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر دەستنوێژیشی گرت، ئەوا گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، وەئەگەر شەونوێژیشی کرد، ئیتر هەموو گرێکان بەتەواوی دەکرێنەوە، وەخۆشی گورج و گۆڵو دڵخۆش دەبێتەوە، ئەگینا لەپەستیو دلگرانیو تەمبەڵی دەمێنێتەوە! ). (ت/١/٤٩٢/ ٥ ز-١٨١ ژ-٩٦٩ = ش/د/ن).

## ڕوونکردنەوە:

عەسقەلانی دەفەرموێ: لەڕواڵەتی فەرموودەکەوە وا دەردەکەوێ کەئەمە هەربۆ خەوی شەو وایە، وەخۆشی هەروایە، بەڵام دوورنییە کەلەخەوی ڕۆژیشدا شتی واهەبێ، هەتا خەوتوو خەبەری نەبێتەوە بۆ نوێژی فەرز.

١- یادێکی تایبەتی مەرج نییە، هەرچی بەیادی خودا دابنرێت بۆئەم مەبەستە دەبێت. وەك سەلاوەت دانو قورئان خوێندنو خوێندنەوەی فەرمودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و دەورو دەرسی زانستی شەرعی. باشترین یاد ئەوەیە کەوا لەفەرمودەی (٥٧٧) دا کەلە دواوەدێ، هەروا ئەوەی کەلەفەرمودەی ژمارە (٥٥٨) داکە رابورد.

(٥٠٦) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: ما روى فيمن نام الليل.. رقم:٧٧٦ = ١٦١٦.

٢- كەسێ لەشی پیس بێ دەسنوێژ بەس نیە، دەبی خۆی بشۆرێ.

## هەروا شەیتان گمێز دەکاتە ناوگوێچکەی

٥٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ فَقِيلَ مَا زَالَ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحَ مَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ فَقَالَ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِهِ). (الحديث: ١١٤٤ ـ طرفه في: ٣٢٧٠).[٥٠٧]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) باسی کابرایەك کرا، گوترا: هەتا بەیانەکی هەر نووستبوو، وە نەچوو بوو بەلای شەونوێژەوە! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە شەیتان گمیزی کردۆتە ناو گوێچکەیەوە). (ت/١/ ٤٩٣/ ٦ ز-١٨١ ژ-٩٧٠ = ش/ن).

## باسی نزاو نوێژ لە کۆتایی شەوەوە

٥٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ يَقُولُ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ). (الحديث: ١١٤٥ طرفاه في: ٦٣٢١، ٧٤٩٤)[٥٠٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ( لەسێیەکی دوایی شەودا، هەموو شەوێ، خودای پەروەردگاری پیرۆزو گەورەمان، دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو، دەفەرموێ: کێ لەم دەمەدا لێم

---

(٥٠٧) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: ما روى فيمن نام..رقم: ٧٧٤ = ١٨١٤.

(٥٠٨) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: الترغيب في الدعاء والذكر في آخر الليل، رقم: ٧٥٨ = ١٧٦٩.

دەپاڕپێتەوە تا بچم بەهاواریەوە، کێ لەم دەمەدا داوای شتم لێ دەکا تا بەشی باشی پێ بدەمو بێ بەشی نەکەم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆش بم! ) (٥٠٩)

## باسی کەسێ لەسەرەتای شەوەوە بخەوێ و کۆتایی شەو بە خواپەرستی ئاوەدان بکاتەوە

٥٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أنها سألت: (كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَنَامُ أَوَّلَهُ وَيَقُومُ آخِرَهُ فَيُصَلِّي ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى فِرَاشِهِ فَإِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ وَثَبَ فَإِنْ كَانَ بِهِ حَاجَةٌ اغْتَسَلَ وَإِلَّا تَوَضَّأَ وَخَرَجَ). (الحديث: ١١٤٦) (٥١٠)

ئەسوەد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتی عائیشەم پرسی: بەشەو شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بووە؟ فەرمووی: ( زۆر جاران

---

(٥٠٩) شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەڕافەو ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، زۆر زانایانەو مەلایانە، لەهاتنە خوارەوەی خودا بۆ ئاسمانی خواروو دەدوێ، وە ڕاو بۆچوونی زاناو لایەنو کۆمەڵە مەزهەبی یەکان باس دەکا، یەکێ لەو زاتانە ئیبنو عەرەبی یە، کە دەفەرموێ: (مـن ڕام لەسەر تەئویلی ئەم جۆرە فەرموودانەیە، کەبۆنی جیهەولاو جێگەیان لێ دێ...).
کەچی بەداخەوە لەپەراوێزدا، کەسێ کەڕەنگ بێ چاپکارەکەبێ، بەبێ عیلم بەنەزانی لەخۆیەوە برێ قسەی بێ سەرو بەری نووسیوە، گوایێ بەخێرێ جەنابی ئەم ئەفەندی یە سەلەفی یەو ئەوەی عەسقەلانی و زانایانی ئیسلام تا ئێستا فەرموویانە بیدعەتو شتی وایەو پڕو پووچەو باطیلەو سەلامەتی لەوەدایە لێی دوور بکەویتەوە. داو لەخوێندەواران دەکەم کەبەگوێی ئەم کولکە خۆنەوارانە دڵیان لەزانا گەورەکان لەق نەبێ. (وەرگێڕ)
(٥١٠) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة الليل وعدد ركعات النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رقم: ٧٣٩ = ١٧٢٥.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتای شەوەوە دەخەوت، لەکۆتایی شەوەوە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ، دەسنوێژێکی جوانی دەشۆردو دەستی دەکرد بەشەونوێژ، کاتێ شەونوێژەکەیی تەواو دەکرد، دەگەڕایەوە بۆ ناو نوێنی نوستنەکەی، جا کاتێ کەبانگبێژ بانگی بەیانی دەدا، لەناو نوێنەکە رادەپەڕی، ئەگەر کاری بەخۆشۆردن هەبوایێ خۆی دەشۆردو غوسڵی دەکرد، دەنا دەسنوێژی دەگرتو دەردەچوو بۆ مزگەوت، لەوێ پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاوڕێیانی دەکرد).

## باسی شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی رەمەزان و لەمانگەکانی تری ساڵ دا

٥٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّها (سئلت: كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطولِهِنَّ ثمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطولِهِنَّ ثمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي). (الحديث: ١١٤٧ طرفاه في: ٢٠١٣، ٣٥٦٩)[٥١١]

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان ـ رەحمەتی خوای لێ بێ ـ فەرمووی: لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم پرسی: لەشەوانی مانگی رەمەزانا، شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: (بەپێی ئاگاداری من بەشێوەی گشتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نە لەشەوانی مانگی رەمەزاناو، نە لەشەوانی مانگی تردا، لە یازدە رکات شەونوێژ، زیاتری نەدەکرد، لەپێشا چوار رکاتی دەکرد، مەپرسە لەجوانیو درێژی یان، ئنجا چوار رکاتی تریشی

(٥١١) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب صلاة الليل وعدد.. رقم: ٧٣٨.

دەكرد، مەپرسە لەجوانیو درێژییان، ئنجا سێ ركاتی تریشی دەكرد. عائیشە فەرمووی: عەرزیم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرلەوە وەتر بكەی جار جارە دەتبینم دەخەوی؟ فەرمووی: ( ئەی عائیشە! چاوەكانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ!). (ت/ ١/ ٤٩٨/ ٥ ز-١٨٢ ژ-٩٨٢ = ش/ د/ ت/ن).

**روونكردنەوە:**

ئەمە مانای وانییە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی رەمەزانا زیاتر لەمانگەكانی تر سەرگەرمی تاعەت نەبووە، راستە كە كردەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشەیی بووە، بەڵام فەرموودەی تری دروست زۆرە كەبەڵگەن لەسەر:

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی رەمەزاندا سەرگەرمی طاعەتو شەونوێژو قورئانخوێندنو رەوان كردنی قورئانو خێرو صەدەقە كردنو خەڵوە كردن بووە، بەتایبەتی لەدەی دوایی رەمەزاندا، بەپێ ی فەرموودەی ژمارە شەشی ئەم تەجریدی بوخاری یە، لەهەموو شەوەكانی رەمەزانانا، حەزرەتی جوبرائیل (سەلامی خوای لەسەر بێ) تەشریفی دەهات بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی پێ رەوان دەكرد، وە بەپێی فەرموودەی ساخ، شەوی وابووە لەرەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتای شەوەوە،ماڵو منداڵو خێزانی خۆیو موسوڵمانانی لەمزگەوت كۆ كردۆتەوەو هەتا نزیكی بەیانی تەراویحی بەجەماعەت بۆ كردوون، تەنانەت مەترسی ئەوەیان بووە كە فریای پارشێو نەكەون، پێغەمبەر ئەوەندە لەشەونوێژا راوەستابوو لاقەكانی پەنەمابوون، شەوی وابووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار لەخەو هەڵساوە بۆ شەونوێژ. كەواتە: ئەگەر كەسێ، هەتا دەتوانێ شەونوێژێكی زۆری دوورو درێژ بكا، جێگەی خۆیەتی، چونكە شتی وا لەسوننەت دا چەسپاوە. (بڕوانە: تاج-١ ز-١٨٢ ژ-٩٧٨ هەتا ژمارە ١٠٠١ بەتایبەتی ژمارە ٩٨٤، ٩٩٤).

# بار لە خۆ قورس کردن لەپەرستش و خواپەرستیدا باش نییە

٥٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: (دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذا حَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ فَقَالَ مَا هَذا الْحَبْلُ قَالُوا هَذا حَبْلٌ لِزَيْنَبَ فَإِذا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ بِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَا، حُلُّوهُ لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ فَإِذا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ). (الحديث ١١٥٠) (٥١٢)

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ مزگەوت، ڕوانی وا گوریسێ لەناوەندی دوو کۆڵەکەدا ڕایەڵکراوە، فەرمووی: ( ئەم گوریسە چییە؟ گوتیان: ئەمە گوریسی زەینەبی خێزانتە، کە لەنوێژ کردنی سوننەتدا ماندوو بوو، خۆی پێ دەگرێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ( بیکەنەوەو لایبەن، شتی وا مەکەن، ئەوەندە نوێژی سوننەت بکەن کەگورج و گۆڵن، کاتێ خاوبوونەوەو خوڵکتان نەما، ئیتر دانیشن) (ریاض/ ١/ ١٤٦= بەرگی یەکەم بەکوردی، فەرموودەی پێنجەم لەزنجیرەی خۆی، ژمارەی فەرموودەکە لە ریاضا ـ ١٤٦).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ڕستەی (ئیتر دانیشن) دوو واتا هەڵ دەگرێ: یەکەم: (ئیتر بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکەن). دووەم: ( ئیتر واز لەکردنی نوێژی سوننەت بهێنن، تا مانووتان دەربچێ).

(٥١٢) أخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها.. رقم: ٧٣٨ = ١٨٢٨، ١٨٢٩.

## کەسێ شەونوێژ بکاو لەپاش خوو پێوەگرتن وازی لێ بێنێ، کارێکی ناباش و مکروە دەکات

٥٧٦-عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يَا عَبْدَ اللّٰهِ لَا تَكُنْ مِثْلَ فُلَانٍ كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ). (الحديث ١١٥٢) (٥١٣)

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ( ئەی عەبدوڵڵا! وەك فیسارە کەس مەبە، کەشەونوێژی دەکرد، بەڵام ئێستا وازی لێ هێناوە). (ریاض/ ١/ ١٥٥ ز-١٥ ژ-١٥٤).

## باسی بەهرەی کەسێ بەشەو بەدەم یادی خوداوە لەخەو خەبەری بێتەوەو نوێژ بکات

٥٧٧- عَنْ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ فَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ ثُمَّ قَالَ اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي أَوْ دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلَاتُهُ). (الحديث ١١٥٤) (٥١٤)

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ کاتێ بەشەو خەبەری دەبێتەوە، بەدەم یادی خوداوە خەبەری ببێتەوەو بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ: هەر خودا خودایە، تاك و تەنهایە، بێ هاوەڵ و بێ

(٥١٣) أخرجه مسلم في الصوم (عينى/٧/٢١٠/١٨١) — المترجم.

(٥١٤) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/ ٣/ ٦٠ ـ خاتمة. رقم: ١١٧١) المترجم.

هاوبەشە، موڵك‌و خاوەنی‌و پاشایەتی هەر قابیل بەخۆیەتی، سوپاس‌و ستایش هەر شایستەی خۆیەتی، هیچی لەدەست دەرناچێ‌و دەسەڵات‌و تەوانایی بەسەر هەموو شتێکا هەیە، سوپاس بۆ خودا، یەزدانێکی پاك‌و بێ گەردو بێ نەنگە، سوپاس‌و ستایش هەر قابیل بەخۆیەتی هەتا هەتایە، هەر بۆ خۆی خودایەو بەس، خودای گەورە لەهەموو مەزنێ مەزنترە، وەهەموو جموو جووڵێ، وە هەموو هێزو توانایی بەدەستی خودا خۆیەتی) فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): ئەوجا بڵێ: اللهم اغفر لي: خوایە! لێم خۆش بە، یا هەر نزایەکی تر بکا، لەپاش گوتنی ئەم گوتە پیرۆزە، خودا نزاکەی گیرا دەکا. فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر لەدوا ئەوە هەڵسێ دەستنوێژێ بگرێ‌و نوێژ بکا، نوێژەکەی قەبووڵ دەبێ). (تاج/ ٨/ ٣٥/ ١ = تاج-٤ ز-٩ ژ-٤٢٨٩).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو عەبدووڵڵای فەربەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە ڕاوی صەحیحی بوخاری یە، لە بوخاری خۆیەوە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: (لەپێش خەوتنا ئەم ذیکرەم کرد بەویردی سەر زمانم، کەسێ هاتە خەوم ئەم ئایەتەی تا کۆتایی خوێندەوە، کە دەفەرموێ: (وهدوا إلى الطَّيِّبِ من القول، وهدوا إلى صراط الحميد). (حەج/ ٢٢).

لە تاجول ئوصول دا ئاماژە بۆ ئەوە نەکراوە کەئیمامی بوخاریش ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، عومەیری کوڕی هانی (ڕەزای خوای لێ بێ) کە چوارەم کەسە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە، خوا ناسێکی گەورە بوو، هەموو ڕۆژێ هەزار ڕکات نوێژی دەکرد، ساڵی سەدو بیست‌و حەوتی کۆچی بەشەهیدی دەمرێ (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم زاتە نموونەیەکە لەپیاوانی ڕشتەکان (سەنەد)ی فەرموودەکانی صەحیحی بوخاری پیرۆز

٥٧٨- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أنه قالَ وَهُوَ يَقُصُّ فِي قَصَصِهِ وَهُوَ يَذْكُرُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ أَخًا لَكُمْ لَا يَقُولُ الرَّفَث يَعْنِي بِذلِكَ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ رَوَاحَةَ:

وَفِينَا رَسُولُ اللّٰهِ يَتْلُو كِتَابَهُ إِذا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنْ الْفَجْرِ سَاطِعُ

أَرَانَا الْهُدَى بَعْدَ الْعَمَى فَقُلُوبُنَا بِهِ مُوقِنَاتٌ أَنَّ مَا قَالَ وَاقِعُ

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنْ فِرَاشِهِ إِذا اسْتَثقَلَتْ بِالْمُشْرِكِينَ الْمَضاجِعُ

(الحديث ١١٥٥ ـ طرفه في: ٦١٥١) [٥١٥]

رۆژێ ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئامۆژگاری دەخوێندەوە بۆ هاوڕێکانی، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوادای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو ڕەواحەی براتان کە قسەی هیچو پووچ ناکا ـ گوتوویەتی (گویل):

وَفِينَا رَسُولُ اللّٰهِ يَتْلُو كِتَابَهُ إِذا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنْ الْفَجْرِ سَاطِعُ

أَرَانَا الْهُدَى بَعْدَ الْعَمَى فَقُلُوبُنَا بِهِ مُوقِنَاتٌ أَنَّ مَا قَالَ وَاقِعُ

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنْ فِرَاشِهِ إِذا اسْتَثقَلَتْ بِالْمُشْرِكِينَ الْمَضاجِعُ

واتە: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ) وا لەناوماندا، لەگەڵ شەبەقی بەیانی دا بەرنوێژیمان بۆ دەکاو، قورئانمان بۆ دەخوێنێ، کەنامەی پیرۆزی خودای گەورەو مەزنە، ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان داوینو، لەڕێگەی چەوت ڕزگاری کردوینو لەکوێرەوەریی کوێرە ڕێو، لە چەرمە سەری سەرگەردانیو، لەکوێرە ڕێی سەرکوێریی، قوتاری کردووین، ئێمە بەدڵ باوەڕی تەواومان هەیە کەهەرچی ئەو پێغەمبەرە نازدارە دەفەرموێ، ڕاستو دروستو هەقەو، زوو یا درەنگ چی فەرمووە دێتەدیو ڕوو دەدات، نیشانەیەکی جوانی تری ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ئەوەیە: کاتێ کە خەڵكو بێ باوەڕو نا موسوڵمانەکان

(٥١٥) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح الباری/ ٣/ ٦٠. رقم: ١١٧١) المترجم.

تێـر خـەو دەبـن‌و، لەشـەودا لاڵ‌و پـاڵ دەكـەون‌و، لەگەرمـەی خـەودا پرخـەی خەویان دێ‌و پرخو هوڕیانە، ئەو زاتە پیرۆزە لەوكاتەدا لـەباتی خـەوتن‌و پـاڵ كـەوتن لـەناو نـوێنی نـەرم‌و گـەرما، سـەرگەرمی شـەونوێژ كردنـەو گەرمـەی عیبادەت‌و خودا پەرستی یەتی) (تاج/ ١٠/ ١٧٦).

## روونكردنەوە:

لێرەدا شێخی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا ئەم چیرۆكە راگوێز دەكا: دەڵێ: دارە قـوطنی سـەبارەت بـەم هەڵبەسـتانە ئـەم داسـتانە دەگێڕێتـەوە: جـارێ عەبدوڵلای كوڕی رەواحە لەگەڵ كەنیزەكێكی خۆیـدا دروسـت دەبـێ، ژنەكـەی لەو كاتەدا لەسەر ئەو حاڵە دەیبینـێ، وە بـە عەبـدوڵلا دەڵـێ: مـن تـۆم بینـی لەگەڵ كەنیزەكەكەتدا دروست بووی ئەویش حاشای لێ دەكاو دەڵێ: شتی وام نەكردووە، ژنەكەیشی دەڵێ: دەی ئەگەر وایەو لەشت پاكەو لەشت پیس نییـە، دەفەرموو ئەندازەیێ قورئانم بۆ بخوێنە،هـەتا بـاوەڕت پـێ بكـەم، كەشـتی وات نەكردووە، عەبدوڵلایش ئەم شیعرانە دەڵێ!

ژنەكەیشی سەرسام دەبێ‌و دەڵێ: ( لەبـەر ئـەوەی بـاوەڕم هەیـە بـەخودا، وا ئەوەی كەبەچاوی خۆم دیم بەدرۆی دەزانم!)

عەبـدوڵلا لەپاشـتر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەم چـیرۆكە ئاگـادار دەكـا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵوێستی عەبدوڵلای پێ خـۆش دەبـێ وەهـا پـێ دەكەنێ كاكیلەكانی دەردەكەون! (فەرمایشتی عەسقەلانی تەواو بوو).

لـەم چـیرۆكەوە دەردەكـەوێ: مـرۆڤ دروسـتە بـۆی بـەفێڵی رەوا، بەحیلـە شەرعی‌و شتی وا، خۆی لەهەڵوێستی شلۆق رزگار بكات، هەتا لـەدادگا دەتـوانێ شوێنەونی (توریە) بكاو سوێند لەسەر شتێ بخوات‌و مەبەستی شتێ تـر بـێ، بەمـەرجێ مەبەسـتی خزمـەتی راسـت‌و دروسـتی بـێ، بەتایبـەتی دەسـتەی

پارێزەران لەم لایەنەوە دەتوانن ئەم داستانە بکەن بەسەرمەشق، بەتایبەتی تر کەکاتێ کەسێ بیەوێ گومانبارێ، بەمەهانەیێ، بەشوبهەیێ لەحەدیێکی شەرعی رزگار بکات.

عەبدوڵلای کوڕی رەواحە (رەزای خوای لێ بێ) ئەنصارییە، خەزرەجییە، کەسناو (کونیە) ی ئەبو موحەممەدە، لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی بەدرو ئوحودو حودەیبیەو خەندەقو عەمرەتولقەضاو هەموو جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە، هەتا غەزای مۆتە، کەلەساڵی هەشتی کۆچیدا لەشام رووی داوە، لەم غەزایەدا یەکێ بوو لەسەر لەشکرەکان کەشەهید کران، نەوەی لەپاش بەجێ نەماوە، یەکێ بوو لەنەقیبەکانی پەیمانی شەوی عەقەبە، یەکێ بوو لەنووسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەیمانی موئاخاتدا پێغەمبەر کردی بەبرای میقداد، ئەم مژدەی سەرکەوتنە مەزنەکەی بردەوە بۆ مەدینە، هەمیشە یەکەم کەس بوو لەلەشکری ئیسلام کە دەردەچوو بۆ غەزا، وە دوایین کەس بوو کەدەگەڕایەوە. جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ سیی سواردا ناردی بۆسەر ئوسەیدی کوڕی رەقراقی جوولەکە، کە لەخەیبەر بوو، کوشتیانو گەڕانەوە.

عەبدوڵلا شاعیرێکی جوانی خۆش دەست بوو، جارێ خۆشە ویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئادەی شیعرێکی سەرپێ یی (ارتجالی) کە زادەی ئەم کاتە بێ بڵێ، کەخۆم چاوم لێت بێ) جا یەکسەر لەجێگەی خۆی راستەوە بوو، بەبێ راوەستان فەرمووی (بسیط):

إنـــي تفرســـت فيـــك الخـــير أعرفـــه
والله يعلـــم أن ماخـــانني البـــصر
أنـــت النَّبِـــيُّ ومـــن يحـــرم شـــفاعته
يـــوم الحـــساب لقـــد أزرى بـــه القـــدر

فثبــت الله مــا آتــاك مــن حــسن
تثبيــت موســى، ونــصرا كالــذي نــصروا

واتــه: بەفیراســەت، بــەنووری ئیمــان هەســت دەکــەم کــەپیتو فــەڕ لــەتۆ دەرباریٚ، بەباشی ئەمە دەزانم، خودا دەزانیٚ کەمن لەم بۆ چوونەما بەهەڵە نەچـووم، تـۆ پێغەمبـەرێکی وای، ئــەوەی لەقیامــەتا لــەتکاو شــەفاعەتی تــۆ نائومێـد بـێ، ئـەوە چارە ڕەشـی قیامـەت خۆیـەتی، خـودا ئـەو دینـە جوانـەی کەبـە تـۆدا ناردوویـەتی دامـەزراوی بفـەرمویٚ، وەك چۆن لەسـەردەمی خۆیـا ئــاینی مووســای دامەزرانــد لەوڵاتــدا، وە پیرۆزییــەکی وەك پــیرۆزیو سەرکەوتنی ئەوانت پیٚ خەڵات بفەرمویٚ). پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بیٚ) پیٚ ی دەفەرمویٚ: (ئەی کوڕی ڕەواحە! خودا تۆیش لەسەر حەق راگیر بکا).

لەعــەمرەتول قــەضــادا ئیبنــو رەواحــە لەبــەردەم مــەوکیبی حەزرەتــەوە تەشریفی دەڕۆیشتو ئەم سروودەی دەخوێندەوە (رەجەز):

خلوا بني الكفار عن سبيله   اليوم نضربكم على تنزيله
ضربا يُزِيلُ الهام عن مقيله   ويذهل الخليل عن خليله

ئیمـامی عومـەریش (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) پێـی دەفـەرمویٚ: ( ئـەوە چۆن هەڵـەی وا دەکەی ئەی ئیبنـو رەواحـە! لـەخاکی بەسـت (حـەرەم) ی خـوداداو لەخزمـەت حەزرەت دا، شـیعر دەخوێنیتـەوە؟! پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفـەرمویٚ: (ئەی عومەر! وازی لیٚ بێنـە بـا شیعرەکانی بخوێنێتـەوە، بـەو کەسـە کەگیانی منی بەدەسە، قسەکانی ئەم لەشیرو تیر چاکتر کاریان لیٚ دەکا).

لەغەزایەکا لەخزمەت پێغەمبەردا، هاوڕێیان هەموویان لـەتاو گـەرمای زۆر هەموو دەستیان دانا بوو لەسەر سەریان، کەسیان بەڕۆژوو نەبوون، بێجگـە لـە پێغەمبەرو ئیبنو رەواحە.

ئیبنو عەبدولبەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە ئیستیعابا دەفەرموێ: چیرۆکەکەی ئیبنو ڕەواحەو ژنەکەی و کەنیزەکەکەی بەناوبانگە، لەچەند ڕوویەکی ساغەوە خۆمان گێڕاومانەتەوە، کە ئاوایە: ئیبنو ڕەواحە شەوێ دەڕواتە لای کەنیزەکەکەی، ژنەکەی پێی دەزانێ و لەسەر ئەوە سەرزەنشتی دەکا، ئەویش حاشای لێ دەکا، ژنەکەیش دەڵێ: من بەچاوی خۆم ئەوەم بینی دەی ئەگەر ڕاست دەکەی دروست نەبووی لەگەڵیدا، فەرموو هەنێ قورئان بخوێنە، چوونکە بۆ لەشپیس دروست نییە کە قورئان بخوێنێ؟ ئیبنو ڕەواحەیش دەفەرموێ (وافر):

شهدت بأن وعد الله حق وأن النار مثوى الكافرينا

وأن العرش فوق الماء حق وفوق العرش رب العالمينا

وتحمله ملائكـــة غلاظ ملائكة الإله مسومينـــا

ژنەکەیشی دەڵێ: ( باوەڕم بەخودا کردوو چاوی خۆمم بەدرۆ خستەوە! چونکە ژنەکەی قورئانی نەخوێند بوو، وە قورئانی لەبەر نەبوو)

٥٧٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: (رَأَيْتُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّ بِيَدِي قِطعَةَ إِسْتَبْرَقٍ فَكَأَنِّي لَا أُرِيدُ مَكَانًا مِنْ الْجَنَّةِ إِلَّا طَارَتْ إِلَيْهِ وَرَأَيْتُ كَأَنَّ اثنَيْنِ أَتَيَانِي أَرَادَا أَنْ يَذهَبَا بِي إِلَى النَّارِ فَتَلَقَّاهُمَا مَلَكٌ فَقَالَ لَمْ تُرَعْ خَلِّيَا عَنْهُ (الحديث ١١٥٦) فَقَصَّتْ حَفصَةُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِحْدَى رُؤْيَايَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ رَضيَ اللَّهُ عَنهُ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ) (الحديث ١١٥٧). [(٥١٦)]

لەتاجدا لەبەرگی پێنجەمی کوردیەکەدا، لە لاپەلاڕە (١٣٠) دا، ئەم فەرموودەیە ئاوایە: ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر

---

(٥١٦) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عبدالله بن عمر (رَضي اللّٰهُ عَنهُما). رقم: ٢٤٧٨.

(دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر پیاوێ خەونێکی بدیبایە دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منیش بە عەزرەتەوە بووم تا خەونێ ببینم هەتا بیگێڕمەوە بۆی، لەو سەردەمەدا من هەرزەکار بووم، جەهێڵێکی رەبەن بووم، ژنم نەبوو، لە مزگەوت دەخەوتم، جارێ لەخەوما دیم وا دوو فریشتە وەك بمگرنو بمبەن بۆ دۆزەخ وا بوو، ئاگرەکەش وەك بیری لەناوەوە هەڵچنراو ئاوا هەڵچنراو بوو، هەروا دوو شاخەی هەبوو، وەکی دوو شاخەی چەرخی سەر بیر، چەند کەسێکی تیادا بوون ناسێمنەوە، ئیتر دەستم کرد بەگوتنی پەنا دەگرم بەخودا لەزیانی ئاگر، جا لەم کاتەدا دوو فریشتەکە گەیشتن بەفریشتەیەکی تر، فریشتە تازەکە پێی گوتم: ترست نەبێ (وە بەوانیشی فەرموو: وازم لێ بهێنن) لەپاشا ئەم خەونەم گێڕایەوە بۆ حەفصەی خوشکم، کە هاوسەری حەزرەت بوو، حەفصەیش دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (عەبدوڵڵا پیاوی چاکە، بریا ـ شەونوێژی دەکرد!) سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: ئیتر لەوەدوا عەبدوڵڵای باوکم بەشەو نەختێك نەبێ نەدەنووست، هەر خەریکی شەونوێژ بوو!) (ریاض/٣/ ٤/٨٨٢).

## پایانێ

مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: باسەکانی شەونوێژ (تهجد) و ئەو باسانەی تر کەوان لەگەڵیا ـ مەبەست: هەتا باسی (التطوع بعد المکتوبة) یە ـ شەستو شەش فەرموودەیان لەخۆ گرتووە، دوازدەیان ڕشتە کرتاون (واتە: موعەللەقن: بێ رشتن) ئەوانی تریان پەیوەستن واتە: (مەوصوولن) چلو سێیان یا لەم باسەدا یا لەباسەکانی پێشیەوە دووبارە بوونەتەوە، پوختەکەیان (٦٦- ٤٣= ٢٣) بیستو سێ فەرموودەیە، ( هەر بیستو سێ کەیان لەتەجریدەکەدا هەن، لەژمارە ـ ٥٥٨ هەتا ٥٨٠) موسلیمیش رەزای خوای لێ بێ هەموویانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەمانەیان:

١-(١١٣٩ فتح. لەتەجریدەکەدا نییە)

٢- (٥٦٩ ت= ١١٤١ ف)

٣- (١١٤٣ ف. لەتەجریدەکەدا نییە چونکە بەتەواوی دیّ)

٤- ئەو تەعلیقەیە کەوا لەپێش فەرمووده ژمارە (١١٤٦) ەوە لەفەتحولباریدا، لەتەجریدەکەدا نییە، چونکە تەعلیقەکانی بوخاری لەتەجریدی بوخاریدا نین.

٥- (٥٧٧ ت = ١١٥٤ ف)

٦- (٥٧٨ ت = ١١٥٥ ف)

٧- (٥٨٠= ١١٦٦ ف. لەتەجریدەکەدا لەسەرتای یەکەم باسی دوا ئەم باسەی ژێر دەسمانە). عەسقەلانی دەیشفەرموێ: هەروا دەبیستراو (ئەثەر) ی صەحابەو تابیعیشی تیادایە. کەواتە: کۆی فەرموودەکان‌و بیستراوەکان دەکەنە (٦٦+١٠=٧٦) لەم حەفتاو شەشە بیست‌و سیانیان لەتەجریدەکەدا هاتوون. چونکە دووبارەو تەعلیق‌و ئەثەر لەتەجریدەکەدا نین، دووبارە لەیەك شوێن دەنووسریّ، مەگەر چۆنها.

## تێبینی:

بەپێی ئەو ژمارە دانانەی کەلەم نوسخە تازانەدابۆ فەتحولباری کراوە، لەلایەن (محمد فؤاد عبدالباقی و هاوڕێکانیەوە - چاپی یەکەم ١٤٠٧ ك - ١٩٨٦ز - قاهیرە) گەلیّ لەباسەکان ژمارەکانیان تەواو دەرناچیّ. ئەوەتا لەم باسەدا کۆی فەرموودەو ئەثەرو تەعلیقەکان دەکەنە (٧٦) کەچی ئەوان ژمارەیان بە (٥٢) پەنجاو دوو داناوە، ئەگەر ژمارە تەنیا بۆ فەرموودەکانیش دابنریّ دەکەنە (٥٤) نەك (٥٢) لەلایەکی تریشەوە هەندیّ‌فەرموودەی ئەم باسە هەیە عەسقەلانی بەیەك فەرموودەی داناوە، کەچی ئەوان دوو ژمارەیان بۆ داناوە،

وەك ژمـاره (١١٢١، ١١٢٢) كەپێـشەوا بوخـارى بـەدوو ڕشـتە گێڕاویەتیـەوە، لەعەبـدوڵڵاى كـوڕى موحەممـەدو لەمـەحموودى كـوڕى غەیلانـەوە، وە عەسقەلانى لەتەنبیهەكـەى كۆتـایى راڤـەى ئـەم فەرموودەیـەدا دەفـەرموێ: ( مـەتنى ئـەم فەرموودەیـە، سیاقەكەى بـەپێى لـەفـضى مـەحمووده، سـیاقى عەبـدوڵڵا بـۆ ئـەم مەتنـە لـەدواوە لەتـەعبیردا دێ). كەتەماشـاى تـەرقیمى عومـەدەتولقارئیش دەكـەى (دار أحیـاء تـراث العربـي) بـۆ ئـەم قـەدەره (٤٥) ژمارەیـان دانـاوه لـەژماره (١٥٠ ـ ١٩٤) بـەپێ ى بـۆ چـوونى بەنـده دەبـێ لەتەرقیمى فەرموودەكانى صەحیحى بوخاریدا، چەن خاڵێ رەچاو بكرێ:

١- ئـەطـراف حـەدیثـەكـە. ٢- بۆچـوونى خـاوەن شـەرحەكە، سـەبارەت بـە مەتنەكە كەسەرباسە، یا حـەدیثـە، مەوصووله یـا موعەللەقـە، یـا ئـەثـەره. ٣- بەتایبەتى لەتەرقیمى فەتحولباریدا.

بسم الله الرحمن الرحيم

يا حي يارحمان يا رحيم حقق لنا الآمال يا كريم!

## ٢٦) باسەكانى نوێژى سوونـنەت

### (نوێژى سوونـنەت دوو ركات دوو ركات سوونـنەتە)

٥٨٠– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَـا الـسُّورَةَ مِـنْ الْقُـرْآنِ يَقُولُ إِذا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ لِيَقُـلْ: اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّـكَ تَقْـدِرُ وَلَـا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِـي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ

قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي قَالَ وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ). (الحديث - ١١٦٦ - طرفاه في: ٦٣٨٢، ٧٣٩٠).[٥١٧]

جابیری کوڕی عەبدوللّا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، بۆ هەموو کارو فرمانێ، فێری ئیستیخارە (داوای نیشاندانی خێـر)ی دەکـردین، وەك چـۆن فێـری سـوورەتەکانی قورئـانی دەکـردین، دەیفەرموو: ( ئەگەر یەکێکتان نیازی کارێکی هەبوو، وە نەیدەزانی باشە یا خراپە، با لەپێشا دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکا، بڵێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي: یا فەرمووی: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْث كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ:

ئـەی خودایـە! داوات لـێ دەکـەم کەبـەعیلمو زانـستی خـۆتو دەسـەڵاتو تەوانایی خۆت چاکەو خێرم نیشان بدەو ئەوەی باشە بۆم زاڵم بکە بەسەر کردنیـا، وەداوای بـەشو بـارەو بەخششی گـەورەی خۆتـت لێدەکـەم، چـونکە تۆتوانـای هـەموو شـتێکت هەیـەو، مـن بـێ دەسـەڵاتمو تـەوانام نییـە، وەتـۆ هەمووشـت دەزانـیو مـن نـازانم، وەهـەرخۆت توانـاو زانـای بەهـەموو نهێنـیو ئاشکرایەك، پەروەردگارم! تۆدەزانی ئەگەر ئەم کارە باشە بۆمن، باشە بۆدینو ئاینمو، باشە بۆژیانمو بۆ سەرئەنجامی کارم).

یافەرمووی: باشە بۆئێستامو باشە بۆ پاشـەڕۆژم، ئـەوا لەچارەمی بنوسـەو ئاسانی بکـەبۆمو لەپاشیشا پیتو بەرەکـەتی تێبخـەبۆم، وەتـۆ دەزانـی ئەگـەر ئـەم ئیـشە خراپـە بـۆمن، خراپـە بـۆدینو ئاینمو خراپـە بۆگـوزەرانمو بـۆ

(٥١٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٣/٦٠ خاتمه. حديث رقم: ١١٧١ - المترجم).

سـەرئەنجامی کـارم، یافـەرموی: خراپـە بۆئێـستامو پاشـەڕۆژم، ئـەو لـەمن لادەومنـیش لەئـەولادە، وەچـی چاکە ئەوەم لەچارەبنوسـە، لەپاشارازیم بکـە پێی!).

پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (وەنـاوی نیازەکەیـشی بهێنـی). واتـە: لەوێـدا کـەدەڵێی: تـۆدەزانی ئـەم کـارە...بڵـێ: ...ئـەم کـارە کـەژن هێنانـە، یاخانوکڕینـە، یائەمەیـە، یائەوەیـە، باشـە بـۆمن ...تـا دوایـی. (تـاج/١/٥١٠-ب/د/ت/ن).

## سەرەوکاری دوورکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

٥٨١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ. (الحديث: ١١٦٣)[٥١٨].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هـیچ سـونە تێکـی تری وەك دوورکاتە سوننـەتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئاوابەباشـی سـەرەوکاری نـەدەکرد! . (ت/١/٣٠٦-ش/د).

## چی لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانیدا دەخوێنرێ

٥٨٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ هَلْ قَرَأَ بِأُمِّ الْكِتَابِ. (الحديث: ١١٦٥)[٥١٩].

(٥١٨) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استجاب ركعتى سنة الفجر، رقم: ٧٢٤.

(٥١٩) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب ركعتى سنة الفجر رقم:٧٢٣- المترجمه.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دووڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، تەنانەت لەدڵی خۆمەوە دەم گوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەکەوێ! (ت/١/٣٠٦-ش/د/ن).

## کردنی نوێژی چێشتەنگاو لەماڵەوە (لەئاوایی دا)

٥٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاث، لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ.

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویستم (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ ئامۆژگاریەی کردوم، هەتا دەمرم تەرکیان ناکەم: لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم، وەهەموو ڕۆژێ بەلایەنی کەمەوە دووڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، وەهەموو شەوێ لەپێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم. (ت/١/٤٨٥-ش/د/ت/ن). (الحديث: ١١٧٦ فتح الباري).[٥٢٠]

## کردنی دووڕکات نوێژی سوننەتی پێش نیوەڕۆ

٥٨٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ. (الحديث: ١١٨٢).[٥٢١]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەکرد: چوار ڕکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆوەو دووڕکاتیش لەپێش نوێژی بەیانیەوە. (ت/١-ش/د/ت/ن).

---

(٥٢٠) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب صلاة الضحى.. رقم: ٧٢١.

(٥٢١) بڕوانە(مسلم: صلاة المسافرين وقصرها، باب: جواز النافلة قائما وقاعدا، رقم: ٧٣٠).

## نوێژی سووننەتی پێش شێوان

٥٨٥- عَبْدُ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلُّوا قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ قَالَ: فِي الثالِثةِ: (لِمَنْ شَاءَ) كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً. (الحديث: ١١٨٣-طرفه في: ٧٣٦٨).[٥٢٢]

عەبدڵڵای موزەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خودای لەسەر بێ) (دوورکات نوێژی سوننەت، لەپێش نوێژی شێوانەوەبکەن) لەسەری جاری سێهەما فەرمووی: (ئەمەبۆ کەسێکە ئارەزوی کردنی ئەم نوێژە سوننەتەی هەبێ). پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێ) بۆیە وای فەرموو، نەوەکو مەردووم بیکەن بەدەستورو وابزانن کەدەبێ هەر بکرێ.

---

(٥٢٢)لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٣/٨٥ خاتمة حديث رقم: ١١٩٧- المترجمه).

# پێڕستی سەرە باسەکان

تَمَّ بِحَمدِ الله